# گفتوگۆ

## دیمانەو چاوپێکەوتنەکانی ساڵی دووەمی گۆڤاری (رامان) لەگەڵ چەند نووسەرو هونەرمەندێک

ئامادەکردنی:

**ئازاد عەبدولواحید**

هەولێر 1999

# گفتوگۆ ٧

چەند گفتوگۆیە لەگەڵ ژمارەیەک
رۆشنبیرو نووسەرو هونەرمەندی کورد

ئامادەکردنی: گۆڤاری رامان

بە بۆنەی ساڵرۆژی دەرچوونی (رامان)ەوە

هەولێر - 1997

* ناوی کتێب: **گفتوگۆ**
* ئامادەکردنی: **گۆڤاری رامان**
* تیراژ: (**1000**) **هەزار دانە ـ چاپی یەکەم ـ هەولێر**
* پیت چنین: **کۆمپیووتەری دەزگای گولان**
* هونەرکاری: **سۆران عوسمان ـ لێزان بارزان ـ کاوە فارووق**
* سەرپەرشتی چاپ: **مەحموود عەزیز**

## له جیاتی پێشەکی

گۆڕینەوەی بیرورا لەسەر ئەو بابەتانەی نوێن.. گفتوگۆکردن لەسەر ئەو خاڵانەی جیاوازی و کێشەیان لەسەرە، سیمای ئەم سەردەمەیە کە ئێمەی تێدا دەژین، بواری ئەدەب و رۆشنبیری یەکێک لەو مەیدانانەی ژیانی مرۆڤە کەوا زۆرترین جیاوازی لە بیرورا و گەورەترین و درێژخایەنترین گفتوگۆ هەڵدەگرێت، گفتوگۆیەک کە هەرگیزاو هەرگیز کۆتایی نایەت و بەدوای خۆیدا پەرێزێکی بەپیت بۆ بیرکردنەوە و پێشخستنی کۆمەلایەتی جێ دەهێلێت.

وەک زۆربەی بوارەکانی تری ژیانی کۆمەلایەتی ئێمەی کورد، بواری رۆشنبیریش لێدوان و را دەربڕینێکی زۆری دەوێت. بەداخەوە کورد درەنگ سیمای شارستانی وەردەگرێت و گفتوگۆش وەک کوڵەگەیەکی ئەم شارستانییەتە، تا ئێستە نەهاتووەتە ناو کولتووری گەلەکەمان و پەی بەگرنگی ئەم شێوازە نەبردراوە.

گۆڤاری **رامان**، ساڵێکی لەتەمەنی گەنجانەی خۆی گوزەراند و بە جۆرێکی بەردەوام، لەساڵی رابردوودا لەرۆژێکی دیاری کراوی هەموو مانگان دەرچوو، بەشێک لە بەرهەمی یەکساڵەی **رامان** ئەو گفتوگۆیانەن کە لەگەڵ ناوە ناسراوەکانی بواری رۆشنبیری کورد رێکدەخران و تیایاندا جیا لە هەڵدانەوەی لاپەڕە شاراوەکانی ژیانی نووسەر، لەسەر بوارە جیا جیاکانی رۆشنبیری و فیکر و ئەدەبی کوردیش پرس و لێدوان کراوە. ئێمە بە پێویستمان زانی ئەو دیدارانە لەناو کتێبێکدا کۆبکرێنەوەو جارێکی تر بیخەینەوە بەردەستی خوێنەران، تا سەر لەنوێ و هەموویان بەجارێک بخوێندرێنەوە، لەم رێگەیەشەوە جۆری بیروڕاو رێگەچارە رۆشنبیرییەکان بەروونتری بکەونە بەر چاوان، بەمەیش شێوەیەکی سادە، بەلام دەوڵەمەندی گفتوگۆ لەنێوان ژمارەیەکی زۆر لەرۆشنبیران دەردەکەوێ کە بەدرێژایی ساڵێک و بەپشوویەکی درێژ ئەنجام دراون.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم لەم بوارەدا سوپاسی کادیرانی گۆڤاری رامان بکەم، بەتایبەتی رۆڵی بەرچاوی هاوکارم کاک ئازاد عەبدولواحید کە ماندووبوون و شەونخوونی لەسەر ئەم دیدارو گفتوگۆیانە کێشاوە، کە ئەمە چاوپۆشی لێ ناکرێت.

ئەگەر ئەم هەوڵدانە بچووکە توانیبێتی جووڵەیەک بخاتە ناو خاوەن بیروڕایانی رۆشنبیری کوردییەوە، ئەوە ئێمە لەبەردەوامیدا گەرمتر دەکات.

**سەرۆ قادر**
**١٩٩٧/٥/٢٩**

**فەلەکەدین کاکەیی:**

# مرۆڤ لە زیندانیش بێ دەتوانێ ئازادانە بیر بکاتەوە.. سیاسەتیش بایەخی وشەی کەم کردۆتەوە

***فەلەکەدین کاکەیی لە ناوەندە سیاسی و رۆشنبیرییەکە ناوێکی ناسراوە، بەڵام زیاتر وەک رۆشنبیرێکی سیاسی ناوی دەرکردووە. لەم دیمانەیەدا لایەنێکی تری کەسایەتی فەلەکەدین کاکەیی دەخەینە بەرچاو کە رەنگە خوێنەران زۆری لێ بە ئاگا نەبن، چونکە بەشێکی زۆری بەرهەمە ئەدەبییەکانی خۆی لە سەردەمێکی زوودا بەزمانی عەرەبی بڵاوکردووەتەوە، یان ئەوەتە بەرهەم و نووسینەکانی خۆی بەناوی( سابیر عەلی ئەحمەد) بڵاوکردووەتەوە.***

***لەم دیمانە گرنگەدا بەرێزیان باسی ناسنامەی رۆشنبیری و پاشکۆیاتی و سەربەخۆیی لە رۆشنبیری کوردی و چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ کەلەپوور دەکات...***

**رامان: بۆچی تا ئێستە رۆشنبیری کورد هەوڵی نەداوە بەدوای ناسنامەی خۆیدا بگەرێ، بۆ ئەوەی بەو ناسنامەیەی خۆی بناسرێتەوەو لەناو ناسنامەی رۆشنبیری میللەتانی تری سەردەست خۆی جودا بکاتەوە...؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** بەلای منەوە کورد تارادەیەک ناسنامەی رۆشنبیری خۆی هەیە، مام هەژاریش هەمیشە ئەوەی دووپات دەکردەوە، کە ئێمە ناسنامەی خۆمان هەیە، بەڵام ناوێرین یان شەرم دەکەین بگەرێینەوە سەر سەرچاوەی کەلتووری خۆمان، کورد وەک هەر میللەتێک لە بۆشاییەوە نەهاتووە، بەڵکو ریشەیەکی هەیە، سەرچاوەیەکی ژیان و بناغەیەکی خۆی هەیە، ئەمەش لەجێگەیەکەوە هاتووە، کە ئەو جێگەیە دەکرێ ببێتە کانگەی رەسەنایەتی، بەڵام لە هەلومەرجی

ژێردەستەییدا، ئەو گەلانەی ژێردەستن، هەمیشە شتی دەرەوە یان شتی خەڵکانی تر بەراستترو باشتر دەزانن وهی خۆیان بەکەمتر، لە ئەنجامدا هەوڵ نادەن وەک خۆیان بن وەک هەن، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ هەوڵ بدا بگەڕێتەوە لای خۆی، بەلای منەوە ئەگەر کورد بەبێ ترس و بە جورئەتەوە بەخۆیدا بچێتەوە، بەبێ ترس هەموو مێژووی نەک تەنیا دەرەوەی، بەڵکو لەمێژووی دەروونیی خۆی بکۆڵێتەوە، ئەوە دەگاتە دەریایەکی بێ پایانی سەلماندنی مرۆڤایەتی خۆی کە وەک هەموو مرۆڤێک هەیەو بێ ترس دەتوانێ خۆی بناسێنێ و خۆی بنوێنێ، مەسەلەی ناسنامە لایەکی تریشی هەیە، ئەو (بابلێین)بارە لەعنەتییەی کەتووشی کورد هاتووەو لەرووی رۆشنبیرییەوە سەدان و بگرە هەزاران ساڵە ئابلووقە دراوە، ئەمە وای کردووە داهێنانی رۆڵەکانی چووەتە گیرفانی خەڵکانی ترەوە.

تاکی کورد وەک هەموو میللەتانی پێشکەوتوو لێهاتوویی و هەڵکەوتوویی تێدایە، ئەو کە بەو پلەیە گەیشتووە تێکەڵاوی بەرهەم و ژیان و سامانی رۆشنبیری و کەلتوری میللەتانی تر بووە، بۆیە تێکچووە، یان بزر کراوە، وەک (**مام هەژار**) دەڵێ دەوروبەر تەنانەت خواکانی ئێمەشیان بردووە، تەنانەت ئاهەنگەکانیشمان، لەوەشەوە نەیانویستووە بناسرێین، بەڵکو ئەوەی کە کوردیش بووەو ناسراوە بووەتە موڵکی خەڵکی تر. دەیان و سەدان ناو هەن گەر ئەوانە هەمووی بەکوردی بونایە یان بەناوی کورد بوایە کورد ئێستە ناسنامەی دەبوو، ئەوسا بەشێوەی بیرکردنەوە و بەمیعمار و مۆسیقا و سەماو هەڵپەرکێی خۆی دەناسرا، تەنانەت بە شێوەی فەلسەفەکەی دەناسرا، چونکە لەناو کورددا فەیلەسووفیش هەڵکەوتووە، لە ناو کورددا لە هەموو جۆرە بوارێکی زانستیدا دەرکەوتن و نبووغی هەبووە، داخەکەم ئەمانە هەمووی لە بوارێکدا کەپێی بووترێ ئەمە کولتووری کوردییە کۆنەکراونەتەوە، ناشتوانی ئێستە ئیسپاتی بکەیت و بە خەڵکی بسەلمێنی،لەبەر ئەوەی بەزمانی تر بووەو تێکەڵاوی کەلتووری خەڵک و ناسنامەی کەسانی تر بووە، لەهەمان کاتدا دەڵێم کورد ناسنامەی خۆی هەبووە، ئەمەش گەڕانەوەیەکی بوێرانەو چاونەترسانەی دەوێ، بێ ئەوەی شەرم بکەین لەوەی بڵێین ئەمە هی کوردە، ماوەیەکی زۆر بوو نەک تەنیا داهێنان تەنانەت نووسین بە کوردی لای هەندێک شەرم بووە، ئێستە بەلای منەوە یەکەمین جارە هەلومەرجی وەها دێتەکایەوە کەوا کورد بتوانێ خۆی بناسێنێ، ئەویش بە بەرز بوونەوەی مەسەلەی کولتوور و ناسنامەی نەتەوەییەوە بەستراوە، بە گشتی ژیانی نەتەوەیی و قەوارەی سیاسی نەتەوەیی و هەبوونی ئەو قەوارە سیاسی و یاسایی و ئابووری و کۆمەڵایەتییە نەتەوەییە، ناکاتە ئەوەی ناسنامەی هەبێت، بەڵام بەرهەمی نەبێت، بە پێچەوانەشەوە مومکین نییە

**نووسینی سیاسیی تێرم ناکا و جیهانی سیاسەتیش بایەخی وشەی کەم کردۆتەوە**

فەلەکەدین کاکەیی ـ سەرۆ قادر — فەلەکەدین کاکەیی ـ ئازاد عەبدولواحید

کوردێک تا ئێستە هیچ دەسەڵاتی نەبووەو وجودێکی دەستووریی یان یاسایی نێو نەتەوەیی نەبووە، بە ئاسانی ناتوانێت پێش ئەوەی هەبێت بتوانێ خۆی بناسێت، گەلانی تر قەوارەشیان هەبووە ئنجا نەیانتوانیوە ناسنامەی خۆیان بدۆزنەوە، بۆ میللەتێکی وەک کورد ئەم کارە ئاسان نییە ...

**رامان: لەباسی فەلسەفەدا فەرمووت کورد کۆمەڵێ شتی هەیە، فەیلەسووفی هەیە، بەڵام ئێستە ئەو ناسنامەیەیان لە بیر کردووە، یان بەدوایدا ناگەڕێت بۆ ئەوەی زەقی بکاتەوە، بەدەردی میسرییەکان دەڵێن تووشی (گرێی خواجە) هاتووە، واتە خۆ بەکەم زانین و خەڵک بەگەورە زانین، یان لە دەروونناسی زاراوەی - مرکب النقص - بەکاردێت ئێستە رۆشنبیری کورد چی بکات تا ئەو ناسنامەیە زەق بکاتەوە، بۆ ئەوەی بیکاتە پرۆسەیەک و بیهێنێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە و قسەکردن.. ؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** وەک وتم مەسەلەی بنەڕەتیی لە چالاکی رۆشنبیری و پرۆسەی بیرکردنەوەوە دێ، کە بۆ خۆی پرۆسەیەکە وەک شەڕ وایە، هەر چەندە لە شەڕ زۆر جیاوازو دوورە، بەڵام وەک شەڕ کە چۆن بوێری و چاونەترسی دەوێت، بەلای منەوە بیرکردنەوەش هەر وایە، لە بیرکردنەوەدا مەیدانێکی گەلێ گرنگ هەیە کە دەبێ مرۆڤ بەبێ ترس خۆی فڕێ بداتە ناوییەوە، وەک ئەوەی بێ ترس خۆی فڕێ بداتە ناو دەریایەکەوە کەبزانێ مەلەوانی دەکات، یان دەردەچێ یان دەرناچێ، ناشبێ لەوە بترسێ، بۆ ئەوەی گۆمەکە بشڵەقێنێ باهیچ نەترسێ. من دەڵێم کورد وەک هەر میللەتێک دەریایەکی پڕ لە گەوهەرو گەنجینەی هەیە، ئەمە گەر زۆرتری لەسەر بڕۆین دەمانخاتەوە سەر خانەی تەنانەت عیرفان و لایەنی سایکۆلۆژی و پاراسایکۆلۆژی و زۆر شتی تر، کە پێوەندی بە لێکۆڵینەوە هەیە لە دەروونی نەناسراوی مرۆڤ.. هەر مرۆڤێکی کورد وەک هەر رەگەزێکی تری هەر نەتەوەیەک هەروەک ئەوەیە بۆ نموونە بزانی داربەڕوو چۆنە، تەماشا دەکەی دارێک دەبڕن، لە پارچەی هەر درەختێ هەموو درەختەکە دەناسن، هەر فەردێکی کوردیش وایە و نموونەی هەموو میللەتەکەیەو پوختەی ژیانی مێژوویی نەتەوەکەی خۆیەتی، وەک مەسەلەیەکی زانستیش نەک هەر تەنیا وەک مەسەلەیەکی ئەدەبی.. لەبەر ئەوە هەر مرۆڤێک لە خۆیدا پوختەی نەتەوەکەی خۆی لە مرۆڤەکەدا هەیە، بەلای منەوە مەسەلەکە بە دەستوور نابێ، بە کۆمەڵیش نابێ، چونکە شتێکی زیاتر زاتییەو لە

چەند کەسێکدا پەیدا دەبێ، ئەو کەسانەی شۆڕشێ بەرپا دەکەن و ڕێگە دەکەنەوە و ڕێچکە دەشکێنن، شتی نوێ پیشان دەدەن و دەڵێن تۆ ئەوەی ئەم حاڵەتە وەک ئەوەیە کە وتم مرۆڤ بەزاتی خۆیدا بچێتەوە، دەبینی هیچی لە فەردی تر زیاتر نییە، ئەمە سروشتی مرۆڤە لە ناو خەڵکدا خۆی بەکەم بزانێ، بەڵام خۆی بەتەنیا هەموو شتێکی لەگەڵدایە، فەرد کە تەنیا خۆی دەبینێتەوە وادەزانێ هەموو دنیا لەناو ئەو دایە، بەڵام کەلەناو کۆمەڵێ خەڵکدا بێت تەماشا دەکا کەمەو بزرەو بە تەنیا تاکێکە، چقڵێکی بچووکە لەناو دارستانێکی مەزندا، ئەمە بەتایبەتی لەم سەردەمەدا زیاتر ئەم مەسەلەیە بۆ خۆناسین دێننەوە، نەک تەنیا کورد، بگرە سەرانسەری مرۆڤایەتی ئەمڕۆ خەریکی ئەوەیە ئینسان بە خۆیدا بچێتەوە، بەڵام بۆ کورد هێشتە پێویستترە، بەلای منەوە مەسەلە لەوێرا دەست پێدەکات. واتە چۆن بتوانی بەبێ ترس خۆت هەڵلاجی بکەیت، هەڵلاجی بەمانای وشە خۆت شیبکەیتەوە،بەبێ ترس هیچ نەبێ بۆ خۆت، مەرجیش نییە خەڵک پێ بزانێ، لەو پرۆسەیەوە تۆ دەگەی بە هەندێ شت و لە جیهانێکی تایبەتی خۆتدا برووسکە دەدات، ئەو برووسکانە ڕۆشنایی دەدات و ئەو ڕۆشناییە شتی نوێت بۆ ڕوون دەکاتەوە.. لە ژیانی هەموو هەڵکەوتووەکانی جیهاندا ئەوە هەبووە، لەلای کوردیش هەر هەیە، با هەمیشە نەچمە سەر ڕۆشنبیران، من دەڵێم لە کورددا نبووغ هەیە، تۆوی لێهاتوویی و بلیمەتی هەیە، بە ئیسپاتی ئەوەی لە زۆر بواردا مرۆڤی کورد بە پلەی بەرز گەیشتووە، بوارێک نییە مرۆڤی کورد ئەگەر تاک مرۆڤیش بێت بەپلەی بەرز نەگەیشتبێ، مانای ئەوەیە ئەم نەژادە خاوەنی ئەو - گەنجینەیەیە. ئەمەلەلایەک، لەلایەکی تر کورد شەرم لە مێژووی خۆی دەکات، شەرم دەکات لەوەی هەمیشە ژێردەست بووە شەڕی لەگەڵ خۆی کردووەو کەلتورەکەی دواکەوتووە، نابێ ئەم کێشە گرنگانە بەترسەوە تەماشا بکرێن، بەڵکو بێ ترس و بە چاوی کراوەوە دەبێ تەماشای بکرێت، دووەمیش ئەوەیە هەندێ ئەڵقە هەیە لە فیکری کورد بزرە، ڕۆشنبیری کورد بەسەر ئەو ئەلقانەدا باز دەدات، گەر وەک زنجیرەیەک بیگری تەماشا دەکەی هەندێ ئەڵقەی تاریک هەیە ئەو تاریکە نابەستێتەوە بەوانی ترو بەسەریدا باز دەدات . ئەمەش ئایا لەبەر دیدێکی ئایینییە، یان لەبەر نەزانینیەتی، یان لەبەر ئەوەی بێ ئەوەی ئەو بزانێ لەلایەن داب و نەریتێکی کۆن خۆی سانسۆر کردووە، ئەو داب و نەریتە لە منالییەوە لە مێشکیدا چەسپاوە، یا دیدێکی تایبەتییە لە مێشکیدا چەسپاوە، بۆ نموونە هەر لە تەنیشتییەوە هەڵکەوتوویەک هەیە ناوی فلان کەسە نایەوێ قەت بزانێ ئەو فلان کەسە ناوی چییە و چی دەکات و چۆن بیردەکاتەوەو ناشیبینێ، ئەمەش بۆ ئەوەی نەزانێ ئەو چییە، بۆیە هەرچی لە دەوروبەری هەیە لێی ناکۆڵێتەوە، دووسێ ئەڵقە لە کەلتووری کوردیدا هەیە دەربارەی ئایینەکانی کوردی پێش ئیسلام، کورد کەلتوورەکەی لە خۆڕا نەهاتووە، **بەڵێ ئیسلام وەک ئیسلام هاتووە دەوڵەمەند بووە بەشێوەیەکی تر کەلتووری کوردی- لە سەردەمی ئیسلامدا لەبەرچاوە، بە تایبەتی لەبابەتاهیری هەمەدانی** بەولاوە لەبەرچاوە، ڕۆڵی زانایانی ئایینی کوردیش دیارە،

بەڵام لەپاڵ ئەوە کەلەپوورێکی کۆنی فراوانی هەیە کە ناچێتە خانەی رۆشنبیری ئیسلامی کوردییەوە، ئەگەر شتێک هەبێ پێی بوترێ رۆشنبیری ئیسلامی کوردی، لەپاڵ ئەوەدا تەواو فۆلکلۆرەکەی لەناو ئیسلامیدا نییەو ناچێتە ئەو خانەیەوە، لە تەواوی فولکلۆرەکاندا نالێم فەلسەفە بەڵکو بەدیدی جیهانیی هەندێ تایەفەی کوردی هەیە، کورد لە باکووری کوردستانی گەورە لە چاو باشووریدا و گەر نەخشەیەک بۆ کوردستان بکێشی لەرووی دابەشبوونی ئایینی و دابەشبوونی بیری تایەفەیی و دابەشبوونی زاراوەو دیالەکتیکیش شتی زۆر سەیر دەبینی کە کورد خۆی لەوانە هەمووی دەدزێتەوە، وەک بڵێی کەلەپوورێکی پشت گوێ خراوە لە کاتێکدا بەشێکی گرنگی کەسێتی کوردی تێدایە، کە هەندێ ئەلقەی نەناسراو هەن کە نووسەران بەسەریدا باز دەدەن و لەدیدی نووسەرانەوە هەمیشە کەمو کوڕی هەیە، ئەگەر ئەم سەد ساڵە وەرگری زۆر شت نووسراوە، بەڵام هەندێ کەس تەنیا هەوڵیانداوە ئەو رێچکەیەبشکێنن بۆ نموونە ئەگەر یەزیدییەکان وەربگرین وا کەلتوورەکە دەخەنە بەرچاو کە کەلتووری تایەفەیەکی چەند سەدهەزار کەسی یان شتێکی بچووک بێ لە کوردستان. کەلتووری تریش هەن چ زازاییەکان یان لەشارەزوور یان لە کرماشان دەبینی کەلتوورێکی فراوانی هەیە، بەڵێ ئێستە لای چەند کەسێکە، یان لای چەند هەزار کەسێکە بەڵام لەراستیدا کەلتووری پێش ئیسلامی کوردەو ریشەی بنەڕەتی دیدو ئایدگای ئێستەی ئێمەیە، دیدی کورد هەر رێژەیەکە لەسەر زەوی، بێگومان بە رۆژێک دروست نابێ

کەسایەتی کورد، یان مرۆڤ بەگشتی هەر مرۆڤێ جیاناکرێتەوە لە کەسایەتی مێژوویی نەتەوەکەی، بەدەست خۆی نییە خۆی پوختەی هەموو میللەتەکەو پوختەی هەموو پێوەندییە کۆمەڵایەتیەکانیەتی، بێگومان پێوەندی کۆمەڵایەتیش لە خۆی جیاناکرێتەوە پێشی دەهەزارساڵیش ئەو میللەتە، یان ئەو نەتەوەیە بە قوناغێ رەت بووبێ، ئەوە لە ناخی دەروونی ناهۆشیاری ئەو مرۆڤەدا ماوەتەوە، بێ ئەوەی ئەو مرۆڤە بە خۆی بزانێ، لەدەیان شتدا سەر هەڵدەداتەوە، نووسەرانی کورد تازە خەریکن بە دوای ئەو شتانەدا دەگەڕێن، کتێبی ئەم دواییەی کاک حەمەی حەمەباقی لەسەر مێژووی مۆسیقای کوردی نووسیوە بۆ هەندێ لایەن چووە، ئەوەش کە ئەو بۆی چووە هێشتە کەمیشە، بەڵام زۆرباشە ئەو بەباشی پەلی هاویشتووە.هەندێ نووسەری تر هەندێ لایەن روون دەکەنەوە کە ئەو لایەنانە تا ئێستە تاریک بووە، بتەوێ و نەتەوێ ئەوە بەشێکی کولتووری کوردییە، مەبەستم لەوەیە کولتووری کوردی یان کولتووری ئیسلامی کوردی، یان کولتووری کوردی ئیسلامی ئەوە بەشێکی زۆر گرنگە، بەڵام کێشەی کولتووری کوردی هەر ئەوەش نییە، پێش ئەویش هەر کێشە هەبووە، چونکە ئەم لایەنە کەمتر لێی کۆڵراوەتەوە رۆژێ لە رۆژان ئەگەر بتەوێ ناسنامەیەک بدەی بە کەسێتی کوردی و کولتووری کوردی لە رێگەی ئەوەوە دەبێ، مام هەژار هەمیشە دەیوت: ئەگەر سەرانسەری کورد یەک ئایین و یەک مەزهەب بوایە سەردەکەوت..

ئایین و مەزهەب زۆر گرنگە و دەبێتە ناسنامەی ئەو میللەتە، یاخود

# ئێمە وەک زانست و هونەر زۆر لەسیاسەتەوە بەدووربن

ئایدیولۆژیەتی میللەتەکە یەک پەیامی دەبێت، بەڵام چ رەورەوەی پێشکەوتنی کورد و دەوروبەر وایان کردووە ئەو بەستەڵەکەی کە بەسەر کورد هاتووە ناچاری کردووە لە هەر جێگە و بەشێوەیەک خۆی بپارێزێ.

ئەمانە هەمووی وای کردووە لە ناو کورددا ئەو یەک پارچەیی مەزهەبییە نەبێت، چونکە ئایینی هەیە و زۆربەی زۆری موسڵمانە ئەگەر چی تەریقەتی ئایینی هەیە، ئەمانە هەموو کاردەکاتە سەر یەکبوونی دیدی کورد و ئەو ناسنامەیە، تا ئێستە یەکێک لە کێشەکانی کورد ئەوە بووە بەروونی نەیوێراوە بچێتە ناخی دەروونی خۆیەوە، نەیتوانیوە تەماشای دەوروبەر بکات، کورد بە چاوی (تابۆ) تەماشای شت دەکات، ئەمە حەرامەو ئەوە خراپە و ئەوەباشە، مەبەستم لە موحەرەمیی رۆشنبیری و فکیریبە، ئەو تابۆیە وای کردووە چاوی ببەستێ لە بەرامبەر زۆرشت کە لە بەردەمیایەتی، لە ئەنجامدا خۆی بزر کردووە، گەڕانەوە بۆ بناغەی خۆی زیاتر ئەرکی رۆشنبیرانە، تەنانەت سونبولە نەتەوەییەکان لەسەردەمی پێش ئیسلامی خۆی دەنوێنێ ئەمەیەکێکە لە هۆکانی کورد ناسنامەی خۆی نەخوێندۆتەوە، گەڕانەوە بۆ ئەوەش هەنگاوێکە بۆ ئەوەی بتوانێ کورد لە خۆی نزیک بێتەوە، کورد تا لە خۆی نزیک نەبێتەوە وەک مرۆڤێکیش خۆی نەناسێتەوە مومکین نییە دەوروبەر بناسێ، پێویستە کورد کەسێتی خۆی بناسێ ، چونکە وەک هەموو کەسێ هەیەو مەوجوودە، بێ ئەوەی شەرم بکا لەوەی کە هەیە، ئەمەش مانای وانییە لەوێ راوەستێ و بە کۆنەکانەوە بنووسێ و پێش نەکەوێ بەڵێ ئەگەر هەوڵ بدا بە پێشکەوتورین پلەی زانست و تەکنەلۆژیادا دەگات، خۆ ئەمە رێگە لەوە ناگرێ، لە ژاپۆن چەندە پێشکەوتوون، ئەو پێشکەوتنە وای لێ نەکردوون کە لە سونبولی نەتەوەیی یان لەناسنامەی نەتەوەکەیان دووربکەونەوە، بە پێچەوانەوە چەند پێشکەوتوون تەماشا دەکەی زیاتر بەناسنامەی نەتەوەیی و کولتووری خۆیانەوە شانازی دەکەن، بەرەسەنایەتی خۆیانەوە ماونەتەوە هەر لە جل و بەرگ لەبەر کردن تا شێوەی چا خواردنەوەیان، تا ئەو لایەنەی کە عیرفان و تەصەوفی تیادایە بەشێوەی پاراستنی پەرستگاکەیان..

**رامان: لە شەستەکان بە عەرەبی رۆمانت نووسیوە، رۆمانی (یانصیب) کە دوکتۆر عومەر تالیب لەسەری نووسیوە، لەوێ ناوتان بە رۆماننوسی کورد دەبات، بەڵام نووسین بە عەرەبی چوونە ناو مەنفایەکی دوانەییە، مەنفای زمان یەکێکە لەو لایەنانە، پێم وایە ئەگەر بە زمانی کوردی ئەو رۆمانەت بنووسیبا لەو باوەڕەدا بووم کەزیاتر وەک رۆماننووسێکی کورد بناسرێیت، ئەوە هۆی ئەوەیە کە لەناو رۆژنامەنووسی کوردی کەم کەس بیستبێتی تۆ رۆمانت نووسیوە، جەنابت نووسین بە زمانی عەرەبی چۆن لێک دەدەیتەوە؟! ئایا ئەوە دەچێتە ناو ئەدەبیاتی کورد،**

**لەکاتێکدا ئەم کێشەیە لە ناو نووسەرە جەزائیرییەکانیش هەیە کە زۆریان بە فەرەنسی نووسیویانە.. ؟!**

**فەلەکەدین کاکەیی:** سەرەتا بە کوردی دەستم بە نووسین کرد، لەشەستەکان چیرۆک و چیرۆکی کورتم بڵاوکردەوە و لەسەردەمی خۆی شیعری کلاسیکیم دەنووسی، ئەو رۆمانەی بە عەرەبی نووسیم کاتی خۆی لە نووسینی عەرەبیدا هەندێ پێشکەوتن هەبوو، سەرەرای ئەوەش لەو سەردەمەدا لە بڵاوکردنەوەی کتێبی عەرەبی زیاتر بوارومەاوە نەبووە، کە لە بەغدا چاپ دەکران، دووەمیش ئەوەیە کە دەمویست شتێک بنووسم و وەک گەنجێک کە دەیەوێ بنووسێت و شتێک پیشان بدات، ویستم شتێک بنووسم، ئەوەبوو ئەوەم نووسی و بڵاوکردەوە، بەڵام بۆ ئاگاداریت هەر لەگەڵ ئەو رۆمانە عەرەبییەدا رۆمانم بە کوردی ئامادەکردبوو کە لە پاشاندا هەردووکی سووتان، ئەو قسەکردنەش لەسەر نەمانیان هیچ نرخێکی ئەدەبی نییە رەنگە تەنیا بووبێتە رووداوێکی مێژوویی بۆ خۆم کە نەماوەو سووتاوە، لاوێک لە هەرتەمەنێک کە دەست پێدەکات بێ چاولێکەری نییە، بۆیە رۆمانەکە چاولێکەری هەندێ کەس و نووسەری پێوەیە، بۆ نموونە بۆ کۆتایی رۆمانەکە چاوم لە گۆگۆڵ کردووە و سوودم لە (**پاڵتۆکە**)ی وەرگرتووە، تەنانەت وشەی - **بیتاقە (یانصیب)**- نەک لە ناونیشانی بگرە لە ناوەرۆکی چیرۆکێکی (ی**ووسف ئیدریس**) وەرمگرت، لەهەمان کاتدا وەک چاولێکەری ویستم سێ کتێب یان سێ رۆمان لەسەر یەک بابەت بنووسم یەکێکیان بە عەرەبی و دوانیش بە کوردی. ئەوەش شتێکی سەیرە و وەزعی نووسەری کورد پیشان دەدات کە لە چ گێژاوێکدا ژیاوە، ئەمە قۆناغی خۆرسکی مرۆڤە، هی دووەم قۆناغی راچڵەکانی مرۆڤ و تا رادەیەک قۆناغی فیوداڵی و جووتیاری، هی سێیەم زیاتر پیشەسازییەو باسی کرێکاران و شتی وەها دەکا، ئەوەی دووەم زۆربەشم لەسەر نووسی باسی جوتیارێک دەکەم دەچێتەوە کەرکووک و دەبێتەوە کرێکار، پاشان چی لێدێ و ئەنجامەکەی بەچی دەگا و چۆن دەمرێ، سێیەم لەبارەی خوێندنم نووسی کەچۆن پێش دەکەوێ. ئەو کاتە نووسیم کە خۆم لە دێهاتەوە چوومە شار. هەر ئەو کاتەش هەوڵی سێیەمم نووسی، کاتی خۆی دەترسام پۆلیس دەهات و تەفتیشی دەکردو دەگەڕان، بۆیە سووتاندمن و ئیتر وازم هێنا، دوای ئەوە گۆڕانکارییەکی تر بەسەر ژیانمدا هات و رووم کردە رۆژنامە. لەبنەڕەتیشەوە لەکاتی چیرۆکنووسیندا هەر خولیای نووسینی رۆژنامەم هەبووە، خولیای نووسینی ئەدەبی نەک سیاسی، بەڵام نووسینی سیاسی لەم دواییەدا تێیکەوتم، بەگشتی ئەو ژیانەی کە تێدا بووم وای لێکردم کەروو لە نووسینی سیاسی بکەم، نووسینەکانم تا پێشی بیست ساڵ زۆربەی زۆری رۆشنبیری و ئەدەبی بوون،

> **مرۆڤ لە زیندانیشدا بێ، دەتوانێ ئازادانە بیر بکاتەوە**

قەڵەکەدی کاکەیی ـ ١٩٥٩/کەرکووک

هەرچەندە کورت بوون، بەڵام شێوەی ئەدەبی پێوە دیار بوون، لە بیست ساڵ تا بیست و پێنج ساڵ بەولاوە زیاتر نووسینی سیاسیم دەنووسی، بێگومان نووسین بە عەرەبی یا بە هەر زمانێکی تر خزمەتی ئەو زمانەیە، من لەوەدا گومانم نییە، لەو بارەیەوە وتارێکم بڵاوکردەوە دیسان بەعەرەبی دەربارەی ئەو نووسەرانەی کە بەزمانێکی تر دەنووسن، هەیە کوردە بەعەرەبی یان بەتورکی یان بەفارسی دەنووسێت، هەیە جگە لەوتارو لێکۆڵینەوە شیعر و چیرۆک و رۆمان و شانۆیان بەزمانەکانی تر نووسیوە، بۆ نموونە- یەشار کەمال - نەیتوانیوە بە کوردی بنووسێ، یان ماوە نەبووە بە کوردی بڵاوبکاتەوە، لە هەردوو حاڵەتەکەدا پرسیار ئەمەیە کەسێکی وەک (**یەشار کەمال**) ئایا لەبەر ئەوەی ناتوانێ بە کوردی بنووسێ دابنیشتایە و هیچی نەنووسیبا، یان لەبەر ئەوەی ماوەی هەبوو بە تورکی بنووسێ، هیچ نەبێ بە تورکی هەندێ شتی بەجێ هێشت. خەڵک دەڵێ نووسەر هەر کوردە و لەسەر کورد دەنووسێ، کامەیان باشترە؟ ئەم پرسیارەم کرد لەبەر ئەوە نووسەر کە دەگاتە حاڵەتێک کە هیچ نەنووسێت و هیچ نەکات و ئەگەر خزمەتی زمانەکەی خۆیشی نەکات و ئەگەر شتێکی باش بنووسێت، ئەوە خزمەتی لایەنی رۆشنبیری میللەتان دەکات وەک رەورەوەی مێژوویی، بەو شێوەیە پاساوم دەدایەوە. ئەوە لەلایەک، لایەنی تر ئەوەیە ئەگەر توانی شت بنووسێ بەزمانەکەی تر، بەڵام لەسەر مەسەلەکەی خۆی زۆر باشترە و دەبێتە پرۆپاگەندەیەک یان ناساندنێک بۆ کێشەی میللەتەکەی، بۆنموونە ئەو رۆمانەی کە من نووسیم دوکتۆر عومەر تالیب لە قاهیرە لەسەر رۆمانی عێراقی دوکتۆرای وەرگرت و بەشێکی تەرخان کرد بۆ ئەو نووسەرە کوردانەی کە بەعەرەبی نووسیویانە، لەوانە **عەبدولمەجید لوتفی و سەمەد خانەقا** و من و، چەند کەسێکی تر بوو کە لە بەیرووت چاپ کرا کە لەوێدا وەک ئەدیبی کورد ناومان دەبات و دەشڵێ: ئەمانە لەسەر کۆمەڵگەی کوردەوارییان نووسیوە، ئەم کتێبەی خۆی لە ساڵانی حەفتا چاپ کردووە ئەگەر تەماشای ئەدەبی عەرەبی و رای گشتیی عەرەبی بکەی کە لەو زەمانەدا نووسەرێکی عەرەب دکتۆرا وەردەگرێ لە قاهیرەیان لە بەیرووت بڵاوی بکاتەوە و بەم شێوەیە ناوی کورد هاتووە، ئەمە رەنگە بۆ ئەوەی ئێوە گرنگ نەبێ، بەڵام لەلای ئێمە زۆر گرنگ بووە، تۆ بە هەر شێوەیەک بێ دەنگی خۆت هەبێ. رەنگە ئێستە لە بەر ئەوەی ماوە بۆ نووسینی کوردی رەخساوە، ئەگەر یەکێ قسەی وا بکات ببێتە گاڵتەجار، بەڵام حەقیقەتەکە ئەمەیە.

بێگومان من ئێستە هانی نووسەران نادەم بەزمانێکی تر بنووسن بە تایبەتی ئەدەب و داهێنان، ئینجا چ رۆمان بێ یان چیرۆک و شیعر و شانۆ و لێکۆڵینەوەش

بێت. نووسین بەکوردی ئەرکێکی بنەڕەتی ژیانە و زمانەکەی خۆت دەوڵەمەند دەکات و زمانی کوردیش یەکێکە لە کۆڵەکە هەرە بنچینەییەکانی وجوودی نەتەوەی کورد .. باسی ناسنامەت کرد، زمانی کوردی بۆخۆی ناسنامەیەکە، زمانەکە بناغەو بنەڕەتی ناسنامەکەیەتی، بۆ نموونە یەڵماز گۆنای بەتورکی کاری سینەمایی کردووە، سینەماکەی دەتوانم بە سینەماگەری کوردی دابنێم، سینەماکەشی ناوەڕۆکەکەی لەسەر کوردستانەو لە کوردستانە، بەڵام بەتورکییە، ئایا ئەمە لەبەر ئەوەیە کە بوار بۆ زمانی کوردی نییە؟ یان وای پێ باشترە، بەڵام شتێکی کردووە. ئەمە لەجێگەی تریش هەیە بۆ نموونە لە جەزائیر بەرچاودەکەوێ، ئەگەر شتی ئەدەبی بەعەرەبی بنوسرێت زیاتر لایەنی مرۆڤایەتی دەوروژێت، مومکین نییە میللەتێک بەزمانی نەتەوەیەکی تر بنووسێت و دژی میللەتەکەی خۆی ئەدەبەکەی بخاتە گەڕ، ئەمە بەردەوامی لایەنی ئینسانی ئەدەبی جیهانییە، دیسان ئەوەش پاساو نییە تا ئینسان بەزمانی خۆی نەنووسێت لەیادمە هێمن کە لەسالآنی دوایی ژیانیدا بوو تازە گۆڤاری (**سروە**) یان پێدابوو دەری بکات، چوومە لای (**وتی سەیرکە ئەو وەختەی کە بوار نەدەدرا شیعرم بۆ دەهات و شتم دەنووسی، ئێستە گۆڤارێکم پێدراوە پەکم کەوتووە و کەڵکم نەماوە**) خەفەتی لەمە دەخوارد یان محێدین زەنگەنە شانۆی هەیە لەقاهیرەو بەغدا نمایش کراون یان یەشار کەمال شاکارەکانی بەچەندین زمانی جیهانی وەرگێڕدراون.. کەم میللەت هەیە یەشار کەمال نەناسن، بەڵام بە ئەدەبی تورکی ناسراوە، چونکە بەزمانی خۆمان نەینووسیوە، نکۆڵیش لەوە ناکرێ کورد ئەو بلیمەتەی تێدایە.

**رامان: هەمیشە نووسەران لە ئەنجامی نووسین و گوزارشت کردن لەخۆیان دەکەونە نیگەرانی لەبەردەم هەڵبژاردنی یەکێک لەرەگەزە ئەدەبییەکان کە زیاتر دەتوانێ تەعبیری پێ بکا، بۆ نموونە هەڵبژاردن لەنێوان شیعرو رۆمان و هەڵبژاردن لەنێوان رۆمان و رەخنە، بەڵام ئێوە لە نووسینی ئەدەبی دابڕان و، رووتان کردە بواری رۆژنامەوانی، بەتایبەتیش نووسین لەبواری سیاسی، ئێستە وەک رۆژنامەوانی سیاسی ناسراویت، یان رۆشنبیرێکی سیاسیت، ئەمەیان چۆن تەفسیر دەکەیت؟!**

**فەلەکەدین کاکەیی:** ئەو قەلەقەی باست کرد بەراستی بۆمن ئاسان نەبوو، ئێستەیش بۆ من ئاسان نییە، ئێستە کە شتی ئەدەبی نانووسم بەڵام هەست دەکەم ئەمە بۆشاییەکە لەژیانما هەرچەندە شتی سیاسی بنووسم تێرم ناکات، چونکە دەزانم ئەوە نییە کەمن دەمەوێ بینووسم، یان ئەوە نییە کەدەتوانم بینووسم، من بەناچاری لەمەسەلەی ئەدەبی دابڕام، بەڵام بۆ خۆم بەدزییەوە دەنووسم کە دەڵێم بەدزییەوە نەک بەو مانایەی کە دەترسم، بگرە ناو بەناو دەنووسم، بەڵام گەیشتووم بەهەندێ قەناعەت و بۆچوونی تر لەژیاندا کە وردە وردە دەگەم بەوەی بپرسم نووسین بۆ چییە...؟

لەلایەکی تر ژیانی مرۆڤایەتی کە تەماشا دەکەم، خۆم لەکۆمەڵ و لە رەوڕەوەی گشتی مێژوودا دەبینم و دەپرسم ئەم بەشەرە بەرەو کوێ دەچێ؟ مرۆڤایەتی بەرەو ئەوە دەچێ ئەوانەی پێشتر و ئێستە نووسراون رەنگە ئەو بایەخەیان نەمێنێ،

فەلەکەدی کاکەیی لەگەڵ عەبدولوەهاب سەید فەتاح / کەرکوک ١٩٥٨

هەندێ جار بەجۆرە عەبەسییەتێکەوە دەڵێم: بنووسی و نەنووسی مانای چی؟ ئەوە نووسیت مانای چێ نەتنووسی مانای چی؟ هەندێ جاریش ئەو پێشکەوتنی زانستییەی هەیە کارێکی وا دەکا کە مرۆڤ هەمیشە خولیای ئەوەی بێ بەرەو پێش بچێ، هەوڵم داوە لەزانست بزانم، ئەنجامی هەموو پێشکەوتنەکان تێبگەم. بۆ نموونە ئەوە ماوەیەکە خەریکی بیرکردنەوەم لەوەی کەوا پاش ئەوەی بارودۆخی سیاسی جیهان گۆڕا، لەو بارەیەوە زۆرشتی نهێنی بیستراوو بینراو هەیە، هێشتە (نەوەی نوێی کورد) نەیانزانیوە بۆچی وای لێهات، مەسەلەکە هەروا سادە نییە، ئەوە نییە هەر تەنیا بڵێین بۆ وای لێهات، یان پیلانێ بوو، مەسەلەکە زۆر لەوە قووڵترە کەخەڵکی تێی گەیشتوون بەهەندێ شێوەی بیرکردنەوەی زانستی، کە زۆر گرنگە بزانین شێوەی بیرکردنەوە چۆنە، ئێستە لەم دوو سێ مانگەدا بانگەوازی شۆڕشێکی بایۆلۆژی لەئارادایە، ئەوە منی خستووەتە بیرکردنەوەوە، سەرەڕای ئەو هەموو ئیشانەی کە هەمەو ئەو قسانەی هەن سیاسی و غەیری سیاسی، هی کورد و غەیری کوردی ئەم شۆڕشەی لەزانستی جیناتتدا هەیە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە و ئەگەر ئەوە سەر بگرێ ئەوە چی کراوە هەمووی دەڕوات و بەشەر دەگاتە قۆناغێکی تر، بۆ نموونە ئینسان فۆتۆکۆپی بکرێ پاش ماوەیەک واتە ئەو ئینسانە هەیەو وەک ئەو تەواوە، کەبەهەمان شێوەو ڕەنگ و بۆچوون دەربچێت، ئەوەش زۆر پرسیار دێنێتە پێش، ئەمە چۆن دەبێ و چی دەکات؟ ئایا چی بەخراپ دەزانێ؟ ئایا ئەو داب و نەریتەی کەهەیە هەمووی گۆڕانکاری بەسەردا نایەت و پێی دەڵێن ڕۆشنبیری بەو چەمکەی ڕۆشنبیری گۆڕانکاری بەسەردا نایەت؟ ئەوەی تیا ناچێت؟ یا ئەوەی ئێمە پێی دەڵێین هونەرو زەوقی لێ دەبینین، ناگۆڕێت؟! (**بەرنادشۆ**) لەیەکێک لە شانۆییەکانی کە لەیادمە نووسیبووی (**ڕۆبۆت - ئینسانی ئالی**) ڕۆژێ لە ڕۆژان شۆڕشێ بەسەر ئینساندا دەکەن، مانای ڕۆبۆتەکان زیاد دەبن و ڕۆژێ لە ڕۆژان شۆڕشێ دەکەن بەسەر ئەوەی دروستی کردوون. دیارە دیدی یا بۆچوونەکەی (برنادشۆ) هاتە دی، زۆر لەوەش سامناکتر هەیە کە لە (ئەتۆم) خەتەرترە، ئێستە خەتەری ئەتۆمی لەسەرمان ماوە، ئەم زەوییە بەچەکی ئەتۆمی چێنراوە و خەتەرەکەشی ماوە، لەگەڵ ئەوەشدا شۆڕشێکی زۆر خەتەرتر لە زەڕە هاتووە، ئەویش دەستکاری کردنی (**جینات**)ە کە دەستکاری کردنە لە بناغەی ژیان لەسەر زەوی، نەک تەنیا لەسەر ئینسان، بگرە لەسەر ئاژەڵ تا ژیانی درەختیش، ئەم شۆڕشە یان کودەتا مەزنە گەر سەربگرێ، ئایا ئەوەی ئێستە پێی

دەڵێین شارستانی و شانازی پێوە دەکەین، یان هەوڵ دەدەین پێی بگەین، ئایا هەمووی لەگەڵ خۆی نابات؟ هەمیشە لەقۆناغێکدا بیرم لەشتی وا کردۆتەوە، توانیومە لەبواری ئەدەب رۆمان و چیرۆک بنووسم و زۆر بەلایدا چوومە، دابڕانەکە تەنیا ئەوە بووە کەنەمتوانیوە بەردەوام بم بەڵکو ئەم هۆیەش هەبووە، ئێستە من لەم قۆناغەدا زۆر بیر لەوە دەکەمەوە رەنگە لە سیاسەتیش لام گرنگتربێ، کە ئەنجام چی دەبێت؟! تۆ ئەو (جیناتە) بێنی و بەهەمان شێوە دروستی بکەیتەوە، مانای وایە هەزارانی وەک ئەو ئینسانە دروست دەبێتەوە. باشە ئەم ئینسانە چۆن بیردەکاتەوە و چۆن دەژی و چۆن پێوەندی دەکاو دیدی لە رووی پێوەندی کۆمەڵایەتی و داب و نەریتەوە چی دەبێ؟ ئەمە مەسەلەیەکی سادە نییە، ئەم جۆرە شتانە وا دەکات ئینسان دوورتر بڕوانێ، بەکورتی بایۆفیزیک پێشکەوتن و شۆڕشی مەزنی تێدایەو کار لەفەلسەفەو جیهانبینی مرۆڤ دەکات.

رامان: بەڕێزتان باستان کرد کەی بەشێوەی ئاشکرا نووسینی ئەدەبیتان بەجێ هێشت و کەی کەوتنە نووسینی ژێر زەمینی-ئەدەبی، بۆ ئێمە جاری یەکەمە بزانین لە پشتەوەی پەردە خەریکی هەندێ نووسینی، بەڵام دەکرێ بزانین چ شتێ ئەو تەکانەی پێدای کەتۆ ئەو جیهانە بەئاشکرا بەجێ بهێڵی و بکەویتە قۆناغی رۆژنامەنووسییەکی بەئاشکراو ئەدیبێکی لە پشتەوەی پەردە، کە تەنیا ببێتە جیهانی تایبەتی خۆت، چ شتێک واتەکانی پێدای؟!

فەلەکەدینی کاکەیی لەگەڵ باوکیدا ساڵی ١٩٥٢/ کەرکوک

فەلەکەدین کاکەیی: کە گەیشتمە ئەو قەناعەتە هەوڵ دەدەم لەرووی جیهانبینی و فەلسەفەوە پرۆژەی جیهانم بۆ چییەو بۆ کوێ دەڕوا، بێگومان ئێوەش، هەر مرۆڤێک ئەو شتەی کەم و زۆر لەمێشکدایە، ئەوە وای کرد هەمیشە خۆم لەقالبێکدا زیندانی نەکەم، ئێستەش وایە تەنانەت لە پلەی حزبایەتی ئەوەندە خۆم لەجێگەیەک راناگرم حەز ناکەم لەیەک قاڵبدا خۆم دابڕێژم، من دژی قاڵبم..

رامان: سیاسەت و شۆڕشگێڕی لەزمانی خۆت لەسەردەمی شەستەکان چەند کاریگەری لەگەڵ ئەو قەناعەتە دا هەبوو؟ ئایا ئەویان کاریگەری هەبوو..؟

فەلەکەدین کاکەیی: مەسەلەکەیەک هێڵە شۆڕشگێڕی پلەیەک نییە، قۆناغێ نییە، شۆڕشگێڕی لای من هەمیشەییە. ئەوەی تۆ قەناعەتت پێی هەیە کە کۆنە، رەنگە لای من کۆن نەبێ، بەڵام ئەوەی قەناعەتی هێنا کە کۆنە و لە جێگەیەک بەجێماوە من دەستی لێ هەڵدەگرم و بەئاشکرا راینووسم، بۆخۆم ئەو دید و جیهانبینییە فەلسەفییەی بەرامبەر دنیا کە هەمە، گەر بزانم بێ کەڵکە فڕێی دەدەم

دەچمە سەر دیدی تر، ئەمە بەلای منەوە بنەڕەتی شۆڕشگێڕی هەمیشەییە، بەواتای ئەوەی مرۆڤ لەراوەستاندا نییە، وەک وتم ناتوانم خۆم لە قالبێکدا دابڕێژم و تێیدا بەند بم، بەڵکو دەبێ ئەو قالبانە بشکێنن، هەر ئەوەیە هانم دەدات. من گەیشتمە قۆناغێکی لەو شێوە بیرکردنەوەیە. من هەمیشە بەخۆمدا دەچمەوە، شتێک هەیە لای من ئەوە یەکەم جارە دەیلێم من هەمیشە و هەموو رۆژێ بەخۆمدا دەچمەوە، هەتا وتەیەک وتبێتم بیر دەکەمەوە ئایا ئەوە راستە یان نا؟ من هەمیشە لەخۆم دەترسم، هەمیشە رۆژی جارێ یان چەند جارێ بەخۆمدا دەچمەوە. تا بزانم ئەو ئیشەی کردوومە راستە یان نا، ئەوەی وتبێتم راستە یا راست نییە.. نازانم خەڵک وان یا نا، بەڵام لەلای خۆمەوە ئەوەم پێڕەو کردووە.

**رامان: باشە پێت وایە راست بێ کە ئەو جیهانەت بەجێ هێشت؟!**

**فەلەکەدین کاکەیی:** ئێستە کە بەجێم هێشت، رەنگە بڵێم راست بوو، لەیەک لایەنەوە بۆ من باش بوو، ناتوانم بڵێم لەیەک لایەنەوە راست بوو، دەڵێم باش بوو، چونکە ئەگەر بەجێم نەهێشتبا ئێستە خۆم بەیەک شت دەبەستەوە، یان تەنیا رۆمان یا چیرۆک و هەموو بۆچوونی خۆم لە قالبێکدا دادەڕشت و، ئینجا وەک ئاوێک دەوەستام و دەگەنیم. من وەک هەمیشە لەقالبێکدا نیم ئێستە زیاتر ئازادم و هەست دەکەم مرۆڤ هەمیشە گیرۆدەی کردەوەی خۆیەتی و هەمیشە بەندی وتەو بەرهەمی خۆیەتی، من دەڵێم ئێستە ئازادترم لەوەی پێشتر. کتێبێکم دانابا یەعنی چی؟ کەدانیشتم هیچ لەمەسەلەکە نەگۆڕاوە، ئەوەی ئێستە لەدنیادا دەیبینم و ئەو گۆڕانکارییە گەورەیە وای لەمن کردووە هەمیشە بەخۆمدا بچمەوە.مەرج نییە ئەوەی من دەیلێم یەکێکی تر قبووڵی بکا، یان بەلایەوە راست بێ، رەنگە دەیان شتم نوسیبێ و دری بێ، هەندێ شتیشم هەیە رەنگە کەس سەری لێ دەرنەکا، رەنگە رۆژێ لە رۆژان هەمووی بسووتێنم وەک هەموو جار ئەمەم کردووە. بەڵام مەسەلەی بنەڕەتی بەلامەوە ئەوەیە نەتەوەی کورد نەتەوەیەکی زۆر زوڵم لێکراوە، ئەو نەتەوەیە تەنیا بەنووسین رزگاری نابێ. زۆر شت لەقۆناغێ کە نووسراوە وەک ئێستە تامی کەمتر دەمێنێ، چونکە جاران لەسەردەمی ئێمە وتارێک زۆر گرنگ بوو کە بڵاو دەکرایەوەو دەنگی دەدایەوە. ئێستە دەیان وتار دەنگ ناداتەوە، چونکە وشە سواوە و ئەمڕۆ بەهۆی زۆر بوونی هۆیەکانی راگەیاندن لەهەمان کاتدا لەجیهانی سیاسەت هەمیشە وشە دەسوێتەوە. ئێستە گەیشتمە ئەو قەناعەتە میللەتی کورد پێویستی بەشتی گەورەتر هەیە، رەنگە خەباتی سیاسی راستەوخۆی رۆشنبیری یان ئەدەب دیسان خەباتی ناڕاستەوخۆیە ئەدەب زەمینەیەکی پتەوترە بۆ مەدای دوورتر و بۆ هەمان کاری سیاسی، بەلای منەوە رۆشنبیری زۆر گرنگەو هەندێ جار رەخنەش دەگرم و دەڵێم یەکێک لەهۆکانی سستی لە بزاڤی رزگاری خوازی نەتەوەی کورد ئەوەیە کە پایە رۆشنبیرییەکەی سستە ،ئەوە مانای ئەوە نییە ئێستە سیاسییەکان نانووسن..، نەخێر، بگرە دەبێ زانابن و مەرج نییە بنووسن، بەڵام دەبێ بەردەوام بەشوێن راستی و حەقیقەتدا بگەڕێن، نووسین و نەنووسین مەسەلەیەکی ترە، نەنووسین مانای ئەوە نییە ئەو مرۆڤە رۆشنبیر نییە، یان هیچ

## بۆ بەرهەمی فیکری تیۆریکی خۆت پێویستە، خۆتی پێ بخوێنیتەوە

نازانێ، زۆرجار رەخنەگری زۆر چاکە نانووسێ، رەخنەی زۆر چاک دەگرێ، کەچی یەک دێڕیشی نەنووسیوەو تێدەگا، هەیشە تێدەگاو دەنووسێ.. هەیە دەشنووسێ نووسەرە و بەڵام ئەو رۆشنبیرە نییە کەوا پێویستە وەک رۆشنبیر هەبێ

**رامان: بە تەئکید ئەگەر بنووسێ کاریگەری تری دەبێ لەسەر بزووتنەوەکەو لەسەر هوشیاری خەڵکی..**

**فەلەکەدین کاکەیی:** من گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کەچی بنووسم، چ نووسینێ کاردەکات، باوەڕم بە کاری راستەو خۆ هەیە بۆ ئەو بزوتنەوەیە..

**رامان: ئەی باشە دیوە ژێر زەمینییەکە یا کپییەکە کە لە جیهانی خۆت دەنووسی ئەمیان بە چ مانایەکە؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** ئەوە پێویستییەکی زاتییە، کەنانووسم هەست دەکەم بۆشایی هەیە و لەلایەکەوە تینووم، ئەو تینوویەتییە وام لێدەکا بۆ خۆم بنووسم

**رامان: پێوەندی بەوەیە زۆر دیەنی ئەم دنیایە یان زۆر لەو شتانەی مرۆڤی پێوە خەریکە تۆ بەپووچی دەبینی؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** ئەوەشی تێدایە، شتی بنچینەیی لەچالاکی مرۆڤ زۆربەی هەرەزۆری ٩٩٪ ی زیاتریش لەچالاکی مرۆڤ دووبارە کردنەوەی شتێکە کە هەیە، ئەوەش مەئلووفەو پووچە، تۆ دەژییت و دەمریت، ئەویتر دەژێ و دەخواو دەمرێ ئەویتر دەژێ و کاردەکاو پێدەکەنێ و شەڕ دەکاو دەمرێ..

**رامان: روانگەی تۆ بۆ چارەنووسی مرۆڤ هەڵبەت گەورەترە لە چارەنووسی نەتەوەیەک، یان زۆر بە روونی دەبینی، یاوەک تێگەیشتووم تۆ هەندێ جار لێڵی دەبینی..؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** زۆر روونی نابینم، ئەوە یەکێکە لە مەسەلەکان. لەساڵەکانی شەستەوە تا کۆتایی شەستەکان، گەیشتمە ئەوەی هەتا بابەتی (حەلاجیات) کەماوەیەک دەمنووسی ئەگەر بیخوێنیتەوە ئەو وەختە گەیشتم بەوەی مرۆڤ پێویستی بە شۆڕشێکی دەروونی هەیە زۆر سەیرە، تەنانەت باسی سۆسیالیستم دەکرد، کە ئەو شتانە لەبەرەی سۆسیالیستی هەبوون بایەخ نەدان بوون بەلایەنی رۆحی، بەڵام دەموت کەموکوڕی هەیە، دەموت تاریکییەک هەیە، مرۆڤ دەبێ لەوتاریکییە رزگاری بیت،ئەو تاریکییە تادەهات نزیک دەبۆوە. بێگومان من ناڵێم چارەنووسی مرۆڤ لەچارەنووسی نەتەوەی کورد جیا دەکرێتەوە، من دەڵێم مرۆڤ کورد بێ یان غەیری کورد بێ ئەو گیانلەبەرەی لەسەر ئەرزە، ئەو ئەستێرە زلەی لەسەری دادەنیشی هەمووی بەتاریکی دەبینی و ئێستەیشی لەگەڵدا بێ زۆر

روونی نابینم، ئەوەتا شۆڕشێک لەبایۆفیزکیدا دەکرێ کە ئینقلابێکی خەتەرەو ڕەشبینییەکی زیاتری خستە بەرچاو، کە ڕەنگە بەراستی ئایندەی مرۆڤ جگە لە پیس بوونی ژینگە و شەڕوشۆڕی زیاترو زۆربوونی مرۆڤ بەبێ رادەو زیادبوونی برسێیەتی و نەخۆشی جۆراوجۆر ئەم کودەتا نوێیەکە لەهەمان کاتدا پێشکەوتنێکی زانستییە و نبووغی بەشەرییەتە کە گەیشتۆتە ئاستێکی وا بەڕاستی ئینسان وا لێدەکات خەریکە ئاسۆ بەرەو تاریکی بچێت.

**رامان: واتە لەجۆری بەرخودی تۆ لەبەرانبەر بوونەوە یان، لە جۆری بیرکردنەوەتدا، یا لەچارەسەر دۆزینەوە بۆ ئەو گرفتانەی کەتۆ لەژیان دەیانبینی دیارە جۆرێک لەرەشبینی لەگەڵ ژیانی ڕۆژانەی تۆ و لەگەڵ بیرکردنەوەتا، یا لەگەڵ بڕیاردانت لەسەر ئەوانە هاندانێکت لەلایە؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** بەو ئەنجامە هەمیشە دەیڵێم زۆرجار هەرچەندە ژیان تاریک بووە، ناخۆش بووە، خۆش بووە بەنیسبەت من لە یەک قەوان زیاتر دەرناچێ، کە ئەمە لای من هیچە، تەنانەت جوانترین کەس لەسەر ئەم زەمینە جوانە، باشە، چاکە، ڕێکە، بەڵام ڕۆژێ دێ تیا دەچێ، ڕۆژێ دێ لەوانەیە ئەو ئەستێرەیە، ئەم زەوییە تووشی بەردێکی ئاسمانی بێت، یان تووشی تەقینەوەیەکی ئەتۆمی جیهانی، یا کارەساتی لەو جۆرە بێت. بەکورتی ئەگەر هەموو گۆی زەویش نەبێ ،بەڵام مرۆڤ وەک گیانلەبەرێک ڕەنگە نەمێنێ، کەنەما چی ئێمە ناوی دەنێین شارستانییەت ئەوە نامێنێ و دەڕوات. چی ناوی دەنێین مێژوو، یا چی ئێستە لەسەری شەڕ دەکەین نامێنن، لەبەرئەوەی من بە ڕۆمان دەستم پێ کرد، ئەم ڕۆمانە زۆر عەنتیکە بوو، لەشتێکی زۆر سادە بۆم هات و تەواوم نەکرد، ڕۆمانەکە پوختەکەی ئەوەیە دووکەس بەئەستێرەیەکی دەستکرد دەچنە ئەسمان، لەئاسمان پێوەندییان بەزەوییەوە هەیەو لەپڕ پێوەندی نامێنێ، ئەوانە چۆن بیردەکەنەوە لەوێ و چی دەکەن و بۆکوێ دەگەڕێنەوەو چی باس دەکەن، ناچار دەبن ژیانی خۆیان بۆیەکتر دەگێڕنەوە و باسی ناخۆشترین و خۆشترین شت دەکەن لەژیان، ئەوسا شەڕەکەش دەبێ بەشتێکی جوان، چونکە نەماوە، ئەوەی برسێتی و تاڵی و شەڕو شۆڕە ئەوەی لەسەری ڕکابەریی زۆریان کردووەو بەشتێکی زۆر توندڕەویان داناوە بۆ شەڕکردن لەسەری، یان تووشی شکست بوون هەمووی هەر بە پیرۆزو جوان دێتە بەرچاویان، بەڵام داخی بۆ دەخۆن کە نەماوە و لەبەردەستیاندا نییە، چونکە لە پڕدا پێوەندی نامێنێ و لەناو ئەو ئەستێرە دەسکردەدا زیندانی دەبن و دەخولێنەوە، ئەمە چەندان لاپەڕەم لێ نووسی تەنانەت ڕۆژنامەنووسێکی سووریایی ئاگادار بوو کە دەمنووسی. بیری ئەم ڕۆمانەش لەوەوەهات ڕۆژێک برادەرێکم هەبوو لە سووریا زۆر لەگەڵی دۆست بووم، تەلەفۆنم بۆ کرد وتیان ڕۆیشت و سەفەری کرد، چەند تەلەفۆنم دەکرد زەنگەکەی بێ وەڵام بوو زۆر موتەئەسیر بووم، چونکە نامەیەکی بەجێهێشتبوو دەڵێ دەرفەتم نەبوو خودا حافیزیت لێبکەم. ئەوسا دەموت ژیان بۆ وایە؟ لە ١٩٨٤دا لە ئەڵمانیا شتێکم نووسی، کۆمەڵەی خوێنکارانی کورد لە ئەورووپا ویستیان بۆم بڵاوبکەنەوە، هێشتا ماوە بڵاونەکراوەتەوە شتی تێدایە بۆ

فەلەکەدی کاکەیی لەگەڵ خوالێخۆشبوو ئەحمەد خواجە - حاجی ئۆمەران ١٩٧٤

چاپ، یەعنی لەحزەی خودا حافیزی، جیابوونەوە، ماڵئاوایی لێکردن، لە هەر بوارێکدا بێ ئەو لەحـــــزەیە رەنگە ناخۆشترین لەحزە بێ، بەڵام هەر دەبێ ئەوە رووبدا، لەحزەی ماڵئاوایی کردن لە شتێک لە هەرشتێک لەماڵ، ژیان، لە کتێب، لەسەفەر، تۆ فلان سەعات سواری فڕۆکە دەبی و دەچی، هیچ چارەت نییە نەڕۆی، ئەو لەحزەیە چییە؟ لەوانەیە حەزیش نەکەی بڕۆی، ئەمە دیدو بۆ چوونی منە بەرامبەر جیهان، رەنگە ئەمە رەشبینی بێت و رووش نەدات و ژیان لەوە خۆشتر بێ لەوەی من یا ئینسانی تر بۆی دەچێت.

**رامان: بەڵام کەس ناتوانێ بەڵگەیەکی مەلموس بەدەستەوە بدات کەوایە.**

**فەلەکەدین کاکەیی:** کەسیش ناتوانێ بڵێ وانییە.

**رامان: ئەو هەستەی کە لەلاتان دروست بووە جۆرە هەست کردن بەبێهوودەییەکە لە نووسین، زۆرهەن لەفەلسەفەشدا بڕوایان بە بێهوودەیی هەبووە، بەڵام هەر لە نووسینی داهێنەرانە بەردەوام بوون لە ئەلبێرکامۆوە بگرە تا سارتەر و زۆر نووسەری تریش ئایا ئەو تەوەللا بوونە لە نووسین هۆیەکەی ئەوەیە کە خۆت هەستت پێ کردووە ئەگەر بنووسی تایبەتمەند نابێ، یان هەستێکی ترە؟!**

**فەلەکەدین کاکەیی:** دوولایەنە، رەنگە هەر کەسێ لە تافی لاوی خۆیدا حەز بە تایبەتمەندی بکات، بەڵام من بڕوام بە تایبەتمەندی نەماوە، سەردەمی ئەوەش نەماوە، چونکە ئینسان هەرچی بیکا ناتوانێ موتەمەیز بێ، رۆژی (٢٠)جار لە (mbc)یش کە کەناڵێکی جیهانییە دەربچێ موتەمەیز نابێ، لەبەر ئەوە بڕوام بە موتەمەیزی نییە و لەولایەنەوە دڵنیام و لەباری ترەوە ئایا ئەوە تەوەللا بوون نییە کە هەر بەجارێ نەمنووسی بێ؟ بەڵێ شتی زۆر عەنتیکە دەنووسم، رەنگە تا ئێستە باسم نەکردبێ، هەندێ جار دەترسم بنووسم، ئەوەندە ئاڵوگۆڕ لە بیرو بۆچوونەکانم دەکەم دەترسم شتێک بنووسم و پاشان وازی لێ بێنم و بچم شتێکی تر بنووسم، ئەوەش بۆمن دەبێتە هاودژییەکی وا کە خەڵکی لێی تێنەگات. ئەگەر (**حەلاجیات**) بخوێنێتەوە هەست بەوە دەکەی زۆر دژی یەکەو بەشێوەی وا هاتووە خۆم ئێستە هەستی پێ دەکەم بۆ چی وایە ؟ چونکە (ئازادانە) دەمنووسی، من لە نووسینی هونەریدا گەیشتم بەوەی نە رۆمان، نەشیعر بواری من نییە، بواری نووسینی من شتی کورتی بچووکی ویژدانییە، ئەوەش کاتێ دەینووسم کە ئازادبم، خۆم ناخەمە ژێر تەئسیری هیچ شتێ. ناڵێم لە هەموو شتێ ئازادم، بەڵام لەهەمان کاتدا خۆم ئازاد دەکەم، تا ئەوەی دەینووسم وەکو نانی گەرم وا دەربچێت، بەدەستنووس چۆن بێ ئەوە پاکنووس دەکەم و دەینێرم، ئەمجا دێمەوە سەر مەسەلەی تەوەللابوون، لە نووسین تەوەللابوون نییە، ترس هەیە. بۆ نموونە دەنووسم

و بڵاوناکەمەوە، جاران زۆر بەئاسانی دەمنووسی و وامدەزانی شتێکی زۆر راستە، ئێستە زیاتر بە گومان و دوو دڵم لە نووسینەکانی خۆم، چونکە ئەوەندە شتی نوێ دێنە پێش، لە پاش دوو رۆژ راست دەرناچێ، بە کورتی گەیشتم بەوەی حەقیقەتی بۆ هیچ شتێ، هەرچی بنووسیت، لەولا شتی تر هەیە، هەرچی بیڵێی لایەنێکی تر هەیە یا شتێکی نوێتر هەیە ئەمە ڕەت دەکاتەوە..

من لەوە دڵنیـانیم ئەوەی دەینووسم وەک بۆچوونێک راستـە، یان، باشە باش نییـە، پێویستـە پێویست نییـە، سوودی دەبێ نابێ، چەند لاپەڕەیەک ڕەش دەکەمـەوە چ سـوودێکی هەیە؟ ئەم نیگەرانییـەی هەمـە لە نووسین یەکێکە لە هۆیەکانی ناخی دەروون، کە ئێستە بە ئازادانە لەگەڵ خۆم بیردەکەمەوە، ئەوەی کە دەڵێی بێهـوودەیی بەو مانایە نییە لەلای من، ئەگینا دەست لە کاری سیاسیش هەڵدەگرم، چونکە ئێستـە کاری رووناکبیری و سیاسی زۆر بەجدی دەکەم، دەڵێم ئەوەی زۆربەی زۆری دەوروبەر بەشـتی زۆر بنەڕەتی دادەنێن لە ژیاندا، من بە هیچی نازانم. لەهەمان کاتیشدا بە سادەیی و بە شێوەیەکی سروشتی لە ژیاندا دەژیم وەکو ئەوەی هەیە.

**رامان: ئەو شتە کورتانەی کە ناوت نا نووسینی ویژدانی بواری نووسینی شیعر دەگرێتەوە یان، (خاطرە)..؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** من نەمدەزانی ناوی چییە، بەراستی کە دەمنووسی ناوم لێنەنابوون، نە (خاطرە)یە، نەشیعر نەپەخشانی هونەرییە، چونکە گەر پەخشانی هونەریش بێ، مانای ئەوەیە تۆ نووسیوتە بۆ ئەوەی (پەخشانی هونەری ) بنووسی، ئەوەی کە هەیە و پێویستە شتێک، هێزێک، بانگێ هەیە لەدەروونەوە کشابێتە سەر تۆ تا شتێک بنووسی.. وام لێدەکات ناچاردەبم کەشتێک بنووسم، هەندێ جار هەیە وام لێدەکات ناچارم بیڵێم، ئەگەر نەیڵێم هەست دەکەم پاڵەپەستۆیەکی زۆر، یان قەرزێکی زۆرم لەسەرە دەبێ بیڵێم. لێرەدا چۆن دەردەچێت؟ هەندێ جار بە شێوەی چیرۆک، یا شانۆیی بچووک دەردەچێ. ئەمە لە فەرەنسا ماناو ناوێکی هەیە، کە نە شیعرە و نە (خاطرە)یە و نە چیرۆکە و نەشتێکی ترە..

**رامان: پێشتر فەرمووتان ئێمە کەلتوورمان هەیە، بەڵام گرنگیمان پێ نەداوە، ئایا بەرای تۆ ئەو زیندووتییە لەو کەلەپوورەدا دەبینی کە بتوانین وەڵامی پرسیارەکانی ئەم سەردەمەی پێ بدەینەوە..؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** نەخێر بەو مانەیە نییە کەوا وەڵامی هەموو ئادەمیزاد بداتەوە، باسی

**زۆر لەسیاسەتکاران بەرەگەزو زمان کوردن، بەڵام قاڵبی مێشک و شێوەی بیرکردنەوەیان ناسیونالیستی عەرەبییە**

هەندێ لایەنی ناسنامەمان کرد، کە زۆر شت دەگرێتەوە، ناسنامە هەموو کولتووری کوردی دەگرێتەوە، چ کۆن چ نوێ، ئەوەی کە دەیلێم هەندێکی وەڵامی ئەوە دەداتەوە کە کورد چییەو چۆن بیری کردۆتەوەو هەندێ لایەنی رۆحیشی تێدایە، ئەوە زۆر قووڵ و دوورودێژە بەلای منەوە خەریکە تێکەڵاوی رەوەندێکی مێژوویی جیهانی بێت، لە وتارێکدا بە شێوەیەکی زۆر گشتی لە گۆڤاری (النهج)دا وتارێکم لەسەر نووسی کە لە دیمەشق دەردەچێت، بە زمانی عەرەبی بوو بەناوی - **القراءة الكردية**- باسێکی مەلای جەزیری -م کردو لەلایەنێکی شیعرەکانی دوام، شیعریەکانیم لەگەڵ تازەترین دۆزینەوەی فیزیکی لە جیهاندا بەراورد کرد، لەسەر فەلسەفەی هیندی بەتایبەتی (شیوا) ئەویش دەچێتە سەر (بوزیبیەت)کەوا ئەسڵی ژیانیش زەبزەبەی هەیە، ئێستە دەرکەوت لەتازەترین زانستی فیزیکی و دۆزینەوەی فیزیایی، ئەسڵی هەموو گەردوون لە بزووتنەوەیەکی زۆر بچکۆلەی بچووکترین رەگەزی زەرە.. زەبزەبە دروست دەبێ، ئەو زەبزەیە دەنگێ دەدات، ئەو دەنگە مۆسیقای هەیە، ئەو مۆسیقایە لە (شیوا) پێشی هەزاران ساڵ لە هیندا خواوەندێکی هیندییەو لە پەیکەرێکدا چەند دەستێکی هەیە، ئەو دەستانە نیشانەی سەمایە، نیشانەی بزاڤێکی دەستکردە، ئەم بزاڤە نیشانەی دەنگە وەک دەنگی (**زێ**)، کە نووسەرێکی گەورەی ئەمەریکی باسی دەکات کە چۆن ئەو دەستی (**شیوایە**) لەگەڵ تازەترین دۆزینەوەی زانستی یەکدەگرن، من لێرەدا لەگەڵ بەرهەمی خۆمان بەراوردم کرد. مەلای جزیری شیعری وای هەیە، رەنگە ئەم رایە بۆچوونێکی نەتەوەیی تێدا بێت کە بلێم بەڵێ لە ناو کوردیشدا چەند کەسێک هەن بەو شێوەیە بیردەکەنەوە ، ئەم نووسینە شێوەی ئەدەبی بەراورد بوو، هەندێکم لە (**خانی**) وەرگرت (**گۆران**)یش چۆن باسی رۆح دەکا، ئەوە سەیرە، نەک لایەنە سیاسییەکەی ولایەنی گەشتەکەی بۆ هەورامان، لایەنی تر، دووسێ پارچە شیعری هەیە کە باسی رۆح دەکات و چۆن ئەو شیعرەی لە نێوان خانی و مەلای جەزیری و لەگەڵ شیوای هیندی دەگونجێ کەپێش چەندین هەزار ساڵە لەگەڵ فیزیکی نوێ یەکدەگرنەوە.

ئەم لایەنەی کەلەسەر شیعری **مەلای جەزیری و خانی** هەیە، لە عەقائدی کوردی کۆنیشدا هاتووە، لەگەڵ هەندێ لایەنی فەلسەفەی هیندی و چینی یەکدەگرێتەوە زۆر سەیرە ئەویشم باس کرد، ئەمە وتارێکی سەیر بوو کە لە گۆڤارێکی (مارکسی)دا بڵاوبۆوەو باسەکە لایەنی عیرفانی و تەصەووف بوو، مەبەستم لە کەلەپووری کوردی و ئەوشتانەیە، کەتەماشا دەکەی شتی جوان وتراوەو دەووترێ، بەڵام گەر بە چاوی خوێندنەوەی شیعر و بە پێی مەزاهیبی ئەدەبی کە ئێستە هەیە شتێکی تر دەردەچێ.. گەر بەچاوی عیرفانی تەماشای بکەی شتی زۆر وتراوە، لای منیش ئەوە شتێکی زاتییە، تۆ دەڵێی ئایا لە کولتووردا شتێک هەیە لەگەڵ سەردەمی ئێستەی تەکنەلۆژیا بگونجێ، لەوانەیە بۆ چوونم جیاواز بێ لە خەڵکی تر، بەڵێ لەلایەنی عیرفانەوە کورد زۆر بەرزە، لایەنێکی هەرە گەورەی لە ئایندەدا لایەنی عیرفانی مەسەلەکەیەو لەم دەوروپشتەدا زۆر کەسی بەرز هەن، هەر بۆ

فەلەکەدی کاکەیی لە کاتی پێشمەرگایەتیدا ـ ژۆلان ١٩٨٢

نموونە (خانی) لەم دووسەد ساڵەی دواییدا پەیدا بووە، یان **(مەولانا خالیدی نەقشبەندی)**، **(خانی)** نەک شاعیرێکە، بەڵکو فەیلەسوفێکی عیرفانی زۆر مەزنە، لەگەڵ مام هەژار دادەنیشتین زۆر باسی لایەنی عیرفانیمان دەکرد، ئەم لایەنە لەلایەکەوە بە پێی بۆچوونی ئێستە وەڵامی زۆرشت دەداتەوە، بەڵام لەلای منەوە بەشەرییەت لە جیهاندا بەرەو دیدێکی عیرفانی دەچێت، بەرەو دیدێکی عیرفانی کە لە جەوهەردا لەگەڵ زۆرشت یەک دەگرێتەوە، لەگەڵ ئەدەبیات و لەگەڵ سریالیزم .. لە هەندێ شتا یەکدەگرێتەوە، لە ئەنجامدا یەکێ لە پەندەکانی عیرفانی دەڵێ: (تۆ لەگەڵ لەحزەی خۆت بژێ) بەڵام چۆن بژییێتەوە ئەوە گرنگە، چۆن لەناو فیکردا بژییێتەوە.

**رامان: ئێوە لە کۆمەڵێ بواری جۆراوجۆر نووسیوتانە رۆمانتان نووسیوە، توێژینەوە تان نووسیوە، ئێستە (خواطر)و شتی کورت و ویژدانی دەنووسی، ئایە لە بواری رۆژنامەوانی بڕوات بە پسپۆڕی نییە لە نووسین؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** پسپۆڕی زۆر گرنگە، لە هەموو بوارێک پسپۆڕی گرنگە، لە زەمانی ئێمە ئەوەی لەسەر ئێمە بوو بە پێی سەرچاوەیەک، یان ئەو بۆچوونانە یا ئەو ماوەیەی رەخساوە هەولّم داوە لەوە بنووسم، تەنیا گرنگ بوو بنووسم، ئنجا بابەتەکە چۆن دەرچووەو، بۆتە رۆژنامەگەری یا چیرۆک و ئەم شتانە گرنگ نەبووە، لەبەر ئەوە بەلای منەوە پسپۆڕی گرنگترە، لە ساڵانی ١٩٦٤ یەکەم جار کۆلێژی رۆژنامەوانی لەبەغدا کرایەوە، داوام کردو وەریش گیرام، بەڵام بوار نەبوو، چونکە بارودۆخ گۆڕا، بەداخەوە تەواوم نەکرد لەوکاتەوە دیدێک لەبەر چاوم بوو کەوا چارەنووسێک لەبەر چاوم بوو هەوڵ بدەم لە بواری رۆژنامەوانیدا کاربکەم، ماوەیەک لە خەیاڵمدا بوو بایەخ بە رۆمان بدەم، پاشان کە نەمتوانی لە بوارێکدا

خۆم بگیرسێنمەوە و خۆم بدۆزمەوە بوارێکی ترم هەڵبژارد، لەبەر ئەوەی بەلای منەوە بەتایبەت ئێستە پسپۆڕی زۆر گرنگە، تەکنەلۆژیا کە پێش دەکەوێت تۆ ناتوانی هەموو شتێ بکەی، حاڵەتی من ڕەنگدانەوەی حاڵەتی نەوەکەیە بەگشتی، ئەو جیلەی ئێمە تەلەفیزیۆنی نەبوو، تەنانەت رادیۆش نەبوو، تا چل و پەنجاکان زۆربەی دێهات رادیۆشی نەبوو، ڤیدیۆو کۆمپیوتەر و فاکس و ئەمانە نەبوو، ئەوەی هەبوو زیاتر ڕۆژنامەو گۆڤارو کتێب بوون کە کەرەسەی بنەڕەتی خوێندن و بڵاو کردنەوە بوو، سەردەمێک پێش چل ساڵ ڕۆشنبیران بەکەمیان دەزانێ لە رادیۆو ئێستگەکان بنووسن، لەو بوارەدا زۆربەی زۆری نووسەر و ڕۆژنامە نووسەکان بە خۆشمەوە لەوە نەگەیشتین کە پسپۆڕی و دەورەو کۆلیج گرنگە، خوێندەوار بوون و دەستیان دایە نووسین و کاری ڕۆژنامەوانییان کردووە، زۆربەی زۆری نووسەرەکان خۆرسک بوونەو هەروا دەستیان پێکردووە، لەو کاتەشدا وەک باوە ڕۆژنامەنووس لەهەموو شتێکی دەنووسی، لەهونەرو ئەدەب حەقی بەخۆی دەدا لەهەموو شتێک بنووسێت، خوێندەواریش قووتی دەدا، چونکە قۆناغەکە وابووە، دەتوانم بڵێم نووسەری ئازا ئەوانە بوون کەلە هەموو شتێ شارەزا بێت و بنووسێت، لەهەموو شتێ شتێکی زانیبا، ئەمە وای کرد زۆربەی زۆری نووسەرانی ئەو سەردەمە پسپۆڕ نەبن لەیەک بابەتدا.. ڕاستە لەبوارێک زیاتر دەردەکەوتن، بەڵام لەهەمان کاتدا وزە و توانایان دابەش دەبوو بەسەر چەندین بواردا، لەئەنجامدا بەهیچ نەگەیشتن، ئەمەش کارێکی خراپەو نووسەر بزر دەبێت و لەئەنجامدا شتی پچڕپچڕ پیشان دەدەیت، لەئەنجامیشدا بەهیچ ناگەی و وەکو ڕۆشنبیری مامناوەندی گشتی حسێب دەکرێی، ئەوە خاسیەتی زۆری نووسەرانە، کورد و وڵاتانی تریش هەر وان.. ئێستە پسپۆڕی دەست پێ دەکات و بە پەیدابوونی کۆمپیوتەر و تەکنەلۆژیا کە پێوەندی ڕاستەوخۆیان بە پسپۆڕییەوە هەیە..

**ڕامان: چەند وتارێکی ئێوەمان بینی دەربارەی مەبدەئی (تسامح) نووسیوتانە، حەز دەکەین دەربارەی ئەو بیرو بۆچوونانە کە پێی ناسراون هەندێ قسە بکەن؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** لەشەستەکانەوە ئەو چەمکە هەیەو شتێکی نوێ نییە، دیارە مرۆڤ کە لە کۆمەڵ و قوتابخانەو خێزاندا پەروەردە دەبێ لەئەنجامدا ژیانی لەسەر شتێک دەگیرسێتەوە، ئەویش ئەوەیە هیچ پێویست نییە بە شەڕو شۆڕ، هەرچەندە خۆم لە شۆڕشێکی چەکداری دۆزییەوە، چارەی گرفتەکانی خۆی بکا، بەڵام مەسەلەی لێبووردن لەوەوە هاتووە کەوا هیچ هۆیەک نییە ڕەگەزی مرۆڤ لەسەرانسەری جیهاندا لەیەکتر

وێنەی بەرگی یەکێک لە بەرهەمەکانی فەلەکەدین کاکەیی کە بەناوی خوازراوە

جیابکاتەوە ..چ لەبەر زمان یان رەنگ یا لەبەر مەزهەب، سروشتییە ئەمە شتێکی دوورترە لەپەروەردەی فەلسەفی و فیکری، بەڵکو پەروەردەیەکی کۆنی کۆمەڵایەتیمە بەهیچ ئایین و مەزهەبێ ناڵێم خراپە یا هەڵەیە، ئەوە لەلام چەسپاوە و شتێکی زاتییە ئەمجا ئەوەی ئێستە مەبدەئی (**تسامح**) کە لەسەرم نووسی مەبدەئێکی جیهانییە بەفراوانی لە جیهاندا ناسراوە و پرۆپاگەندەی بۆ دەکرێ، کە لەسەریشم نووسی قووڵترە لەوەی جیاوازی نەکرێ لەنێوان مرۆڤ چ لە رووی ئایینی بێ، چ لەرووی زمانەوە بێ، چ لەرووی نەتەوەییەوە بێ، دەتوانێ ئومەمی بێ بەمانایکی تر ئەمەی ئێستە زۆر قووڵترە لەوەی کە لە ئەوروپادا هەیە، رەنگە ئێمە بەوە نەگەیشتبین، بەنووسینیش ناتوانین روونی بکەینەوە بۆ ئەو خەڵکە، چونکە ئاستی کۆمەڵایەتیمان بە رادەی ئەوان نەگەیشتووە کە لێی تێبگەین، ئەو شێوە تەساموحەی ئەوان دەیڵێن، هەزاران شت کە ئەوان چاوپۆشی لێدەکەن ئێمە لە سەری شەڕ دەکەین.

**رامان: هەر بۆیە (سەعدي) ت خۆش دەوێ و لەسەر شیعرە بەناو بانگەکەی نووسینت هەیە.**

**فەلەکەدین کاکەیی:** بەڵێ شیعری (بەنی ئادەم) -موحازەرەیەکم لەسەر خوێندەوە دیدی ئەوان زۆر سەیرە حافزو سەعدی پێشی شەش سەد ساڵ یا حەوت سەد ساڵ بەو شێوەیە بیر بکەنەوە، ئەو مەبدەئە نوێ نییە، خەتێک بووە لە مێژووی مرۆڤایەتی هەمیشە خەڵکێکی زۆر بڕوایان پێ بووە، مرۆڤ هەندێ جار هەیە هەندێ ئیش وەرناگرێ، مومکین نییە ئەوەی ئەو مەبدەئەی هەبێ هەندێ کارو مەسئوولیەت وەربگرێ یا هەندێ کار بکات.

**رامان: سیاسەتی مەزن هەمیشە فکرێکی مەزن لە پشتییەوەیە، سیاسیی مەزن دروست نابێ ئەگەر فیکری مەزن لە پشتەوەی نەبێ، سیاسەتی ئەمڕۆی کورد لەو ئاستەی کە هەیە، ئایا هۆی چییە فکرێکی مەزن لەپشتەوەی نییە بۆ ئەوەی لەو بارودۆخەی ئێستەی رزگاری بێ.. ؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** ئەگەر پرسیارەکە ئاسانتر بکەین دەڵێین بۆچی سیاسەتی کوردی نزمە یا دواکەوتووە، ئەو حاڵەتەی لەسەر فەردی کورد پێش ئێستەش هەبووە دەتوانم بڵێم بەهۆی دواکەوتنی بزووتنەوە سیاسییەکانی کوردەوەیە، یا بەهۆی کێشەی ناوخۆوە، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تەبەعییەی کە هەبووە، واتە پاشکۆی فیکری و سیاسی، دیسان حاڵەتە رۆشنبیرییەکە لە فیکرییەکە جیاناکرێتەوە لە حاڵەتە فکرییەکە، چونکە حاڵەتە رۆشنبیرییەکە دەست پێ دەکات. بۆ نموونە لە عێراق بمانەوێ و نەمانەوێ گەر ئێستە بە وردی لێی بکۆڵینەوە تەماشا دەکەی زۆر لەسیاسەتمەداران بێ ئەوەی خۆیان ئاگاداربن رەنگە بەرەگەز و زمان کوردبن، بەڵام قاڵبی مێشکیان شێوەی بیرکردنەوەی ناسیۆنالیستی عەرەبییە، تەجروبەی عەرەبی لەسەر مێشکیان داڕێژراوە، وا داڕێژراوەو بەو شێوەیە بیر دەکەنەوە رەنگە مەبەستیشیان تەقلیدکردنی ئەوانە بێ، ئەمە مەسەلەیەکی سادە نییە لە ئێران و تورکیاش هەر وایە..

## ئەوەی دەوروبەر بەشتی زۆر گرنگی دادەنێن، بەلای منەوە گرنگ نییە

**رامان: رۆشنبیری سیاسی کورد لە بیرکردنەوەدا لەشێوەی یان کەتەلۆکی شەخصیەت وەرگرتندا پاشکۆی ئەو ولاتانەیە کە کورد لەژێر دەستیان دەژین؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** ئەنجا دەچنە ولاتێکی تر.. دیسان لەوێ هەمان کێشە لەولاتی دەرەوەش هەیە، لەو ولاتەدا هەوڵ دەدا کتومت وەک ئەو ولاتە بێ.. لەبەر ئەوە هەموو شتێکی لێ بزر دەبێ..

**رامان: ئەگەر لەبیرت بێ لە ژمارەیەکی گۆڤاری (رامان)دا وتت: پێم وایە سیاسەتمەداری کورد رێژەیەکی یەکجار زۆری نزیکەی تۆ (٩٩٪)ی سیاسەتمەداری کوردت بەنارۆشنبیر دانا، لەگەڵ ئەو رێژە کەمەش سیفەتی پاشکۆیاتیشی هەیە وەک باست کرد، پێت وایە ئەو شێوازییە لەناو شەخصیەتی سیاسی کوردا هەیە بۆ ئەو هۆیە دەگەڕێتەوە یان نا..؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** رۆشنبیر دوو کەرتە.. رۆشن-یا بیری رۆشن مانای بەرۆشنی بیربکەیتەوەو ئیتر لەسەر هەر مەسەلەیەک بێ. تۆ کوردی هەرچەندە بیرت فراوان بێ و زانیارو ئاگاداربی، بەلام مەسەلەکەت لاون و تێکەڵ و بەستراو بێت و لەلات روون نەبێ، یان کورد پاشکۆی نەتەوەی تر بێ، بتەوێ و نەتەوێ بەو مانایەی من دەیەلێم ئەو کەسە رۆشنبیر دەرناچێ، زۆربەی رۆشنبیران نەک ناخوێننەوە، ناشخوێنن، ئەو بابلێین (١٪)ـەش کە دەخوێننەوە بەبێ ئەوەی بەخۆیان بزانن پاشکۆی بیری نەتەوەکانی ترن، ئینجا دەبنە کۆیلەی بیری ئایدۆلۆژی تر، یان پاشکۆی بیرێکی دوورتر، رەنگە ئەوەش فەلسەفەو بیرێکی زۆر بەرز بێت، بەلام بەشێوەیەکی وا ساکارو کاڵ وەریدەگرن زۆر شتی خۆیانی تیا بزر دەبێ، کەسایەتی بارزانی لەچیدایە لەوەدایە کە کوردە، فاکتەرێکی هەبوو جێگیر بوو، خەڵک دەیزانی بارزانی کوردە،رەنگە پیشانی نەدابێ کەوا چەند (دەزانێ)، ئەوەی نزیکی بووبێ دەیزانی (بارزانی) ئاگاداری هەموو وەزعی جیهانیش بوو، بارزانی ئاگاداری هەموو دەوروبەری خۆی بوو، کە لەگەڵی دادەنیشتی هەرچەندە زۆر کەم قسەی دەکرد، بەلام لەجیهاندا چی دەکرا قسەی لەسەر هەمووی دەکرد، رای تایبەتیشی لەسەر هەبووە و نەشینووسیوە، بەلام چیيە (وەک کورد ماوەتەوە) لێرە وتارێکم نووسی ئەمە یەکێکە لە خووە ئەساسیەکانی بەهێزیی کەسایەتی بارزانی.
بارزانی چووە سۆڤیەت نەبوو بەشیوعی و وەک کورد مایەوە، نەبووە پاشکۆی فلان و فلان یان عەبدولسەلام و قاسم، لەگەڵ بەعس رێک کەوت، بەلام نەبووە پاشکۆی بەعس، لەگەڵ ئێران هاوکاری کرد، بەلام نەبوو بە پاشکۆی شای ئێران، پاش شکست کەیاخی بوو چووە ئەمەریکا، لە ئەمەریکا نەبوو بە پاشکۆی لیبرالیستی ئەمەریکی، بەشێوەی تایبەتی خۆی سەربەخۆیی فیکری نەتەوەیی

خۆی پاراستووه. هەڵسوکەوتی لەگەڵ بەرزترین مەوقعی (یەکێتی سۆڤیەت)دا کردووە کە لە کۆمیتەی مەرکەزی ئەو سەردەمەی سۆڤیەت بووە، ئە لەگەڵی دانیشتووه، لەگەڵ خرۆشۆف دانیشتووه، بەلام شتی بنچینەیی خۆی ماوەتەوە، هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەموو لایەنەکانیش کردووە، دەتوانم بلێم سەربەخۆیی نەتەوەیی فیکری بارزانی، یەکێکە لەبەرهەمە ئەسیاسییەکانی دروست بوونی کەسایەتی کورد، من دەلێم تۆ رۆشنبیر بە لەسەر عەرەبی چی دەزانی لەسەر بێگانە چی دەزانی بزانە ئەو شتێکە بەلام تۆ پاشکۆی شێوەی بیرکردنەوەی ناسیۆنالی عەرەب یا فارس، یا تورک بێت ئەوە بۆخۆت دۆڕاوی.

**رامان: ئێستە رۆشنبیری کورد بەجۆرێک لەپاشکۆ دەزانی لەناو میللەتەکەی خۆیدا، ئەم رەسەنایەتییەی کە تۆ بەدواوەیت لەناو رۆشنبیری کوردا بەدەگمەن دەبینرێ؟!**

**فەلەکەدین کاکەیی:** باسی سیاسییەکانمان کرد..

**رامان: ئەم واقیعە بەجۆری تر لەناو رۆشنبیریشدا هەیە، ئەم بێ تەئسیری و جۆرێک لەترسنۆکی و لێڵی لەدەربڕیندا کەئاماژەت پێدا وای کردووە رۆشنبیری کورد لە رووبەروو بوونەوەدا زۆر سەرکەوتوو نییە، لەکاتی چارەسەردا دەستەوەستانە، کەواتە قەیرانی رەسەنێتی لەناو رۆشنبیر دا هەیە..؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە شەرم لە ئەسڵ و بەرهەمی خۆی دەکا، شتی ئەوی تر، بیری نەتەوەی بالادەستەکە بەباشتر و بالاتر دەزانێ و دەیکاتە پێوانەی خۆی، وەک بیرو بۆچوون و ئەدگارەکانی، تەنانەت لە لێکۆڵینەوەکان، دەربارەی ئەو لێکۆڵینەوە ئەدەبیانەی کە دەکرێن تەماشادەکەی هەمووی پێوانەکەی قوتابخانەی عەرەبی یا ئەوروپییە، بۆ بەرهەمی فیکری تیورێکی خۆت دەوێ خۆتی پێ تەماشا بکەی. من دەتوانم بلێم ئەوە بەرهەمێکی ریالیستە یا رێبازێکی ترە، بەلام لەهەمان کاتدا تا ئێستە پێوانەیەک دانەنراوە لەچوارچێوەی بۆچوونی خۆی وەکو کوردێک تەماشای بکات، بۆیە ناتوانێ لێی تێبگات. تەماشای دەکەی رۆشنبیری کورد هەوڵ نادا لەشتی خۆی تێبگات، تەنیا بەبەراوردکردن نەبێ، زۆرجار بووە لەبەرچاو خۆی شتێ روویداوە ئینجا دەڵێ رادیۆی لەندەن وتی ئەوسا باوەڕی پێ دەکات. ئەمە زۆر گرنگە تا رادیۆی لەندەن باسی نەکات کە لە تەنیشتی خۆی روویداوە بڕوای پێ ناکات، جاران زیاتر وابوو.. رۆشنبیرانیش لەوە رزگاریان نەبووە، هەموومان بۆخۆبشم رەنگە لە قۆناغێکدا تەماشا بکەی لەو پاشکۆیە تییە رزگارمان نەبووە، ئاسانیش نییە وابەئاسانی لێی رزگاربین، هەلومەرجێکی بابەتی زۆر فرەوان بۆ رۆشنبیران هەیە ناتوانن بەئاسانی خۆیانی لێ رزگاربکەن، من ناڵێم رۆشنبیران دەترسن یا ناوێرن، من دەلێم بوێرن، رۆشنبیرانی کورد هیچ وەختێک ترسنۆک نەبوون و زۆربەی زۆریان لە هێڵی گشتیدا بوێر بوونە، بەلام دەمکوت کراون، چ لەلایەنی دەستەلاتی بالادەستی نەتەوەیی، یان لەلایەنی دەستەلاتی کوردییەوە چەند بچووکیش بووبێ، چ حزبێ بووبێ یان ئاغاو و کوێخایەک دەمکوتی کردوون، نموونەش زۆرە بۆ بوێری

و ئازایەتی رۆشنبیری کورد، بوێری شتێکە کەبەدەست خۆیەتی، لەگەڵ ئەوەشدا لەپاشکۆیەتیەکەشدا دیسان هەر بوێر بووە..

**رامان: ئێستە کورد وەک میللەتێک، یان وەک میللەتێکی ئیستهلاکی لە تێرامان و بیرکردنەوەی خۆی کەمتر رەسەنایەتی پاراستووە، لەلایەنی ئەدەبییەوە باست کرد کە پەنا دەبەیتە بەر بەرنامەی تر چ عەرەبی یان رۆژئاوایی بۆ خوێندنەوەی بەرهەمی خۆی، میللەتێکە تا ئێستە (منتج) نییە کە بۆخۆی بەرنامەی هەبێ بۆ خوێندنەوەی ئیش و کاری خۆی، چ لەبواری فیکری یان لایەنە ئەدەبییەکانی تر.. لەو قۆناغەدا چی بکرێ باشە؟!**

**فەلەکەدین کاکەیی:** هەموو ئەو شتانە لەچارەنووسی بزووتنەوەی سیاسی مەسەلەی کورد جیاناکرێتەوە، بۆ ئەوەی لەو قۆناغە دەرباز بێ دەبێ ئازاد بێ، بۆ ئەوەی ئازاد بێ دەبێ کارێکی ئازادی هەبێ، کوردێک کە ئازاد نەبێ هەمیشە بودەڵە و شڵەژاوە، نیگەرانی هەیە چونکە نازانێ سبەینێ دەکەوێتەوە ژێر دەستی کێ؟ بەپێی گرێی خواجەیی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکات، لەبەرئەوەی هەمیشە لەناخ و دەروونیدا ئەو گرێیە هەبووە، بێ ئەوەی بیدرکێنێ، لەبەر ئەوەی ئازاد نییە، کاتێ ئازاد دەبێ و دەبێتە خاوەنی هەست و کیانی خۆی، دەڵێ بارژێمە کوردییەکە دیکتاتۆریش بێ، نابێ شتی بخەینە ئەستۆی رۆشنبیران کە دەسەڵاتیان نییە، مەسەلەکە بەسەربەخۆیی سیاسییەوە بەستراوە، تا ئازاد نەبن ئەو حاڵەتە بەردەوام دەبێت.

**رامان : لای تۆ ئازادی بەمانای ئەوەی مرۆڤی نووسەر یا رۆشنبیر ئازاد بێ لەدەربڕینی ئەوەی پەسەندە و خێری مرۆڤی تێدایە؟!**

**فەلەکەدین کاکەیی:** ئازادی مەرجێکی زاتییە، تۆ دەتوانی لەزیندانێکدا ئازادانە بیر بکەیتەوەو دەشتوانی لەدەستەڵاتیشدا بیت ئازاد نەبی لەبیرکردنەوەدا، ئازادی بابەتێکی گرنگە.. تۆ لە کۆمەڵگەیەکی ئازاد بژیت باوەڕت پێی هەبێ دیسان دەگەڕێیتەوە سەر مرۆڤەکە خۆی و ئازادی پێ دەدەی، بەڵام نازانی ئازادییەکەی بیری دەرناخات، چونکە بیری بەندە بەداب و نەریت و سانسۆری زاتی خۆیەوە و ناهێڵێ ئازادانە بیربکاتەوە..

**رامان: کەواتە سنوور بۆ بیرکردنەوەی ئینسان نییە؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** نەخێر سنوور نییە، مرۆڤ تا خۆی ئازاد نەکات، کەس ناتوانێ ئازادی پێ بدا، ئەوەش مەسەلەیەکی زاتییە، وشەی (هەڵلاجی) بۆ بەکار دەبرێت، خۆ هەڵلاج کردنێکە، طقوسێکە چۆن بتوانێ بیرکردنەوەت هەڵلاج بکەیت، دادەنیشی بێ سانسۆر چی هەیە بیخەرە سەر کاغەز، باشە لەوە چی باشەو چی خراپە؟ بۆ خۆت چ رێگەیەک هەڵدەبژێری، دەبێ لەکۆمەڵگەدا ئازادی سیاسی و بیرورا دەربڕین هەبێ، دیسان ئازادی بنەڕەتی ئازادیی زاتییە، پێویستە مرۆڤ خۆی خۆی بگەیەنێ بەوەی ئازادانە بیربکاتەوە..

**رامان: ئێمە ئەو نەوەیەی ئەو ئاستەنگ و کۆتانەی تێیداین چ لەناو خۆی، چ لەدەرەوەی خۆی. هەندێ هەلومەرجی کۆمەڵایەتییە، هەندێکی سیاسییە ناهێڵێ،**

**هەندێکی داب و نەریت و ئایینیە، تۆ پێت وایە بۆ ئەوانە کەبیر بکەیتەوە دەبێ هەموو ئەوانە لەلایەک دابنێی و دوایی بگەڕێیتەوە سەریان، یان ئەوەتا دەبێ مرۆڤ لەبیرکردنەوەدا پابەندبێ؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** دەمێنێتەوە سەر مرۆڤ خۆی، دەبێ مرۆڤ نەوەی ئەم سەردەمە بەتایبەت ئازادبێ، خۆمان بەخۆمان سانسۆر دەکەین، تاڕادەیەک ئازادی جاران باشتر بووە لە ئێستە، بەلای منەوە ئەو نەوەیەی دوای ئێمە ئازادانەتر بیر دەکەنەوە، زووتر بەگژ داب و نەریت و شتەکاندا دەچن، مرۆڤ کە دادەنیشی بیر لەخۆی دەکاتەوە، واقیعی راستەقینەی خۆی دەردەبڕێت، کەم مرۆڤ هەیە وابێ و بۆخۆی بیربکاتەوە، گرنگ ئەوەیە بۆخۆت ئەمە بزانی، نەک تۆ خۆت چۆن بیردەکەیتەوە، بگرە خەڵکیش چۆن لەتۆ دەڕوانێ.. مرۆڤ کە دادەنیشێ لەگەڵ خۆی دایەلۆگێکی زاتی دروست دەکات، ئینجا ئەو کات بیەوێ و نەیەوێ خۆ سانسۆر کردنێک هەیە، چونکە تەسەور بکەی تۆ ئازادی ، ئازاد نیت، چەند بەخۆت بنازی و وا بزانی کە ئازادی ئازاد نیت، لەحەقیقەتدا شتێک هەیە سنووری بۆ خۆی داناوەکە نازانی چییە و بۆچی هەیە. من لەگەڵ ئەوە نیم هەموو شتەکان لەولاوە دابنێی ئەوسا بیر بکەیتەوە، ئەمە شتێکی عەمەلیش نییە، ئەوەی من دەیڵێم مرۆڤ بەشێوەیەکی زاتیانە بیر بکاتەوەو شێوەی بیرکردنەوەی ئازادانەبێ، مرۆڤ بەتەنیا بۆ خۆی دابنیشی بیری ئازادترە وەک ئەوەی لەناو کۆمەڵدا بێت، چونکە ئەو دیکتاتۆرانەی لەمێشکیدایە نامێنێ، مێشکی مرۆڤ بەکۆمەڵێ دیکتاتۆر تەنراوە، زانینەکە دیکتاتۆرە، زانینێک وەرت گرتووە بەقەناعەتێ، ئەو قەناعەتە بڵێی راستە دیکتاتۆرە، چونکە لەراستیدا راست نییەو رێگەت لێدەگرێ، شتێک هەیە ئەزبەرت کردووە، تەسەور دەکەی راست بێ، کەچی راست نییە، وەک دیکتاتۆرێ بەرچاوت دەگرێ ناهێڵێ شتەکان وەک خۆی ببینی، دیکتاتۆرێکی تر هەیە سانسۆرێکە کەوەرگیرا دەبێ فلان شت نەڵێی فلان شت نەکەی، چەند بتەوێ ئازاد بیت ئازاد نابیت وشتێک هەیە دەتبەستێتەوە، لەهەمان کاتتدا ئەو کۆتانە بشکێنی وبتوانی ئەو کۆتانەی لەمێشکتایە وردە وردە بڕووخێنی، ئەو کاتە دەگەی بە ئەدەبی سەرچاوەی زاتیی، ئازادیی زاتیش ئەساسی ئازادییە کەمرۆڤ خۆی بۆ خۆی دروستی دەکات .

**رەنگە باسم نەکردبێ، هەندێ جار دەترسم بنووسم**

**رامان: تۆ تێکەڵی ژیانی سیاسی بوویت و لەناو بزووتنەوەکەدا گەیشتی بەپلەی سەرکردایەتی، لەمڕۆدا قەناعەتێ لەناو رۆشنبیران هەیە کە دەڵێن رۆشنبیر نابێ بچێتە ناو ژیانی سیاسەت بەر لە(٣٠) ساڵ دەستتان پێکردو ئێستە دەورێکت تێدا هەیە، جەنابت لەسەرەتاوە ئەو ترسەت لا هەبوو ئەو چارەنووسە سیاسییە دوورت بخاتەوە، یان ئەو قەناعەتەت هەبێ کەرۆشنبیر توخنی سیاسەت نەکەوێ؟**

## لەکاری وەزارەتدا بەهاوکارانم راگەیاندووە، بەشێوەی بناغەدانان بۆ دەوڵەتێک کاربکەن

**فەلەکەدین کاکەیی:** سەرەتا باسم کرد کە نیگەرانیم هەیە وئێستەش ئەو نیگەرانییە بەردەوامە لەگەڵمدا، خۆم بەدزییەوە شتێک دەنووسم، بەڵام بەرامبەر بەوەی رۆشنبیر لەسەرووی خۆی بترسێ من بەراستی نازانم، لەسیاسەت وحیزبایەتی مەرج نییە ببێتە وەزیر یا ببێتە ئەندامی سەرکردایەتی حیزبێک ئەوە، پێی ناڵێن سیاسەت. بەداخەوە لەسیاسەتیشدا ئەوەی پێی دەڵێن بواری ئەدەب دیسان لەکوردستاندا پسپۆڕیان نییە، جگە لە مەسەلەی رۆشنبیری یان نارۆشنبیری، یا پاشکۆیی ونapاشکۆیی وسەربەخۆیی و پسپۆڕیش هەیە، کەممان هەیە لەرووی ئەکادیمییەوە سیاسەتی کردبێ، ئەم کۆمەڵگەیەی خۆمان لایەنی خراپ و رەنگە لایەنی باشیشی تێدا بێت، لەبەر ئەوە پسپۆڕ نەبوون کێشەیەکی تری ئێمەیە، نەلایەنە رۆشنبیرییەکە تەواو دەکرێ و نە لایەنە سیاسییەکە تەواو دەکرێ، لەئەنجامدا هەمووی بەنیوەچڵی دەمێنێتەوە، لەبەر ئەوە خۆم بەسیاسییەکی سەرکەوتوو نابینم بەو زانیارییەی لەسەر سیاسەت هەمە، بەپێی زانستی سیاسەت وهونەری سیاسەت، ماوەیەک خوێندم ئەوسا زانیم سیاسەت چییە، من سیاسی نیم و بۆ سیاسەت دروست نەبووم،بەهەموو قەناعەتی خۆم گەیشتمە ئەو رادەیەی بۆ سیاسەت دروست نەبووم، سروشت وایە ناتوانم ببمە سیاسی و لەهەمان کاتیشدا تووشم بووەو هەڵمبژاردووە، بەگرنگیش لەسەری بەردەوام دەبم، نازانم هاوکارانی ترم لەحیزبەکانی تر یا لەسیاسەتدا چۆن بیر لەخۆیان دەکەنەوە؟ ئایا رازین لەخۆیان کە سیاسین، من رازی نیم لە خۆم، چونکە دەزانم ئەوەی دەیکەین سیاسەت نییە، بەڵێ دەتوانم بڵێم کاری ئیدارییە، هەوڵدانێکە بۆخزمەت کردن لەوبارەوە، دڵی خۆمان دەدەینەوە گەر بڵێین شتێک دەکەین و بەنیازێکی پاک دەیکەین، لەوەزیاتر نییەو لەرووی هونەرو زانستییەوە زۆر لێی دوورین.

**رامان: لەم دواییەدا پلەی وەزیری رۆشنبیریت قبووڵ کرد، دەکرێ وەک رۆشنبیرێک لێت بپرسین نەک وەک سیاسییەک، تۆ بۆچی وەزیریت قبووڵ کرد..؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** لە مەسەلەی حیزبایەتی هەوڵم داوە ناوێکی تایبەتم نەبێ لە سیاسەتدا، بەڵام وا چوومەتە ناو مەسەلەکەوە، ئەوەی کە پێی دەڵێن سیاسەت من خۆم لێی رازی نیم، بە ئاسانی ناتوانم لێی بپچڕێم، گەیشتووم بە تەمەنێکیش سادە نییە سەر لەنوێ دەست پێ بکەمەوە، بەڵام بۆچی کاری ئیداری دەکەم، ئەوە لەسەرەتادا خۆم زۆر لە کاری ئیداری دوور دەخستەوە، دەشترسام لەبەر ئەوەی هەلومەرجی هەرێم هاندەر نەبوو، بەڵام پاش رزگار کردنی شاری هەولێر هەلومەرجی نوێ هاتە پێش و ئێستەش لەو قەناعەتەدام یەکەمجارە ماوە هەبێ

شتێ بەشتێ بکرێت، هەرچەند کەمیش بێ، من لەسەرەتاوە لە پاش پێکهێنانی پەرلەمان و حکومەت و لە پاش ئەو هەموو ساڵە دوورو درێژە کە تیایدا خەباتم کردووە وەک لە هیچ جێگەیەکدا نەبووم هەوڵم دەدا لە بوارەکانی تردا مرۆڤ راستەوخۆ خزمەت پێشکەش بەکۆمەڵ بکات. ئەمەش بە جۆرە خەباتێک دەزانم، مەسەلەی وەزارەت وەک خەبات وەرمگرتووە، چونکە مەیدانێکە بۆ خەبات کردن. نەک هەر ئەوەش، بگرە ئەوەی تیۆرییەو لە مێشکمدا نەخشەو بەرنامەم بۆ داناوە پیادەی بکەم و بەشدار بم لە جێبەجێ کردنی بەرنامەی حیزبی و رۆشنبیری. پاشان هەلومەرجی وا هاتە پێش و بەتەکلیفی حیزبیش مانگێ بێ(١٠) مانگ بێ،ساڵێ بێ، دوو ساڵ بێ مرۆڤ بتوانێ کەمتر، زۆرتر شتێک پێشکەش بکات، هەمیشە ئەوەش دەڵێم رۆشنبیران درێغیان نەکردووەو کەموکوڕی لەرۆشنبیراندا نابینم، بەڵکو لە نەبوونی هەلومەرجی ترو زیاتر باری سیاسیدا دەبینم، ئایا دەتوانین شتێ بۆ رۆشنبیری کورد پێشکەش بکەین یان نا؟ لەم چەند مانگەی کە لە وەزارەتدام بۆم دەرکەوت ئەگەر نەختێ جیدی بین ئەوە دەتوانین هەندێ شت پێشکەش بکەین، گرنگترین شتیش کە پێویستە متمانەی رۆشنبیران بۆ وەزارەت بگێڕینەوەو بە تەجروبەش دەرکەوتووە کە تا رادەیەک ئەو متمانەیەمان گێڕاوەتەوە.

بێگومان زۆری دەوێت ئەو متمانەیە بگێڕینەوە، چونکە رۆشنبیران زۆر سەرکوتکراون و زۆرپشت گوێ خراون، هەندێکیان دەستگیریش کراون، ئەم کارەش پرۆسەیەکە وەک هەلێک هاتە پێش بەخراپم زانی ئەو بوارە بەجێ بهێڵم، خۆم خستە ناوییەوە، رەنگە بۆ خۆم ماندوو بوونی تێدا بێ و باش نەبێ، لەوانەیە وشەی وەزیرم لا گرنگ نەبێ، لەهەمان کاتدا وەک شتێکی نەتەوەیی پێم خۆشە کورد کیانێکی رۆشنبیری و کەسایەتییەکی رۆشنبیری دروست بکا، لەوەزارەتیش هەمیشە لەگەڵ برادەران کۆ دەبمەوە پێیان دەڵێم دەبێ وا بیر بکەینەوە، کە ئێمە بناغەی دەوڵەتێک دادەمەزرێنین، ئەوەی دەیکەین دەبێ بزانین بۆ دەوڵەتێکە، بۆ کیانێکی بچکۆلە نییە، ناتوانم بڵێم لەوەدا سەردەکەوم، بەڵام بەو نیازو ئومێدەین کەشتێک بکەین ببێتە بناغەیەک و ئەوانەی دوای ئێمە بێن لەسەری بینا بکەن و برۆنە پێش..

**رامان: بەحوکمی مەوقیعی سیاسی و خۆشت وەک رۆشنبیرێک لە زۆربەی بڕیارە سیاسییە چارەنووسسازەکانی ئەم ولاتەدا بەشدار دەبن، لە پێش بڕیاردان و لە دوای ئەنجامی هەر بڕیارێ کە دەیبینی، بەو فەلسەفەیەی کە ئێستە هەتە حاڵەتی دەروونیت چۆنە؟!**

**فەلەکەدین کاکەیی:** لە (٩٧٩-٩٨٠)ەوە نزیکم لە بڕیاری سیاسی، بڕیاری سیاسی گرنگ لە بزاڤی رزگاریخوازی کورد لێرەوە تا ئەوەی پێوەندی بە پارچەکانی تریشەوە هەبوو، بێگومان ئەمە ئاسان نییە، هەندێک بڕیار هەن زۆر سەختن، هەندێکی بە دڵمان نییەو بیرورای خۆمان دەردەبرین و هەندێ جار لەسەر هەندێ بڕیار لەم(٢٠) ساڵەی دواییدا تووشی ململانێی توندیش بووم، بە پێی نهێنی حیزبایەتی هەندێ ململانێ چۆتە دەرەوەو دەوڵەتانیش پێیان زانیوە، زۆر

جار لەولاتەکانی تر هەندێ جار باسیان کردووە، بە قەناعەتی خۆم هەندێ جار لەسەر بیروڕای خۆم شەرم بووە، ڕەنگە ئەو قەناعەتەم ڕاست نەبوو بێ، بەلام بە قەناعەتی خۆم کردووەو تووشی هەندێ کێشەی دەروونیش بوومە بەلام بەگشتی هێڵی گشتی وەربگرێ جگە لە ڕۆلی ڕاگەیاندنی ناوەندی لە (٩٧٤)ەوە بە تایبەتی لە کۆنگرەی (٩)ی پارتی لە (١٩٧٩) بەدواوە تا کۆنگرەی (١١) ڕۆلی بنەڕەتیم هەبووە لە داڕشتنی بەرنامەو پرۆگرامی حیزب، لەگەل چەند برادەری هاوکاردا هەمیشە ئەو هێڵەمان کێشاوە، شانازی بەوە دەکەم ئەو هێڵە نەک بۆ پارتی بەتەنیا بەلکو هێڵەکە بە گشتی بۆ بەرژەوەندی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد گەڕاوەتەوە، زۆر بەیانی گرنگ هەیە نووسیوومە، هەندێ جار بیرم کردۆتەوە کتێبێ بەناوی (بەیان) بنووسم، ئەو بەیانە گرنگانەی خۆم بە شەخسی نووسیومە، چ بە ناوی پارتی و بەرە سیاسییەکان کە دامەزراون، کاریگەری هەبووەو ڕاستەوخۆش ئەنجامی هەبووە.

**ڕامان : هەستت کردووە لە هەندێ لەو بەیانانە بەشدار نەبوویی..؟**

**فەلەکەدین کاکەیی:** زۆر جار هەبووە لایەنی ئەدەبی و سیاسیش تۆ کە لە کۆمەلێکدا بەشداربی، مانای ئەوە نییە تۆ دانیشتی ڕای خۆت دەرنەبڕی، بەلام بەشێوەی گشتی مرۆڤ بیەوێ و نەیەوێ شەریکی ئەو حالەتەیە کە لەگەلیایەتی، من لە هیچ لەو حالەتانەش پەشیمان نیم، هەر چەندە هەمووی بە گوێرەی دلی خۆت نییە..

**ڕامان : تۆ باست کرد گەلێ ڕەشبینی و تیۆری عەبەسیانە لە ڕوانینی تۆدا بەرانبەر ژیان هەیە، ئەم دوو سیفەتە لەلایەنی سیاسی چۆن دەکەوێتەوە، بەتایبەتی کە بڕیارێکی سیاسی دەدرێ و پێوەندی بە ژیانی میللەتەکەوە هەیە؟.**

**فەلەکەدین کاکەیی:** مەسەلەی ڕەشبینی بۆ چارەنووس و ئایندەی بەشەری ئەوە هەر هەیە، بەلام مەسەلەی ئەدەبی دێتە پێش، چونکە مەسەلەکە بەلامەوە ئەخلاقیشە. بزووتنەوەیەکی گەورەی میللەتێکی چەوساوە، زۆر جار هەستم کردووە ئەگەر کوردیش نەبام دەبوا بێم خزمەتی ئەو میللەتە بکەم، ئەوەندە چەوساوەو بێبەشە کەچی ناشزانێ بێبەشە، ئەو جۆرە ڕەشبینیە وای لێکردووم کە گوێ بە هیچ شتێک نەدەم، ئەو جۆرە ڕەشبینیە جۆرە نەهلەستییەتێک و جورئەتێکی لەلا دروست کردووم، ئەمەلە سیاسەتیشدا ڕەنگی داوەتەوە لەلام، لە سیاسەتدا هەندێ ڕام دەربڕیوە کە لای هەندێ کەس سەیر بووە، وەک بلێی شتێک بتەقێتەوە چاوەڕوان کراو نەبووە، بەلام وتوومە. دەبێ سوپاسی برادەران بکەم کە لە منیان قبوول کردووە، ڕەنگە لە کەسی تریان قبوول نەکردبێ، ئەو تەقینەوەو بوێرییە بۆ ئەوە نییە بلێم من ئەوەم، بگرە لەوەوە هاتووە مەسەلەکە هیچ بووەو بەوە دەگەیشتم واقیعە کە بە قەناعەتی خۆم بلێم من ڕاستگۆیی لەوە دەبینم بلێم ئەمە ئاسنە چەرم نییە، کەمادام ئاسنەو قەناعەتم پێ هێنا بلێم باشترە کە ئاسنە ڕاستگۆیی لەوەدایەو ئەنجام چی دەبێ، یا قبوول دەبێ و نابێ لە لام گرنگ نابێ..

**ڕامان : هاوکارە سیاسیەکانی تۆ هەندێ جار دەلێن ئەمە جیهانی تایبەتی کاک**

فەلەکە هەندێ دەڵێن فەلەکیاتە..
**فەلەکەدین کاکەیی :** ئەو رایە کۆنە مانای ئەوەیە لەناخی دەروونمدا ئەوشتە هەیە ولایەنێکی فیکرییە و لە دیدی من دوور نییە و شتێکم لە پشت وتنەکەدا نییە، ئەگەر زەرەرەی هەیە بۆخۆمە لەوتنی ئەو شتانە قازانجی بۆمن نەبووە، زەرەرنەبێ، زۆرجار وتنم بەشێوەی خۆکوشتن بووە ،نەک لەناو حیزبەکانی تریشدا لە جێگە سیاسییەکانی تردا ،بەڵام مەبەستم فەلسەفەی ئینسان بووە بۆ دابین کردنی هەڵویستی خۆم.
**رامان :جەنابت وەک وەزیری رۆشنبیری بۆ ئەم بارەتەپیوەی رۆشنبیری کوردی، یان ئەوکەلاوە رۆشنبیرییەی کە هەیە هیچ هەولێکتان هەیە بیبووژێننەوە؟**
**فەلەکەدین کاکەیی:** ئاسان نییە، پلانێکی ساڵانەمان داناوە، بووژانەوەی رۆشنبیری بەساڵ ودووساڵ نابێ، لەبەرهەمی پاش چەندین ساڵە دەردەکەوێ، ئومێدم بەوە هەیە هەندێ شت بۆ رۆشنبیران بکەین تا متمانە بە خۆیان ودەزگاکانی خۆیان پەیدا بکەنەوە، هەوڵ بدەین چ بە خۆم وچ برادەرانمان، لەگەل ئەوانەی لەدەرەوەش کاردەکەن بە بودجەکەی هەیە دەتوانرێ کار بکرێ، میللەتی کورد ودام ودەزگاکانی دەتوانن بەشتی کەم کاری گەورەبکەن، شتێک دەبینم خوشحاڵم دەکا کە روناکبیران بوێر وئازان و وەک دەروێش وێرای ئەوهەموو سەختی ژیانە چالاکی دەنوێن و دێنە پێش . دەبینن کەبایەخ بە مەسەلەکە دەدەی ئەوانیش زۆر بە گەرمی و باشی دێنە پێش و هەوڵ دەدەن توانای خۆیان بخەنەکار و تەنانەت تێبینی وئامۆژگاری چاکیشمان پێ دەدەن، ئەوەش بۆخۆی بەلگەی دلسۆزی وخۆشەویستیانە بۆ وەزارەت .
**رامان :مانای ئەوەیە رۆشنبیری کورد لەئاستی کێشەی سەردەمی میللەتەکەی خۆیەتی ؟!**
**فەلەکەدین کاکەیی:** بێگومان زۆریش لەسیاسییەکان پێشکەوتووترن وزۆریش ئاگادارو شارەزاو دڵسۆزن ،بەڵام ئەوەیە دەستیان بەستراوەتەوە ، ئەمەش لەبەرهەلومەرجی مادی وسیاسی بەرگەی هەندێ شت دەگرن و، نایانەوێ دڵی ئەم و ئەو بشکێنن، لەم ماوە کەمەدا رۆشنبیران و هونەرمەندان کە نەختێ ماوەمان پێ داون، یان کە هەستیان کردووە کاردەکەین.. ئەوانیش دێنە پێشەوە و ئەرکەکەت لەگەڵ هەڵدەگرن، ئەمەش جێگەی شانازی کوردە، وێرای ئەو ژیانە سەخت و بارە کۆمەڵایەتییە سەختەی کەهەیانە و لەهەموو توێژێ ژیانیان سەخترە، کەچی ئیسپاتی دەکەن لە هەموو کەسێ زیاتر بەتەنگەوەی کێشەی میللەتەکەیانن، من گەش بینم و پشت ئەستووریشم بەچالاکی رۆشنبیرانی کورد...
**رامان: واقعی حاڵی رۆشنبیری کوردی لەلایەن زۆربەی هەرە زۆری رۆشنبیران ئیدانە دەکرێت و لێی نارازین کە خۆیان بەشێکن لەپێکهاتەی ئەو رۆشنبیرییەی کە هەیە، بەو ئاستە متەوازیعە بەلای ئێوەوە چۆن دەکرێ رۆشنبیری کورد لەو گرێیە رزگاری بێ..؟**
**فەلەکەدین کاکەیی:** من نازانم رۆشنبیرانی کورد هەندێکیان نەک هەموویان بۆ

تووشی ئەو گرێیە بوون؟ راستە دەبێ رۆشنبیران رازی نەبن لەم واقیعەی کە ئێستە هەیە، ئەوەش مەسەلەیەکی سیاسییە نەک رۆشنبیریی. ئەوەی لەم (٥-٦) ساڵەدا هەبوو راوەستان و بەستەڵەکێ بوو، ئەوە وای کردووە نارازی بن، دەشبێ نارازی بن، بەڵام کە بڵێی باری گشتی رادەی رۆشنبیری نزمە، من دەڵێم بوار هەبێ نزم نییە، رۆشنبیران ناڵێم زۆر پێشکەوتوون، بەڵام ئەگەر بەراوردی رۆشنبیری کوردی لەگەڵ هەلومەرج و ئەو (٦) ساڵەی گرانی و ئابلۆقەو شەڕی ناوخۆ بکەی، ئەوە ئاستی رۆشنبیرانی کورد زۆر باشە، من نازانم بۆ نارازین لەخۆیان، بەپێچەوانەوە من دەڵێم ئەو وەختە نارازی بن کە هیچ نەکەن، رۆشنبیرانی کورد لەوە نارازین کە ماوە نییە کار بکەن، مانای ئەوە نییە توانایان نییە، بگرە ماوەیان نییەو ئەو گرێیە لەجێی خۆیدا نییەو بێ پاڵپشتە، تەنانەت ئەگەر هەمووباری رۆشنبیری بەراورد بکەی، ئەوە رۆشنبیری کورد هیچی کەمتر نییە لە دەوروبەر، بەرهەمی کەمتر پێشکەش کردووە لەبەرئەوەی ماوەی نەبووە نەک لەبەرئەوەی لەزاتیدا نەبووە .. لە هەموو بەشەکان بگری لەشانۆ بگری لەچیرۆک بگری لەشیعر و رۆمان و سروودو مۆسیقا و شێوەکاری، رۆشنبیری کورد هیچی لەدەوروبەر کەمتر نییە.

**سازکردنی گفتوگۆ:**

**سەرۆ قادر - ئازاد عەبدولواحید**

**د. مارف خەزنەدار:**

## لەبارەی یەکێتی نووسەرانی کورد:

# دووای هەژاری موکریانی و ساڵح یووسفی هەڵوێستم رەشبینانە بووە

***پرۆفیسۆر د. مارف خەزنەدار وەک رووناکبیرێکی ناودارو دڵسۆزێکی نەتەوەیی هەمیشە راو بۆچوونەکانی ئازادانەو ستراتیژئامێز بۆ دووا رۆژی گەلەکەی لە چوار چێوەی لێکدانەوەو دنیا دیتنی خۆی دەربڕیوە، بە درێژایی ژیانی بە راستگۆو پەرۆش ناوی دەرکردووە، دووای تێپەڕبوونی ئەم ساڵانەی دووای راپەرین و دروستبوونی گرفت بۆ ئەم دەرفەتە مێژووییە و پێنانە قۆناغێکی دیکەی مێژوویی ئەزموونی کوردستان، رامان سەبارەت بە وەزعی سیاسی و رۆشنبیری و رۆژنامە نووسی و زانکۆو- تاد ئەم چاوپێکەوتنەی لە گەڵ مامۆستای بەرێز سازداو ئەویش ئاوها هاتە وەڵام:***

**رامان: دووای راپەڕین چوار واقیعی سیاسی ( واقیعی بەرە، واقیعی حوکوومەتی ئیئتیلافی، واقیعی دابەش کردن، واقیعی ئێستە) هاتە کایەوە، جەنابتان لە کام واقیع دا زیاتر گەشبین بوون لە مەسەلەی کورد؟**

**مارف خەزنەدار:** بەلای منەوە راپەڕینی ١٩٩١ بۆ مەسەلەی کوردی عیراق گەلێ گرنگتر بوو لە هەردوو رووداوەکەی پێشووتر (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨)و (١١ی ئازاری ١٩٧٠) ئەگەر وەستایانەو ژیرانە مامەڵەی لەگەڵ دا بکرایە، بەڵام بێ پێچ و پەنا و ئەم لا ئەو لا دەڵێم هەر لەسەرەتاوە من گەشبین نەبووم، چونکە ئەوەندەی من ئاگاداربووم لە بیرو باوەڕو هەڵسوکەوت و کردەوەی ئەو لایەنانەی بەڕێوەبردنی دەسەڵاتیان پێ سپێردرا بە تایبەتی پارتی و یەکێتی هەستی ناوەوەم ئەوەی بۆ دەر دەبڕیم کە هاوسێکانمان و ئەنجوومەنی ئاسایشی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان ( UN ) بە تایبەتیش ئەمەریکاو ئینگلیز «وەکو نێوەندی هێز» گەلێ زیرەکترو دیبلۆماسی ترو چاپوکترن لە دەمڕاستانی هەموو حزبە کوردستانیەکانمان، بە حسێب و کتێبیش ئەم حزبانە بوون بە زمانی میللەتی کوردو لە باتی ئەو قسەیان دەکرد، ئەمە بووە هۆی سەرەکی من خۆم دوورەپەرێزو لاتەریک بگرم، ئەگینا من نەک تەنیا وەکو نووسەر یا مامۆستاییێکی زانستگا، بەڵکو وەکو «تیکنۆکراتێکی

مەسەلەی خوێندەواری و رۆشنبیری»ش دەمتوانی چمکێکی گۆڕەپانەکانی پەرلەمان یا وەزارەت یا رێکخراوە سەندیکایی و کۆمەڵایەتیەکان بگرم. وەک وتم لەو واقیعانە لە هیچ یەکێکیان دا گەشبین نەبووم.
واقیعی بەرە بەو شێوەیەی لێرە کرا کردەوەییێکی لە ناو چوو و فەوتاوی هەندێ لە پێوەندی حزبەکانی هێنایەوە یادم لە دوای جەنگی دووەمەوە لەو ولاتانەی بە سۆسیالیست ناو دەبران هی وەک ولاتەکانی خۆرهەلاتی ئەوروپا. لەو ولاتانەدا بە رووکەش فرە حزبی هەبوو، لە جێیەکی وەک پۆلۆنیا و ئەلمانیای خۆرهەلات لە هەریەکێکیان دا زیاتر لەشەش حەوت حزب لە ناوەوە بوون، بەلام ئەو حزبانە هیچ دەسەلاتێکیان نەبوو، بە ناوی «بەرەی نیشتمان» یەوە هەموو حزبەکان لە ژێر دەستی کۆمۆنیستەکان دا بوون، لای ئێمە هەمیشە ئەم تاقی کردنەوەیە پێڕەوی کراوە تا ئەم سەردەمەش، کەچی لە جێی خۆیدا رووخاو لە ناوچوو. لەو ولاتانەدا حزبی کۆمەنیستەکان سەرۆکی بەرەبوون، بەلام لای ئێمە دوو حزب سەرۆکی بەرەبوون یەکێتی و پارتی، ئیتر ئەمە بووە هۆی ئەوەی هەر یەکێک لەو دوو حزبە هەوڵ بدا حزبە وردەکان لە خۆی نزیک بخاتەوە، ئەنجامیش هەروابوو، لە هەموو کاتێکی ئەو پێنج شەش ساڵەدا دەتوانی بزانی کامە لەو حزبانە زیاتر مەیلیان بۆ پارتی هەیە یا بۆ یەکێتی، کەوابێ بەرە زیاتر بوو بە مەیدانی ململانێ. جگە لەوە هۆی سستی و بێ دەسەلاتی حزبە وردەکان ئەوەبوو لەسەر دوو حزبە گەورەکە دەژیان، داهاتی دارایی کوردستانی عێراق بە دەست ئەوانەوە بوو و بەشی حزبەکانی تریش دیاری کرابوو. ئیتر دەبێ هەر ئەوە بلێم هاوار بە ماڵ و مێشک و بیرو باوەڕی ئەو وردە حزبانەی لەسەر دوو حزبە گەورەکە دەژیان.

## پێویستە لە زانستگادا رەوشتی زانست بپارێزرێ

ئەگەر هەموو حزبە کوردستانییەکان بە گەورەو بچووکەوە لە ناو خۆیان دا یەکسان بوونایە و هەڵسوکەوتی سیاسی نێوانیان دیمۆکراتیانە بوایە و لەبازنە هەرە تەسکەکەی مەسەلەی نەتەوەی کورد کە «ئاسایشی نەتەوایەتی»یە یەکترییان بگرتایە، بەرە شپرزە نەدەبوو و لە دواییدا لە ناو نەدەچوو.
واقیعی حوکومەتی ئیئتیلافی تاقی کردنەوەییێکی ناشارستانیانە بوو بەو شێوەیەی کە کرا. ئیئتیلاف لە گەلێ جێگەو سەردەمی ئەم سەدەی بیستەمە تا ئەمڕۆش لە زۆر ولات دا کێشەو ململانێی لایەنە سیاسییەکانی جێ بە جێ کردووە (فەرەنسا، هیندستان، رووسیای ئێستە..)، بەلام لای ئێمە نا، چونکە ئیئتیلافەکە رێگەی زیاتر خۆش کردبوو بۆ ئەوەی تەنگو چەڵەمەو گیروگرفتی زۆرتر بۆ هەر دوو حزبەکە دروست بکا. تکات لێ دەکەم و لەخۆت دەپرسم، لە هیچ حوکومەتێکی گێتی ئەوە بینراوە یا بیستراوە هەموو وەزیرێک یاریدەدەرێکی هەبێ!؟ وەزیرو یاریدەدەر یەکسان بن لە دەسەلاتیان دا!؟ ئەگەر وەزیر لە حزبێک

بێ دەبێ یاریدەدەر لە حزبەکەی تر بێ!؟ لەگەڵ ئەم هەموو پەژموردەیی و شەرمەزارییە دا «وەزیرێک» شانازی بەوەوە دەکرد «وەزیری شۆڕشە»، نەیسە ئەمەشم قوبووڵە، بەڵام بۆ خوا دەڵێم رەنگە وەزیرەکانی تر تۆزێکیان کردبێ، بەڵام ئەمەیان هیچی نەکردو رووی کردە هەندەرانیش.

ئەم کردەوە نادروستەی ناومان نا ئیئتیلاف لە نێوان دوو حزب بەو شێوەیەی دانرا زەمینەی خۆش کرد بۆ واقیعی دابەش کردن.

واقیعی دابەش کردن، دیاردەیێک بوو دەبوو روو بدا، لێرەدا هێزی چەکدارو ستراتیجی سوپایی دەورێکی باڵایان هەبوو لەبەرنامە دانانی بەش کردنی جوگرافی. لە ئەنجام دا بوو بە دوو دەسەڵات. بەم جۆرە مەترسییێکی پشت شکێن لە ناو دڵ و دەروونی هەموو کوردێکی دڵسۆز پەیدابوو. هەر چۆنێ بێ ئەم وەزعە نا ئاسایی و نایاساییە نەدەبوو بەردەوام بێ، ئیتر دەبوو چۆن بشکێتەوەو چۆن شکایەوە ئەمەیان نازانم! وابوو واقیعی ئێستە پەیدابوو.

ناتوانم لە بارەی واقیعی ئیستاوە جارێ هیچ بڵێم. بەلای منەوە هێشتا زووە، چونکە تیۆرییەکە نەچۆتە خانەی پراکتیکەوە، بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم کورد لە هەموو کەسێک زیاتر تاقی کردنەوەی هەیە، بە تایبەتی لەژێر کەوتن دا، ئەگەر دەرس لەو تاقی کردنەوانە وەربگرێ، رەنگە بتوانرێ بەسەر تەنگو چەڵەمەکانی ئێستەدا زاڵ بێ.. نازانم خۆهەتا هەتایەش نابێ مەسەلەی کورد بێ چارەسەری بمێنێتەوە!؟ تەمەنی مەسەلەکە زیاتر لە سەد ساڵە با لێ نەگەڕێین ئێکسپایەر بێ!

**رامان: دوای دروست بوونی ئەم واقیعەی ئێستە هەق نییە مشوورێک بۆ یەکێتی نووسەران بخورێ و بەدەستەی بەڕێوەبردنێکی تازەی دەنگدانەوە بخرێتە گەڕ؟ لەم وەزعە تازەیە دا چی بکرێ باشە؟**

**مارف خەزنەدار:** زۆر سەیرە، تۆسەرنجت داوە لای ئێمە لە دوای لاچوونی واقیعێک و هاتنە ناوەوەی واقیعێکی تر گەورەترین گیروگرفتمان دووبارە دامەزراندنەوەی رێکخراوە کۆمەلایەتی و ئەدەبی و هونەرییەکان دەبێ. ئەگەر کار بەرێگەی سروشتی خۆی بڕۆیشتایە پێویستمان بەم گۆرانکارییە نەدەبوو. گۆڕینی روخساری یەکێتی نووسەران لەوە هاتووە بە شێوەیێکی نا ئاسایی بۆ بەرژەوەندی لایەنێکی سیاسی یا دوو لایەنی ئیئتیلافچی دروست دەکرێ. ئەم رەوشتە لای ئێمە میراتی کۆمۆنیستەکانی رووسیایە و بۆ ئێمەو گەلێ لە کۆمەلانی تری سەر رووی ئەم زەوییە ماوەتەوە. ئەم رەوشتە زیان بەخشە لەپاش ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ سەری هەڵدا، ئەوکاتە پارتی دیمۆکراتی کورد (هێشتا نەبوو بوو بە کوردستان) و قەومییەکان دەیان وت «یەکێتی نووسەرانی کورد»، کۆمۆنیستەکان وعەبدولکەریم قاسم دەیان وت «یەکێتی نووسەرانی عێراق»، قسەی ئەمانە سەرکەوت و ئێمە بووین بەلق.

لە رۆژی ١٠ی شوباتی ١٩٧٠ بۆیە یەکەمین جار بەرەسمی حوکوومەتی عێراق رێگەی دا «یەکێتی نووسەرانی کورد» دروست ببێ. لەپاش مانگێک لە ١١ی ئازاری ١٩٧٠ واقیعێکی تر هاتە ناوەوە، پارتی دەسەلاتێکی وەختی کەوتە

دەست، دوو ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی نووسەران بە دڵی پارتی نەبوون، سوور بوو لەسەر دوورخستنەوەیان، مەسەلەش هەرواکەوتەوە. لە ساڵانی پێش ۱۹۷۰ تا ساڵی ۱۹۷٤ یەکێتی نووسەران سەر بە پارتی و کۆمۆنیستە کوردە عێراقییەکان بوو. لەپاش ئەوە یەکێتی نووسەران کەوتە بەردەستی دەزگا ڕەسمییە ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنەکانی کە پێوەندیان بە کوردەوە هەبوو، هەندێ جار کۆمۆنیستە کوردەکانیش بۆ بەرژەوەندی خۆیان دەستیان تێوەردەدا، ئەم کارە تا ساڵی ۱۹۹۱ی خایاند. لە بە هاری ئەو ساڵە واقیعێکی تر کەوتە ناوەوە، هەلێکی لەبار بوو ئەم جارەیان یەکێتی نووسەران لە حزبایەتی دوور بخرێتەوە. لە دوای ۱۱ی ئازاری ۱۹۹۱ ی شاری هەولێر پێش ئەوەی حزبەکان، بە تایبەتی یەکێتی و پارتی بکەونە خۆ ، کۆبونەوەیێک لە نامەخانەی گشتی هەولێر کرا، لەسەر داوای هەندێ برادەر بەشداریم تێدا کرد بە ئومێدی ئەوەی یەکێتی نووسەرانێک دروست بکرێ نەبێتە دار دەستی حزبەکان، بەڵام حزبەکان لە دوای ئەوەی خۆیان کۆکردەوە دانیان بەو کۆبوونەوەیە و بڕیارەکانی نەهێنا ، هیچ جۆرە حسێبێکیان بۆ ئەو لیژنەیەش نەکرد کە لە ئەنجامی هەڵبژاردنێکی دیمۆکراتیانە کەوتە ناوەوە. وابوو لە دواییدا کۆنگرەیان لە شەقلاوە بەست. هەندێ قسەی بێ تام و بۆ لەلایەن چەند ئینتیهازیێک کرابوو لە ڕووی ئەوەوە کێ نووسەرەو کێ نووسەر نییە!! پێوانەیان حزبایەتی و بەکار هێنانی چەک و سیلاح بوو نەک ئیلهام و ئیستێتیک.

## هەموو ڕێکخراوەکان بە ڕێکخراوی نووسەران و مرۆڤیشەوە بوونە مەیدانی ململانێی حزبایەتی

بەم جۆرە دەبینی لەم ڕووەوە مێژوویێکی سەیرمان هەیە، ڕەوشتێکی سەیرتریش دروست بووە مەسەلەکەی ئالۆزتر کردووە. بۆ چارەسەر کردنی ئەم دیاردەیە پێویستە یەکێتی نووسەران لە دەست تێوەردانی حزب و حزبایەتی دوور بخرێتەوە، ئەمە نەک دەبێ ئێستە مشووری بۆ بخورێ، بەڵکو دەبوو پێش ئەم واقیعە حزبەکان یەکێتی نووسەران نەکەن بە مەیدانی ڕمبازی سیاسی خۆیان، ئێستەش وەکو دەڵێن نەچووە و بچێ ئەو ڕێکخراوەی هەمیشە من ناووم بەم جۆرە بردووە «تووشی دەردێکی بێ دەرمان بووە، نەدەمرێ ڕزگاریمان لیێ ببێ، نەچاکیش دەبێتەوە سوودی لێ وەربگرین» ، پێویستە لە سیاسەتی ڕۆژانەو حزبایەتی دوور بخرێتەوە. نوێشکی قسەی من ئەوەیە، حزبەکان باواز لە یەکێتی نووسەران بهێنن، بەقەدەر بەرەیان پێ درێژ بکەن، مۆدەی تاپۆ کردنی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و هونەری لە لایەن حزبەوە بەسەر چووە، تەنانەت لە وڵاتە سۆسیالیستەکانی پێشووش دا هی وەک یەکێتی سۆڤیەتی کۆن (۱۹۱۷- ۱۹۹۱).

**ڕامان: زۆر جار لەسەر یەکێتی نووسەران قسەتان کردووە، دەکرێ پێمان بڵێن ئەو سەرنج و ڕەئیانەی ئێوە شەخسی یان مەوزووعی بوون؟**

**مارف خەزنەدار:** من وەک یەکێک لە دامەزرێنەرانی یەکێتی نووسەران (١٠ی شوباتی ١٩٧٠) بۆ ماوەی سێ ساڵ و نیو وەک ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر و سکرتێر و جێگری سەرۆک و سەرنووسەری گۆڤاری «نووسەری کورد» تێیدا مامەوە، لەو دەوروبەرەی کە بەهەشتیان هەژاری موکریانی و ساڵح یووسفی سەرۆکی بوون. لە ساڵی ١٩٧٣وە خۆم لێی کشاندۆتەوە تا ئێستە. لەوساوە تا ئەم دەمە وەک لەمەوپێشیش باسم کرد هەڵوێستم ڕەشبینیانە بووە لە بابەت یەکێتی نووسەرانەوە، ئەمەش تەنیا لەبەر ئەوەی مەیدانی پڕۆپاگەندەی حزبایەتی بوو زیاتر لەوەی خزمەتی ئەدەبی کوردی بکا. لەبەر ئەوە گومان لەوەدا نییە کە هەڵوێستی من مەوزووعیانەیە نەوەکو شەخسی. لەو دوو سێ ساڵەی دواییەدا هەڵوێستم هەر وەک خۆی مەوزووعیانە مایەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە هەڵوێستێکی شەخسیش هاتە پێشەوە، ئەمە بووە هۆی ئەوەی زیاتر لە یەکێتی نووسەران دوور بکەومەوە. لە هەڵوێستی شەخسی دا مافی خۆمە کەسانێک لە ساڵی ١٩٨٥ لە یەکێ لە ژمارەکانی گۆڤاری «نووسەری کورد» قسەی وا بەمن و عومەر مارف بەرزنجی و خەڵکی تر بڵێ مایەی شکات کردن بێ لە دادگا، من لەو یەکێتی نووسەرانە دوور بکەومەوە، چونکە ئەو دوژمنەی منی تێدایە. من دەستم لەشکات کردن هەڵنەگرتووە، ئەگەر یەکێک بپرسێ و بڵێ: ئەوا زیاتر لە یازدە ساڵ تێپەڕی بەسەر ئەو وتارەدا، بۆ چ شکات نەکراو کەی دەکرێ؟ وەرام ئەوەیە من لە هاوینی ١٩٨٨ گەڕامەوە وڵات تا ساڵی ١٩٩١ شکاتم بۆ نەکرا، چونکە دەمزانی بە هۆی فازیل بەڕاک و وەزارەتی ڕاگەیاندنەوە هیچم بۆ بە هیچ ناکرێ. لە ساڵی ١٩٩١ یشەوە تا ئێستە ئەگەر شکاتم بکردایە مەسەلە بە چاکەی من نەدەگەڕایەوە، چونکە پشتی بە یەکێتی و پارتی و کۆمۆنیستە کوردە عێراقییەکان و وردە حزبەکانی تر قایم بوو. هەموو لایێک دەزانن ئەم کردەوە ئینتیهازیە مەگەر تەنیا بە یەکێکی وەک ئەو بکرایە. من خۆشم نازانم لە ڕاستی دا سەر بە کامە لایان بووە! ڕەنگە سەر بە هەموویان بووبێ!

**ڕامان: لەم وەرامەی بەڕێزتان هەست بەوە دەکەین، وەک ئەوەی ئێوە خوا نەخواستە کەسێکی بێ هێزو بێ دەسەڵات بن، کەچی ئەو توانای ئەوەی هەبێ بە سەرتانا زاڵ بێ. لەبەر ئەوە ئەگەر شکاتتان لێ بکردایە لە دادگا چۆن پشت گوێ دەخرا؟**

**مارف خەزنەدار:** بێ گومان پشت گوێ دەخرا، چونکە پێش ١٩٩١ ئەو لەمن لە پێشەوەتر بوو لە نێوەندەکانی هێزی حوکوومەت و وەزارەتی ڕاگەیاندن و دەزگا کوردییە حووکوومەتییەکان لە بەغداو هەولێرو سلێمانی. لەپاش ١٩٩١یش ئێوە لەمن چاکتر دەزانن ئەو لە هەموو حزبە دەسەڵات بەدەستەکانەوە، وردو درشتەوە نزیکتر بوو، لەپاشانا لەیەک دوو حاکمی ناسیاویشم پرسی، وتیان: جارێ کاتی ئەم سەرێشەیە نییە. ئەمەو دەتوانم بەڵگەیێکی زیندووشت بۆ بێنمەوە: لەپاش کۆچی دوایی برای خۆشەویستم شاعیری گەورەی کورد دیلان (١٩٨٩)، لە دوای تەواو بوونی پرسەو پێش ئەوەی لە سلێمانی بگەڕێمەوە هەولێر، بەرنامەی

ئاهەنگێکی جەماوەری گەورەم دانا بۆ چلەی شاعیر. لەبەر ئەوەی من خۆم لە سلێمانی نەبووم لیژنەییێکم بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم کارە ڕێک خست، لیژنەکە مستەفا سالح کەریم و عەبدوللا ئاگرینی تێدا بوو. هەموو شت ئامادە کرا بە ئاگاداری «دار الثقافه الجماهیریه»ی سەر بە وەزارەتی ڕاگەیاندن، ڕۆژێک پێش ئاهەنگەکە چوومەوە سلێمانی، ئەو شەوەی دەبوو بۆ سبەی ئێوارە کۆبوونەوەکە بکرێ، کاتژمێری ١١ی شەو لە وەزارەتی ڕاگەیاندنەوە لە بەغدا تەلەفۆن بۆ فریا جاف کرا کە پێویستە لە ئاهەنگەکەی چلەی دیلان ئەو کەسە بەشدار بێ و وتاریش بخوێنێتەوە، ئەگینا دەبێ کۆبوونەوەکە ئیلغا بکرێ. بەم جۆرە ناچار بووم لیێ بکشێمەوە بۆ ئەوەی هیچ تەگەرەییێک نەیەتە پێشەوە. ئەو دوو برادەرەشم تێ گەیاند کارێکی وا نەکەن کۆبوونەوەکە بشێوێ، بێ گومان ئەوانیش ئامادە بوون بۆ ئەمە، چونکە میکرۆفۆن و وتار خوێندنەوە بۆیان لەمن گرنگتر بوو.

**ڕامان: ئێمە پێمان وایە کەسانێک هەبوون یەکێتی نووسەرانیان بۆ مەرامی شەخسی و سیاسی خۆیان بەکار دەهێنا، ئێوە دەڵێن چی؟**

**مارف خەزنەدار: ئەم قسەیەتان ڕاست و دروستە. لە ساڵی ١٩٧٤ەوە لەو کاتەی بەهەشتی سالح یووسفی** لە بەغدا دەرچوو یەکێتی نووسەران بوو بە مەیدانی چڵکاو خۆری و ماستاو ساردکردنەوەو گیرفان پڕ کردن، کەسانێکی زۆر لە هەموو بابەتێکی بیرو بۆچوونی سەر بەدامو دەسگاو ڕێکخراو وحزبی جۆراو جۆرو لانەی نهێنی و فس فس پاڵەوان یەکێتی نووسەرانیان کردە گۆو قاشۆکانیش بەدەست خویانەوە بوو، ئەمە ئامانجی سەرەکی ئەو کەسانەبوو. ئیتر لە پێناوی وەدەست خستنی ئەم هەموو خێرو خێراتە دەبوو ناوە ناوە ژمارەییێک لە نووسەری کورد دەر بکەن، یا کۆڕو کۆ بوونەوەییێک ببەستن، لە هەموو قۆناغێکیش دا پێش خزمەتی ئەو لایەنە سیاسیانە بن کە لەو ڕۆژگارە دا لەروو بوون. بەڕاستی نووسینەوەی مێژووی یەکێتی نووەسەران بابەتێکی قورس و پڕ لە تەنگوچەڵەمەیە، یەکێکی شارەزاو وشیارو نەترسی گەرەکە.

**ڕامان: زۆربەی هەرە زۆری ئەو کەسانەی ناو دەستەی بەڕێوەبردن و لقەکان (دوور لە مەسەلەی سیاسی) کاتی ئەوە نەهاتووە پێیان بگوترێ بەسە، گاڵتە بە ئەدەب و یەکێتی نووسەران مەکەن و چیتر بۆ دەسکەوتە شەخسییەکانی وەک (پارەو زەوی) بۆ چەند کەسێک بە کاری مەبەن؟**

**مارف خەزنەدار:** ئەم قسەیە ڕاستە، هەر لەبەر ئەوەشە یەکێتی نووسەران تووشی نالەباری بووە، زۆری ئەوانەی هەوڵ دەدەن ببن بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر، یا سەرۆک، یا سکرتێری لق مەبەستیان خزمەت کردنی ئەدەبی کوردی نییە، بەڵکو بەرژەوەندی کەسایەتییە، تۆ دەڵێی **(دوور لە مەسەلەی سیاسی)**، لای ئەو کەسانە مەسەلە سیاسییە حزبایەتییەکە لە پێناوی بەرژەوەندی کەسایەتییە، ئەگەر مەبەستیان ئەمە نەبوایە هیچ گلەییێک لە یەکێتی نووسەران نەدەکرا. جگە لەوە زۆری ئەوکەسانە ئەندامی حزبیش نین، بەڵکو چامرلغن، کەچی لە مەلیکیش مەلیکترن، بۆیە ئەو کەسانە زیانیان زۆرە بۆ ئەو ڕێکخراوانەی خۆیان پێیانەوە

هەڵواسیوە.
لە لایێکی تریشەوە ئێمە «نووسەری موحتەریف» مان نییە، بەمانای ئەوەی لەسەر داهێنانی ئەدەبی بژی، هەر یەکێک لەوانەی خۆیان بۆ سەرکردایەتی یەکێتی نووسەران ئامادە دەکەن، لەسەر نووسین ناژین، هەزارو یەک کارو پیشەیان هەیە، ئەگەر لەسەر نووسینیش بژین ئەوا مووچەخۆری دەسگارۆشنبیرییەکانی میری و حزبەکانن، ئەمانە نابێ هیچ سوودێکی مادی لە یەکێتی نووسەران وەربگرن. پارەو زەوی دابەش کردن نابێ لە ئارادا بێ، مووچەو زەوی لەو لایەنەوە وەردەگیرێ کە نووسەر کاری تێدا دەکا (دەزگاکانی دەوڵەت و حزبەکان)، زەویش بە درێژایی ژیانی مرۆڤ تەنیا جارێک وەردەگیرێ! بەم جۆرە یەکێتی نووسەران دەبێتە بنکەی کاسبی و پارە پەیدا کردن و لە ئامانجی سەرەکی کە خزمەت کردنی وشەی کوردییە دوور دەکەوێتەوە.
**رامان: ئەگەر ئیلحاح لە د. خەزنەدار بکرێ و دەنگی پێبدرێ بۆ ئەوەی بکرێتە سەرۆکی یەکێتی نووسەران دەڵێ چی؟**
**مارف خەزنەدار:** بەلای منەوە پرسیارەکە پێویستە بەم جۆرە بێ «لە ساڵی ١٩٧٣ وە تا ئێستە خۆتان لاتەریک گرتووە، بۆچ لە یەکێک لەواقیعە تازەکان (لە ١٩٥٨وەو تا ئێستە واقیعمان زۆر بووە) هەوڵتان نەداوە ببن بە ئەندام لە یەکێتی ی نووسەران؟ بەلای منەوە شەرەفی ئەندامیەتی یەکێتی نووسەران میدالیەو نیشانێکی گەورەیە بەسنگمەوە، بەڵام لەبەر ئەو هۆیانەی باس کرا خۆم لێ دوور گرتووە. تۆ مەڵێ سەرۆکی یەکێتی نووسەران، بڵێ ئەندامیەتی یەکێتی نووسەران، ئەگەر من بزانم ئەم رێکخراوە بێ لایەن و سەربەخۆو کاروباری لە دەست نووسەرە راستەقینەکانی دەروێشی وشەی کوردی دەبێ، من ئامادەم ببم بە یەکێک لە دامەزرێنەرانی، وەک ئەندامێکی ئاسایی بەشداری لە هەڵبژاردن و دەنگ دان دا بکەم، خۆ ئەوکاتەش زۆر بەختیار دەبم ئەگەر لە مێشکم دا یەکێکم دا نابێ بۆسەرۆکایەتی و ئەو دەربچێ، ئیتر رێی پیشان دەدەم، بەرنامەی بۆ دادەنێم، وتارو باسی بۆ دەنووسم، موحازەرە پێشکیش بە کۆڕو کۆبوونەوەکانی دەکەم.
**رامان: ئێمە مەبەستمان ئیلحاحتان لێ بکرێ و دەنگتان بۆ بدرێ هەڵوێستان چۆن دەبێ؟**
**مارف خەزنەدار:** ئەوکاتە ناچار دەبم قوبووڵی بکەم، بێ گومان ئەم ئیلحاحەش دەبێتە هۆی ئەوەی یارو یاوەرم زۆر بن و هەندێ لە ئەرکەکانی سەر شانم سووک بکەن و ئەوان ببن بە سەرۆکی راستەقینە، دیارە مامۆستاو براگەورەش نازی بەسەر قوتابیان و دۆستی ئەمەکدارەوە هەیە پێچەوانەکەش هەر راستە.
**رامان: وەک نووسەرو مامۆستا جەنابتان دیارن و چەندین شاکارو بەرهەمی ئەدەبیتان پێشکێش بە کتێبخانەی کوردی کردووە، بەڵام دوای راپەڕین شتێکتان دیار نییە؟**
**مارف خەزنەدار:** هەندێ کەس دەڵێن لە دوای ساڵی ١٩٨١ (ئەوساڵەی لە

زانستگای بەغدا بەخانەنشینی دوور خرامەوە). بەڵێ لەساڵی ١٩٨١ تا ساڵی ١٩٨٣ لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی لای خۆمان هیچم بڵاو نەکردەوە، لە ساڵانی ١٩٨٣-١٩٨٨ گەلێ وتارو لێکۆڵینەوەو ریپۆرتاژم بڵاوکردەوە بە زمانانی کوردی و عەرەبی و فرەنسی لە چاپەمەنییەکانی جەزائیرو چاپەمەنییە کوردییەکانی هەولێرو بەغدا نووسینەکانم لەبەر چاوون.

تۆ دەڵێی دوای راپەڕین شتێکتان دیار نییە، لەولایەنەوە دەڵێم ئەوەی دیارە کەم نییە، ئەوەی دیاریش نییە زۆرە. قۆناغی ماوەی ساڵانی پاش ١٩٩١ بەلای منەوە یەکێکە لە قۆناغە هەرە بەپیت و بەرەکەتەکانی ژیانی خوێندەواریم، ئەوەی دیارە ئەگەر ئەو ریپۆرتاژانەی لەگەڵ من دا کراوون بە زمانانی کوردی و عەرەبی کۆ بکرێنەوە کتێبێکی زیاتر لە ٤٠٠ لاپەڕەیان لێ دروست دەبێ، جگە لەمە بەشێکی زۆر لەو ریپۆرتاژانە وەرگێڕاونەتە سەر زمانانی تورکی و فارسی و هەندێ لە زمانانی ئەوروپا. جگە لەمە وتارو لێکۆڵینەوەم لە رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکانی ئەوروپا بڵاو کردۆتەوە. لە ساڵی ١٩٩٥ گۆڕین و لێکۆڵینەوەیێکم لە بارەی ژیان و گەشتەکەی پووشکین بۆ ئەرزەرۆم لە سوید بڵاو کردۆتەوە، شتی تریش هەیە لەبیرم نەماوون. هەرچی ئەوەی ئامادەش کراوە، زیاتر لە سێ هەزار لاپەڕە لە یاداشتەکانم نووسیوەتەوە، چەند بەرگێکی «مێژووی ئەدەبی کوردی» م تەواو کردووە، چەند هەزار لاپەرەییێکە. داستانی پەخشانە شیعری «کوردیادە» چاپی دووەمی لە چاپخانەیە (چاپی یەکەمی لە ساڵی ١٩٨٥ لە لەندەن کەوتە دەست هاورێ و برادەرو ئەدەب دۆستان). لێکۆڵینەوەییێکم لە بارەی **«کێشەی شاعیری گەورەی رووس پاسترناک»** لە تەواوبوونایە. بەرنامەی نووسینەوەی کتێبێکم داناوە لە بارەی شاعیری گەورەی خۆرهەڵات عومەر خەیامەوە، ئەمەو هەمووی لەو چوار پێنج ساڵەی دواییدا گەییێنراونەتە ئەنجام. ئەمە جگە لە خوێندنەوەی موحازەرە لە زانستگاکانی سەڵاحەدین و سلێمانی و سەرپەرشتی کردنی نووسینەوەی نامەی ماجستێرو دوکتۆرا، وەرام دانەوەی پۆستەی ئەدەبی ئەویش گرنگەو کاتی دەوێ بۆ یەکێکی وەک من سکرتێرو کۆمپیووتەرم نییەو رەشنووس و پاکنووسی هەموو کارێکم دەکەونە ئەستۆی خۆم.

**رامان: زیاتر خەریکی چین و چۆن موتابەعەی وەزعی سیاسی و رۆشنبیری دەکەن؟**

**مارف خەزنەدار:** گەلێ جار ئەم پرسیارەم لێ کراوە، رەنگە خوێنەرانی خۆشەویست ئاگەداری هەندێ لەم لایەنانەی ژیانم بن، لەگەڵ ئەوەش دا بۆ شکاندنی تێنوویەتی ئێوە لەم لایەنەوە دەڵێم: من هەمیشە خەریکی خوێندنەوە و نووسینم. کاری سەرەکیشم ئەمەیە، ئینجا رێبەری کردنی قوتابیانی خوێندنی بەرزی ماجستێرو دوکتۆرام، ئەمە کاتێکی زۆری دەوێ. باغی ماڵەوەمان نازێکی زۆری بەسەر منەوە هەیە، بە تایبەتی لەم رۆژانە دا ئاومان کەمە، یا هەر نییە، بێ ئاوترین ماڵ لە گەڕەکی رووناکی مەڵبەندی رووناکییە. ئایا دەزانن باغ و باغچەی ماڵان و ناو شاریش لە سامانی نەتەوایەتی حسێب دەکرێ! سەرم لەلایەنە

پراکتیکەی سیاسەت دەرناچێ. لە تیۆرییە کە بۆچوونم هەیە، تا ئێستە گەلێ لە بیروراکانم لەم لایەنەوە هاتوونەتە دی لە بارەی رۆشنبیریشەوە ئەوانەی دەرەوە تا رادەیێک کـتـێب و گـۆڤـارو رۆژنامـەم بۆ دەنێـرن، ئەوەی ناوەوەش هەندێ لە چاپەمەنییەکان وەردەگرم، ئەمانە دەخوێنمەوە، ئەوەی بۆشم نانێرێ وابزانم زیانێکی ئەوتۆم لێ نەکەوتووە بە نەخوێندنەوەیان.

**رامان: مامۆستا ئێوە وەک چیرۆکنووس لە شەستەکان دیار بوون، چیرۆکی کوردی حەفتاکان و تا ئێستە چی تەکانێکی هونەری بەخۆیەوە گرتووە؟ ئایا ئەو هەولانەی بە نێوی نوێخوازی خۆی ناساندووە تا چەند سەرکەوتوون؟ کام چیرۆکنووس ئەم رێچەکەیەی گرتووە؟**

**مارف خەزنەدار:** لە شەستەکان دا دەستم بە نووسینی چیرۆک کرد، ئەمە قۆناغی «ژیانی رووسـیـا»م بوو. لە چیـرۆکنووسـینی ئەوەسـام، دەبێ ئەوە بزانی لە بڵاوکردنەوەی چیرۆک پەلە ناکەم، جاری وا هەیە لە پاش بیست ساڵ چیرۆکەکە بڵاو دەکەمەوە، لەبەر ئەوەیە لە کۆتایی هەموو چیرۆکەکانم جێگەو رۆژو مانگ و ساڵی نووسینی چیرۆکەکە دیاری دەکەم.

لە دوای شەستەکان لە چیرۆک نووسین نەوەستام، لە حەفتاکان دا «قۆناغی بەغدا» کۆمەڵێکی ترم نووسیەوە، لە هەشتاکان دا «قۆناغی جەزائیر» کۆمەڵە چیرۆکێکی ترم ئامادە کرد، لەپاش گەڕانەوەم بۆ نیشتمان لە گۆڤارو رۆژنامەکان دا بڵاوم کـردنەوە، لە نەوەدەکـان دا سـەردەمی ئێسـتـەمـان لە چیـرۆک نـووسین نەوەستاووم.

بەلای منەوە زاراوەی «نوێخوازی» لە داهێنانی ئەدەبی دا بریتییە لە موحازەرەی رەخنەی ئەدەبی بۆ قوتابیانی هەرسێ قۆناغی ئەکادیمیەو زانستگا **(بکالۆریۆس، ماجستێر، دوکتۆرا). چیرۆکی کوردی بەلاسایی کردنەوەی چیرۆکی کلاسیکی ئەورووپا دەستی پێ کردووە.** نوێخوازی لە ناوەرۆک دا شتێکی سروشتییە، چونکە پێویستییەکانی هەر قۆناغێکی گۆڕانی کۆمەڵ دەبنە هەوێن بۆ دروست کردنی تێکستی چیرۆک، لە رووی روخساریشەوە،وشەکانی زمان وتەعبیرو دۆزینەوەی مانای تازە لە گۆڕان دایە، من وا لە نوێخوازی دەگەم، بێ گومان ئەم نوێخوازییەی تۆ شتێکەو «مۆدێرنیزم»یش شتی ترە وەک رێچکەو رێبازێکی ئەدەبی لە سەدەی نۆزدەم دا لە ئەورووپا پەیدا بوو. رەنگە مەبەستی نوێخوازییەکەی ئەم پرسیارە شێواز (ئوسلووب) بێ، ئەمەیان سنووری بۆ نییە لە قۆناغێک دا دەتوانین جۆرەها چیرۆک ببینین هەریەکەیان سەر بە قوتابخانەیێکی رێبازی ئەدەبی بن، لە هەموو حاڵەتێکیش دا جوانکارییە پێویستەکان دەبێ لە چیرۆک دا بەدی بکرێن. چیرۆکی کوردی تازە بە لای منەوە تا پلەیێک سەرکەوتووە لە رووی هونەرییەوە، کارێکی سروشتییە زۆرانبازی لە نێوان رێچکە ئەدەبییەکان دا هەبێ، ئەم دیاردەیە گێتی ئەدەبی کوردی فراوانترو دەوڵەمەندتر دەکا.

من ناتوانم چیرۆکنووسی نوێخوازو «کۆنەخواز» لە ئەدەبی کوردی دا دیاری بکەم، مەسەلە شێوازە نەک شتێکی تر، لە بەر ئەوەیە بۆم ناکرێ ناوی چیرۆکنووسی

کوردی وات بۆ ببەم کە بە نوێخواز لە قەڵەم بدرێ، تەنیا دەتوانم بڵێم لە پاش جەنگی یەکەمەوە هونەری چیرۆک لە ئەدەبی کوردی پەیدا بووەو لە دوای جەنگی دووەم پەرەی سەندووەو لەو رۆژگارەوە تا ئێستە چیرۆکنووسی باشمان لێ هەڵکەوتووە.

**رامان: بێجگە لە سیاسەت و خوێندنەوەو نووسین چی خولیایێکی (ئیهتیمامێکی) دیکەتان هەیە؟**

**مارف خەزنەدار:** خولیا و هۆگری گەلێ شتم، سەرم لێ شێواوە، کاتی ئەوەم بەدەستەوە نییە هەموویان بهێنمە دی، لەبەر ئەوە زۆربەیان لە بیر چونەتەوە. هەندێ جار لە کتێبێک یا پەرە کاغەزێک دەگەڕێم کۆکراوەی ئەو خولیایەم دەکەوێتەوە بەرچاو، دڵم خورپە دەکا، ئەو رۆژەم دێتەوە یاد کە گیرۆدەی ئەو خولیایە بووم.

گوڵ و دارو درەخت لەولاوە بوەستێ، گرفتاری کۆکردنەوەی بەردو گوێی شەیتانۆکەو بە بەردبووی مێش و مەگەزو (کارەبای زەرد)ی هەموو وڵات و رووبارو زەریایانی زەوی ئێمە بە تایبەتی ئەو جێگەیانەی چاووم پێیان کەوتووەو گەشتم تێدا کردوون. تا ئەودواییەش نەمدەزانی بەردی سپیی حەمام هەیە، لای ئێمە هەروا باوە بەردی حەمام دەبێ رەش بێ، ئەم بەردە سپییەم لە کەنداوی کاریفی هەرێمی وێلزی بەریتانیا دۆزییەوە. پوولم کۆ دەکردەوە، بەڵام هەر زوو دام بەیەکێ لە براکانم گیاوگوڵم وشک دەکردەوەو وێنەی مۆزاییکی جوانم لێ دروست دەکردن، ئێستە هەندێ نموونەی گیاوگوڵی رووسیاو ئەڵمانیاو ئیسپانیاو باکووری ئەفەریقام لایە. هەرچی وێنەی فۆتۆگرافیشە تا خوێندنی بەرایی کۆلێجی ئەدەبیاتی بەغداشم خۆم بە پسپۆڕی ئەم هونەرە دەزانی، لە منداڵی شاگردی بەهەشتی گیوی موکریانی بووم لەو سەردەمەی خاوەنی ستۆدیو تاقانەکەی فۆتۆگراف بوو لە هەولێر، شارەزای گێتی کامیراکانی ئەو سەردەمە بووم، وێنەی یادگاری و هونەری بە نرخم لاماوە.

ئێستە وازم لەم ئیهتیماماتانە هێناوە، بەڵام شوێنەواریان لە ناخی دڵم دا هەر ماوون و تەزووییێکی گیانی خۆش دەدەنە دەروونم و هەست و نەستم دەبووژێننەوە.

**رامان: بیستوومانە مامۆستا خەزنەدار لەبەر ناکۆکی شەخسی ناهێتە ناو نووسەران، ئایا ناکۆکی شەخسی زیان بە یەکێتی ناگەیەنی و ئەم دوورە پەرێزییەی جەنابتان مەیدان چۆڵ کردن نییە؟**

**مارف خەزنەدار:** بە دوورو درێژی لەم گفتوگۆیەدا ئەم کێشەیەم روون کردەوە، یەکێتی نووسەران بەبێ من و کەسی تریش دەژی، وەک وتم شەرەفێکی گەورەیە بۆ من ئەگەر یەکێتی نوسەران بێ لایەن و سەربەخۆو دەستی هیچ لایەنێکی سیاسی بەسەردا نەبێ من ببم بە ئەندامێکی بچووکی، خۆ ئەگەر دوژمنایەتیەکیشم لەگەڵ یەکێک دا هەبێ بە دادگا نەبێ نەگاتە ئەنجام، ئەوکاتە مافی رەوای خۆمە لەو یەکێتی نووسەرانە دوور بکەومەوە.

**رامان: د.خەزنەدار بە ئازادی و قسە لە روویی دەدوێ، دەربارەی ئەم وەزعەو**

**ئایینده چی دەڵێ؟**

**مارف خەزنەدار:** ئەگەر بمانەوێ بە قەڵەمی درشت لە هۆی دروست بوونی ئەم وەزعە بکۆڵینەوە، بەلای منەوە سیاسیەتی هەر دوو تێوەندی هێز (پارتی و یەکێتی) دەورێکی گرنگیان بینی لە دروست بوونی وەزعەکە. بە تاقی کردنەوەکانی پێشومان دەگەینە ئەنجامێک ئەویش ئەوەیە هەر یەکێک لەم دوو هێزە بە تەنیا ناتوانێ ئامانجەکانی نەتەوەی کورد بهێنێتە دی. هەر لەبەر ئەوەش بوو هەمیشە دەموت دیمۆکراتیانە با خەریکی ئەزموون و تاقی کردنەوەیێک بین وەک ولاتە پێشکەوتووەکان بەوەی هێزێک بۆ ئەویتر دابێنێ و بیخاتە پێش خۆی و لە دوایەوە بڕوا، ئەگەر سەرکەوت باجارێکی تریش فەرمانڕەوایی لە دەست ئەوبێ، خۆ ئەگەر سەرنەکەوت هێزەکەی تر دێتە مەیدانەوە، کەس بەقسەی منی نەکرد. ئێستەش نەچووە بچێ بازەمینەیێک خۆش بکرێ لە پێناوی بەڕێوەبردنی کاروباری فەرمانڕەوایی ولات لەو رۆژگارە ناسکەدا. بەگیانی دیمۆکراتی و گفتوگۆ هەموو گیرو گرفتێک جێ بەجێ دەبێ بە مەرجێک ئینتیهازی و کوڕی رۆژو دوو روو دوور بخرێنەوە دوا رۆژ گەلێ شتی تری پێیە، بڕیار دەبێ تەنیا بۆ بەرژەوەندی خەڵکی کوردستان بێ، نەک حزبێک یا رێکخراوێک یا بەشێک لە کۆمەڵ.

**رامان: لەم چەند ساڵەی رابردوودا پێم وایە هەرگیز کورد هێندە گۆڤارو رۆژنامەی بەخۆیەوە نەبینیوە، هەرگیز هێندە لاواز نەبووە، ئەگەر چەند رۆژنامەو گۆڤاری لێ دەربکەم رەنگە نەگاتە پەنجەکانی دەستێک، ئێوە سەبارەت بەم باری رۆژنامەگەرییەوە چیتان لا گەلاڵە بوو بوو و چۆنتان دەبینی؟ بە تایبەتیش رۆژنامە حزبییەکان؟**

**مارف خەزنەدار:** ئێمە رۆژنامەگەری بێ لایەن و ئازادمان نەبووە. رەنگە یەکێک بڵێ لە دوای ساڵی ١٩٩١ ەوە ژمارەی رۆژنامەو گۆڤار ئەوەندە زۆر بوو لە چەند سەدێک تێپەڕی کردبوو، ئەمە راستە بەلام ئەم چاپەمەنییانە بڕیان نەکرد. نیوەی زیاتر تەنیا ژمارەیێکیان لێ بلاوکرایەوە، لەبەر گرانی کەرەستەی چاپ لە وزەی تاکە کەس نەبوو رۆژنامەو گۆڤار دەربکا، زیاد لەسەر ئەمەش ئەگەر چەند کەسێک توانیبێتیان دوو سێ ژمارە لە چاپکراوێک بلاو بکەنەوە بۆنی بێ لایەنی و سەربەخۆیی لێ بێ، ئەوانیش لە پاشانا ناچاری ئەوە دەبوون دەست لەبەر حزبە دەوڵەمەندەکان پان بکەنەوە، ئیتر ئەو چاپەمەنیانەش لە چوار چێوەی بێ لایەنی دەردەچوون و دەبوون بە زمانی حاڵی حزبەکە، هەندێ جار لە حزبەکەش حزبی تر دەبوون. ئیتر بەم جۆرە مەیدان بۆ رۆژنامەگەری حزبی چۆڵ بوو، بە شێوەیێکی گشتی رۆژنامەو گۆڤارە حزبییەکان لاواز بوون، هۆی سەرەکی ئەم لاوازییە بە لای ئێمەوە ئەوەبوو حزبەکان زیاتر لە پێویست حزبایەتیان لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەکانیان دەکرد، ئەمە لاسایی کردنەوەیێکی تاکە حزبی ولاتە سۆسیالیستەکان بوو، بە تایبەتی رووسیا. ئیتر چۆن لەناو حزبەکان دا دیمۆکراتیەت نەبوو، یا بێ هێز بوو، ئاواش ئەم کارە لە رۆژنامەو گۆڤارەکان دا رەنگی دابووەوە، ئەمەو نەبوونی کادیری هونەری پسپۆڕ لە مەیدانی رۆژنامەگەریدا هۆیێکی گرنگ

بوو له لاوازی رۆژنامەو گۆڤارەکان. له پاشانا دیاردەییێکی سەیر لەو ناوەوە بوو ئەویش ئەوەبوو خاوەن ئیمتیازو سەرنووسەر له ئەندامانی لیژنەی مەرکەزی یا مەکتەبی سیاسی دا دەتران، هەموومان دەزانین ئەمانە بەلای رۆژنامەکانیش دا نەدەچوون، ئیتر وەکو بلێی کەسانێک ئەمەک و رەنج دەدەن بە ناوی کەسانێکی ترەوە، ئەمە بێ گومان گەلێ گرێی سایکۆلۆجی دروست دەکاو جگە لەوەی راستیش دەشارێتەوە. وابزانم خاوەن ئیمتیازی هەموو رۆژنامەییێکی حزبی حزبەکە خۆیەتی، رەنگە لەبەر یاسای چاپەمەنی بێ یەکێک دادەنێن خاوەنی چاپەمەنییەکە بێ، ئەمە رێی تێ دەچێ، بەڵام سەرەک نووسەر پێویستە کاری تەنیا دەرکردنی رۆژنامەکەی بێ و کاری تری نەبێ، ئەگەر له لیژنەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسیش نەبێ باشترە، با ئەندامی حزبەکە بێ،

رۆژنامە حزبییەکان بۆ حزبەکانی خۆیان دەنووسن و بۆ خوێندەواری گشتی کورد نانووسن، لەبەر ئەوە له رۆشنبیرو خوێندەواران دادەبڕێن، بەلای منەوە رۆژنامەی حزبی نەوەکو نابێ تەنیا زمانی حزب بێ (ئەگەر چی لەسەر بەرگی رۆژنامەکە بە ئۆرگانی حزب ناو دەبرێ) بەڵکو پێویستە زمانی میللەت بێ و دیمۆکراتیانە بیروڕای پێچەوانەی حزبەکەی خۆش بڵاو بکاتەوە، بەگشتی پێویستە دەرس له رابردوو وەربگرین و ئینقیلابێک له رۆژنامەگەری حزبیدا بکەین له پێناوی ئەوەی رۆژنامەکە زمانی حاڵی میللەت بێ پێش ئەوەی ئۆرگانی حیزب بێ.

**رامان: سەبارەت بە وەزعی زانکۆ؟**

**مارف خەزنەدار:** بلێ «زانستگا» چونکە زانکۆ بۆ (الجامعة) له کاتی خۆی دا بە هەڵە دانرا. هەر چۆنێ بێ دەڵێم خۆزگەم بە دەسگا حووکوومەتییەکانی تر بێگومان زانستگا رەوشت و رێ و رەسم و یاساو دەستووری خۆی له ماوەی هەزار ساڵ دا دروست بوون. ئەم رەوشتانە زۆربەیان گشتین واتە له هەموو زانستگاکانی گێتی هەن، هەندێکیشیان ناوچەیین واتە تایبەتی نین بەوەزعی کورد یا عێراق بەگشتی، ئەوەی من ئاگادارم هیچ جۆرە رەوشتێکی زانستگایی له زانستگای سەلاحەددین نەماوە له رووی بەڕێوەبردن و پێوەندی لەگەڵ قوتابی و مامۆستاکە ئەم دوولایەنە بنج و بناوانی هەموو زانستگاییێکن. سەرۆکایەتی زانستگا لای ئێمە ئیش و کاری سەرەکی دابین کردنی مووچەی مامۆستایان و مووچەخۆرەکانی تریەتی.

رامان: دەستێوەردانی لایەنەکان تا ئێستە له زانکۆ چۆن بووە؟

مارف خەزنەدار: له بەهاری ۱۹۹۱ لەپاش گۆڕانکارییە بنچینەییەکان سوور بووم لەسەر جێ بەجێ کردنی دووشت ، واز له دیوارەکان بێنن و شەڕ له پێناوی ئەوە نەکەن دیوارەکە وێنەی کامە شەهیدی لەسەر بکێشرێ، چەکدارو حزبایەتی نەیەتە ناو زانستگا. هی وا هەبوون دەیان وت مارف خەزنەدار ئیهانەی شەهیدان دەکا ، خێرەومەندێکیش له گۆڤاری «الثقافة الجديدة» نووسی بووی حووکوومەت منی کردووە بە ئەندامی ئەنجوومەنی زانستگای سەلاحەددین، بۆ لەوپێش پێش

خزمەت بووم دەست بەسنگی ڕێزەوە پێشوازیم لە چەکدارەکانی حووکوومەت دەکرد، بۆ ئێستە دەڵێم چەکدار نەیەتە ناو زانستگاوە. لەگەڵ ئەوەش دا من بیانوو بۆ «الثقافة الجديدة» نادۆزمەوە بەوەی کۆمۆنیستە کوردە دەسەڵاتدارەکانی ئەو کاتە لە نێوان خۆیان دا دەیانوت گۆڤارەکە چاکی نەکردووە و ئەمە بیرو رای حزبی کۆمۆنیست نییە هەر چۆنێ بێ ئەوان شەکریان شکاندووە، منم سەرکەوتوو.

ئەوی ڕاستی بێ لەسەرەتادا هەموو حزبەکان بە گەورەو بچووکەوە هەوڵی ئەوەیان نەدەدا لە زانستگا نزیک ببنەوە، بە پێچەوانە سەرۆکایەتی زانستگای ئەو سەردەمە لە بەر هەر هۆیێک بێ هەوڵی دەدا لە حزبەکان نزیک ببێتەوە، بە تایبەتی پارتی و یەکێتی، ئەمەی بۆ پاکانە بووە لە پێناوی مانەوەی خۆی یا هەر هۆیێکی تر. وابوو زۆرانبازی هەر دوو حزب هاتە ناو زانستگاوە، وەک هەموو دەسگاکانی تر ئەم دوو هێزە پێک نەدەهاتن لەسەر دابەش کردنی جێی بەڕێوەبەرەکانی زانستگا. ناچار ڕێگەیێکی نادروستیان دۆزییەوە ئەویش هەڵبژاردن بوو، ئەم جۆرە هەڵبژاردنە لە هیچ شوێنێکی گێتی دا نەکراوە، نازانم لەکوێ ئەمەیان هێنا. ڕەنگە جۆرە هەڵبژاردنێک هەبێ لە هەندێ لە زانستگاکانی ئەورووپاو ئەمەریکا، بەڵام نەک بەو جۆرەی لێرەکرا. لەوێ ئەگەر یاسای هەڵبژاردن هەبێ ئەوا لە نێوان ئەو کەسانە دەبێ کە پلەی پرۆفیسۆرییان هەیە، ئێمە لەوکاتەدا لە زانستگای سەلاحەددین بە هەموو پێنج شەش پرۆفیسۆرمان هەبوو، کەچی لێرە یاریدەدەری پرۆفیسۆریش بەشداری کرد. من ناچار بووم موقاتەعەی ئەو هەڵبژاردنە بکەم و بەلایەوە نەچم نەبۆخۆ پالاوتن نە بە دەنگ دان، لە لیستەی زانستگای سەلاحەددینیش من کۆنترین مامۆستام (لە رووی وەرگرتنی پلەی پرۆفیسۆری)، هەروەها لەقەبی مامۆستای یەکەمی زانستگای سەلاحەددینیشم بەرەسمی لەگەڵ باوەڕنامەو نیشانەی وەرگرتووە. لەگەڵ ئەوەش دا تا ئەم کاتەی ئەم قسانەش دەکەم مانەوەی من لە زانستگای سەلاحەددین لەبەر بەژەوەندی قوتابییانە، ئەگینا هیچ جۆرە هەڵوێستێک لە ناوەوە نییە شانازی پێوە بکەم و خۆم بە مامۆستای ئەو زانستگایە بزانم.

**ڕامان: دزێوترین ڕەفتارێ لە زانستگا نارەحەتی کردبێ؟**

**مارف خەزنەدار:** زۆرن، گەلێ زۆرن، هەموو پێوانەیێکیان پێشێل کردووە. کەس بیستوویەتی مووچە خۆری زانستگا، یا سکرتێری جەنابی کارگێڕ لە مامۆستای کۆلێجەکان بەڕێزترو دەست ڕۆیشتووتر بێ! کۆلکە خوێندەوار با باوەڕنامەی دوکتۆراشی هەبێ پلەی بەرزی پرۆفیسۆری بدرێتێ. پلەی پرۆفیسۆری پێوەندی بە باوڕنامەوە نییە، گەلێ لە پرۆفیسۆری زانستگا بەرزەکانی گێتی باوەڕنامەی دوکتۆرایان نییە.

دەزانی ئەم ڕستە بێ ماناو نالەبارو دواکەوتووە «استثناء من شروط القبول» چی کردووە، ماڵی زانیاری و زانستی وێران کردووە. قوتابی مەرجەکانی ماجستێرو دوکتۆرای تێدا نەبووە وەرگیراوە. ڕەنگە لە ڕۆژنامەکان دا هەواڵی ئەو قوتابییەتان بیستبێ لە کۆلێجێک وەرگیرابوو بە دڵی نەبوو، هەزار فرت و فێڵیان بۆ کرد، بۆ

دوو سێ کولێج گواستیانەوە تا گەیاندیانە کۆلێجی پزیشکی، لە سەد نمرە زیاتری کەم بوو لە تاقی کردنەوەی بەکالۆریای شەشی ئامادەیی تا لە کۆلێجی پزیشکییەوە وەربگیرێ. ئەگەر لیژنەییەکی لێکۆڵینەوە دابنرێ گەلێ کردەوە ئاشکرا دەبێ کە دەوریان بووە لەتێک دانی شیرازەی زانستگای سەلاحەددین. سەرۆکایەتی بە هۆی واسیتەو واسیتەکاری دەستووری زانستگای پێشێل کردووە، هەندێکیشی خستۆتە سەر سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران، هەر کەسێکی ویستبێتی نا یاسایانە قازانجێکی دەست بکەوێ عەریزەی بۆ سەرۆکی زانستگا نووسیوە، ئەویش بۆ سەرەک وەزیرانی ناردووە، ئەمەش لە سەری نووسیوە **«استثناء من شروط القبول»** ئەمە لە ولاتی دواکەوتوودا، خۆ لە بەریتانیا ئەگەر مەلیک سەلاحیەتی بەکار بهێنایە دەمێک بوو دورگەکە نوقومی ناو زەریاکانی مانش و باکوورو ئوقیانووسی ئەتلەسی بوو بوو.

**رامان: لە داهاتوودا زانستگاتان چۆن دەوێ؟**

**مارف خەزنەدار:** جارێ پێش هەموو شتێک دەبێ ئەوە بزانین لەگەڵ ئەوەی زانستگاکانی ولات لەگەلێ شت لە یەکتری دەکەن، بەڵام هەر یەکەی تایبەتییەتی خۆی هەیە دەبێ بپارێزرێ، بەگشتی زانستگام بەم جۆرە دەوێ:

پێش هەموو شتێک پێویستە زانستگا لە حزب و حزبایەتییەوە دووربێ. مەرجی زانستگایی عالەمی بۆ بەڕێوبەرانی دابنرێ وەک سەرۆکی زانستگاو عەمیدی کۆلێجەکان. ژمارەی مووچەخۆرەکانی کەم بکرێتەوە ئەوانەی پێوەندییان بە موحازەرەو زانستییەوە نییە. ئەو کاتە دەس نیشان کردن ودۆزینەوەی سەرۆک و عەمیدەکان کارێکی ئاسانە، دەڵێم ئاسانە چونکە مەرجەکان پەنجە بۆ کەسەکان درێژ دەکەن. ئیتر سەرۆکی زانستگاو عەمیدەکان وەک مووچەخۆری تر نابن، رەوشتی زانستگا دەپارێزن، وەک مامۆستا خۆیان دەخەنە روو نەک مووچەخۆری ئاسایی، لە نامەخانەو موختەبەرو کێڵگە و نەخۆشخانە کار دەکەن، دەرس دەڵێنەوە، وتارووباس دەنووسنەوە، مەکتەب دادەنێن، سەرپەرشتی هەموو کاروبارێکی زانستی دەکەن، زۆربەی کاری بەڕێوەبردنیان لە لایەن سکرتێرەکانیانەوە جێ بەجێ دەکرێ. من زانستگام ئاوا دەوێ.ئێمە بۆ ئەوەندە دواکەوتووین! لای خۆمان لەمەوپێش وا نەبوو. لە ساڵی ١٩٦٨ کە تازە لە رووسیا گەڕابوومەوە مامۆستای گەورەم عەبدولعەزیز دووری سەرۆکی زانستگای بەغدا بوو، کەم لە ژوورەکەی خۆی دەبینرا، ساڵی دوو سێ کتێبی دەنووسییەوە، موحازەرەکانیشی لە پۆلی یەکەم و دووەمی بەشە زانستیەکانی مێژوو و زمانی عەرەبی و فەلسەفەی کۆلێجی ئەدەبیاتی بەغدا دەووتەوە. لەکارو باری زانستگا تەنیا پرسی پێ دەکرا، ئیمزاشی لە دوو شت دا بەدی دەکرا، یەکەمیان تەرقیەی زانستی مامۆستایان، دووەمیان پەیمانی نێوان زانستگای بەغداو زانستگاکانی تر. نزیکەی سی ساڵ بەر لە ئێستە زانستگامان وابوو بێ، بۆچ ئێستە وای لێ هات!!

**رامان: ئەوەی ئێمە بیزانین لە هیچ رێکخراوێکی ئەدەبی و کۆمەلایەتی و**

**تەنانەت مافی مرۆڤیش نەبوون بە ئەندام، تەنیا کۆمەڵەی ئەکادیمیان نەبێ، هۆی ئەمە چییە؟**

**مارف خەزنەدار:** چونکە حزبایەتی لەناو هەموو ڕێکخراوەکان دا دەکرا، مافی مرۆڤیش دوور نەبوو لەو دەست تێوەردانە، من ناوی ئەم ڕێکخراوەم نابوو «مافی حزب». تکا دەکەم کتێبی ساڵانەی مافی مرۆڤی گێتی بخوێنەوە بۆ ئەوەی بزانی لە کوردستان چی کراوە! ئەندامیەتیم لە کۆمەڵەی ئەکادیمیان لەبەر ئەوەبوو تا ئێستەش ئازاد و سەربەخۆو بێ لایەنە. ئەوەی ڕاستی بێ لە سەرەتادا لەویش دوو دڵ بووم، بەهەموو ئەندامەکانم ڕاگەیاند بوو هەر کاتێک حزبایەتی بچێتە ناویەوە من لیێ دوور دەکەومەوە، جارێکی تریش دەڵێم ڕەنگە یەکەمین ڕێکخراو بێ تا ئێستە لە حزبایەتی خۆی پاراست بێ.

**ڕامان: دەزگاکانی ڕاگەیاندنی گوڵان ڕەئی موخالفی خۆیان بلاو دەکەنەوە، ئەوەمان بەکردەوە سەلماندووە، جەنابتان چی دەڵێن و چی سەرنجێکتان لەسەر گولاّنییەکان هەیە؟**

**مارف خەزنەدار:** چاکتان کردووەو دەستتان خۆش بێ. هەر لەبەر ئەوەش بوو لە کاتی خۆی دا لەگەڵ دەرچوونی گۆڤارەکە بە دەنگییەوە هاتم، ئەو شایەتییەی بۆ دەدەم نووسینەکانی منی وەک خۆی بلاو دەکردەوە. ئەم کردەوەیە کارێکی ئاسایی و بەکەڵکە بە تایبەتی لە کۆمەڵێکی وەک کۆمەڵی ئێمە. داخی گرانم لای ئێمە دیموکراتیەت هەر قسەیە و کەمیش دەچێتە ناو پراکتیکەوە.

هیوادارم ڕامان کە دەزگای گوڵان دەری دەکا لەسەر ئەو بەرنامەیە بڕوا کە داینراوەو ڕامانییەکانیش سنگ فراوانترو دیموکراتی ترو ئازاو چوست و چالاکتر بن.

**ڕامان ـ دەکرێ دوا ڕووداوی بیلۆگرافیاکەتان بۆ باس بکەی کە ئێستە خەریکی نووسینەوەیت؟**

**مارف خەزنەدار:** ئەوەی من دەینووسمەوە بیبلۆگرافیانییە، ڕێڕەوی ژیانە، خۆپیشاندانی ژیانێکە تایبەتی بەخۆم، بەڵام گەلێ کەس وێنەی خۆی و کرداری خۆی تێیدا دەبینێ. ڕەنگدانەوەی بەسەرهاتی ڕۆژگارێکی درێژە، مێژوویەکی ئاسۆ دوور، لە جێگاوبانێکی پان و بەرین لە بەستەڵەکی سێبیریاوە تا بیابانی گەورەی ئەفەریقا و لالە زارەکانی قەفقاس و دیمەنە چاو ئەندازەکانی ئەندەلوس و زۆر جێی تر خۆی دەنوێنێ، جوگرافیایەکی ئاسۆ فراوانە.

لەوکاتەی ئەم پرسیارانە لەمن دەکەی، لەبەر گەرما لە نووسینەوە وەستاووم. تاقی کردنەوەو قوتابیان و یارانی زانست و ئەدەب و هونەر و بەزمی پڕەندانیش بەشی خۆیان هەیە، جا بۆیە هەرچەندە ماوەیەکە نووسینی ڕێڕەوی ژیانم ڕاگرتووە، وەک هەموو هاوینەکانی پێشووتریش، بەڵام بێ گومان دەزانم لەکوێ وەستاووم. ئەو جێیەی نووسینەکەم لێ ڕاگیراوە ناو پاپۆڕی تیپازەیە لە شاری عەننابەی جەزائیرەوە ڕوومان کردۆتە مارسیلیای فەرەنسا. ڕۆژی عەرەفات و شەوی جەژنی قوربانە (١٩٨٤). هەست و نەستی ناوەوەم ئۆقرەی گرتووە، ئارام و هێمنی و

لەسەر خۆیە، کە شوێنەوارە خۆشەکانی ئەورووپام دەدی خۆم بە تاوانبار دەهاتەپێش چاو لای نزیکەکانم. ئەو جارە تەنیا نەبووم، سەعدیە خانی بەڕێزو بنیادی دەرچووی پۆلی سێیەمی قوتابخانەی سەرەتایی لەگەڵم دا بوون، دڵیان بەوە خۆش بوو چاویان بە فەرەنسا و پاریس دەکەوێ، مەڵبەندی ژیانی تۆفیق وەهبی لە لەندەن بەسەر دەکەنەوە لەرێی.منەوە خێزانی **بەڕێزم تۆفیق وەهبی** بە خەزووری خۆی دەزانی و بنیادیش بە باپیری.

بەڵێ کە وەرامی ئەم پرسیارەت دەدەمەوە دڵم هەر لەلای رێڕەوی ژیانم دایە، بەڵام تا ئێستەش نازانم چۆن باسی ئەم مارسیلیایە دەکەم ئەوەی بەشەوقترین ئەڵماسی زەریای سپی ناوەڕاستەو شارستانیەتی سەرانسەری مێژووی ئادەمیزادی کۆکردۆتەوە لەسەردەمی فینیقییەکانەوە تا ئێستە؟

**رامان ـ ئایا هەموو ئەو رۆشنبیرو هونەرمەندانەی سەردانتان دەکەن لەگەڵ ئێوە لەڕووی فیکرو ئایدیۆلۆژییاوە نزیکن، بەزۆری لەگەڵ میوانەکانت دەربارەی چی دەدوێن؟**

**مارف خەزنەدار:** بەڵێ ئەوە راستە هەموو ئەو رۆشنبیرو هەونەرمەندانەی میوانی هەمیشەیی دیوەخان و نامەخانەی مەڵبەندی رووناکین لە رووی فیکری و ئیدیۆلۆجییەوە، لەمنەوە نزیکن، مەسەلەش دەبێ هەروا بشکێتەوە. هەموو کەسێک لە ئاوزەی خۆی دەگەڕێ لەڕووی بیرو خوو و رەووشتەوە. میوانەکانی من دوو بەشن، هەندێکیان ئەوانەن باسم لێوە کردن، بەشێکی تریش دۆست و برادەری دەرەوەی گێتیی خوێندەواری لە کاسبکارو مووچەخۆرو کاربەدەستانی میری و برێک لە بەڕێوەبەرو کارگێڕانی رێکخراوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانن (حزبەکان). گفتوگۆمان لەگەڵ ئەمانەدا رەنگە کەمێ دیبلۆماسیەتی تێدابێ، بەڵام بە ئاشکرایی و شێوەیەکی کراوە رەخنەیان لێ دەگیرێ و رێزگرتنی چاکەشیان لەبیر ناکرێ.

تاقمی یەکەم واتە ئەو رۆشنبیرو هونەرمەندانەی لە یەکترییەوە نزیکن، ئەمانە ئارامی گیان و ئۆقرەی خەیاڵ و نموونەی بیرکردنەوەمن. دیوەخان بەباس و هەواڵی ئەدەب و رۆشنبیری گەرم دەبێ. ناڵێم باسی سیاسەت ناکرێ، بەڵام سیاسەتێکی گشتی تیۆری ئامێز، نەک تاکتیک و پراکتیکی رۆژانە. لە هەموو بارێکیش دا خۆم و میوانە بەڕێزەکانم ئامادەی ئەوەنین گوێ لە بیرو رای ئامادەکراو و دوو ڕوویی و هەڵپەرستی و دیماگۆگی و بۆچوونی بوودەڵەو مێشک درێوی کردەوەی تەپیوی نوقوم بووی بیروکراتیزم بگرین. دەمەوێ ئەوەش بەبناگوێت دا بچرپێنم ـ سوپاس بۆ یەزدانی پاک ـ لە دیوەخانی مەڵبەندی رووناکی تا ئێستە بەهیچ جۆرێ زویر بوون، یا دڵ شکاندن، خوانەخواستە قسەی نابەجێ کردن، یا سنگ دەرپەڕاندن و بۆیەکتری چوونە مەیدان رووی نەداوە، لە دوا رۆژیش دا روو نادا.

**رامان ـ هەندێ بیرورا هەن دەڵێن مارف خەزنەدار رووناکبیرێکی گۆشەگیرەو خۆی لە واقیع بەدوور دەگرێ. ئێوە لەم بارەیەوە چی دەڵێن؟**

**مارف خەزنەدار:** پێچەوانەی ئەم بیرورایە راستە، منێک ئەگەر گۆشەگیر بوومایە

نەدەگەیشتمە ئەو پلە کۆمەڵایەتییەی ئێستە لەسەری وەستاووم لە گێتی کوردەواری و مەیدانی خۆرهەڵاتناسی و کورد ناسی دا، دیارە هەندێ کەس لەسەر ئەو باوەڕەن دەبێ یەکێکی وەک من لە هەموو دەورو رۆژگارێک دا خۆی هەڵبقورتێنێتە ناو هەموو رێکخراو و نێوەندی هەموو هێزێکەوە، من ئەمەم بۆ ناکرێ. ئەو کەسانەی وا هەست دەکەن من گۆشەگیرم ئەو باوەڕەیان لەوەوە هاتووە من خۆم لە نێوەندی هێزەکان نزیک ناکەمەوە، ئەمە راستە چونکە ئەگەر لە کۆمەڵدا نیسبەتی خراپە لە نیسبەتی چاکە زیاتر بێ یەکێکی وەک من وەک گۆشەگیر دێتە بەرچاو، ئەگەر مەسەلەکە والێک بدەینەوە ئەم رایە راستە. بەڵێ لەم دوو سێ ساڵەی دوواییەدا، ئەو گۆڕانە بنچینەیەی بەسەر کوردستانی عێراق داهات، هەر لە سەرەتاوە ـ وەکو هاورێ نزیکەکانم دەزانن ـ من لە سەر ئەو باوەڕە بووم خراپە بە تەواوی بەسەر چاکەدا زاڵ دەبێ، ئەنجامیش هەروا بوو، ئیتر ماستاو ساردکردنەوە بۆ حزبە کار بەدەستەکان و میکرۆفۆن هەڵگرتن بۆ کەسانی بەناو گەورەی کۆمەڵ بەڕێوەدەبەن پیشەو خوو و رەوشتی من نییە. لە پاشانا کۆمەڵ مەیدانی زۆر فراوانە، ئەگەر کاربەدەستانی بەڕێوەبردن و هەموو حزبەکانیشی لێ دەربکەین بەشێکی زۆر دەمێنێتەوە بۆ یەکێکی وەک من، لەبەر ئەوە من گۆشەگیر نیم، زۆربەی کورد لەگەڵ من دایە، منیش لەگەڵ زۆربەی کوردم، سەرباقی ئەمەش وەک مرۆڤێک هاورێ و ناسیاوم لە دەرەوەی کوردەواری دا کەم نین.

**رامان ـ تا ئێستە لە بواری نووسینەوە گەلێ رەخنەو بابەت دەربارەی خۆت و نووسینەکانت هاتوونەتە بەرهەم. رات دەربارەی ئەو رەخنەو رەخنەگرانە چییەو بابەتەکان و خودی ئەو رەخنەگرانە چۆن هەڵدەسەنگێنی؟**

**مارف خەزنەدار:** راست دەکەی، حەزم دەکرد لەم لایەنەوە بێ دەنگ بم بۆ ئەوەی زیاتر برینم نەکولێتەوەو بەشداری لەوە نەکەم خوێنەری بەڕێز تووشی سەرێشە بکەم. بەڵام لەسەر ئارەزووی ئێوە بەکورتی لەم لایەنەوە دوو قسە دەکەم: راست دەکەی زۆرشت بەرامبەر خۆم و بەرهەمەکانم نووسراوە. ئەوەی بەرامبەر بەخۆم بەشی هەرە زۆری رەخنە نییە، جنێوی بازاڕی دەم پیسانەیە. من خۆت دەکەم بەدادوەر، ئەگەر یەکێک بمکا بە پیاوی ئینگلیز و جاسووسی ئەدمۆندس (کوردناسی گەورە رێزم هەیە بۆی) و دوژمنی ئایین و دەروێشی (ناڵێم سۆفیزم) و سەر بە سەهیوونیزم و جوولەکەیەتی و سەرباقی ئەم هەموو تاوانانە دایکی یەکجار گەورەو بەڕێزی بەهەشتیم لە رشانەوەی رزگاری نەبێ، من وەرامی چی بدەمەوە؟! دەبێ ئەوەش بزانین ئەم تۆمەتانە لە کۆمەڵی ئێمەدا تاوانێک بوون ملی تاوانباریان لە پەتی قەنارە نزیک دەکردەوە.

هەرچی رەخنە گرتنیشە لەبەرهەمە زانستی و داهێنراوەکانم، من بەتەواوی لەگەڵ ئەو بیروڕایە نیم کە رەخنە لە مەیدانی خوێندەواری کوردی دانییە (عەبدولسەمەد خانەقا رەخنەگری چاک بوو) بەڵام زۆر زۆر کزە، ئەوانەی رەخنەیان لەمن گرتووە، ئاگاداری رەخنە نین. گەلێ وتارو نامیلکەو کتێب بۆ ئەم مەبەستە لەسەر من نووسراونەتەوە، لەبەر نزمی و کزی و بێ تامی و نازانستی نووسینەکان

نەمویستووە کاغەزی سپی پاک لە پێناو نیەتی لێڵی پیس ڕەش بکەمەوە. کاکی برا هەر بۆ بەڵگە دەڵێم ئەگەر یەکێک ـ لەگەڵ ڕێزم بۆی ـ نەزانێ من دەرچووی خانەی بەرزی مامۆستایان (دار المعلمين العالية) نیم و دەرچووی کۆلێجی ئەدەبیاتی بەغدام، ئیتر من وەڵامی چی بدەمەوە!

ئەوەش بەتەواوی ڕاست نییە کە من هەمیشە بێ دەنگ بووم. وانییە، ئەگەر ئەوەی لەسەر من نووسراوە بە ڕەخنەم دانا بێ وەڵامم داوەتەوە، بەڵام ئەمە کەم ڕووی داوە. بێ دەنگ بوونم لەم لایەنەوە قازانجی بە مێژووی کەلتووری کورد گەیاندووە. چونکە قسەی بێ تام و بلّقی سەر ئاوە. دەبێ ئەوەش بلێم بەشێکی زۆر ـ ئەگەر هەمووش نەبن ـ لەوانەی بەناو ڕەخنەیان لەمن گرتووە، پەشیمان بوونەتەوە، ئەوەی جنێوی بە خۆم دابێ لێی خۆش دەبم و گەردەنی ئازاد دەکەم، بەڵام بە دایکم نا!

**ڕامان ـ تا ئێستا گەلێ کتێب و نووسینت دەربارەی ئەدەبیاتی کلاسیکی بەرهەم هێناوە کەچی دەربارەی شیعری تازەی کوردی هیچ نووسین و بەرهەمێکت نییە. بۆ؟**

**مارف خەزنەدار:** من لەسەر ئەو باوەڕەدام بەرهەم لە شاعیر جیانابێتەوە، لەگەڵ ئەوەش دا بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوە، دەکرێ شیعرێکی دیاری کراو وەربگیرێ و بکەوێتە ژێر زەبری ڕەخنەوە. یەک دوو شیعری چاکیش ڕێگە بەمن نادەن بیروڕا بەرامبەر بە شاعیرێکی زیندوو بە تایبەتی لاویش دەرببڕم. بۆیە لەسەر ئەو باوەڕەم شاعیر تازیندوو بێ ناتووانین بڕیاری دوایی لەسەر کەسایەتی ئەو شاعیرە بدەین. لەبەر ئەوەیە من خۆم زۆر لە قەرەی شیعری تازە یا سەردەم نەداوە، لەگەڵ ئەوەش دا نووسینم هەیە لەم بابەتەوە، بۆ بەڵگە پێشەکیم بۆ کۆمەڵە شیعری هەندێ شاعیری لاو و گەنج نوسیوە، هەروەها لەکتێبی «هەڵبژاردە لە دیوانی گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ـ ١٩٧٧»ش باسی بەرهەم و شاعیرانی سەردەمم کردووە.

من ناتوانم لەو ئادەمیزادە شاعیرە بدوێم ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نەک ساڵ بە ساڵ لە گۆڕان و پەروەردە بووندا بێ. ئەمڕۆ قسەی جوان دەکا، سبەینێ سەری لێ دەشێوێ و قسەی «ناشیرین» دەکا، دوو سبەی دێتەوە سەرخەت و قسەی جوان دەکاتەوە... تاد. چی لە شاعیرێک بکەم ئەم جۆرە ڕەووشتەی هەبێ! ڕاستە بەرهەم لە ڕەووشت جیا دەکرێتەوە، ئەمە بۆ مردوو ڕەنگە کارێکی بەجێ بێ، بەڵام بۆ شاعیرێکی زیندوو نابێ حسێبی ئەوەی بۆ بکەین هیچ نەبێ تا دەمرێ؟!

تا ئیستاش هەر بڕیارێکی لەلایەن منەوە درا بێ لە بارەی هەندێ لەو شاعیرانەی لە سەرەتای ژیانی شیعرییان دەمیان گەیشتبێتە من هی وەک **عەبدوڵڵا پەشێو و لەتیف هەڵمەت و ئەنوەر قادر و دڵشاد مەریوانی** و هی تر ئەو قسانەی بۆم کردبوون لە دوواییدا هاتوونەتە دی.

**سازکردنی گفتوگۆ:**
**فەیسەڵ دێهاتی**

هونەرمەندی پێشەنگ ئازاد مەحموود شەوقی:

# شانازییە بۆمن وێنەکێشی خاکی کوردستان بم

ئازاد مەحموود شەوقی هونەرمەندێکی شێوەکاری پێشەنگ و ناسراوی گەلەکەمانە. لە بنەماڵەیەکی هونەرییە، باوکی «مەحموود شەوقی» و هەموو برایەکانی لە بواری هونەری شێوەکاریدا کاریان کردووە. لە ساڵی ١٩٢٩ چاوی بۆ ژیان هەڵێناوە. لە ساڵانی ١٩٤٧ ـ ١٩٤٨ەوە بەشداریی لە بزووتنەوەی شێوەکاریی کوردیدا کردووە. لە ساڵی ١٩٤٨ لەگەڵ سێ هونەرمەندی عێراقی لە شاری کەرکووک پیشانگەیەکی شێوەکاری هاوبەشیان کردووەتەوە کە (د.سینان سەعید، مەحموود عوبێدی، سدیق ئەحمەد) بوون. هونەرمەند ئازاد شەوقی یەکێکە لەوانەی لەگەڵ سەرەتای دامەزراندنی پەیمانگەی هونەرە جوانەکان لە عێراق، لەبەشی شێوەکاری، بە شێوەیەکی ئەکادیمیانە کەوتووەتە خوێندن و پەیمانگەی تەواو کردووە، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٥٥ دا کە لە پەیمانگە دەرچوو، لە شاری سلێمانی خزمەتی هونەری تەشکیلی کوردی کردووەو ساڵانە چ بە پیشانگەی تایبەتی و چ لە پیشانگەی هاوبەش لەگەڵ هونەرمەندانی تری کورد بەشداری کردووە.

ئەم هونەرمەندە وەک مامۆستایەک رۆڵێکی بەرچاوو کاریگەری هەبووە لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی هونەریی و پێگەیاندنی وەچەیەکی هونەریی راپەڕیو، بێجگە لەوەی دەستپێشخەری کردووە لە دامەزراندنی مۆزەخانەو بێ وچان هەوڵی داوە پەیمانگەیەکی هونەرە جوانەکان بۆ کورد بکرێتەوە، ئەوە بوو لە پێش راپەڕین بە چەند ساڵێک ئەو ئاواتەی هاتە دی و لە شاری سلێمانیدا پەیمانگەی هونەرە جوانەکان دامەزرا و لەو پەیمانگەیەدا کۆمەڵێک لە قوتابیانی کورد لە بوارە جیاجیاکانی هونەری مۆسیقا... شانۆ ... شێوەکاری پەروەردەکران. لەم دوواییەدا چاومان پێی کەوت و لە دەمەتەقێیەکدا لەگەڵی کەوتینە لێدوان لە پرۆژە هونەرییەکانی.. هۆی وەستاندنی چالاکییەکانی خۆی و بیروڕای تایبەتی بەرامبەر بە بارودۆخی ئەمڕۆی کوردستان.

رامان: وەک هونەرمەندێکی کورد کە لە بواری هونەری شێوەکاریدا کار دەکەیت، باسی ئەو سەردەمەمان بۆ بکە کە تێیدا دەستت داوەتە کاری هونەری. ئەو

**هونەرمەندانەی پێش تۆ لە شاری سلێمانی، یان لە شاری کەرکووک کاریان کردووە کێ بوون؟ ئایە کاریگەرێتییان بەسەرتانەوە تا چ ئاستێک بووە؟**

**ئازاد شەوقی:** من وەک موعەلیمێک و وەک ئینسانێک کە شانازی بە پیشەکەمەوە دەکەم، لەسەر بەشێک لە بەشەکانی جوانی ژیان و خۆشەویستی بە هەموو مانای وشەوە، وەک بچووکێک و خزمەتکارێک شەرەفی ئەوەم لە ماڵەوە بەرکەوت کە بتوانم رۆژێک لە رۆژان ئەم بوارە لە خۆمدا پەرە پێبدەم.

ئێمە لە بنەماڵەیەکی خوێندەوارین، باوکم تەئسیرێکی باشی لەسەرم هەبوو، بەڵام من لە پێش چلەکانەوەو لە چلەکانیشدا (١٩٤٦ ـ ١٩٤٨) بەتەواوی خۆم بۆ بەشی شێوەکاری تەرخان نەکردبوو، بگرە ژیانی کۆمەڵایەتیم لە چەند رۆژنامەیەکی ناسراوی عێراقدا وەک (ئەلوەتەن) و (ئەساس) و هەندێکی تر کە لەدووای جەنگی جیهانی دووەم دەردەچوون دەست پێدەکات، کە برای خۆشەویستم د.مارف خەزنەدار ئاگای لەو نووسینانەم هەیە و زیاتر ئەو تەشویقی دەکردم، چونکە ئەو کاتە ئەو لەبواری نووسیندا باڵا دەست بوو، بەڵام هەموو ئینسانێک رێرەوی ژیانی دەبێ بەخۆی دەست نیشانی بکات، ئەوە بوو هەلم بۆرەخسا لە ساڵی ١٩٥٢ چوومە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا بەشی بەیانییان، کە یەکەم پەیمانگەی هونەرە جوانەکانە لە عێراق بە دەستپێشخەری هونەرمەندی گەورە مامۆستا فایەق حەسەن و حقی شبلی و نووسەری عێراقی زەنوون ئەیووب دامەزرا کە ئەم نووسەرە عەمیدی پەیمانگەکە بوو.

سروشتی کوردستان لە تابلۆیەکی هونەرمەند ئازاد شەوقی

من قەرزاری مامۆستاکانی خۆمم کە ئەو بەهرەیەیان تێدا خولقاندم هەر لە قۆناغی سەرەتاییەوە پەیمانگەش رێ خۆشکەر بوو بۆمن، چونکە یەکەم کورد بووم لە لیوای کەرکووک لەو پەیمانگەیەدا وەرگیرام، پاشان هەندێ کوردی تر بوونە هاوبەشم، کە تا ئێستەش هەر لە رێرەوی جووڵانەوەی شێوەکاری کوردیدا بەشدارن لەوانە هونەرمەند سلێمان شاکر و هونەرمەند محەمەد عارف کە پاشان هاتنە پەیمانگەوە، لە سلێمانیشدا تەنیا کەسێک هەر هونەرمەندی خوالێخۆشبوو خالید سەعید بوو کە هاتە پەیمانگەوە.

من ناتوانم بڵێم پەیمانگە، یان ئەکادیمیا کارگەی دروست کردنی هونەرمەندن، دەبێ ئینسان خۆی رێرەوی ژیانی خۆی دەست نیشان بکات، چونکە پەیمانگە و ئەکادیمیا تەنیا رێگە خۆشکەرێکن. جێگەی شانازییە بۆ من هونەرمەندی نەمر

مامۆستا جەواد سەلیم و هونەرمەند فایق حەسەن و عەتا سەبری لە ساڵی دووەمیشدا هونەرمەند ئیسماعیل شێخلی مامۆستام بوون، کە ئێستە تەنیا هونەرمەند ئیسماعیل شێخلی ماوە، ئەو مامۆستایانە دۆستی دێرینی میللەتی کورد بوون، بۆیە ئێمە قەت لە بەغدا هەستمان بە غەریبی نەدەکرد، ئەوەندە مرۆڤ دۆست بوون زیاتر لە برا عەرەبەکان بایەخیان بە ئێمە دەدا، تەنانەت هانیان دەداین خوێندنی باڵا لە دەرەوەی عێراق تەواو بکەین، لەپاش تەواو کردنی پەیمانگەش بە نامە هەر هاندەرم بوون، بەراستی من ئەو کاتانەم هەرگیز لەبیر ناچێتەوە.

## حکوومەتی هەرێم دەبێ دەستووری هەبێ و مافی ئازادیی بداتە رۆشنبیران و هونەرمەندان

**رامان: ئێوە ساڵانێکی دوورو درێژتان لە بواری هونەری شێوەکاری بەسەر بردووە، لەپاش ئەو ئەزموونە، ئێستە بیستوومانە جەنابتان مانتان لە وێنەکێشان گرتووە، حەز دەکەین باسی هۆی ئەم مانگرتنە بکەیت؟**

**ئازاد شەوقی:** ئەوە حەقیقەتە... پرسی دەروونی بەشێکیان خەونن و نایەنەدی، من هاوار دەکەم حزبە کوردستانییەکان وەک بچووکێک داواتان لێدەکەم کە دەبێ ئاشتی بەرپا بێ و ئازادی بەرۆشنبیران بدرێ، دەبێ رۆشنبیران و هونەرمەندان تەبابن، نەمامی خۆشەویستی لەم خاکەدا بچێنن، هەر ئەوەشە هەمووومان خەونی پێوە دەبینین. لە هەموو شوێنێکدا خەڵک خەبات دەکات ئازادی بچەسپێنێت، کوردیش حەز لەوە دەکات ئازادی و ئاشتی بەرپا بن، ئەگەر چەکیشی هەڵگرتبێ، بۆ ئەوەبووە خاکی خۆی بپارێزێ و ئازادی بکات. میللەتی کورد، میللەتێکی دڵپاکە، بە مەرحەبایەک زۆر شتی لەبیر دەچێتەوە، جێگەی داخە میللەتی کورد تەبانەبێ، حەیفە شەڕانی بێ، یان بکوژرێ.

**رامان: پێت وایە مانگرتنەکەی جەنابت هیچ کاریگەرییەکی هەبووبێ و دەنگو سەدایەکی وای هەبووبێ شایەنی باس بێت؟**

**ئازاد شەوقی:** وا بزانم دەنگی حەقیقەت لەلای زۆرکەس رێزی خۆی هەیە، بەڵام چۆن ئەو دەنگە جێگەی خۆی دەکاتەوە بێگومان کات و کۆششی دەوێ. پەرلەمان ئەگەر بکەوێتەوە گەڕ لەوێ لیژنەی رۆشنبیری هەیە، ئەو کاتە حکوومەت دەبێ دەستووری هەبێ و مافی ئازادی بە رۆشنبیران و هونەرمەندان بدات، لە پاڵ مندا کۆمەڵێک دەنگ هەن، کە هەمان بۆچوونی منیان هەیە، یان لەوانەیە پشتگیریم لێبکەن و بڵێین هەقتە براکوژی دەبێ راوەستێ و پەرلەمان بکەوێتەوە گەڕ، هەقە میللەتی کورد بناسرێ، کە میللەتی کورد بەرێگەی رۆشنبیرییەوە دەناسرێ، کەچی رۆشنبیری و کولتووری ئێمە ماوەیەکی دوورو درێژە بەشەڕەوە خەریکە، بە ژیانێکی ئاڵۆزەوە خەریکە، کە ئاشکرایە ئەمە چ زیانێکی گەورەی هەیە.

من راسته ئێسته مانم گرتووه، بەڵام بەو هیوایەم بە هەوڵی خێرخوازان ئاشتی بچەسپێت، کە،ئێسته مانم گرتووه خۆم بە نیمچە مردوویەک دەزانم، لە ساڵی (١٩٤٢)ەوەو من لە تابلۆ کێشان نەوەستاوم، دێ بەدێ لە کوردستان گەڕاوم وێنەم کێشاوە، ئینشائەڵلا ئەو شانازییەم پێدەبەخشرێ کە وێنەکێشی خاکی کوردستان بم.

**رامان: جەنابتان کە لیژنەی رۆشنبیرانی بێلایەن بوون کۆششتان بۆ ئاشتی دەکرد، بەڵام لە پاشاندا لەگەڵ نووسەرێک دەستتان لەو لیژنەیە کێشایەوە دەکرێ بزانین هۆی چییە؟**

تابلۆیەکی ئازاد شەوقی

**ئازاد شەوقی:** ئەم لیژنەیە بەرێکەوت دروست بوو، من ئینسانێکی بێلایەنم، هونەرمەندم، سیاسیی نیم، وتیان هەندێ کەسی بێلایەن کە گوێیان لێبگیرێ بێن و بخرێنە بەینی هەردوو لاوە، لیژنەکەشیان ناو نا لیژنەی رۆشنبیرانی بێلایەن. لیژنەکە لە ماوەیەکی کورتدا چالاکی زۆر بچووکی نیشاندا، بەڵام بەرنامەیەکمان دانا تا کۆبوونەوەی لەسەر بکرێت هەندێک لەو حزبانەی سەرپەرشتیی ئەو لیژنەیەیان دەکرد، زۆر شتیان دەکرد بەشێک لە ئێمە هەر ئاگامان لێنەبوو، کە ئەویش زۆر لەسەر کەسانی بێلایەن دەوەستێ، بەداخەوە چالاکییەکانمان بە ئەنجام نەگەیشت، من ویستم وەک وێنە کێشێک دەورێکی گەورە ببینم لە جێگیر کردنی ئاشتی، چونکە نەک ئێستە، بگرە هەر لەساڵی (١٩٥٨)ەوە من لەگەڵ رێبازی ئاشتی عێراقدا وەک بێلایەنێک کار دەکەم، وشەی ئاشتیم زۆر لەلا جوانە، چونکە بەبێ ئاشتی هیچ شتێک نابێ، نەژیان، نە رۆشنبیری نابێ، ئەگەر رۆشنبیری نەما تۆ ناتوانی لەگەڵ میللەتدا بدوێیت، چونکە هەر ئاشتییەکە شارستانییەت دروست دەکات و قەڵەم پەروەردە دەکات، بە ئاشتی ئینسان جوان دەبێ و خۆشەویستی زیاتر دەچەسپێ، بۆیە من هاوارم بردە بەر دۆستێکی رۆشنبیری خۆم کە زۆر بەتەنگ هەستی منەوەیە، بۆیە پێکەوە کە دەستمان لەو کارە کێشایەوە، چونکە بەرهەممان نەبوو و نەماندەتوانی هیچ بکەین.

**رامان: جەنابتان ئێستە وەک هونەرمەندێک دوورە پەرێز دێنە بەرچاو، لەگەڵ کۆڕو کۆبوونەوەی هونەرمەندان کەمتر تێکەڵاوی، ئایا هۆیەکەی شەخسییە، یان هەر لەسەرەتاوە وابوویت، یان بارودۆخێکی تایبەتی دروستی کردووە؟**

**ئازاد شەوقی:** هونەرمەند ئەو کەسەیە کە مومکین نییە بتوانێ دوورە پەرێز بێ، ئێمە ناڵێین حزبەکانی کوردستان سەرپەرشتیی کولتوورو رۆشنبیری کورد نەکەن. بەداخەوە حزبەکان بەشێکی زۆری تەئسیراتی هونەرمەندانیان قۆستەوە، من دەڵێم

له سیاسەتدا سازش کردن هەیە، بەڵام هەرگیز لە رۆشنبیریدا موساوەمە کردن نییە، ئێستە ناتەبایی هەیە، کە هەر ئەو ناتەباییە ئێمە لەکار دووا دەخات، لە کاتێکدا لە هونەر هەر ئیشەکە قسە دەکات، بەڵام تەئسیراتی حزبەکان کارێکی وای کرد کە ئێمە بخرێینە ناو ئەو گێژاوەوە، چونکە حزبەکان زۆربەی هونەرمەندەکانیان کڕی، مەسەلەکە لێرەدا هەر پارە نییە، لەوانەیە هەندێکیان بەعاتیفە رایانکێشابن، لە راستیدا رۆشنبیری دەنگێکە نابێ تەئسیری لێبکرێ، ئەگەر حزبەکان بەخۆیاندا بچنەوە دەبێ زەمینە بۆ رۆشنبیران و هونەرمەندان خۆش بکەن و ئازادییان بدەنێ و هەلومەرجی گونجاویان بۆ بڕەخسێنن و کەرەستەیان بخەنە بەردەست، لێرەدا هەرچەندە بەرهەمەکە بۆ میللەتە بەڵام شانازییەکە بۆ ئەو حزبە دەمێنێتەوە کە بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ هونەرمەند دەکات، لەو حاڵەتەشدا حزبەکان دەبێ لەسەر شتە جوانەکان و کارە چاکەکان مونافەسەی یەکتر بکەن.

**رامان: حکوومەتی هەرێمی کوردستانیش نەیتوانی حکوومەتایەتی خۆی بکات، لە مەسەلەی پەرە پێدانی هونەرو رۆشنبیری؟**

**ئازاد شەوقی:** دیسان دووپاتی دەکەمەوە کە حزبایەتی وەک خەلەلێک چووەناو دەزگاکانی دەوڵەتەوە، لەبەر ئەوە هەر بەڕێوەبەرێکی گشتیی و هەر وەزیرێک بیری لە خۆی و لە دەوروبەرو تاقمەکەی خۆی دەکردەوە، لەبەر ئەوەی جیهازی راگەیاندن بڕیاری بەدەستە، بۆیە گلەییەکی زۆرم لە وەزارەتی رۆشنبیری کابینەی یەکەم هەیە، بە تایبەتیش کابینەی یەکەم کە دەیتوانی لەسەر بڕیاری وەزیر کۆمەڵێک یاسا و پرۆژەی جوان بخاتەبەردەمی پەرلەمان، کە پەرلەمانیش لەپاش خوێندنەوەی پەسندی دەکردو وەزیر جێبەجێی دەکرد، بەراستی هیچ بڕیارێکیان دەرنەکرد خزمەتی هونەرمەندان و رۆژنامەنووسیی بکات.

**رامان: بیرورایەک هەیە دەڵێ هونەر بە تایبەتی و داهێنانی کوردی بە گشتی، لە پێش راپەڕین چالاکتر بوو، وەک دووای راپەڕین، تۆ هەست ناکەیت ئەو کەف و کوڵەی جاران نەمابێ، ئایە هۆیەکەی چییە؟**

**ئازاد شەوقی:** پێش راپەڕین دوژمن لەناومان دەژیاو موعاناتەکەمان زۆر قورس بوو، ئەوەندەی ئاگامان لێ بێت بە تایبەتی لە سلێمانی رۆشنبیران دەستیان خستبووە ملی یەکترو هیچ کەلێنێکی وا گەورە نەبوو دوژمن کنەی تێدا بکات. دەبوو لە پاش راپەڕین ئەو تەبایی و یەکگرتنە دوو قات بوایە، بەڵام ئێستە هونەرمەندان بوونەتە گرووپی جیا جیا، نەمانی یەکێتی فیکرو دۆستایەتی نێوان رۆشنبیران و هونەرمەندان بۆ چارەسەری کێشەکان بەدی ناکرێ، چونکە هەندێ لەوانەی لاواز و هەلپەرستن، دوو روو و پارە پەرەستن، ئەو مەرایی کەرانە ئامادەن بچنە هەموو بوارێک، بەداخەوەش زەمینە بۆ ئەوانە خۆشکرا، هاتە سەر ئەوەی بڕیار بەدەستیش بن، ئەمەش بووە هۆی دابڕانی نێوان هونەرمەندان، کە پێشتر ئەوە زۆرکەم بوو. پێشتر هونەرمەندان خواخوایان بوو پیشانگەیەک هەبێ و تێیدا سەرکەوتووبن، هەرچەندە دوژمنیش لەناویان بوون ئەوساکە پێکەوە دادەنیشتن، ئێستە کە دوژمن رۆیشتووە گیروگرفت ئەوەیە هونەرمەندان و رۆشنبیران دانوویان

پێکەوە ناکوڵێ، ڕۆشنبیر جنێو بە یەکتری دەدەن، ئەوە لە کاتێکدا ڕۆشنبیر زمانی خۆی هەیە، زمانی برایەتی هەیە، بۆ دانانیشن بیروڕای ئازاد لەگەڵ یەکتر ئاڵوگۆڕ بکەن، ئەمەش گەورەترین کارەساتە کە ڕۆشنبیران یەکتر نەدوێن و یەکتریان خۆش نەوێ.
ڕۆشنبیران لایەنێکی کاریگەرن لە ژیانی میللەتدا وەک دەڵێن ئاوێنەی کۆمەڵن، بەداخەوە ئێمە لە ئاوێنەیەکی شکاودا خۆمان دەبینین، لەو حاڵەتەشدا ئینسان لە ئاوێنەی شکاودا شێواو دەردەکەوێ، کە دەتوانین ئاشتی و خۆشەویستی و ڕێز لێنان لەیەکتر بکەینە بنچینە، زمانی دەمەتەقێ پێڕەو بکەین، ئێمە زمانی حیوارمان نییە، بۆیە یەکتر ناناسین، کەچی جنێو بەیەکتر دەدەین.

**رامان: وەک هونەرمەندێکی خاوەن ئەزموون کە سەردانی پیشانگەکان دەکەیت، سەرنج و رەخنەت لەلا دروست دەبێ، بۆچی وەک هونەرمەندە عێراقییەکان شاکر حەسەن ئال سەعید و نوری راوی هەوڵت نەداوە نووسینت لەو بوارەدا هەبێ؟ یان بۆچی بەشدار بوونت لەبواری رەخنەی تەشکیلیدا نییە؟**

**ئازاد شەوقی:** من وەک وێنەکێشێک ، ناتوانم بڵێم وەک هونەرمەندێک چاوەڕێی ئەو پاداشتەم کە میللەت دەمداتێ، کە ئەو خەڵاتەم هەڵگرت کە بڵێن تۆ هونەرمەندی، ئەوسا ئەو خەڵاتە لەهەموو دانیشتنێکدا دەکەمە ملم و پیشانی میللەتەکەمی دەدەم، بەڵام من وەک وێنەکێشێکی ئارەزوومەند تا ئەم لەحزەیە لە مەسەلەی رەخنە غافڵ نەبووم، هەرچەندە بواری رەخنە لەبەغدا زیاترە، لەبەر ئەوەی گۆڤاری پسپۆڕیان هەیە کە چالاکانە بەرهەم بڵاو دەکەنەوە، من حەز دەکەم لە وڵاتی خۆم لەسەر هونەرمەندەکان بدوێم، بەڵام ڕۆژنامەکان زۆربەیان هی حزبەکانن، زۆر جار دەڵێن درێژ دەنووسیت، ئێ خۆ رەخنە (فاکس) نییە. برووسکە نییە، لەوانەیە بۆ ئەوەی بیروڕای خۆت نیشانی جەماوەر بدەیت، لاپەڕەیەکی ڕۆژنامەیەک پڕ بکەیتەوە، نووسینی وەک وێنەکێشان نییە، تەجریدی بکەیت، یان بیکەیت بەسریالی، یان بەدوو فڵچەو ڕەنگ کۆتایی پێ بهێنی، هەرچەندە سریالییەت حەقیقەتێکی گەورەیەو هونەرێکی بەرزە کە بڕوام پێیەتی، یان تەجرید کە هونەرێکی بەرزە، بەڵام نەک بۆ ئێرە کە زۆر کەس دەیکەن، بۆیە بوارت نادەن رەخنە بنووسی.
من زۆر جار لە هونەرمەندان رووم تێدەکەن و دەڵێن حەز دەکەین بیروڕات بزانین، منیش زۆرجار حەز دەکەم لەسەر هەندێ پیشانگە بنووسم، بەڵام بوار نییە.

**رامان: وەک پرۆژەی نووسین دەتوانی ئەو نووسینانە لەدوو توێی کتێب بڵاو بکەیتەوە؟**

**ئازاد شەوقی:** من لە ساڵی ١٩٤٢وە ئەرشیفم هەیە لەسەر هونەری تەشکیلی کورد، کۆمەڵێ مامۆستا خۆم بەقەرزاریان دەزانم، لەوانە مامۆستا (گۆران)ی شاعیر کە لە هەولێر دراوسێم بوو، ئەوکاتە دەستی لەکار کێشا بووەوە.

**رامان: ئێوە لەگەڵ (١٠) هونەرمەندی تر سەردانی پاریستان کرد، نیاز لەسەفەرەکە ئەوەبوو هونەری کوردی بەدەرەوەی کوردستان بناسێن، بە رای ئێوە تا**

**چ رادەیەک توانیوتانە بەو تابلۆیانە هونەری کوردی بناسێنن؟**
**ئازاد شەوقی:** کە باسی چوونە پاریس دەکرێ وەزعم تێکدەچێ. من پاریسم نەدی، ٨-٩ رۆژێک لەوێ بووین، من (لۆڤەر)م نەدی، تا ببم بە حاجی هونەر، واتە بچمە پاریس و (لۆڤەر) نەبینم بەواتا هیچم نەدیوە، کە رۆیشتین کاک مەسعوود بارزانی و مام جەلال و کاک جەوهەر نامیق سالم سەرۆکی پەرلەمان قسەی جوانیان بۆ کردین، پێیان وتین ئێوە دەچنە دەرەوە، دەبنە باڵیۆزێک بۆ گەلەکەتان، دەبێ لەخەڵک بگەیەنن ئێمە کێین. ئەوەبوو هەردوو بەڕێز یارمەتییان داین.
من دەڵێم خۆزگە نەچوومایە بۆ پاریس، بە راستی ناتوانم لە پاریس بدوێم. من دەڵێم (٨) کەس بووین، بەڵام خۆزیا (١٠٠) کەس دەبووین، چونکە زۆر هونەرمەندی بەتوانا بێ بەش بوون من بە ئامادەبوونی بەڕێز (کەندال) سەرۆکی ئینستیوتی کورد لە پاریس لە بنکەی مافی مرۆڤ وتەیەکی ئاراستەی خاتوو (دانیال میتران) کرد، لەوێ وتم ئێمە بەشێکی زۆر بچووکین لە خێزانێکی گەورەی رۆشنبیری میللەتی کورد، بەرێکەوت ئێمە هاتین و داوەتی ئێوە بووین، وتیشم کۆمەڵێکی زۆر گەورەتر بەجێماون، خۆزگە رێگەیان بۆ دەکرایەوە، کە ئەمانەش لەهەموو بوارەکانی هونەرو نووسیندان، تا بتوانن کەلتووری کورد بە پاریس بناسێنن.
**رامان: جگە لە بواری هونەری، پرۆژەی ترت هەیە بۆ خزمەتکردنی میللەتی کورد، وەک پرۆژەی کوردۆلۆژی، هەروەها پێشنیارت کردبوو بۆ دامەزراندنی پرۆژەیەکی کۆکردنەوەی سامان و کولتووری هونەری کوردی، ئایا ئەو پرۆژانە گەیشتووەتە کوێ؟ ئایە هیچ حزبێکی دەسەڵاتدار بە پیر ئەو پرۆژانەوە هاتووە؟**
**ئازاد شەوقی:** دەڵێن ئەگەر ئینسان لەبواری پسپۆڕی خۆی کاری نەکرد ئەوە هەڵەیە، من دوو ساڵە وێنە ناکێشم، بەڵام ئاورم لە نووسین داوەتەوە، ئەوانەی خەونن دەبنە حەقیقەت.
لە راستیدا پرۆژەکە یەکەمجار بەناوی کوردۆلۆژییەوە نەبوو، پێشتر من پرۆژەکەم پێشکێشی پەرلەمان و حکوومەت کرد، بەشێک لە رۆشنبیران تا ئەم لەحزەیە وەڵامیان نییە، من دوو پرۆژەم هەیە هیوادارم بەزووترین کات وەڵام وەربگرمەوە، هیچ بەرژەوەندیی منی تێدا نییە، بەرژەوەندێ میللەتە، چونکە پرۆژەی دووەمم کردنەوەی کۆلیجی هونەرە جوانەکان لەزانکۆکانی کوردستانە.
**رامان: وەک خاوەن ئەزموونێک لە بواری هونەر، چ خۆتان، چ خەڵکێکی تر ئایا هەوڵی ئەوەتان داوە کە ئەو ئەرشیفە کۆ بکەنەوە؟**
**ئازاد شەوقی:** وەک ئارەزوویەک لە چلەکانەوە زۆر شتم لەلای خۆم نووسیوەو کۆکردووەتەوە، ئەگەر بشێ بڵاو بکرێتەوە دەبێ دەزگایەکی گەورە یارمەتیی لەچاپدانی بدات، من ئەرشیفێکی دەوڵەمەندم هەیە، بەڵام هیچ لایەنێک یارمەتی نەداوم، تەنیا حزبی شیوعیی کوردستان نەبێ کە پرۆژەی فلیمێکی وەسائقی لەسەر ژیانم بەرهەم هێناوە، کە ئەوەش تا ئێستە جێبەجێ نەکراوە، بەهەر حاڵ سوپاسیان دەکەم.

**رامان: جگە لەبواری هونەری شێوەکاری، دەستپێشخەریتان لەبواری تردا هەیە؛ وەک پرۆژە پێشکەشتان کردووە سەنتەرێکی لێکۆڵینەوەی کولتووری کوردی هەبێ، تا چ رادەیەک بە دەنگتانەوە هاتوون؟**

**ئازاد شەوقی:** من کە ئێستە کار ناکەم، ناشتوانم بێ ئیش دابنیشم، بۆیە لەمێژە ئەو پرۆژەیەم لەلایە، بەشێکیم لەبواری وەزیفیدا ئەنجام داوە، لەبواری دامەزراندنی یەکەم مۆزەخانەی جلوبەرگی کوردی عێراقی و نەتەوایەتی، لە رێی پەیمانگەی هونەرەوە گەیاندمە جیهان، کە لە نێوان دەوڵەتاندا دەبەستراو وەزارەتی مەعاریفی ئەوکاتە بۆ ئاڵوگۆڕی رۆشنبیری من جلی کوردیم بۆ هەموو دنیا ناردووە، خەڵکی دەرەوەش هەمان شێوە بۆیان ناردووم، لە رێی وەزارەتی دەرەوەو مەعاریف بەدەستم دەگەیشت.

لە ساڵی ١٩٦٩ کە دیسان ئەوکاتە شەڕ بوو، کوردستانم بەجێ هێشت و چووم بۆ سعوودیە لەوێ بووم بە مامۆستای هونەرە جوانەکان، لەجێی مامۆستا شاکر حەسەن ئال سەعید کە هاتمەوە ئەو مۆزەخانەیە نەمابوو، جگە لەوە هەوڵم دا وەک مامۆستایەک کە باوەڕم پێیەتی، برەو بە رۆژنامەی قوتابخانەکان بدەم.

**سازدانی گفتوگۆ:**
**ئازاد عەبدولواحید**

(ع.ح.ب) ی شاعیر

# زۆر کەم لایان بەلای شیعری مندا کردووەتەوە

***شێخ محەمەد شێخ حوسێن بەرزنجی کە بە (ع.ح.ب) ناسراوە، شاعیرێکی لەسەر وەچەی شیعری گۆران حیساب دەکرێت، هەر لەوساکەوە تا ئەمڕۆ بە بێدەنگی شیعر دەنووسێ و چوار کۆمەڵە شیعری بەچاپ گەیاندووە، شیعرەکانی بە پێی بنەما هونەری و شیعرییەکانی ئەو قۆناغە هەوڵی نوێ کردنەوەی تێدایە، بە مەبەستی ئاشنا بوون بە بیروراو بۆچوونی بەڕێزیان لە بارەی ژیان و بەرهەمەکانییەوە رامان ئەم دیمانەیەی لەگەڵ ساز کرد.***

**رامان: هەر لە سەرەتاوە بە بیری ئەدەب دۆستانی بهێنینەوە کە ع.ح.ب ـ لە چییەوە هاتووە؟!**

ع.ح.ب: لەو سەردەمەدا خۆم لەو باوەڕەدا نەبووم ئەو شیعرەی کە دەینێرم بڵاودەکرێتەوە لەلایەکی ترەوە وام پێخۆش بوو نەکەومە بەردەستی دەسەڵاتدارانی ئەو کات و تووشی نارەحەتی بێم، ئنجا لەبەر ئەوە یەکەم قەسیدە کە بۆ گەلاوێژی ئەو سەردەمەم نارد لە گەنجی و پیری و مردندا هەر بەناوی ـ عەلی ـ برامەوە ع.ح.ب ـ عەلی حوسێن بەرزنجییەوە ناردم، ئیتر دەستبەرداری ئەو نازناوەش نەبووم و هەر لەسەری رۆیشتم تا گەلاوێژ داخراو لە سەردەمی (ژین)یشدا هەربەهەمان شێوەو زیاتریش هەر خۆم وام پێخۆش بوو بەناوی عەلی برامەوە نووسین بڵاوبکەمەوە. خەڵکەکەش دەقی پێوەگرت.

**رامان: ئەو شیعرە لە چ ساڵێکدا لە گەلاوێژ بڵاوبۆوە؟!**

**ع.ح.ب:** لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٧، ئەوکاتە تازە بە فەرمانبەر دانرابووم و نێردار بووم بۆ ماوەت، هێشتا نەچووبومە ماوەت و لە چوارتا بووم کە ناردم بۆ ـ گەلاوێژ ـ کەدیتم بڵاوکراوەتەوە بە راستی زۆرم پێخۆش بوو، بەڵام تا درەنگانێک و تا ئێستەش زۆر کەس نازانن شاعیرم، چونکە خۆم حەزم بەوە نەکردووە لای خەڵکی باسی خۆم بکەم بڵێم من شاعیرم و شیعرم هەیە، تا ئێستە شیعرەکانی

خۆم بۆ کەم کەس خوێندۆتەوە، لە گەلاوێژ کە شیعرەکانم بلاّودەکرانەوە خوێنەران لە پاڵ خۆما دەیانخوێندەوەو نەشیان دەزانی شیعری منن و خۆشم قسەم نەدەکرد..

**رامان: چ بەرهەمێکت لە چاپ دراوە؟!**

ع.ح.ب: چاپکراوەکان چوار دیوانە ـ ناسۆری دەروون ـ گرێی نهێنییەکان ـ زەردەخەنەی تاساو ـ تریفەی رێژاو ـ کە دوواهەمینیانەو لە هەشتاکاندا لە چاپ درا، دیوانێکی چاپنەکراویشم هەیە بڕوا ناکەم چاپ بکرێت، هۆمیرۆسیشم بەشیعر وەرگێڕاوە ئەویش چاپ کراوەو بلاّوکراوەتەوەو چاپکراوەکان ئەو کتێبانەیەو هیچی تر..

**رامان: رەخنە تا چ رادەیەک حەقی بەشیعری ئێوە داوە؟!**

ع.ح.ب: زۆرکەم لەسەر شیعری من نووسراوەو نەمدیوە شتێکی ئاوها بایەخدار بێت، چ بەچاک یان بەخراپ، لاوێک شتێکی نووسی و خوالێخوش بوو دلّشاد مەریوانی و قزلّجی لە رۆژنامەیەکدا بابەتێکی نوسی بوو..

**رامان: مامۆستا پێوەندیتان لەگەڵ گۆراندا چۆن بوو؟!**

ع.ح.ب: گۆران پێش ئەوەی بیناسم، شیعرەکانی کاریگەری زۆریان هەبوو بۆ سەر هەست و نەستم و خۆشویستنی شیعرو شیعر نووسینم، ئیتر کە شیعری ئەوم لە گەلاوێژدا دەبینی زیاترم دەخوێندەوە، زیاتر لە شیعری شاعیرەکانی تر سەرنجی رادەکێشام، چونکە زۆر بەیایەخ و بەلەزەت و بەچێژتر بوون، هەر لەو کاتەوە لە پەنجاکانەوە کە من لە عەربەت بووم ئەو لەسەر کار لابرابوو، رۆژنامەی ژینیان پێ دابوو، دەچووم بۆ لای، لە یەکەم چوونە لای ئەویش پێی خۆش بوو، منیش هەموو جارێک کە دەهاتمەوە شیعرم پێ بوایە، یان نا دەچوومە سەردانی لە رۆژنامەکە دەمبینی و لە چاخانەکەی ـ حەمە رەقدا ـ لەبن پایەیەکدا هەموو رۆژنامەکانی دەخوێندەوەو لەگەڵ دوو چای شیریندا، جارێک قەسیدەیەکم دابوویە. ئەو وتی دەسکارییەکم کردووە، منیش وتم هەڵبەت لە بەرژەوەندیی منە.. وایزانی پێم ناخۆشە، وتی: ئاخر کەمێک دەستکاری شیعری شاعیرێکم کردبوو، کەچی نارەحەت بوو پێی..

**رامان: رازیت بەوەی بڵێین مامۆستا ـ ع.ح .ب سەربە قوتابخانەی گۆرانە..؟**

ع.ح.ب: بەلای منەوە ئەدەب قوتابخانەی بۆ دانەنرێت چاکە، چونکە ئەوە سنوورێک یان هێڵێکی نییە، راستە بۆ نموونە شیعرو ئەدەبیاتی رابوردوو لەگەڵ هی ئەم سەردەمەو لەگەڵ ئەوانەی دووا رۆژیشدا جیاوازیان هەیە، بەلاّم ئەگەر بە قۆناغ دابەش بکرێت، ئەمە نالی و ئەوە گۆران و ئەوە دووای گۆران، شتێکی چاک نییە، من هەرخۆم بە قوتابی گۆران زانیوەو ئێستەش مامۆستامە رابوردووش بە ئێستەو ئێستەش بەدوا رۆژەوە پێوەندی هەیە، بۆ نموونە شیعری ئێستە لەگەڵ سەردەمی نالیدا زۆر جیاوازە، ئەوسا شیعر لەسەر شێوەی قەسیدە بوو، یەک قافیە دەهاتە خوارەوەو هەر دێڕە هەڵبەستە مانایەکی تایبەت بە خۆی هەیبوو، بەلاّم لە چل و پەنجاکاندا قەسیدە هەر دێڕە قافیەی خۆی هەیە لە دووایشدا لەیەک بابەت دەدوێت، ئەگەر دێڕێک لە شوێنێک لابرێت مانای قەسیدەکە دەشێوێنێ. بەس بۆ

غەزەل و شیعری کۆن ئەوە نەبوو.

**رامان: مامۆستا لە نێوان دیوانی یەکەمت تا تریفەی ڕێژاو گۆڕانکاری دەبینیت..؟!**

**ع. ح. ب:** شیعر ئاوێنەی ژیانە، ژیانیش دەگۆڕێت، بیرم دێ لە گوندەوە کەمالمان هاتە سلێمانی، هیچ ئافرەتێکم بی پەچەو عابا نەدەدی، هەموو ئافرەتێک لە سەرو تەمەن ١٢ سالییەوە پەچەو عابای بەسەرەوە بوو، ئەمە وەک عادەت و بارودۆخی ژیانی ئەو سەردەمە، ئێستە پەچە هەر نەماوە، تەنانەت لە شوێنێک بۆ شوێنێکی تر، لە بەرزنجەو سەرکاندا ئەوساش پەچەو عابا نەبوو، ئەدەبیش ئاوێنەی ژیانەو دەگۆڕێن..

**رامان: ئێوە هەر بە پێوانەی جاران سەیری شیعر دەکەن یان بەگشتگیری لێی دەڕوانن؟!**

**ع. ح. ب:** ئێمە میللەتێکی چەوساوەو زوڵم لێکراوین و نازانین تاکەی وا دەبین، ئەدەبی ئێمە پێوەندی بە دەورو بەرەکەمانەوە هەیە، لەم سەردەمەدا کە کوردی تیایەو ڕووبەڕووی داگیرکردن و ڕاوەدوونان و کۆڕەوو شەڕی براکوژی و برسێتی و بێ کاری دەبینەوە، دەبێ ئەدەب باس لەچی بکات..؟

بەڕای من پێش هەموو شتێک ئەدەب دەبێ لە خزمەتی خاک و نیشتمان بێت و ئەوسا بۆ ئافرەت و جوانی و شتی تریش بێت..

**رامان: مانای وایە بڕواتان بەو دابەشکردنە هەیە کە دەڵێ ئەمە شیعری دڵدارییەو ئەو شیعری نیشتمانیەو تاد..؟!**

**ع. ح. ب:** تەنانەت ئەو شیعرانەی بۆ ڕووداوێک دەنووسرێت ئەو هونەرەی نییە، وەک ئەوەی هەستی خۆت لە ڕەنگدانەوەی ناخی خۆتەوە بە شیعرێک یان پەخشانێک دەربڕی، بەڵام تۆ کە میللەتەکەت لە کڵۆڵی و خاکەساریدا دەبینی ناچار دەبی موعاناتی خەڵکەکە بە شیعر دەربڕیت، من بەو ڕێبازە هەمەلایەنەی باسی دەکەیت نەڕۆیشتووم، ئەگەر شیعرم بۆ ئافرەت نوسیبێ هەر بۆ ئافرەت بووە، تەنانەت متەسەویفەکان کاتێ باسی ئەوین و خۆشەویستی دەکەن و خۆیان دەڵێن مەبەست لە ئەوینە بۆ خودا، هەمیشە وەک ڕەمزێک شیعر دەنووسێت و تێیدا مەبەستی لە چەند بابەتێکی ترە..

**رامان: شیعرەکانی تۆ زیاتر مۆرکێکی چینایەتی پێوە بووە، لە خزمەتی خەڵکی ڕەش و ڕووت و زەحمەتکێشی کوردا بووە، چەند شیعرێکیشت بەسەر زاری خەڵکەوە بووەو جێ ڕەزامەندیی هەموانە، بەڕای تۆ پەیامی ئەدەب دەبێ لە خزمەتی چ لایەنێکی لە کۆمەڵگە بێت..؟!**

**ع.ح.ب:** کە دەڵێین میللەتی ئێمە چەوساوەیە، خاکەکەمان دابەشکراوە، بەڵام لەناو میللەتەکەماندا جاران دەرەبەگ هەبوون، کە خاوەن موڵکەکان بوون، دەوڵەمەندیش هەبوون سەرمایەدار بوون، هەروەها جوتیارانیش هەبوون کە زۆریان لەژێر سایەی خاوەن موڵکەکاندا بوون.. ڕەش و ڕووت و هەژارەکانی ناو شاریش لەژێر سایەی پارەدارەکاندا دەژین، من خۆم لە ماوەت بووم، جوتیارێک خەڵکی

# جێی شانازیمە قوتابی مامۆستا گۆران بم

دێی ـ سپیندارە ـ بوو، ئاغاکەی ئەو سەردەمە بە خەنجەر لێی دابوو، هێنایانە ماوەت، هێشتا نەمرد بوو، لەوێ پێی وتبوو ئەگەر نەڵێی بەراز لێی داووم ماڵ و منداڵیشت دەکوژم.. کە هێنایانە ئەوێ بۆ ئیفادە وەرگرتن کابرای جوتیار وتی: من بەراز لێی داووم، من خۆم لە نزیکەوە ئاگام لەو ستەمە گەورەیە بوو.. ئێمە گەلەکەمان لەلایەکەوە بەدەست بێگانە غەدرمان لێ دەکرێت لە ناوخۆشماندا خاوەن موڵکەکان و خاوەن پارەکان ئەوانیش زۆرو ستەم لە خەڵکە هەژار و زەحمەتکێشە کە، ئەوکاتە ئاسایی بوو شت بۆ ئەو کابرایە بنووسم کە زوڵمی لێ کرا، دەشمزانی کە دوو چینی جیاواز لەو رووداوە دایە، هەر لەو سەردەمەدا بەبێ ئەوەی کتێبی مارکسیش ببینم خۆم دەمزانی کە چینەکانی کۆمەڵ جوداوازن لەیەکتر، هەر لەو دەمەدا ئەنجامەکانی جەنگی جیهانی دووەم هاتە پێشەوە کە بەرەی یەکگرتووی هاوپەیمانان سەرکەوتن و نازی و فاشیەت شەڕیان دۆڕاندو لەو کاتەدا واهاتە ئاراوە کە یەکێتی سۆڤیەت پشت و پەناو یاریدەدەری چینی هەژارو چەوساوەیە، لەبەر ئەوە تادووای شەستەکانیش خەڵکی بە گەرمییەوە بەرەو پیری ئەو بیروباوەڕو فیکرەیە چوون، بەو بۆنەیەوە خەڵک کە دیدەی زوڵم و زۆر هەیە زیاتر بەلای مارکسیەتا دەچوون..

**رامان: تۆ زوڵم و زۆرێک کە دەرهەق بە خەڵکی ئەنجام دەدرا هانی دایت بۆ شیعر نووسین یان هۆکارێکی سیاسی شەخسی؟!**

**ع.ح.ب:** هەردووکیان، زوڵم و زۆرەکەم بەچاوی خۆم دەدی و شیوعیەکانیش زۆریان دۆست و برام بوون، ئەوەش کاریگەری خۆی هەبوو..

**رامان: جاران لەبەر ئەوەی هۆیەکانی راگەیاندن نەبوون، زۆر لە شاعیران، شیعرەکانیان دەکردە هۆیەک بۆ ئامۆژگاری خەڵک، ئەی ئێستە چۆن لە شیعر دەڕوانیت؟!**

**ع.ح.ب:** ئێستە شتەکان هەمووی گۆڕاون، ئەوسا ئەمەریکا و بەریتانیاو ئەو دەوڵەتانەی تر بە ئیمپریالیزم ناویان دەهات، بەڵام ئێستە میللەتەکەمان حەز دەکەن ئەمەریکا وڵاتمان داگیر بکات بەمەرجێ لەژێر زوڵم و ستەمی دەوڵەتانی دەوروبەر رزگاربین، ئەوکات ئێمە داوای رووخانی ئەو دەوڵەتانەمان دەکرد کە ئێستە زۆربەی خەڵک بەرزگار کاری ناو دەبەن..

**رامان: مەبەستمانە بڵێین وەزیفەی شیعر ئێستە هەمان وەزیفەی جاران نابینێت..؟!**

**ع.ح.ب:** ئەگەر شیعر بۆ هۆشیار کردنەوەی خەڵک نەبێت، ئەی دەبێ چی بێت؟!..

**رامان: ئێستە زۆر شتی تر هەن لە هۆشیار کردنەوەی خەڵکدا بەشدارن لەوانە وتارو لێکۆڵینەوەو بەرنامەی تەلەفزیۆنەکان و هتد... بەڵام شیعر وەزیفەی**

**سەرەکی خۆی لایەنی بوونە مرۆیی و جوانناسیەکەیەتی..**

**ع.ح.ب:** ئەوانەی باسی دەکەیت راستە رۆڵی هۆشیار کردنەوە دەبینن و ئەرکەکە لەسەر شانی شیعرو ئەدەب کەم دەکەنەوە، لەم رۆژانەدا لە رۆژنامەیەکدا تابلۆیەکی کاریکاتێریم دی و لەوحەیەکی رەش کرابوو، لەژێریدا نوسرابوو، ئەمجارەیان شەو قەلای نا مەردانە، ئەم وێنەیە خۆی زۆر شتە، ئەوەتا وێنەیەکی کاریکاتۆری رۆڵی شیعرێک دەبینێت، ئێستە لەچلەکان و پەنجاکانیش کێشەمان زۆرترەو لە مەینەتێکی زۆر گەورەدا دەژین، دوژمنان چاویان بڕیوەتە ئەوەی بە یەکجاری لەناومان ببەن، ئیتر چۆن شیعر دەیپەرژێ خەریکی جوانناسی و مانای جوانی و ناسکی خۆی بێ و دەسبەرداری گەل و خاک و نیشتمانەکەی بێت..؟!

**رامان: مەبەست ئەوەیە شیعرەکانت نەبێتە دروشم کاری؟!**

**ع.ح.ب: بۆ دروشم هیچم نەنووسیوە، قەسیدەی (ئەمشەو)یش هەست و شعورو لێکدانەوەی خۆمەو بەو شیعرەم دەربڕیوە، یان ئەی هەژار هەر لە چلەکاندا نووسیومەو لە دیوانی ناسۆری دەروونداپە، ئەمە هەر باسی ژیان و بەسەرهاتی کچێکی هەژاری ئەو چینە چەوساوەیە کە لە لادێدا دەژی، ئەمە دروشم نییە ..**

**رامان: تێبینی ئەوە دەکەین لە قسەکانتا کە شیعرەکانت زیاتر بۆ جووتیارو چینی زەحمەتکێش بووە، ئایا لە شارەکاندا بۆ کرێکاریش شیعرت گوتووە..؟!**

**ع.ح.ب:** شیعرم بۆ هەژارو چینی چەوساوە نووسیوە، نازانم ئەوانیش بکەمە طەبەقات..

**رامان: «هەر کاروانێ بۆ خۆر بڕوانێ، کەم بن یا زۆر، هەر دەگەنە خۆر» ئەم بەیتە شیعرە لە موناسەبەیەکدا کاریتێکردووی تا بیلێیتەوە یان بۆ مەبەستێ گوتوتە..؟!**

**ع.ح.ب:** زۆرجار رووداوێک کاری تێکردووم و شیعرێکم بۆ نووسیوە بەلام جاری واهەبووە، ویستوومە شیعرێک بنووسم، بەلام بۆم نەکراوە.. کەوتنی مهاباد کارەساتێکی زۆر گەورە بوو، بە پێی ئەو کارەساتە گەورەیەو لەو رۆژەداو لەو ئاستەدا نەمتوانی هیچ بنووسم جگە لە مەسەلەی ئەفسەرەکان..

**رامان: بڕوات بەوەیە شیعر ئیلهام بێت؟!**

**ع.ح.ب:** نازانم چۆن چۆنییە، جار هەبووە لە خەو راپەڕیووم و پارچە شیعرێکم نووسیوە، کەچی جاریش هەبووە بە سەعات دانیشتووم شیعری بنووسم کەچی بۆم نەنووسراوە..

**رامان: لە تەمەنی شیعریتدا لە هەموو بەرهەمەکانت رازیت..؟!**

**ع.ح.ب:** بەرهەمەکانم هەمووی ئازیزو خۆشەویستن، وەک چۆن دایک منداڵ و کۆرپەی خۆی خۆش دەوێت، بەلام هەموو شیعرەکانی گۆران ـ دەروێش عەبدوللا نییە، شیعرەکانی خۆم ئەوەی لێی رازی نەبووبم لام بردووە، یان چاپم نەکردووە.. ئەوانەی نووسیومن لێیان پەشیمان نیم..

**رامان: جار بە جار شیعری ـ نازم حیکمەتتان ـ وەرگێڕاوە؟!.**

**ع.ح.ب:** دەبوو نازم حیکمەت وەک شاعیرێکی ئوممەمی شتێکی بۆ میللەتەکەم بگوتایە، بەلام نکۆڵی ناکرێت شاعیرێکی چاکە، بەنیسبەت گەل و چینی خۆیەوە

قوربانیدەر بووە، تەمەنێکی زۆری هەر لە زیندان بەسەر بردووەو، هەندێک لە شیعرەکانیم لێ وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

**رامان: یەکەم شیعرت کە لە گەلاوێژ بلاوبۆوە تەمەنتان چەند بوو؟!**

ع.ح.ب: هەر ئاوا ٢٣ ـ ٢٤ ساڵێک دەبووم..

**رامان: جگە لە گۆران پێوەندیت بە شاعیرەکانی ترەوە چی بووە؟!**

ع.ح.ب: لەگەڵ هەردی شاعیردا هەم دراوسێین، هەم دواییش خێزانەکەی خزمە، لەبەر ئەوە دۆستایەتیم لەگەڵ ـ هەردی ـ دا هەربووە، بەس ئەو شیعری لە پێش مندا نووسیوە، ـ کاکەی فەللاح ـ لە پەنجاکاندا بووینە دۆست و برادەر، بەلام لەگەڵ «کامەران و دیلاندا» پاش ئەوەی لەسەر وەزیفە لابرام و هاتمەوە سلێمانی ئەوسا لەگەڵ ئەوانیشدا تێکەڵ بووم..

**رامان: ئاماژەت بە هەردی شاعیر کرد، بە شیعرەکانیدا دەردەکەوێت مەرج نییە شاعیر زۆر بنووسێ و بلاوبکاتەوە، هەردی شیعری کەمەو شاعیرێکی گەورەیشە.. نموونەی تریش (بێخود) لە شیعری «لەو رۆژەوە رۆیشتووە تۆراوە دڵی من» یان عەلی عارف ئاغا بە شیعری ـ گوڵ و خونچەی بەهاران ـ وەناسراوە؟!**

ع.ح.ب: زۆر راستە، شیعرەکانی هەردی هەمووی چاکن.. بەس نازانم بۆچی دەستبەرداری شیعر بوو..

**رامان: قەت لەسەر بیرو باوەڕ دووچاری گرتن و راوەدونان بوویت؟!**

ع.ح.ب: بەڵێ لە ساڵی ١٩٦٣ « بەتۆمەتی شیوعیەت گیرام» پێش ئەوەی بدرێمە دادگا لەسەر کار فەصل کرام، پاشان لە دادگاشدا تەبرییە بووم.. ئەوسا وەزیفەم کاتبی نفووس بوو لە دائیرەی ئەحوالی مەدەنی، پاش ماوەیەک لە گیرانم ماوەی ساڵ و نیوێک لە نوگرە سەلمان و بەندیخانەکانی کەرکووک و دەیالا، تەنانەت لە زیندانەکەی کەرکووکدا نزیکەی هەزار کەسی تیا بوو، دووایی من بەناوی یەکێکەوە کە ناوی عەلی حوسێن محەمەد بوو، عەلی برام پێش من بەو ناوەوە هاتە دەرەوە، منیش بەناوی (محەمەد حوسێن محەمەد)ەوە هاتمە دەرەوە، ئەگینا ئەگەر بدراینایە بە دادگا ئەو کات حوکم دەدراین، ئەو دوو ناوەش لە زیندانەکەدا هەبوون و پارتی بوون، ئێمە شیوعیی بووین، لەبەر رێککەوتنێک بەربوونی ئەوان ئاسایی بوو، بۆیە من و براکەم بەناوی دوو برای ترەوە کە جوتیار بوون لە خەڵکی گەرمیان دەرچوون.

**رامان: بەندیخانە ئەو کاریگەرییەی هەبوو چەند شیعرێکتان پێ بنوسێت؟!**

ع.ح.ب: بەندیخانە زۆر نارەحەت و سەغڵەت بوو، تا لە سلێمانییەوە بردیانین، سەد کەس بووین، قەسیدەیەکم هەیە لەسەر ـ کاروانی دیل ـ ، لە دیوانی (گرێی نهێنییەکاندایە)، حەمە دەمەمان لەگەڵ بوو، کاتێ دایانبەزانین بۆ حەوانەوە، حەمەیان جیاکردەوەو کوشتیان بەمەرجێ لەسەر سیاسەتیش نەگیرابوو، بە درێژایی رێگە دڵۆپی ئاویان نەدایێ، زۆرمان زمانمان ئاوسا بوو، ئاو لە لەشیاندا نەما بوو، چونکە تەمموز بوو، بەو عەزابە ئێمەیان برد، تەنانەت لە رێگە تووشی قافڵەیەکی عەسکەری بووین ئەفسەرێ هات و بەو ئەفسەرەی وت کە لەگەڵمان

بوو وتی: ئەمانە چین؟! ئەویش لەوەڵامدا پێی وت: موتەمەڕیدن.. هاواری کرد، ئەی بۆ نەیانکوژم..! لە ماوەی بەندیما یەک تا دوو قەسیدەم نووسیوە، لە کاروانی دیلدا ئەو بەسەرهاتەم بەشیعر گێڕاوەتەوە.. کاتێ لەنوگرەش بووین کە جەماعەتی عەبدولسەلام عارف شوێنیان بە حەرەس قەومیەکان لێژکرد، ئەوسا مامەڵەی ئێمە لە زیندان گۆڕاو بەرەو باشتر چوو..

**رامان: کاتی خۆی دڵشاد مەریوانی کۆڕێکی لەسەر شیعرەکانت سازدا بەتایبەت لەسەر تریفەی رێژاو کە جۆرە تازە بوونەوەیەکی تێدایە، بە تایبەتی لەرووی کێش و داڕشتنەوە، ئایا لەسەر ئەو رێچکەیە بەردەوامیت؟!**

**ع.ح.ب:** مرۆڤ کەچووە تەمەنەوە ئەو توانایەی نامێنێ، بڕواناکە جەواهیری بتوانێ هێزی مێشکی بنووسێ وەک ئەوانەی سی ساڵ لەمەوبەری زۆر ئاساییە مرۆڤ هێزی مێشکی و توانای بیرکردنەوەی لاواز دەبن، ئەگەر بتوانم شیعر بنووسم هەر بەو شێوەیە دەینوسم..

**رامان: وەک کەسێکی مەسحوقی کۆمەڵگە، ئایا ناڕوانیتە ژیانێکی باشتر، ئەو باشترە لە چیدا دەبینی؟!**

**ع.ح.ب:** ئەوە پێوەندی بە سەرکردەو حزبەکانەوە هەیە، میللەتی ئێمە وەزعی زۆر خراپە، ئنجا ئەم هەرایەی لەسەر کورسی و پارەو دەسەڵات دەکرێت، گەر وەهابێت ئەم فرسەتەی ئێستەش لە دەست دەدەین، هیچ نەبێ بابەزەییان بە خەڵکەکەدا بێتەوەو حیسابێک بۆ ئەم زروف و بارودۆخە بکەن کە بەرەو خراپترمان دەبات، ئەگەر هەرای براکوژی نەبوایە ئێستە وەزعمان باشتر دەبوو.

**رامان: تۆ کۆمەڵگەیەکی بێ چین و چەوساوەت دەوێ یان کۆمەڵگەیەکی ئەوروپا نییە؟!**

**ع.ح.ب:** بەڕای من دەبێت بۆ دروست کردنی دەوڵەتێکی کوردی لەم کوردستانی عێراقەدا هەوڵێ بدەین، پێش ئەوە هەوالّدانمان بۆ یەکسانی زۆرستەمە.. هەوڵدان ئێستە بۆ دەوڵەتێکی سۆسیالیزمی وەک خەون و خەیاڵ وایە، چونکە دەوڵەتی سۆسیالیزمی لە دووای دروست بوونی دەوڵەتی نەتەوەییە..

**رامان: بەنیسبەت شیعری لاوەکان چی دەڵێت و .. ئەی دووا وتەت چییە؟!**

**ع.ح.ب:** شیعرێک من تێینەگەم بە شیعری دانانێم ئێستە هەر لە ژمارە(١)ی گۆڤاری راماندا شیعرێکی «**سەباح رەنجدەر**»م بەرچاو کەوت. لەوانەیە هەیە بڵێ ئەمە چاکترین شیعرە، بەڵام ئەو تەمو مژە من لێی تێناگەم، بەمەرجێ ساڵەهای ساڵە شیعر دەنووسم و دەخوێنمەوە، ئنجا گەرخۆی شەرحێکی لەسەر بدایە، شیعریش نابێ شەرحی خۆی بکات.. ماوەیەک کۆمەڵێ لاو شیعریانم دەدی لەوانە بەرزان هەستیار و ئەوان رێک و پێک بوون.. زۆر ئاسایی ئێستە شاعیری لاوی باشمان هەیە و ئومێدی دواڕۆژیان پێیە، ئەوان شتێکی چاکیشیان لەبەردەستایە، بۆیە دەبێ شتی باشتر بەدەستەوە بدەن.

**سازکردنی گفتوگۆ:**

**ئازاد عەبدواحید ـ محەمەد عومەر عوسمان**

***ئەحمەدی قازی: (وەرگێڕ)***

# نەخۆمان ئاگامان لە کاری ڕۆشنبیری سەرانسەری کوردستان هەیە، نەدراوسێکانیشمان

***ئەحمەدی قازی یەکێکە لە نووسەرە چالاکەکانی کوردستانی ئێران کە زیاتر لە بواری وەرگێڕاندا جێ پەنجەی دیارە و تا ئێستە کۆمەڵێک بەرهەمی ئەدەبی لە فارسییەوە کردووە بە کوردی، یان بە پێچەوانەوە چەند بەرهەمێکی کوردی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی، سەرەڕای ئەوەی لە بواری ڕۆژنامەنووسیشدا سەروکاری گۆڤاری (سروە) دەکات.***

***گۆڤاری (رامان) بۆ ئەوەی پشکی خۆی لە هەموو کوردستانی گەورەدا هەبێ بە ئەرکی خۆی دەزانێ ئەو نووسەرانە بە خوێنەرانی خۆی بناسێنێ و ناوبەناو بەسەریان بکاتەوە. تا پردی پێوەندی نێوان هەموو لایەک پتەوتر بێ.***

**رامان: لەبەرهەمە وەرگێڕدراوەکانی جەنابتان کە بریتیین لە (ژانی گەل) و (دوانی سەیرو سەمەرە) (چیرۆک)، (قەیرانی کەنداو) (مێژوو)، (نامەکانی ریلکە) (لێکۆڵینەوەی ئەدەبی) ، (شیعرەکانی نیما) (شیعر).**

**بەڕێزتان وەک وەرگێڕێک چۆن لەو چوار بوارەدا کارەکانتان ئەنجام داوە؟**

**ئەحمەدی قازی:** بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانی من دەکرێنە دوو بەش، بەشی یەکەمیان ئەوانەن کە لە زمانی ئینگلیزییەوە کراونەتە فارسی. وەک:

١ـ تورەمەی ئەژدەها. (نسل اژدها) نووسینی: پێرل باک.

٢ـ دوانەی سەیرو سەمەرە. (دوقلوهای عجیب) نووسینی: مارک توین.

٣ـ شەوی بێ پایان. (شب بی پایان)

٤ـ کۆساری حەقیقەت. (کوهسار حقیقت) نووسینی دەفنە دۆمۆریە.

٥ـ سەردەمی غوولەکان (عصر غولها) نووسینی وینا دێلمار

٦ـ سەددام و قەیرانی کەنداو (صدام و بحران خلیج) نووسینی دوو هەواڵنێری

بەناوبانگ.
بەشی دووەم ئەو بەرهەمانەن کە لە زمانی فارسییەوە، یان لە ئینگلیزییەوە کراونەتە کوردی کە بریتیین لە:
١ـ نامەکانی ریلکە لە ئینگلیزییەوە کراوە بە کوردی، بڵاوکردنەوەی گۆڤاری سروە.
٢ـ دوانەی سەیرو سەمەرە لە فارسییەوە کراوە بە کوردی.
٣ـ زۆر بابەتی ئەدەبی، مێژوویی لە ئینگلیزی و فارسییەوە کراون بە کوردی و لە گۆڤاری (سروە)دا بڵاوکراوەتەوە.
٤ـ بەشێک لە شیعرەکانی نیمایوشیج، شاعیری نوێخوازی ئێرانی کراوە بە کوردی و لە گۆڤاری سروەدا بڵاوکراوەتەوە.
جگە لەمانە چەند بەرهەمێکیشم لە زمانی کوردییەوە کردووە بە فارسی وەک:
١ـ ژانی گەل (رۆمان) نووسینی (ئیبراهیم ئەحمەد) بەهاوکاری وەرگێڕی بەتوانا محەمەدی قازی
٢ـ ئەندێشەی مرۆڤێک نووسینی (حوسێن عارف).
مەبەستیشم لە وەرگێڕانی بەرهەمی جۆراوجۆر بۆ سەر زمانی کوردی زیاتر پێوەندی بە ئارەزووی خودیمەوە هەیە، وێڕای دەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی لە هەموو روویەکەوە. ئێمە لە ئێراندا لە سەرەتای رێگە داین، چەند ساڵێکە لە بواری رۆشنبیریدا نیمچە ئازادییەک بەدی دەکەین. ئەگەر لە هەر لایەنێکەوە بۆی بچین دەبینین زمانەکەمان، رۆشنبیری و کەلتوورمان پێویستیان بە خزمەتکردن هەیە، وەک ئەدیبێک ناتوانی خۆت تەنیا بە لایەنێکەوە ببەستیتەوەو خەریک بیت، بەتایبەتی ئەگەر بەرپرسییەکی گرنگی وەک دەرکردن و هەڵسوڕاندنی گۆڤارێکی وەک (سروە)ت لە ئەستۆ دابێ.
لە نێوان رووناکبیرانی کوردو هاوولاتیانی دیکەدا شێوە نامۆییەک و دوورە پەرێزییەک هەبوو، ئێمە وەک کورد کە لە ئێراندا بەزمانی فارسی دەخوێنین و قوتابخانەو زانکۆکانمان بە زمانی فارسی تەواو دەکەین، کەم و زۆر ئاگامان لە رەوتی کاری رووناکبیران و رۆشنبیرانی سەرانسەری وڵات هەیە، بەڵام بە پێچەوانەوە، رووناکبیرانی فارس یاخود ئازەری یا.. لەرەوتی رۆشنبیری نێو کوردستان ئاگادارنین، ئەوەندەی ئاگاداریش بن زۆر کەم و نادروستن. بۆ ئەوەی ئەم شێوە نامۆیی و دوورە پەرێزییە نەمێنێ لەگەڵ چەند کەسێک لە رووناکبیرانی کورد لە سەر ئەوە رێک کەوتین کە دەبێ روخساری رۆشنبیری و ئەدەب و مێژووی کورد بە هاوولاتیان بناسێنین، هەرچەندە ئەم کارەش بە شێوەیەکی رێکوپێکی بەرنامەدار ئەنجام نەدراوە، بەڵام زۆرکەس بە دەنگمانەوە هاتن بۆ نموونە: مامۆستا محەمەدی قازی، تاریخی کوردو کوردستانی (**ڤاسیل نیکتین**)ی کردە فارسی، مامۆستا یوونسی بانەیی زۆر کتێبی وەک (**کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستدا**) نووسینی کریسس کۆچێراو، کوردەکان، نووسینی دیرک کێنان... تاد کردە فارسی، بەندەش لە بواری (رۆمان) دا (ژانی گەل) و (ئەندێشەی مرۆڤێک)م کردووە بە فارسی،

# مەبەستمە ئارادەیەک هونەری وەرگێڕان فێری لاوەکان بکەم

بەرۆژ ئاکرەیی و ناسرسیناو مارف ئاغاش لە بواری ناساندنی شیعری کوردی بە تایبەتی شیعرەکانی شێرکۆ بێکەس، عەبدوڵڵا پەشێو بە خوێنەرانی فارسی رۆڵی بەرچاویان نواندووە. زۆرکەسی دیکەش هەن کە لەو بوارەدا زەحمەتیان کێشاوە کەمن لێرەدا ناویانم لە بیرنییە.

**رامان: جگە لە ناساندنی شێوە نووسین و ئەندێشەی نووسەری کورد بە گەلانی دیکە، لە وەرگێڕانی (ژانی گەل) و (ئەندێشەی مرۆڤێک)دا، مەبەستی تایبەتی ترتان نەبووە؟**

**ئەحمەدی قازی :** هەڵسانم بە وەرگێڕانی (ژانی گەل) و (ئەندێشەی مرۆڤێک) بۆ زمانی فارسی بەو مانایە نییە کە تەنیا هەر ئەم دوو رۆمانەم بەلاوە جوان بووبێ و بەس، بەڵکو زۆر بەرهەمی جوانتر لەوانەش هەن، بۆ نموونە (**گەلە گورگ**) کە کۆمەڵە چیرۆکێکی (**حوسێن عارف**)ە، کارێکی زۆر جوانە، یاخود (**هەڵکشان بەرەو لووتکە) کە رۆمانێکی (عەبدوڵڵا سەراج**)ەو کورتە چیرۆکەکانی عەتا نەهایی و.. تاد. بەڵام دەرفەت و بوارم بۆ هەڵنەکەوتووە بیانکەم بە فارسی.

**رامان: وەک وەرگێڕێک پێوەرو پێوانەت چییە بۆ هەڵبژاردنی ئەو کتێبانەی کە بەنیازی بیانەکەیت بە کوردی، ئایا ئەو کتێبانەن کە تیشکێک دەخەنە سەر مێژووی گەلەکەمان، یاخود دەروازەیەک دەکەنەوە بۆ ناساندنی ئەدەبی کوردو گەلانی دی؟**

**ئەحمەدی قازی:** تا نەزانم نووسراوێک، رۆمانێک یا هەر بەرهەمێک کەلەبەرێک و بۆشاییەک لە دنیای رۆشنبیری کوردیدا پڕدەکاتەوە، وەریان ناگیرم. کە نامەکانی (**ریلکە**)م بەزمانی ئینگلیزی خوێندەوە، هەستم بەوە کرد کە شاعیر یا نووسەری کورد دەبێ لە ناوەڕۆکی ئەم نامەگەلە تێ بگات. لە سەرپێی خۆی بوەستێ، لە رەخنەنەترسێ، بە تایبەتی رەخنەی ئێمە بەداخەوە زۆرتری تا نووت و تەشەرو جنێوە!

یاخود لە وەرگێڕانی شیعرەکانی (**نیما**)دا مەبەستم ئەوەیە کە شاعیری کورد بە ناسینی شێوازی نوێ و لووتکە بەرزەکانی ئەدەبی فارسی و شاعیرێکی گەورەی وەک (نیما) بەرەو ئاسۆیەکی فرەوانترو هەراوتری دنیای شیعر رەپێش بکەم و لە بازنەی بەرتەسکی شیعری کوردی کوردستانی ئێران رزگاری بکەم. هەروەها ویستوومە لایەنێکی ئەدەبی بە راودرکاریش بخەمە بەرچاو، من شیعرێکی (**نیمایوشیج**)م بڵاوکردبێتەوە. دەقە فارسییەکەشم لەگەڵ چاپ کردووە، چونکە دەمەوێ هونەری وەرگێڕانیش تا رادەیەک فێری لاوی تازەکار بکەم. لەسەر ئەم

بڕوایەم کە ئەدەبیاتی فارس و عەرەب و تورک لە خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا زۆر زۆر قەرداری وەرگێڕانە بەنرخەکانی خۆرئاوان. ئەگەر وەرگێڕان نەبوایە، هەرگیز ئەدەبیاتی فارسی نەدەگەیشتە ئەم ئاستەی ئەمڕۆ.. گومانی تێدانییە ئەدەبیاتی عەرەبییش هەر ئەم ڕێگەیەی گرتۆتەبەر، کەوابوو ئێمەش بۆ دەوڵەمەندکردنی ڕۆشنبیری و زمان و ئەدەبی کورد، دەبێ ئەم خاڵە لەبەرچاو بگرین.

**ڕامان: تەنز لە ئەدەبیاتی کوردیدا بە بەراورد لەگەڵ لایەنەکانی دیکەی ئەدەبیاتدا وەک ڕۆمان لاوازتر دێتە بەرچاو، هۆی ئەم لاوازییە چۆن دەبینن؟**

**ئەحمەدی قازی:** ئەدەبیاتی کوردی بە شێوەیەکی گشتی، ئەدەبێکی کزو سەرکوتکراوە، ئەدەبێکی کوشتەی ژێر سانسۆرو چاوەدێری، ئەدەبێکی بێ دەرەتان و حەشارگە، ئەدەبێکی خزمەت نەکراوی پشت گوێ خراو، جگە لە لایەنی فۆلکلۆر، لایەنەکانی دیکەی ئەدەبیاتی کوردی هەموو کزولاوازن، ئینجا ئەمە بێت حاڵ، دەبێ (تەنز) حاڵی چۆن بێت! هەڵبەتە وێڕای ئەم لاوازییەش، هەندێ لایەن لە هەندێ لایەنی دیکە زۆر لاواز و کزترن.

تەنز لە ئەدەبیاتی پاراوی پەرەگرتوودا لەدایک دەبێ، ئەدەبیاتی سەرەتایی و ساکار ڕەنگە بتوانێ گاڵتەو هەجوو گەپ لە خۆیدا جێ بکاتەوە، بەڵام بەزەحمەت دەتوانێ (**زمانی تەنز**) بخوڵقێنێ، تۆ لە نێوان هەزاران نووسەری جیهانی تەنیا دەتوانی ناوی چەند تەنزنووسێک دیاری بکەیت. ئەمە لە خۆڕانییە، تەنز نووسینیش بەهرەو جیهانبینی تایبەتی خۆی گەرەکە، ئەگەر لەمن بپرسی: ئەی چۆنە تۆ تەنزی وەک (باقەبێن) یا تەنزی دیکەت بۆ گۆڤاری سروە نووسیوە، کت و مت دەڵێم: ئەو ترووسکە بەهەرەیەم بەهۆی شارەزایی لە ئەدەبی فارسی و ئینگلیزی دەست کەوتووە نەک لە نێو ئەدەبی کوردییەوە.

**ڕامان: وەک تەنز نووسێکی کورد، سنووری نێوان تەنزو گاڵتە جاڕی چۆن دیاری دەکەن؟**

**بەرای بەڕێزتان هەر نووسراوەیەک بزە بخاتە سەر لێو دەتوانرێ بە تەنز بژمێردرێ؟**

**ئەحمەدی قازی:** (تەنز) ماناو نێوەڕۆکی تایبەتی خۆی هەیە، تەنز زیاتر باسی دەردی ژیان و ئینسان و کۆمەڵگە دەکا. دەزانین کە ژیان و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی پڕ لە زوڵم و زۆر و بێ دادوەری و ناتەبایی و چەوساندنەوەو کوشتن و بڕین..تاد. تۆ دەتوانی بە قەڵەم هێرش بەریتە سەر ئەم زاڵم و ستەمکارو پیاوکوژانەو بەتەشەرو تانووت و جنێو هەوڵ بدەی بیانخەیە سەر ڕێگەی ڕاست.

بەڵام ئەوە سەلمێنراوە کە بەرەنگاری ڕاستەوخۆ زۆرکاریگەر نییە! لێرەدا تەنزو زبانی تەنز کارامەترن. ئەگەر بتوانی کارێکی وابکەی خەڵک بە ستەمکار پێ بکەنن، باشتر سەر دەکەوی، تەنز کاریگەرییەکی بەردەوامتری هەیەو زۆرتر لە مێشکی ئادەمیزاددا خۆی رادەگرێ. تەنز دەرمانێکی تاڵی کاریگەرەکە لە کەپسوولێکی شیریندا دەرخواردی خوێنەر دەدرێ و زۆرباش دەردە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان دەرمان دەکا. ئەوەی گاڵتە بێ تەنیا بۆخۆشی و رابواردن و کات بەسەر بردن دەوترێ یا دەنووسرێ وەک قسەخۆشانە (JOKES) نوکتە. کە لە

ئەحمەدی قازی: سەرنووسەری گۆڤاری سروە

کــۆڕو دانیـــشـــتندا دەوترێن. یا ڕۆژنامەو گۆڤارە گاڵتە جاڕییەکان چاپی دەکـەن. ئەم گـاڵـتـەجـاڕییـە هەرچەندە جاروبار دەردێکی ژیانیش وەبیـــر دێننەوە، بەڵام زۆر ترین بە مـەبەسـتی مـژوڵکردن و رابواردن و پێکەنین دەوترێن و دەنووســرێن و بەرەو قووڵایی ژیان ناچنە خوارەوە.

**رامان: بەڕێزتان ئەگەرچی لەزۆربەی بوارەکـــاندا بەرهەمی باشـــتـــان پێـــشکەش کـــردووە، بەڵام وەک رێچکەیەکی تایبـەتی لە ئەدەبدا، رێـچـکـەیـەکی دیاری کـــــراوتـان هەڵنەبژاردووە، هۆی ئەمە چییە؟**

**ئەحـــمەدی قـازی:** من خـۆم جـۆرە مـرۆڤـێکم هەرگـیـز بە قـولینچکێکی دنیـای هەراوی ئەدەب رازی نابم، دەمـەوێ مەلەوانی هەموو بەشەکانی ئەم دەریا بێ بن و بێ سنورە بم، لە کاتێکدا شیـعرم خـۆش دەوێ و بەشـێک لە هێـزو تـواناو کـاتی بۆتەرخـان دەکـەم، لە خـوێندنەوەو ئارەزوو کـردنم و سەردەرکـردنم لە ئەدەبیـاتی چیرۆکـیشـدا بێ ئاگـا نەبم، هەروا بۆ بەسەرکردنەوەو ئاگاداری لە رووداوو مێژووی جیهان بە تایبەتی مێژووی وڵاتیش هەوڵدانم هەیە، ئەمـەشیـان لەرێی خـوێندنەوەو گـوێ گـرتن لە رادیۆو تەلەفـزیۆن و لەزۆر کەناڵی تریشەوە ئاگام لە رووداوەکانی وڵات و جیـهان هەیە، بەتایبەتی زۆر بە پەرۆشەوە بەدوای رووداوەکانی کـوردسـتـان دەکەوم، وێڕای ئەوانەش تا ئێـسـتـە زۆر بە زانستی زمانەوانی و رێزمان و واژەناسی زمانی کوردییەوە خەریک بووم و لەسـەر رێزمـانی کـوردی کـتـێبـیـشم بڵاوکـردۆتەوەو زۆر وتاریشم لەم بارەیەوەو نووسیـوەو بڵاو کردۆتەوە لە راستیدا من خۆم دەستی یارمەتیم بۆ هەموو لایەک درێژ کـردووە، بەتایبـەتی ئەوانەی کــە لە هەوڵی خـۆپێکەیاندن و گـەیشتن بە لووتکەدان و دەیانەوێ «جێ پێیەک بۆ خۆیان لە دنیای نووسیندا بکەنەوە بەهەر شێـوەیەک بێت، بەتایبـەتی لە سـەدەی رابردوودا لەم کـوردسـتـانە زۆر کـەس لەم رێگەیەدا بەردەوام بوون و زۆریشـیـان لە نیـوەی رێگەدا پچڕان و بەزین و دەست بەردار بوون، هەندێکیـانیش ماڵ و سامانی خۆیان لەسەر دانا تا دیوانۆکەیەکیـان چاپ کردو سنگیان رەپێش کردو چوونە پشت میکرۆفۆن و .. بەڵام نەبوونە هیـچ و رەنج بەخەسار مانەوە، لە نێو ئەوانیشـدا تاک تاکەی لێ هەڵکەوتن کە بەهرەیان تێدا بوو و قسەی دڵی خۆیان بەخەڵک وت. دەردو مەینەتی گەل و ئادەمیزاد بوو بە هەوێنی شیعرەکانیان و، بەرەو ئاسۆی تازە چوون و بوون بە لووتکە.

منیش لە سەرەتاوە بە شیـعـر دەستم پێکرد، بەڵام زۆر زوو لێی سارد بوومـەوە

چونکە پێم وابوو تەنیا بەزمان و کەرەی شیعر و شاعیری ناتوانم ئەو خزمەتەی پێویستە بەزمان و رۆشنبیری کوردی بکەم،. هەروەک وتم لوتکەم بۆ دەشتایی و بەرینایی بەجێ هێشت و لێرەدا بەهرەکەی خۆمم بەرفرەوانتر کرد تا زیاتر خزمەت بە ئەدەب و ئەدیبی کورد بکەم. وەک دەفەرمووی لە هەموو بوارێکدا بەرهەمی باشم بەدەستەوە دابێت، دیارە ئەوەمایەی شانازی و سەرکەوتنێکی گەورەیە.

وەک لە پێشتریش وتم، بەرێوەبەردنی گۆڤاری (سروە) کە پێداویستی بە شارەزایی لە هەموو بەستێنێکدا هەیە، بواری ئەوەی نەدام بەتەنیا خۆم بە لایەنێکەوە خەریک بکەم و ببم بە (لووتکە).

**رامان: خوێنەران پێیان وایە زمانی (نیما) لەو زمانە نەرمترەکە بەرێزتان شیعرەکانتان پێی وەرگێڕاوە، ئایا ئەم کارەتان بۆ باشتر گەیاندنی پەیامی شیعری نیما بووە یاخود هۆیەکی دیکە هەیە؟**

**ئەحمەدی قازی:** ئەگەر جیاوازییەک لە نێوان زمانی شیعری (نیما) و وەرگێڕانەکەی مندا هەبێ، ئەوە بۆ جیاوازی نێوان زمانی فارسی و کوردی دەگەڕێتەوە. ئێمە وەک وەرگێڕ، ئەرکی سەرەکیمان ئەوەیە ناوەڕۆکی بابەتەکە وەربگێڕین و بێ زیادوکەم بیگەیەنینە خوێنەر. بۆ گەیشتن بەم ئامانجەش دەبێ بەرنامەی گونجاوو لەبار لەبەرچاو بگیرێ تا ناوەڕۆکی بابەتەکە بەتەواوی لە زمانێکی دیکەوە بگوێزینەوە بۆ زمانی کوردی. بەرەچاوکردنی لایەنی ئەمانەتی ئەدەبی ئەوە ناچارین پاڵەپەستۆ بخەینە سەر زمان. زۆرجار ناچار دەبین، ئەو زەبرەی نیما بەدوو یا سێ واژە لە هەستی خوێنەری دەدا، ئێمە بە شەش حەوت واژە بیگەیەنین، لەلایەکی دیکەشەوە دەبێ ئەم راستیەمان لەبیر نەچێ کە وەرگێڕانی وشە بە وشە مومکین نییە، ئەگەر بشکرێ ئەوە وەرگێڕانێکی تۆکمەو پڕ بەپێست نابێت.

**تەنز دەرمانێکی کاریگەرە لە کەپسوولێکی شیریندا دەرخواردی خوێنەر دەدرێ!**

بە پێچەوانەی قسەکەی جەنابتان، من پێم وایە زمانی وەرگیڕانەکەی من لە زمانەکەی نیما نەرمترو ئاسانترە، چونکە من لەم وەرگێڕانەشمدا هەوڵم داوە مەبەستەکەشی بکەمەوەو بە زمانێکی ئاسانتر بیخەمە بەردەستی خوێنەر. دەتوانم بڵێم زۆر خوێنەر لەرێی وەرگێڕانەکانی من لە شیعرەکانی نیما گەیشتوون.

**رامان: جەنابتان وەک سەرنووسەری گۆڤاری «سروە» و نووسەر و وەرگێڕێکی خاوەن ئەزموون، دەربارەی زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی بیرو راتان چییە؟**

**ئەحمەدی قازی:** ئەو پرسیارە زۆر لەمێژە ویژدان و هزری روناکبیرانی کورد دەهەژێنێ کە بۆ پێکهێنانی زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی دەبێ چی بکەین؟ پێکهێنانی وەها زمانێک، بێگومان بەرلەوەی مەسەلەیەکی رۆشنبیری یا

زمانەوانی بێت، مەسەلەیەکی سیاسییە! ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان کوردستانێکی یەکگرتوو پێک بێت، ئەوە زمانی یەکگرتووش زۆر بە ئاسانی پێک دێت.
مەسەلەکە بەمجۆرە دەکەوێتەوە کە دەسەڵاتداری سیاسی کوردستان دەستوور دەدا فلانە زاراوە ببێتە زمانی یەکگرتوو. لە نووسین و قوتابخانە و زانکۆو رادیۆو تەلەفزیۆندا تەنیا لەو زاراوەیەدا کەڵک وەربگیرێ. پاش چەند ساڵ ئەو زمانە دەبێتە زمانی یەکگرتووی کورد. وەک زمانی ئینگلیزی لە بەریتانیا یاخود فارسی لە ئێراندا یا عەرەبی قورئانی لە وڵاتە عەرەبییەکاندا. ڕەنگە ئەو پرسیارە بێتە گۆڕێ ئەی ئەم هەموو زاراوەو بن زاراوەیەچی بەسەردێ؟ وەڵام ئەوەیە: زاراوەو بن زاراوە تێدا ناچن، چونکە قسەپێکەرو بەکارهێنەریان هەر دەمێنێ. هەروەک دەیان زاراوەو بن زاراوەی دیکەی ئێرانی کە پاش سەدان ساڵ کە لە تەمەنی زمانی یەکگرتووی فارسی تێدەپەڕێ، ئێستەش هەرماون، یا زاراوە عەرەبییە عامیەکان کە لە هەموو وڵاتە عەرەبییەکاندا، یا زاراوەی سکۆتلاندی SCOTISH، یا وێلزی WELSH لە بەریتانیادا.. تاد.
بەڵام لە هەلومەرجی ئێستەدا، بۆلێک نزیک کردنەوەی زاراوە سەرەکییەکانی (کوردی باکوور ـ ناوەڕاست ـ باشوور) لەسەر نووسەران و شاعیران پێویستە بۆ فێربوونی هەموو ئەم زاراوانە هەوڵ بدەن و لە نووسین و خوڵقاندندا لە واژەو دەستەواژەو دروستکردنی زاراوەکاندا کەڵک وەربگرین. ئەم هەوڵە ئێستە زۆر برەوی هەیەو زۆر بەرهەمی باشی بووە. ویژدان و ئارەزووی پێک هێنانی زمانی ئەدەبی یەکگرتوو کە هەموو کوردستان بگرێتەوە لە زۆربەی نووسەران و قەڵەم بەدەستاندا ورووژاوەو بوونی زمانێکی ئاوا کە ئارەزووی هەمووما نە، ئەوە هەر ئەو نیازو ئامانجە دەبێتە هۆی پێکهێنانی.

**بەدرەدین ساڵح**

**لەسەر راسپاردەی رامان ئامادەی کردووە**

## چیرۆک نڤیس د. فاضل عمر

# کورتە چیرۆک . . . ئاڤاکرنا گاڤەکا مرۆڤایەتیێ یە

***چیرۆک نڤیس فاضل عمر ئێکە ژ چیروک نڤیسێت دیارو بەرچاڤ و حازریاخو یا بەردەوام هەیە د مەیدانا چیروکێ دا و د کوروو جڤات و گەنگەشێت ئەدەبی دا... هەروەسا ئەم دشێن بێژین هەر چەندە د. فاضل گەنجە لێ تا رادەکێ دیار خودان ئەزمونەکا چیروکێ یەو کومەلەکا چیروکا لـ سالا ١٩٩٢ چاپ کر لبن ناڤێ «کالێ پەشیمان»***

**رامان: تو چاوا د کورتە چیرۆکێ دگەهی؟**

**د.فـاضل:** ب دیتنا من، کورتە چیرۆک دزین و ئاڤاکرنا گاڤەک مرۆڤانی یە چ ئەڤ گاڤە، ئەڤ پێنگاڤە هزرکی بت یان ژ راستی یا ژیانێ بت، چ سەربەخۆ بت چ پارچەیەک بت ژ زنجیرەکا بویەران... هەلبەت ئەڤە ژی دچارچۆڤێ راچاندن و زمانەک تایبەت دا دهێتە ئاڤاکرن.

ژ ئالەک دیڤە مە بڤێت، نەڤێت چیرۆک بـ گشتی ژ چەند توخمێن تێکەل و داڤکێش کری و هەڤبەند پێک دهێت، وەک: بویەر، دەم، قەهرەمان، زمانێ ئەدەبی، گوتو...تاد. وگەلەک جاران ئەڤە هەمی ژی کورتە چیرۆکەکی دروست ناکەن، چونکی رازا وێ، کرۆموسۆمێ کورتە چیرۆکێ ژێ کێمە، ئەڤە نەدوورە بۆ چۆنەک فەنتەزی و ئاشۆپی بت لێ بـ سەرێ گەلەک کەسان دهێت بۆ نمۆنە: مرۆڤ دێ هەلبەستەکێ خوونت، هەمی توخمێن وێ تێدا هەنە، لێ نە هەلبەستە! یان کورتە چیرۆکێ، ژ سەر ڤە کورتە چیرۆکە لێ دەنگەک ژ کووراتی یا مەژی یێ مرۆڤی دبێژت ئەڤە سەرهاتی یە.

تایبەتمەندی یەک دی ژی کورتە چیرۆکێ هەیە، ئەو هەڤبەندی یێن لسەر ئێک ئاستی؛ هەڤبەندی یێن نە ئالوزی و سادە، بەرەڤاژی چیرۆکا درێژ کو لسەر چەند ئاستان دهێتە نڤیسین و ئاڤاکرن... لەو ئەز نە دگەل وێ بۆ چۆنێمە ئەوا دبێژن کورتە چیرۆک گڤاشتنا چیرۆکا درێژە یان چیرۆکا درێژ بەرفرەهکرنا چیرۆکا کورتە، چونکی د گەل هەمی هەڤبەندی یان، هەر تەرزەکی هەبوونا خوەیا جودا هەیە، ئانکو چیرۆک نە دۆزا خانی یەکێ مەزن و خانی یەکێ بچووکە بەلکو هەڤبەندی و تێکەلی یێن بەر تەنگ و بەر فرەهە.

**رامان: بهزراتە، وەک جاران خاندنگە هێت ئەدەبی (الواقعیە، الطلیعیە،**

**البنيويه..)تاد، گرنگی یا خۆ مایه یان نه؟ و بۆچی؟**

**د.فاضل:** رۆشنبیری یا مرۆڤی بـ (لسەرێک ئاڤاکرنێ) پەیدا بوویە، ئانکو هەر ژدەما مرۆڤی هەست بـ هەبوونا خوە و سروشتی کری تاکو ئیرۆ بەردەوام و ل هەمی ئاستێن ژیانا خوە نژیاری پێ دکەت و هەکە ل ئەوروپا یان ئەمەریکا خەلک ژ قۆناغێن ڤان دبستانان دەربازبن ئەم دەرباز نەبوینە، بەرەڤاژی، ژنوو، روژ بو روژ ئەڤ دبستانێن ئەدەبی لنک مە سەر هلددەن و ئەڤە ژ تایبەتمەندی یا

## ئەز جهێ لناڤ چڤین رەوشەنبیریا کوردی دبینم

جڤاکا مە سەر هلددەت، کو هەر ژ ژیانا کۆچەری یێ تاکو کوپیتکا شارستانی یا مرۆڤان گەهشتی یێ پێکڤە، دیەک قالبیدا دژین، لێ بـ گشتی جڤاکەک گەلەک پاشکەفتی هەیە و پێتڤی یە وی ئاستی بەرەڤ پێش ببەین، لەو هەر کەسێ پێنگاڤ وەکی وی دڤێت هاڤێتین، یان یێ ڤەقەتیای یان ژی تۆفانەکا د بتلەکی دا چێ کری و تاکو نهۆ راستیخوازی یا وێنەیی (الواقعية التصويرية) ل مەیدانا ئەدەبێ مە زالە و زەمانێ هندەک دی، ل هندەک جهان نەمایە وتازە یێن سەری لنک مە هلددەن، وەک چەڤەنگخوازی یێ (الرمزية)، سوریالی یێ، بنیاتگەری یێ... هەکەرچی ئەڤا دوماهییێ رەنگەک بەردەوامی یێ هەیە، چونکی پێکۆلا شرۆڤەکرنا زانستی و تەبایی و بەردەوام دکەت... کو کێر هەمی دەم و زەمانان بهێت، لەو دجڤاکا مەدا، کو جڤاڤەک د دەستوداریێ لڤینێ و گهۆرینێ دایە هەمی تشت رەوانە و ئەڤ (هەمی تشت رەوانە) رەنگەک بەرەللایی و بێ ئارمانجی یێ ددەتە نڤیسینێ و ئەوێن دبێن هزر دکەن ئەم د ئالۆزی و گرفتاری یا هندا بوونێ دا دژین هەکەرچی ئەڤە تا رادەیەکی راستە، لێ پێتیڤی یە ئەم ژ بیرنەکەین کو نە رۆشنبیری دگرفتاری یێ دایە بەلکو ئەڤا بەردەست و ئەم تێدا رۆشنبیری یا گرفتاری یێ یە وهەردەما گرفتاری نەما هەمی ریبازو دبستان دێ ژێک هێنە ڤاڤارتن و یا تازە، یا بەرهەمدار دێ سەر کێشی یێ کەت... من دوو کورتە چیرۆک بـ قالبەک و زمانەک تایبەت نڤیسین، لێ ژ ڤەقەتیانێ پێڤە چ بـ دەست من نەکەڤت! راستە، هندەک هەڤال ژێ رازی بوون و هیڤی یا بەردەوامی یێ بۆ من کرن، لێ ئەز وەکو نڤیسەر بـ ڤەقەتیانێ حەسام وتا رادەیەکێ پاشڤە هاتمە ڤەو نهۆل رێ یەک ناڤنجی دگەرم.

**رامان: تو چاوا چیرۆکێ دنڤیسی؟ لسەرێک یان قۆناغ - قۆناغ؟**

**د.فاضل:** ئەز باوەرناکەم کەس کورتە چیرۆکێ قۆناغ -قۆناغ بنڤیست، لێ پرسیار بـ رەنگەک دی باشترە: تو چەند جاران یەک کورتە چیرۆکێ دنڤیسی تاکو قالبێ دوماهیکێ وەردەگریت؟ کورتە چیرۆکا من بویەرەکە، سەرهاتی یەکە، هزرەکە و نەدوورە خەونەک بت و ئەز دهێم قالبەکی دکەمە بەر و ئەڤ قالبە هەر

دگهۆرینێ دایە تاکو ئەز بەلاڤ دکەم، هەلبەت هەر قالب گهۆرینەکێ باندۆرا خوە لسەر ناڤەرۆکێ ژی هەیە، بۆ نمۆنە لـ ڤێ دوماهی یێ من دڤیا کورتە چیرۆکەکێ لسەر شەرێ خوە- خوەیی بنڤیسم من دو قەهرەمان لـ ژنەکێ ئاشق کرن... تاد. لێ من دیت ئەڤ قالبە گەلەک سادەیە و ناڤەرۆکێ ژی سادە دکەت، ئەڤجا من بیژنەک خودان بیرهاتن دروست کر و کەسەک لێ ئاشق کر و

پشتی چەند پێنگاڤان بیژن دل دخوەشی و ئەڤینێ دزانت ئاشقێ وێ نەمێرە! و ئەڤ زانینە دبتە ئەگەرا کوشتنا وێ بخوە... هۆسا ڤی قالبێ تازە ناڤەرۆک زەنگینتر لێ کر وهەڤرکی ژ ئاستێ کەسی دەرباز کرە ئاستێ مللەتەکی هەمی یێ، بـ کورتی ئەز کورتە چیرۆکێ لسەرێک دنڤیسم، لێ گەلەک جاران و هەرجارەکێ مرۆڤ هەڤبەندی یێن تازەتر ئاشکرا دکەت تاکو دگەهتە رێکێن گشتی کو هینگێ ژیان بـ هەمی ئالۆزی و بەرفرەهی یا خوەڤە دبتە کورتە چیرۆکەک و مرۆڤ درێست و رادچینت.

**رامان: پێوەندی یێت تە دگەل نڤیسەرا چاوانن؟**

**د.فاضل:** چونکی هەر نڤیسەرەکێ هەبت، چ بچووک چ مەزن، چ گەنج چ پیر ئەز وەکی ئاڤاهی یەک سەر بەخۆ لێ دنێرم ئو بـ ڤێ دیتنێ رەفتارێ دگەل دکەم، ئانکو ئەز نڤیسەرێ باش ونە باش، زیرەک وسست نابینم... ئەز بەرهەمێ خۆش و نەخوەش ، بەرهەمێ کەڤنەشۆپ ونوخواز دبینم... لەو تێکەلی یامن دگەل هەمیان باشە وئەز جهێ خوە دناڤ هەمی چێن رۆشنبیری یا کوردی دا، ل دەڤەرێ دبینم وئەز دێ ڤێ فلی یێ بۆ خوەکەم کو ئەز ئەزمانێ هەمی چڤان دزانم وهیڤی ئەوە هندەک برادەر ڤێ نەکەنە کەڤنەپەرێسی ودو رویاتی.

**رامان: قارەمانێت چیرۆکێت خوە تو فەرز ورەسم دکەی یان واقع وژیانا رۆژانە لسەر تەفەرز دکەن؟**

**د.فاضل:** نڤیسینا هەردەڤەک ئەدەبی، ئاڤاکرنەک تایبەتە دجیهانا هزرکی دا لێ چونکی ژدەرڤەی هۆش وهشیاری یا مرۆڤی دنیا هشک ومرارە وچونکی ژبلی ڤی زمانێ ئەم پێ دئاخڤین، ژبلی ڤان هەستێن مەهەین ئەم نەشێن چو ئالاڤێن دی یێن

تێک گەهشتنێ پەیداکەین، لەو ئەم نەچارین رەنگەک چاڤ لێ کرنا ژیانێ بکەین وئەڤە راستیەک تەحلە، نەخوە چیرۆکا دهێتە نڤیسین نەئەوە، ئەوا رۆژانە دقەومت، لەو قالبێ چیرۆکی ناڤەرۆکێ بەرچاڤ دکەت، ئەڤجا قەهرەمانی ژێ وێنە دکەت، کەس ب شیرو رم وتیروکڤانان لبەر کۆمپیوتەری راناوەستت هەکەر ژچەڤەنگی یێ دەرکەڤت...ئەڤجا وەکو ئەز بۆ دچم مێژووا چیرۆکێ ( مێژووا ناڤخوەیی یا بویەرێ) قەهرەمانی ئاڤادکەت وهەر قەهرەمانەکێ هوسا بهێتە ئاڤاکرن وەکی زینا ل چێلێ کری یە.

وەکو سەربۆرا من یا کەسانی، ئەز هزرەکێ دبینم یان قالبەکی ( هەلبەت هەردوژی دگهۆرینێ دانە) وب تەمام کرنێ چیرۆک ئاڤادبت ئانکو ژیارا دچیرۆکێ دا قەهرەمانی دیار دکەت نە ژدەرڤە دهێتە داڤکێش کرن.

## لڤان نێزیکا دێ کوما دوویێ یا کورتە چیرۆکا ئامادەبن

**رامان: رەئیا تە چی یە ب خەلاتێت ئەدەبی یێت جیهانێ؟**

**د.فاضل:** بەری هەر تشتەکی خەلات ئەدیبی دروست ناکەت، چونکی پشتی هینگی دهێت، ب گۆتنەک دی خەلات ئافەرینەکە دبێژنە نڤیسەرەکی ئەڤە تشتەک باشە. لێ مخابن ئەڤ خەلاتانە، گەلەک جاران، هندەک رێین دی نیشا مەددەن، ژوان کی یێ خەلات وەرگرت، هندە بوو گوپیتک و چۆ دامێ. یەک دی نڤیسەرەک هێژا هەیە و چونکی خەلات وەرنەگرتی یە ل رێزا دورسێ دادنن ...

کورت وکرمانجی خەلات رەنگەک پشتگیری وگەرم کرنا نڤیسەری یە، لێ مخابنی خەلکەک بۆ هندەک مەرەمێن دی ب کاردئینن. هەروەسا. وەکو تەمام کرنا پرسیارا تە، من دڤێت پێشنیارا خەلاتەک کوردستانی بکەم بۆ باشترین نڤیسارێن کوردی چ پرتووک، چ گوتار ئو ل هەمی ئالێن ئافراندنێ، وئەم دکارین ناڤێ خەلاتێ خانی لێ بکەین بۆ هەر نڤیسارەک هەژی وسالێ جارەکێ بهێتە دان... وهەکەر ڤێ پێشنیارێ جهێ خوەگرت دێ بتە هاریکاری بۆ نڤیسەران و نەدوورە هەڤرکی یەکا ئەدەبی ژی پەیدا بکەت... وئەم دکارین بکەینە خەلاتەک سەرانسەری بۆ هەر کوردەکێ هەبت.

**رامان: تە چ پێنگاڤ نەهاڤێتینە بۆ نڤیسینا رۆمانێ؟**

**د.فاضل:** ئەز دشێم بێژم من پێکۆل هەبوون وهەبوونە بۆ نڤیسیناچیرۆکێن درێژ ونهو بەردەستن، لێ هەردەما ئەز لێ ڤەدگەرم ئەز ساڤاتی یا وان دبینم وئەز خوە دووری ئاست وشیانێن رۆمان نڤیسینێ دبینم لێ ئەڤ راستی یێ ئەز سار نەکریمە وهیڤی یا من ئەوە ئەز بکارم رۆمانەکا کوردی بنڤیسم، لێ رۆمان بت. نەک چیرۆکەک درێژ... چاوا بت، ب دیتنا من قوناغێن ژیانا مللەتان تەرزێن ئەدەبی پەیدا دکەن و چو ژ ڤالاهی یێ ناهێت، چاڤ لێ کرن نەبت وچاڤ لێ کرن مەبڤێت نەڤێت خرشە.

**رامان: چ جیاوازی هەیە دناڤبەرا نڤیسینا کوردی ب تیپێت عەرەبی و تیپێت لاتینی و تەچ پەیڤ لدور ڤی بابەتی هەیە؟**

**د.فاضل:** هەچوەکو تەدڤێت مەژ جیهانا چیرۆکی دەرینی. ب کورتی و وەک ئەز بۆ دچم،ب کارئینانا تیپێن لاتینی نەبەس سەرهاتی یا هەست وسۆز دەربرینێ یە وکانێ کیشک چێترە... سەرهاتی ب رەنگەک دی یە. ب کارئینانا تیپێن لاتینی پەیداکرنا رەنگەک ڤەقەتیانێ یە دگەل کاودانێن مێژوویی وبەرەڤ ئاسۆیەک دی چۆنە. لەو گهۆرینا تیپێن لاتینی ب یێن ئەرەبی ب هشیاری یا مللەتی مەو بڕیارا سیاسیڤە گرێدایی یە.

**رامان: کێ پتر شیایە تەبو ئالێ خۆڤە رابکێشت ئەدەب وچیرۆک یان دختۆری؟**

**د.فاضل:** دختۆری ب رەنگەکی نەیێ دی شەڕ کرنە دگەل دەستوورو قانوونێن سروشتی ژبۆ بەرژەوەندی یا مرۆڤی ووەکی رەنگەک پاراستنا نفشێ خوە ئەز حەز ژ دختۆری یێ دکەم. وەکی دی ژیانا من یا دروست ،وەختێ من یێ هەری خۆەش ئەوە، دەما ئەز ب قەلەمی جیهانەکا دی دئافرینم وقەدەرا وی خەلکێ لێ دژیت دکەڤتە دەستێ من وئەز دبمە ئافرندە و دادوەر و ئاکامداریێ وێ دنیایێ، راستە ئاشۆپی یە، لێ باشترین دیاری یا هۆشێ مرۆڤی یە.

**رامان: تە چ پرۆژە لبەر دەستن؟**

**د.فاضل:** من هندەک نڤیسارێن کەڤن هەنە، هەکە وەخت هات من دڤێت نووژەنکەم.

چەند گوتارێن زمانی من کۆم کرینە وئامادەنە بۆ چاپێ.هەروەسا زمانێ سێ یێ ژی ئامادەیە.

من ل وەختێ خوە دوشانۆنامە وچیڤانۆکێن ئیسۆپ وەرگێڕاینە سەر زمانێ کوردی وهەکەر دلیڤە پەیدا بوو دێ بەلاف کەم.

وکۆما دووێ یا کورتە چیرۆکان ژی یا بەرەڤ تەمام بوونێ دچت هەروەسا من وهوزانڤان کاک محسن قوچانی پرۆژێ پرتووکەکێ لسەر رۆشنبیری یا کوردی هەیە، هیڤی ئەوە ب دوماهی بینین.

**د. فاضل عمر**

**- ل سالا ١٩٦٢لگوندێ( گرەش) لدەڤەرا سلیڤانی لقەزا زاخو ژدایک بویە.**

**- سالا ١٩٨٦ کولیجا پزیشکی ل زانکو مویسل بدیماهی ئینایە.**

**- سالا١٩٨٣ دەست ب بەلاڤکرنا بەرهەمێ ئەدەبی کریە.**

**- ئەندامێ دەستەکا گوڤارا ( دەنگێ مە) بو لدهوکێ ١٩٨٥ -١٩٨٩و ئەندامێ دەستەکا گوڤارا ( نوخازی) بو سالا ١٩٩٢- ١٩٩٣و نها ژی ئەندامێ دەستەکا گوڤارا ( پەیڤ)ە یائێکەتیا نڤیسەرێت کورد لدهوکێ... هەروەسا وەزیفا وی ژی دختورە ل خەستەخانا دهۆکێ.**

**لەسەر راسپاردەی رامان وەسفی حەسەن ئامادەی کردووە**

### هونەرمەند ئەحمەد سالار:

# هونەرمەند دەست بەچاوییەوە ناگرێ، هونەری بالاش ناتوانێ لە سیاسەت دوور بکەوێتەوە

***هونەرمەند ئەحمەد سالار ئەو ناوە دەرەوەشاوەیەی شانۆی کوردییە کە لە سەرەتای سالانی حەفتاوە بەبێ پسانەوە لە خزمەت کردنی شانۆی کوردی کەمتەرخەمی نەکردووە، لە پال ئەوەشدا بەردەوام وەک مامۆستایەک لە ئامۆژگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی خەریکی پێگەیاندنی قوتابیانی هونەری شانۆ بووە. سەرەڕای ئەوەش خاوەنی چەندان کتێب و سیپارەی جۆراوجۆرە لە بواری شانۆ، لەگەل ئەو مێژووە دووروودرێژە کە خۆی لە چارەکە سەدەیەک نووسین و دەرهێنان و نواندن و مامۆستایەتی دەدا، کەچی ئێستە ئەحمەد سالار لە ناوەندی هونەری ونە و وەک جاران ئامادەبوونی نییە. (رامان) بە پێویستی زانی دیمانەیەک لەگەل ئەو رابەری بواری شانۆیە بکات..***

ئەحمەد سالار: بەخێر هاتن ، سەر چاوان ، گەورەتان کردین

**رامان : بابە کۆپلەشیعرێکی جەنابت دەست پێبکەین ..**

ئەحمەد سالار :

**لەگەل ئەستێرە من ئەدوام — خەیالم هێندە بالا بوو**
**هەتا زنجیری ئـــەم ئەشقە — لەدەست وپێم نە ئالابوو**
**بەلێ من وا لە بەرچاووم — سەرنجی سەردەمی پێشوو**
**کە گولزاری تەماکانم — هەموو دەم ئال و والا بوو**

**رامان : زۆر باسی ئەوە دەکرێت کە – ئەحمەد سالار – بێدەنگ و بێ پرۆژەیە و خووی داوەتە سیاسەت، سیاسەت بە تەواوی بەربادی کردووە ، ئەمە لە ناوەندی هونەری هەموو کوردستاندا باس دەکرێ، دیارە ئەم باسکردنە لەبەر دەوری دیارو**

**ئیجابی خۆتە لە شانۆی کوردیدا، بەرپەرچدانەوەی بەڕێزتان بۆ ئەم قسەیە چییە ؟!**

**ئەحمەد سالار :** ئەوە خۆی گرنگی پێدان و بە تەنگەوە هاتنە ، بەڵام من ئەوەندە دەڵێم و هەرچەند دوو وتارم پێشکەش کردووە لە سەر پەیوەستی و پێوەندی تەواوەتی جەوهەری لە نێوانی «هونەر و سیاسەت »و «هونەرو فەلسەفە»خۆی سیاسەت هونەرە و هونەریش سیاسەتە، ئەگەر هونەرێک بیروباوەڕ و فەلسەفەی لە گەڵدا نەبێ و زەمینەی سەرەکی نەبێ ، هەرگیز ئەوهونەرە باڵا نەبێ ، واتە زەمینە فیکری و ئایدیۆلۆجییەکە و ئەو زەمینە فەلسەفییە شتێکی پێویستەو دەبێ هەر هونەرمەندێ خۆی لەسەر ئەم زەمینە نەبینێتەوە بەرو بوومی نابێ ، وەک ئەو درەختەی گەر رەگی نەبێ لە کوێ چاوڕوانی بەرو بوومی لێ دەکرێت ، من وابزانم واقیعێک لەم ساڵانەی دواییدا هاتە پێشەوە پتر بە بوونی سەپاندنی ئەو شەڕە ناوخۆییە قڕە ئاشووبەوە بوو کە دژ بە هەموو هەڵوێستێک و مەنتیقێکی ژیاری جوانی ژیانە ، وەک هونەروزانست و ئەدەب و وەرزش و هەموو ئەو شتانەی کە بۆن و بەرامەی هونەرو جوانی و ژیانیان لێ دێ ، ئەوانەی کە هەوڵ و بوون و گوڕو وزە بدەن بۆ بەرەو پێشەوە چوونی ژیان و گوزەران ، هەموو ئەوانە بەهۆی ئەو بارەوە کەوتنە خامۆشی و کەنارگیرییەوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من وە نەبێ دابڕ بووبم ،

مەحموود زامدار ـ ئەحمەد سالار ـ ئازاد عەبدولواحید

بەڵکو « گەواهی » زیندووم بە دەستەوەدیە ئەگەر بێت و لەدادگەدا دووشایەت هەبێ رەنگە من سەدان شایەتم هەبێ لەو بەرهەمە زیندووانەی کە هی ئەم ماوەیەشە ، چ لە تەلەفزیۆن یا لە سینەما ، یان نووسین ، دەیان وتارو کۆڕو لە سەروو هەموویانەوە دەقی شانۆییم پێیە کە خۆتان دەزانن دەقی شانۆیی ئاسان نییە وەک هەندێ بابەتی تر. کە بە چەند رۆژێ بنووسرێت دوا دەقیشم بریتییە لە «لە ژێر تارای سورمەچندا » کە کاملترین بەرهەمە نووسیبێتم، ویستوومە ئەوەی کە هەمووی تیۆرەو بۆ

تیۆردانان نەخشەم بۆ کێشابوو.. کە هەنگاو بوو بەرەو شانۆیەکی کوردی یا کوردستانی یا کوردەواری پوختەکەی لەم بەرهەمەدا رەنگی داوەتەوەو لەم ماوەیەدا نمایش دەکرێت، جگە لەوە لە تەلەفزیۆن و بابەتەکانی ترو بۆ رادیۆ و تێکرا لەم بوارانەی کە مەبەستیان بڵاوکردنەوەو پەخش کردنی هونەر بێ من بەرهەمم تیا بڵاو کردوونەتەوە، ئێستە ئەوەی لەبەردەستمایە دوا بەرهەمی نووسینمە بریتییە لە شانۆی ئەزموونگەری و کۆمەڵێ وتارە سەبارەت بەشانۆ، پتر هەنگاوە نوێیەکان لە شانۆی جیهانیدا، بەستنەوەی خۆمان بەرەوتی شانۆی جیهانییەوە، لەبەر ئەوە من سوپاسی ئەوکەسانە دەکەم کەوا بەتەنگ هونەرەوە دێن، هاتوون لەگەڵ مندا واقیعێکی گەورە هەیە ناتوانم تەریک بم لەو واقیعەدا، ئەو واقیعە هەمووماني لە ئامێز گرتووە، منیش ئەزموونێکم هەیە لەو واقیعە گەورەدا، لەبەر ئەوە گەربێتوو لە بەراوردا بیلبۆگرافیای ئەو بەرهەمە شانۆییانەی کە کورد پێشکەشی کردووە یەکێک لەو بەرهەمانە بۆ نموونە «**فایەق عومەر تۆفیق**» لە شاری سلێمانی تاوەکو ساڵی هەشتاکان وابزانم گەر زێدەرۆییم نەکردبێ رەنگە ٧٠٪ی ئەو بەرهەمانە راستەوخۆو ناراستەوخۆ پێوەندی بەمنەوە بووبێ چونکە «٤٢» بەرهەمی دەرهێنمنی تێدایە، جگە لەوە وەک نووسین چ وەک ئەکتەر.. دەرهێنەر.. نەخشەکێش، چ دیکۆر و لایەنەکانی ترو سەرپەرشتی هونەری، زۆربەی ئەو بەرهەمانەم کردووە، بەڵام گەر بێتوو بەراوردی بکەی بەم ساڵانەی دوایی هەر دەبینین مەودایەکی زۆر فراوان هەیە لە نێوانیاندا، ئەوەش لەوانەیە فراوانی ئەو نێوانەیان بێ، لەگەڵ ئەوەشدا دابڕ نەبووم و بەرهەمم پترە لە هەموو ئەوانەی لە شانۆی کوردیدا کاردەکەن..

ئەحمەد سالار قوتابی ئەکادیمیای هونەرەجوانەکان ـ ١٩٦٩

**رامان: وەڵامی -بۆ بێدەنگی- تەقریبەن وەڵامت دایەوە، ماناى کە شوهەواکەی هی ئەوە نەبووە کە هونەری تیا نەشونما بکرێ و کاری هونەری تیا پێشکەش بکرێت، بەڵام باسی کۆمەڵێک کاروبەرهەمی ترت کرد، ئایا لەو کارو بەرهەمانەی پێشووت و ئەوانەی ئێستەش خەریکیانی، هەوڵت داوە شێوازی تایبەتی خۆت هەبێت، یان شێوازی چارەسەری خۆت لەم بوارەدا هەیە؟**

**ئەحمەد سالار:** لەسەرەتاوە من بەتایبەتی لە ساڵانی حەفتاوە دەمویست شێوازێکی کۆمیدی تایبەت ئەنجام بدەم، ئەو هەوڵەم لە دامەزراندنی تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردیدا بوو تا بتوانم شێوازێکی تایبەتی لە هونەری کۆمیدی دروست بکەم، ئەوە بوو ئەو هەنگاوە لە چەندین ئەکتەر کە بەو بوارە ناسران رەنگی دایەوە، بەڵام دوای ئەوەش سەردەمێکی دی هاتە پێشەوە لە ئاکامی

> **هونەر خۆی سیاسەتە، ئەگەر هونەر سیاسەتی لەگەڵدا نەبێ ئەو هونەرە باڵا نابێ**

مامەڵەیەکی زۆر لەگەڵ دەقە بێگانەکاندا، پتر دەقە کلاسیکییەکان لە بەرهەمە جیهانییەکان لەوانە دەیان بەرهەمم پێشکەش کرد لە هی بێگانە و عێراقی و عەرەبی، لە ساڵەکانی هەشتاوە گەیشتمە ئەو راستییە کە پێویستە ئێمەش رەنگ و رواڵەتی خۆمان هەبێت، چونکە ساڵەکان بەرەو ئەوە دەچوون رەنگ و رواڵەتی خۆمان بزر بێت، بۆیە رەنگ و رواڵەتێکی نوێ لە کۆمەڵێ شانۆوە بۆ نموونە:

لە «نالی و خەونێکی ئەرخەوانی» دەست پێ دەکات، **«کاتێ هەڵۆ بەرز دەفڕێ»**، پاشان لە **«کێشەی چوون و نە چوون یان گریان نالی دێتەوە»** یا **«جەزیری وانەی ئەڤین دادەدات»** هەروەها لە **«شەهێن لە سەختەندا هێلانە دەکات»**و **«ئەو دەمەی ئەڤین مەزنتر دەبێ»** و دوابەرهەم کە بریتییە لە **«لە ژێر تارای سورمەچندا»** هەموو ئەمانە هەوڵدانە بۆ شانۆیەکی کوردەواری و هەڵێنجانە لە کەلەپوری کوردییەوە-بەواتا فراوانەکەی- ئێستە بەرەو ئەوە دەچم تەنانەت زمانی کوردی تایبەتمەندی تیا دەبینم، هەروەک چۆن (**کۆرنێ و راسین**) لە شاکارە شانۆییەکانیاندا شانازییان بە زمانی فەرەنسی دەکرد، منیش بروام هەیە کە زمانی کوردی گەلێ باڵایەو زمانێکی راستگۆیە بۆ دەربڕین و تێگەیشتن و گەیاندن، بەتایبەت لە دەربڕینی ناخی مرۆڤ، کۆمەڵێ دەنگمان هەیە، ئەو دەنگە تایبەتیانە کە پێوەندی بە بوونی نەتەوەی کوردوباری ژیان و گوزەرانی کوردەوە هەیە رەنگدانەوەی زوبان و هەمووشتەکانی تریش پێوەندی بە بارو گوزەرانەکەوە هەیە، بەتایبەتی ئێمە کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵی و هەرەوەزکاری بووین، هەمووشتێ بە کۆمەڵکاری بووە، پێویستە ئێمە لەمانە هەڵهێنجین لە -**بووکە بەبارانێ**- وە لە -**کۆسەبەبە**- و ئەوانی تر کە هەمانە. لەو کۆمەڵگە کشتوکاڵییە کوردییە هەرەوەزییە زۆرشت هەن کە زمانەکەی دەوڵەمەند کردووە، پتر وای لە زمان کردووە کە بۆنی خاک و ژیانی لێ بێ، جگە لەوەی زمانێکی شیرینی مۆسیقا ئامێزە..

**رامان: کەواتە بۆ دامەزراندنی شانۆی کوردی و دەستنیشان کردنی شانۆی کوردی بەرای ئێوە لە دەقەوە دەست پێ بکەین یا لە دەرهێنان یا لە هەردووکیان؟**

**ئەحمەد سالار:** سەرەتا دەبێ دەق بێ؟

**رامان: مانای وایە دەبێ رووئیا موتەکامیل بێ..**

**ئەحمەد سالار:** ئەو شتانە پێکەوە بەستراوون، ئێمە لە ئەزموونەکانی جیهانیدا بۆ نموونە گەربێتوو سەیری بەرهەمەکانی -**پیتەر فاییس**- بکەین یا **مایرهۆڵد** -دەبینین- ئەوانە شێوازێکی نوێیان وەک -برتۆڵد بریخت- هێناوەتە ئاراوە زۆربەیان دوو شتیان پێکەوە بەستۆتەوە، دەق چاوگێکە بیناسازییەکەی لەسەر دەکرێت، لە هەمان کاتدا شێوازیشە، چونکە پێوەندی توندوتۆڵی جەدەلی لە

## شەڕی ناوخۆ دژ بە هەموو مەنتقێکی ژیاری و جوانی بوو

نێوانیاندا هەیە، و ئەو کەرەستەیەی بەکاری دەهێنێ، خۆی لەو شێوازەدا دەبینێتەوە کە تێیدا کاردەکات، واتە بۆ ئەو نووسەرانە کە ئەو شێوازەیان بەکارهێناوە دەقەکە هاوشان بووە لەگەڵی، ئێمە ئێستە لەم قۆناغەکەدا کە پتر لە (٧٠)ساڵە هەوڵدان هەیە بۆ شانۆی کوردی و لە پاش بەیانی (١١)ی ئازارەوە «ساڵی ١٩٧٠»کورد هەنگاوی گەورەی ناوە، تا لەسەر بوار و ئەرشیفەکانی پیشەمەندی و تایبەتمەندی، شانۆی ئێمە سەری هەڵدا، پاشان لە هەشتاکان هەوڵ درا ئەزموونە نوێیەکان بێتە ناو شانۆی کوردییەوە لەرێی ئەو گەنجە خوێن گەرمانەی کە دەیانویست برەو بە شانۆی کوردی بدەن..

**رامان: ئەی بۆ شانۆی وێنە چی دەڵێن، وەک ئەزموونی -سەلاح قەسەب- کە (دەسەڵاتی دەق) بەتەواوی نامێنی و (دەسەڵاتی ئەکتەر) جێی دەگرێتەوە..**

**ئەحمەد سالار:** بەڵام زەمینەیەکی دیار هەیە لای ئەو کە بریتییە لەو سیناریۆیەی کە (دەقە)کە پێش ئەوەی (**وێنە**)بێ، بۆیە ئەو دەقە لە تێکستی شانۆیی جیاناکرێتەوە، سەلاح قەسەب سکێچەکانی دەقە، کە هاتووە بۆ نموونە: کە **-ماکبێث-** ی کردووە کە یەکێکە لەبەرهەمەکانی شکسپیرو بنچینەوبنەمای خۆی هەیە، جگە لەوە دەق بیرو بۆ چوونە و هەموو دەقێ فەلسەفەیەکی هەیە بێ فەلسەفە(دەق) بوونی نییە..! دەرهێنانیش -بەرلەبەرجەستەکردن- بینینەوەیە..

**رامان: باشەی ئەی ئەو ئەزموونەی قەسەب بۆ ئەمڕۆی شانۆی کوردی دەست دەدا؟**

**ئەحمەد سالار:** ئەوە ئەزموونێکی نوێیە، بوونی خراپ نییە، بەڵام مەرج نییە ئەوە بەسەر شانۆی کوردیدا تەعمیم بکرێ، ئەوە یەکێکە لە هەوڵەکان، وابزانم ئەوەی سەلاح قەسەب زۆر نەژیا، ئەزموونەکانی زۆربەیان ئەوەی -پیتەر فایس- زیندووە و بە خێرایی نییە دەرهێنەرە گەورەکانیش دوایی ئەوانە دەکەون چ **-مایرهۆڵد-** یا ئەوانەی **-برێخت-** ئێستەش دەنگێکی هەرە گەورەیە لەسەدەی بیستەمدا..

بۆیە هەندێ جار هونەرمەندی ئەزموونکار لەمەشقدا بەردەوامە، لە هەموو مەشقێک و شتێکدا بینینەوەیەکی تێدایە، ئەو وێڵی ئەو بینینەوانەیە تا بتوانێ شێوازێکی نوێ بێنێتەکایە...

یەک راستی هەیە دەبێ بیلێین، ئەزموونگەری رێباز نییە، ئەزمونگەرێتی هەوڵی بینینەوەیە، تەوژمیش نییە، بەڵام خولیایەکی زیندووی پیرۆزە لە هەستی هونەرمەندا بۆ داهێنان، کە شوێن پێ هەڵگریی و شێوازە لاساییکارەکان بە جێ دەهێڵێ و دەیەوێ خودی خۆیی و کەسایەتی خۆی لەو داهێنانەدا ببینێتەوە و ئەوەش کاری هونەرمەندی بەتوانایە..

ئەحمەد سالار و خوشکەکەی لەگەڵ باوکیدا

**رامان: ئەگەر کاری دامەزراندنی شانۆی کوردی بریتی بێ لە دەق و دەرهێنان، یان دەرهێنەرەکە خۆیشی دەق بنووسێ، ئەی ئەگەر دەرهێنەر روئیای هەبێ و نەتوانێ دەق بنووسێ..؟**

**ئەحمەد سالار:** زۆربەی ئەو ئەزموونانەی لە جیهاندا هەن بەتایبەت با بڵێین لە شانۆی کۆنیشدا و لە شانۆی یۆنانیەکاندا، یۆرپیدس و ئەسخیلۆس و سۆفۆکلیس و ئەرستۆ فانیس و ئەمانە کە باشناخ ترین نووسەرەکانی سەردەمەکەیان بوون و ئەوانە کارەکانیشیان دەرهێناوە و رۆڵی سەرەکیشیان بینیوە، پاشان لە سەردەمی (**ئەلیزابیث**)دا شەکسپیر و مارلۆ و پاشان لە سەردەمەکانی تریشدا لای مۆلیر و کەسانی تر هەمان شێوە دەبینینەوە ،بەڵام پاشان ئەو شێوازە رۆی، بەوەی کە پسپۆڕێتی و تایبەتمەندی لە بوارەکانی هونەردا هەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ کەس لەبەر ئەوەی شارەزای هەردوولاکەن سەرکەوتوترن، ئەگەر نووسەرێکی شانۆیی شارەزای لە تەکنیکاری نووسینی شانۆیی بێت ئەوە باڵادەستترە، چونکە دەق کە دەنووسرێ، شانۆیی بۆ خوێندنەوە نییە، دەقی شانۆیی بۆ پیشان دانە، ئەو کاتەش تەواو دەبێ کە بەرامبەر بینەر پێشکەش دەکرێ و بینەر بوونی تێیدا هەیە، واتە جیاوازە لە هەموو بابەتێکی تر و، بۆیە لەسەرووی دەقەوە، دەقێکی تر هەیە کە دەقی دەرهێنانە، ئەو دەقە نووسەرەکەی خۆی هەیە، هەندێ جار لە نەبوونی نووسەرەکە دەرهێنەرەکە تەواوکەرەوەیەتی، بەڵام پێویستیشە دەرهێنەر لە سپاردەکەیدا دەستپاک بێ..

**رامان: تۆ لەو باوەڕەدای کە دەستەی شەماڵ عومەر و ئەوانەی تر شتێکیان هێنابێتە کایەوە، وەک جەنابت فەرمووت -سەریشی نەگرت-، ئەی شانۆی -بێهوودەیی- بۆ شانۆی کوردی دەس دەدات؟!**

**ئەحمەد سالار:** مەرج نییە کت ومت وەریبگرین، بەڵام هەندێ لایەنی هەیە سوودی لێوەردەگیرێ، من -توندوتیژی- و -تۆمارگەیی-- و بەیت ئامێزی برێختی و هەموو شێوازەکانی تریش سوودم لێوەرگرتوون، بەڵام مەرج نییە وەکو خۆی بێنم بیکەمە کوردی، چونکە جیاوازیەکی زۆر لە نێوانماندا هەیە، ئەو هەوڵانەی گەنجە خوێن گەرمەکانی وەک -شەماڵ عومەر- و دانا رەئووف- و.... مەرج نییە تەنیا لاساییکردنەوەی وێنەیی بووبن، بەڵکو ئەوانە هەندێ تایبەتمەندی خۆیانی تیا بوو، شتەکانیان رەنگ و رواڵەتی کوردی تیا بوو، بە تایبەتی هەڵێنجان لە کەلەپووری کوردی و بەیت و ئەفسانە کوردییەکان کە لەبەرهەمەکانی خەج و سیامەندو کارەکانی تردا دەبینرێنەوە، زۆر ئاساییشەکە مرۆڤ بوو بە مامۆستا رەنگە قوتابییەکەی ماوەیەک لەسەر رەوتی مامۆستاکەی بەردەوام بێت و دوایی خۆی لێ

دەرباز بکات، ئەو جیابوونەوەیە کەسایەتی تایبەتی بۆ خۆی دروست دەکات

**رامان: ئەی جەنابت بڕوات بە ململانێی قوتابخانە شانۆییەکان هەیە؟**

**ئەحمەد سالار:** بەڵێ..

**رامان: لەبەرچی؟**

**ئەحمەد سالار:** ئەگەر رای تیۆردۆزەکان وەرگرین لە پشت ئەو رەخنانەوە کەسانێک هەن، نابێ نکۆڵی لە دەوری تاکە کەسی بکرێت کە لە بوونی ململانێ دەوردەبینێ و ململانێش ئەگەر نەبووایە مەنگی و راوەستان دەبوو، هونەری کوردیش لە هەشتاکانەوە شتێک کە برەوی پێدا لە نێوان کۆمەڵێ خەڵکیدا چ لە خوێن گەرمەکان یا لە کەسانێکی تریش کە رەگیان رەنگە پتر داکوتابێ و ئەو دیاردەیە بووە هاندەر بۆ ئەوانە و ئەوانی تریش تا بتوانن گوڕبدەنە خۆیان..

**رامان: هونەرمەند ئەندامێکە لە کۆمەڵەکەی، ئایا بە چاوی کۆمەڵەکە سەیری ژیان دەکا یان بە چاوی خودی خۆی وەک هونەرمەندێک..؟**

**ئەحمەد سالار:** هونەرمەند لەو جۆرە نییە کە چووە شاری کوێرانەوە دەست بە هەر دووچاوییەوە بگرێ، ئەو بینینەی کە دەیبینێ هەستدارترە لە کەسانی تر و رۆڵێکی پێشڕەوایەتی هەیە و وەک کەسانی تر نییە، (گۆران)ی مەزن کە هات و ئەزموونەکانی خۆی دەرخست، زۆر کەس لە مەزنێتیەکەی نە دەگەیشتن، چونکە لە ئاستیدا نەبوون گاڵتەیان پێ دەکرد، بەڵام ئەو هەر بە پێشەنگیی مایەوە..

**رامان: ئەوە مەیدانی شیعرە، ئەی لە مەیدانی شانۆدا جەنابت هیچت کردووە؟**

**ئەحمەد سالار:** شتم کردووە، بەڵام ئەوەی لە ناخمایە هەمووی نەموتووە.. گۆرانییەکە کەمی چڕاوە..

ئەحمەد سالار لە ١٣ ساڵیدا

**رامان: کامە بەرهەمی خۆت زیاتر بەلاوە پەسندتر و جوانترە؟**

**ئەحمەد سالار:** دوا بەرهەم ... بەڵام «نالی و خەونێکی ئەرخەوانی» بە کەمترین ماوە نووسیوومەو زۆر شیرینە لام، ئەو کارە سەدان لاپەڕەی لە سەر نووسراوەو سەدان سەعاتیش چەند و چوونی لەسەر کراوە، بەڵام هەر دوا بەرهەمم لاشیرینترە کە سەرناوەکەی «لە ژێر تارای سورمە چندا.. دایە»

**رامان: باسی ئەوەت کرد کە نووسەری شانۆ دەبێ کەلەتەکنیک و کون و کەلەبەرەکانی شانۆ شارەزابێت، ئایا نووسەری وامان لەم بوارە دا هەیە؟**

**ئەحمەد سالار:** ئەوانەی کە دەقیان نووسیوە جێگەی رێزن، چونکە لەسەردەمێکدا نووسیوبانە هەم بەتوانا بوون، هەم ئازاش بوون، رەنگە

هەندێکیان ئەگەر بەو پێوەرەی ئاستی ئەمڕۆ هەڵیسەنگێنین باش نەکەوێتەوە، بەڵام ئەوانە گرنگی خۆیان هەیەو لە بایەخی مێژوویان کەم نابێتەوە، هەندێ دەقی تر هەیە لای (گۆران)و کەسانی تر، بەڵام کارەکان هەمووی بە هەنگاوێک نەڕۆییون، ئێمە شتەکانمان بۆ گرێیەکی دەروونی تایبەت گەڕاوەتەوە، لەبەردەماندا ڕێگر بووە... کیانی سیاسی کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر ئەدیب و هونەرمەندە گەورەکانیش کە داهێنانیشیان کردووە ویستویانە گرێیەکی دەروونی زۆر کە لە ئەستۆیاندا بووە بیکەنەوە، ئەدەب و هونەر جێگرەوە بووە بۆ کۆمەڵێ شتی تر کە لە نەبوونی کیانە سیاسییەکە دەکەوێتەوە، ئەو گرێیە، گرێی نامۆبوونی هونەری کوردە، لە نێو نووسەرانی کوردا دەیان ناو هەیە وەک (حەمەکەریم هەورامی) و (عەبدولڕەزاق بێمار)و (سمکۆ ناکام)و (تەڵعەت سامان) (فوئاد مەجید میسری)و (عومەری عەلی ئەمین)و (دڵشاد مەریوانی) شەهیدو زۆر نووسەری تر کە رەنگە ئێستە ناوەکانیانم لەیاد نەبێ...

## بۆ دامەزراندنی شانۆی کوردی دەبێ لەدەقەوە دەست پێبکەین

**رامان: ئەی بەڕای جەنابت چ پێوەندیەک لە نێوان بابەت و گرێ چن (حبكە)دا هەیە؟**

**ئەحمەد سالار:** یەکێک لەو بایەخانە کە بابەتەکەیە، ئەو بیرۆکەو چیرۆکەیە کە دەیگرێتە خۆی و مەبەستێکی فەلسەفی خۆیشی لە ناخدا هەیە، ئەو گرێ چنە یەکێکە لە کەرەسە درامییەکان و دەشبێتە هۆی چێژ راکێشانی بینەر، پەیوەستیشە بە ململانێ و هێڵی فرمانەکە و بەرزبوونەوەو نزم بوونەوەی رووداوەکەوە، دوایی بەرەو ئاکامێک دەڕوات، ئەرستۆ لە هونەری شیعردا بە فرمانی تەواوەتی ناوی دەبات، دەست پێ کردن و ناوەڕاست و کۆتایی هەیە، هەرسێ قۆناغەکەی تیادەبینێتەوە، کە پەیوەستی بابەتەکەیە ئەو سێ قۆناغە، یەکێکە لە تەکنیک کارییەکانی دارشتن، لاوازی ئەوە دەبێتە لاوازی شانۆییەکە، ئێمە لە زمانی شانۆیی پێی دەڵێین.. (رووخا) واتە ئەو پردەی کە لە نێواندا هەیە و لەسەرەتاوە بە هەموو هۆیەکەوە لە بینراوی سەرەتاییەوە کە (دیمەنی دەسپێکردنە) تا وا لەبینەر بکەی کێشەیەکی بخەیتە بەردەم و لەوێدا هێڵی ململانێیەکە دەردەکەوێت، وای لێ دەکەی رایکێشی بۆ بەردەوام بوون، ئەو چێژەش وردە وردە دەیدەیتێ، وەک چۆن کێکی شیرینت هەیە بیدەی بەمنداڵێ بەیەکجار بیدەیتێ چێژەکەی لێ کەم دەبێتەوە و دوای ناکەوێ...!

**رامان: کەواتە وەک ستانسلاڤسکی بیر دەکەیتەوە..؟**

**ئەحمەد سالار:** ئەویش لەمەدا ئەو پەڕی ئەرستۆییە و ئەو پەڕی پەیوەست بوونە

به شێوازەوە و -برێخت-یش، ئەوەی کە زۆر گرنگی پێداوە، چێژبیەتی، کە بە هەموو هۆیەک بەکاری هێناوە و ئەو چێژە چێژی راکێشانی بینەرە، چونکە هەموو هۆکارەکانی دەرهێنان کە بەکاردێت، خولقاندنی کەشی دەروونی گشتی هەمووی بۆ ئەوەیە وا لە بینەر بکەی دوای بکەوێ -حبکە- گرێچنکەش فتبۆلێکە، تۆپێکە لە یاریگاکەدا کە چاوی سەیرکردن بەدواوەی دەبێت..

**رامان: مانای لەگەڵ ئەم رایەی ستانسلافسکی-دای کە دەڵێ هەر کاتێ لە هۆڵی شانۆدا پەردە هەڵدرایەوە ئەوساتە وا لە بینەر دەکەین توند دەیگرین و وای لێ دەکەین خۆی لە بیر بچێتەوە، ئێمە بۆ ناو جیهان و کە شوهەوای خۆمانی رادەکێشین؟**

**ئەحمەد سالار:** من لێرەدا لەگەڵ ئەوجیا دەبمەوە، من ناڵێم خۆی ببیر بچێتەوە من لێرەدا لەگەڵ -برێخت- م، چونکە نامەوێ بینەر خۆی بیرچێتەوە، شانۆ شانۆی گۆرانکارییە نەک لێکدانەوە، نەک ئەو شانۆییەی کە ماوەی چەند سەعاتێ لە کەشێکی دەروونی تایبەتیدا، ئەو مرۆڤە لە هەموو شتێ دابڕ بکەم، بەڵکو دەمەوێ لەوێوە ژیانە ئاڵۆزەکەی خۆی جارێکی تر بەبیر بهێنمەوە کە چۆن گۆڕانکاری تێدا دەکاتەوە، لەبەر ئەوە پێویستە زوو زوو وریا بکرێتەوە ، من لە شانۆییەکەدا ئەو هۆیە نامۆبوونانەی کە ئەو بەکاری هێناوە من کەرەستەی ترم یانزیکترم بەکار هێناوە، چونکە مەبەستمە ئەوە رووبدات، لێرە دووبارە ئەوە دەڵێمەوە رووداوەکە، بابەتەکە کە پەیوەستە بەو حبکەیەوە وەک فتبۆلێکە لە یاریگەیەکدا، خەڵک دوای فتبۆڵەکە دەکەوێ و دوای فلانە یاریکەر ناکەوێ، فتبۆڵ لە کوێ بوو بینەر سەیری ئەوێ دەکا، ئەوە حبکەکەیە، ئەگەر چووە ئەودیو یاریگەکەوە سەیر ناکرێت، کە تۆپەکە چووە ناوەوەو کەوتە یارییەوە ئەوسا بەدوایەوە دەبن ، ئەو دابڕبوونە کە ببێ (رووخانی) شانۆیەکەیە لەبەر ئەوە دەبێ ئەو هونەرمەندە بە وریایی ئاگاداری ئەو لایەنە گرنگە ببێ..

ئەحمەد سالار بە ساوایی

**رامان : هەن دەڵێن شانۆی -پیکیت- رەنگی نائومێدی کوشندە ناداتەوە، بەڵکو مرۆڤ بانگ دەکات تا بەوردی لەم جیهانە جەنجاڵە بکات و ترس و ئەوهامەکانی خۆی کە دەبێتە هۆی نائومێدی بەرەوێنێتەوە، بە تایبەتی کاتێ کە بۆی روون دەبێتەوە ئەو جیهانە هیچ مانایەکی تێدا نییە، تۆ چۆنی بۆ دەچی؟!**

**ئەحمەد سالار :** سەرهەڵدانی ئەو جۆرە ئەدەبەی کە -پیکیت و سارتەرو کامۆو تارادەیەک-کافکا- شی لە خۆ گرت، ئەوە لە سەرەتاوە لەرۆچوونی ئەو بایەخانەی کە جەنگ هێنای بەسەر چەمکە پیرۆزە مرۆڤایەتیەکاندا،

## ئەزموونە نوێیەکان لە ڕێی لاوەکانەوە هاتنە ناو شانۆی کوردییەوە

وەک ڕەنگدانەوەیەکی ئەو ڕۆچوون و وێرانکارییە، ئەو فەلسەفە و شێوازو قوتابخانە هونەرییە سەری هەڵداوە، لەوەدا پێکەنینێکی تێدایە جیاوازە لە هەموو پێکەنینەکانی کە زانایەکی وەک (برگسۆن) لە فەلسەفەی پێکەنین دەست نیشانی دەکات، یەکێ لەو پێکەنینانەی کەمەبەستمانە باسی بکەین، ئەوەیە کە بۆ نموونە «لە چاوەڕوانی گۆدۆ» دایە، گۆدۆش نایە بەڵام چاوەڕوانن، کلۆڵی و کوێرەوەری تێدا دەبینی، یا لە (کورسیەکان) لای یۆجین یۆنسکۆ لە (پرۆفیسۆر)دا ئەمە خۆی لە خۆیدا لە ناخ و قوڵایی ئەم کۆمیدیایەدا چاوگێکی تراژیدیایی هەیە، ئەو قوتابخانەیە ڕەنگدانەوەی ئەو واقیعەیە..

ئەو دەمەتەقێیە لەو شانۆییانەدا هەیە خەڵکێ وا دەزانن بە ساکارانە داڕێژراوە، بەڵام دایەلۆگ، لە شانۆی ناماقووڵدا لە هەموو لایەنێکی تر گرنگ ترە، چونکە لە نێوانی ئەو وشانەدا هەندێ جار هەست بەنەبوونی مەنتیق لە پەیوەست بوونیا دەکەی، ئەوە بارێکی کۆمیدی هەیە و هۆش دەجووڵێنێ و ئەو هۆشە بەراوردی ئەو مرۆڤەی پێشترو پاشتر دروست دەکا، بۆ نموونە : لە چاخەکانی ناوەڕاست بەستەڵەکێکی بیرو بۆچوون لە هەموو شێوازەکانی ئەدەب و هونەرو لایەنە فەلسەفییەکاندا هاتە پێشەوە بە درێژایی چەند سەدەیەک و پاش ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی تا دەگاتە ڕینیسانس، ئەو سەردەمە بەستەڵەکێ دروست بوو، لە سێ کوچکەیەکدا هەمووی بەرێوە دەچوو کە بریتی بوو لە شێوازی ئۆرۆستۆکراتیزم واتە موحافیزی و موحافیزی دەیەوێ ئەوانە پەیوەست بکات، ئەو ڕاگیرییە لەوەدا دروست بوو، بەڵام گۆڕانکاریی هات و شێوازەکەی گۆڕی و سەرهەڵدانێکی تر دروست بووەوە لە مایەی، ئەو بەستەڵەکەوە سەر هەڵدان دروست بوو، ویستی بەسەر شارستانیەتی یۆنان و گریک و ڕۆماندا بەراوردیی دروست بکاتەوە کە هونەری باڵا هەبوو، ئەگەر ئەو بەستەڵەکە نەبووایە ئەو بەراوردە نەدەهاتە دی، - مایکڵ ئەنگیلۆ و داڤنشی و ڕافائیل و دەیان بلیمەتی تری وەک ماکیاڤیلی و دەیان ناوی تر کە لە بوارەکانی تری شیعرو شانۆدا هاتنە کایەوە، ئەلیزابێتیش بە کریستۆڤەر مارلۆ و بن جۆنسن و تۆمارکیدو ولیەم شکسپیر و ئەمانەوە دەستی پێکرد، کەواتە : لەدایک بوونی ئەو بەستەڵەکەیە، ئەوان لەوپەڕی شارستانیەتەوە کە ئەورووپای ڕۆژئاوا باڵاترین شوێنەواری ڕینیسانس و هەموو شۆڕشە پیشەسازییەکان بوو بۆ وای لێهات وێرانکاری وا ڕوویدا؟ ئەمە خۆی لە خۆیدا باشترین مەحکووم کردنی زەبرو زەنگ و شەڕو شەڕەنگێزییە لەو سەردەمەدا، هەندێ بۆچوون دەڵێن لەگەڵ ڕۆچوونەکەدا ڕۆچوون، بەڵام گوزاریشتە لەو حاڵەتە دڵ ڕەقەی بەسەر مرۆڤایەتیدا هاتووە ..

**ڕامان : کەواتە ئەو ژیانە جەنجاڵە لای تۆ چ مانایەکی هەیە ؟ وەک لای عەبەسیەکان وایە ؟**

## هونەرمەندی ئەزموونکار لە مەشقدا بەردەوامە، بۆیە وێڵی بینینەوەیەکە شێوازی نوێی تێدا بێ

**ئەحمەد سالار :** ئێمە گەر بۆ مەنتیقە ناماقووڵییەکە بگەڕێینەوەو بچینە قووڵایی زیاتری وجودیەتەوە، یا بۆ تیۆرەکانی کە لە بوارەکانی ئایدیالیزمی فەلسەفەو دەروونناسی و بوارەکانی تردا دانرا بگەڕێینەوە بۆ کیرککگاردو پاشان بۆ فرۆید ئەمە رەنگدانەوەی دەگەڕێتەوە بۆ بیرکردنەوەی مرۆڤ ، ئایا مرۆڤ بێ بیر کردنەوە دەبێ، بیر کردنەوە خودی ژیانە، بۆیە دابڕ بوون نییە لە ژیان، بەڵام بێهوودەیی یەک لایەنە

بۆ چوونە ، کە ژیان پردێ بێ لە نێوان دوو نەبووندا، لێرەدا بێهودەیی دەتخاتە ئەوەی بێ فەلسەفە بی لە ژیان، ئێمە لێرە ناکۆک دەبین چونکە بوون کە بەردەوامی هەیە ئەو بەرهەمە دەنووسی مانای بوونت هەیە، بیر دەکەیتەوە..

**رامان :کەواتە : وەک دیارە تۆ بڕوات بە فەلسەفەی مارکسیزم هەیە ؟**

**ئەحمەد سالار :** بەڵێ چونکە، وتەیەکی ماکیسم گۆرکی هەیە لە شانۆی لە قولاییدا یا لە (ناخ)دا پرسێک دەکا کە بۆ ئینسان دەژی ؟! ئەو پرسیارە دەکات و نموونە دەهێنێتەوە وەرامێکی دەداتەوە، کەی وەرامی دەداتەوە؟ کە کەیل دەبێت خۆی (ساتین) پرسیار دەکات و وەرامێکی پڕ بە پڕی بارەکە دەهێنێتەوە کە ئەو وەرامە لە ناخی ( لەو گۆرگییەی کە تاڵاوە نازناوەکەی ) هەڵقووڵاوە دەڵێ- مرۆڤ دەژی بۆ ئەوەی ژیان جوانتر بکات : واتە مەبەستێک هەیە و ئەرکێکی لە ئەستۆدایە و ئەرک لە ئەستۆ نانیش مانای فەلسەفەیە، ئامانجێک و مەبەستێک بۆ جوان کردنی ژیانە، کوردوتویەتی بزن بۆ شەوێک جێی خۆی خۆش دەکات، کە دەزانێ شەوێکەو بەیانی سەردەبڕدرێت جێی خۆی خۆش دەکات ، بەڵام مرۆڤ کە خاوەنی سەرمایەیەکی زۆر مەزنە ..

**رامان : بەڵام برا بزن نمایش ناکات، بزن و شانۆ کوجا مەرحەبا ؟**

**ئەحمەد سالار :** دەڵێی مەرحەبا چونکە تراژیدیا واتە گۆرانی بزن وەبوونی بزن و کەوڵە بزن پۆشین لەداب و نەریتەکانی سەر هەڵدانی شانۆ بووەو هەر لە رووی پیرۆزییەوە بزنێکیان خەڵاتی سەرکەوتووی پێشبرکێی - دیۆنیزیۆسی- دەکرد..

**رامان: ئەم بەستەڵەکە کە لە شانۆی کوردیدا هەیە تۆ گەشبینی بەوەی ئەنجامی باش و گەورەی لەدوابێ.. ؟**

**ئەحمەد سالار :** بەڵێ ئەم بەستەڵەکەی کە ئێستە هەیە پاش ئەوە رووداوێ روویدا کە لە خەونیشدا بەلای خەڵکەوە نەبووە، تووشی ئەوە هات وەک ئامادەنەبوون بۆ وەرگرتنی ئەو بارە نوێیە ئیتر بەدەستی من لەوشانۆیەدا تەعبیرم کردووە بەشەترەنج، کە دەستەکان دەستی ترن هی خۆمان نین، ئەوە دەیەوێ کش

لەمیللەت بکات، لێرەدا شتێک هەیە حەز دەکەم جیاوازییەکە لەوەوە دەست پێ بکات بۆ ئەو هونەرە کەبەر لەراپەڕین پێشکەش دەکرا بەو هەموو سانسۆرەی کە هەبوو بالاَترو بۆشناخ ترو جوانترو بەهێزتر بوو، بۆچی ئەوساکە هونەرمەندەکە بەگوڕترو خوێن گەرم تر بوو لەکارەکەیدا، کەچی دوایی لاواز بوو؟؟؟ هونەری زۆر بالاَ پێشکەش کراوەو وێڕای ئەوەش هونەرمەندی کورد سەربەرزن کە جێگرەوەی هەموو سەنگەرێ بوون، جێگرەوەی تفەنگەکان و بوون و مێژووو هەموو شتێ بوون، هونەرمەندو ئەدیبی کورد شەرەفمەندترین بوونیان لە بوونی نەتەوەیی کوردا هەیە لەو سالاَنەدا بە تایبەتی، کەس ناتوانێ نکۆڵی لە هەڵوێستی مەزنیان بکات و ئەوەی گوڕی پێ دابوون نهێنیەکەی لەوەدایە کێشەی گەلیان لەئەستۆ دابوو، خاوەنی کێشەکەش بوون

**رامان : یانی دوای راپەڕین ئەو گوڕو جۆشەی نێو هونەرمەندان نەما؟!**

**ئەحمەد سالار :** بەڵێ : لەجەماوەر دابڕکران

**رامان : لەبەرچی و کێ دابڕی کردن..؟!**

**ئەحمەد سالار :** لەبەر ئەوەی ململانێیەکی دواکەوتووانەی نەژیارییانە بۆ زلێتی و دەسەلاَتداری و تاجی زۆرەملێ لەسەرنان لەسەر ئەو نەتەوە مالوێرانە ، کە دیارە ئەولایەنە هەلپەی بووەو هەمیشەو ویستوویەتی لاسایی کەسانی تر بکاتەوە.. لەشوێنانی تر کوڵکە دیکتاتۆری رمووزن ئەوانە لەسەر مالۆچکەی کورد ویستیان خۆیان بسەپێنن.. بەلاَم هەر گەشبینم چونکە ئەم

رجەب و پیاو خۆران ـ دەرهێنانی ئەحمەد سالار

بەستەڵەکە گۆڕانکاری بەسەردا دێت و خۆی ئەزموونە.. ئەو سەردەمە بۆ ئەوە دەچووم پاش راپەڕین دەرەقەتی کەرەسەکە نەیەین، چونکە ناتوانێ لەو رووداوە گەورەیە دەرببڕێ، هەر چۆن لەو ولاَتی سۆڤیێتی جاران ئەدیبان و هونەرمەندان لەپاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر ماوەیەک لەگەڵ خەڵکەکە تووشی نائومێدی بوون دەیانووت : کوا پۆشکین و گۆگۆڵ و لیۆ تۆلستۆی و بلیمەتاکانی تر، بەلاَم پاش ماوەیەک کە ماوەیەکی مەنتیقیە تا بتوانێ هاوشان بێتەوە بتوانێ بگاتە پایەی کەرەسەکە، ئەوە بوو نووسەری زۆر گەورە لەهەموو بوارەکاندا دروست بوون لەپاش راپەڕین من وام دەزانی کار وا دەڕوا لە دڵی خۆما وتم: ئەمە لەوە دەچێ هونەرمەندێکی پەیکەر ساز کێوی سەفینی بخەیتە بەر دەست و پێی بلێی: ئەم کێوە پەیکەرێکی گچکەی لێ بکە، بەلاَم دەرەقەتی نایەت و دەستەکۆڵە هەر لە داوێنی سەفیندا دادەنەوێ و رەنگە ناوچەوانی لەبەردی ئەلحەدی داوێنی سەفین

## شانۆی کوردی دەتوانێ سوود لەهەموو رێبازەکان وەربگرێ، بەمەرجێ کت و مت وەک خۆی نەبێ

بدات، وتم رووداوەکە زۆر گەورەیە، پاش یەکەمین فیستیڤاڵی هەڵەبجە هەموو هونەرمەندان کۆبوونەوەو داوا لەمن کرا دەقێ بنووسم، داواکەیانم لەپێشدا بەئاسانی وەرگرت و پێم خۆش بوو ئەو شەرەفەیان بەمن رەوا بینیوە، بەڵام دوایی خۆم گیرۆدە بووم کەسەیرم کرد شارێک ژیانی هەزارەها کەس و خۆیشم بەمندالی لەو شارەدا ژیابم، بەیانی هەڵدەستی و نامێنێ، دایک و کوڕو باوک و برا هەموو ژیانی مرۆڤایەتی تیا نامێنێ،وای لی دێ بیرم لێ کردەوە من لەکەسانی خزمانەوە زۆر سەر گوزشتەم بیستبوو ،کە هەزار برینی قووڵی تراژیدین..

**رامان : مەبەستت ئەوە بوو کارەساتەکە هێندە گەورە بوو، دەرەقەتی نەدەهاتی؟**

**ئەحمەد سالار :** بەڵێ دەرەقەتی نەدەهاتم، بەڵام بۆ سەرهۆرەی جافی گەڕامەوەو بەوەوە دامڕشتەوە، ئەو ئاوازانەی کە لەژێ ناسکەکەی شارەزوورو هەڵەبجە دەدا، ئەوانەم هەمووی لێدا، ئەو شیعرو گۆرانی و یادانەی کەلە عەبابەیلێ و گولان و بامۆک و مۆردانەو کوێ و کوێ، هەموو ئەمانەم کۆکردەوەو دامڕشتنەوە، لەکاتێکدا ٢٠ - ٣٠ هەزار کەس سەیریان دەکرد دەگریان لەگەڵیداو (١٥٠) کەس بەشداری کردبوو لەنمایش کردنیدا، خۆیشم لەگەڵ ٢٠-٣٠ هەزار کەسدا دەگریام، بەڵام هەر هەستم کرد من غەدرم کردووەو شتێکم کردووە دەرەقەتی نایەم..

**رامان : لە ئەدەبیاتی سۆڤێتی جاراندا، کارەساتی لینینگراد تا ئێستەش هەر بەردەوامە شتی لەسەر دەنووسن.. دەکرێ هەڵەبجەی ئێمەش دەیەها نووسەرو هونەرمەند بەرامبەر ئەو کارەساتە هەر دەسبەکار بن؟**

**ئەحمەد سالار :** نموونەیەک دەهێنمەوە برادەرێکی خۆشەویستم هەبوو، هاورێیی منداڵیمەو زۆر بە بە وەفابوو. زۆر قەرداری بووم (رەفیق فایەق) زۆر بە حاڵەتێکی کلۆڵی کۆچی کرد تا ئێستە لەهەموو کەس ئازیز تر بووە لام ئەوو قوتابییەکی خۆم کە برادەرو هاورێم بوو -ئاراس تەیب- دەمەوێ شتێک بنووسم ناتوانم، بابەتەکە دەستم دەگرێ و دەمەوێ شتێ بنووسم دەستی بدەمێ و حەقی بدەمێ بەڵام لە ئاستیدا لاوازم

**رامان : یانی هەندێ رووداو هەن وەختی پێ دەوێ تا دەبێتە هەوێن، یا ئاگرێکی بەنیلەنیلی پێدەوێ تا پێبگا؟**

**ئەحمەد سالار :** کە شانۆییەک دەینووسم زۆر بیری لی دەکەمەوە کە بۆ

لالۆکەریم ـ دەرهێنان و نواندنی ئەحمەد سالار

خۆشەویست و ئەربابی هونەریش باسی دەکەم لەوەدا خەیاڵم دەبزوێ و بیرە سەرەکییەکەم بۆ دێتە ئاراوەو جاری وا هەیە رستەیەک دەنووسم و بەجێی دەهێڵم و لەشوێنی خۆم دێم و دەچم،گـــــــــۆرانـی دەڵێم و چا لە دوای چا دەخۆمەوە، تا دەگاتە ئەوەی بەجێی دێڵم، لەپاشا کە هەوێن بوو دەینووسم

**رامـــان : ئەمـــەیان وا، ئەوانەی لەنزیکەوە شارەزای جەنابتن دەڵێن کاک ئەحمەد سالار یەک چەشنە (نمط) تۆ دەڵێی چی..؟!**

**ئەحـــمــەد ســالار** : نەخێر، جاران دەیانووت لەهەموو شانۆیەکدا هەر دەوری کۆمیدیت هەیە، بەڵام من هاتم دەوری - **پالتـــۆم** -م بینی دەوری ئەساسی - ئەکاچی- لە شانۆی گۆگۆڵ و یا دەوری ئۆتێللۆم بینیوە یاداود پاشا لەو پەڕی تراجیدیدا .. لەشانۆی - پردی وڵاتەوە - کە لە فیستڤالی یەکەمی هونەری کوردیدا پێشکەش کراو لەهەموو دەقەکانی تریش جیاوازی تێدابوو، ئەم دوا دەقەشم جیاوازە لەهەموو ئەوانی تر، بەڵام زنجیرەیەک پەرەپێدان هەیە بۆ ئەو قۆناغە، من نە لەدەرهێنان ونە لەنووسینا ئەو کلێشە بەندەنیم بۆ نموونە: تەنەکەو خەج و سیامەند و نالی جەزیری و ئۆتێللۆو هاملێت کە من دەرمهێناون یا شانۆیی «ئەڤیجینیا لە ئۆلیس»ی یۆرپیدسی یۆنانی کە لە ٥٥٠ی بەر لە زایینی عیسای پێغەمبەر نووسراوە لە ئەسینا پێشکەش کراوە، ئەو پێشکەش کردنەی کە یەکەم بەرهەمی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی بووە، ئەگەر من قاڵبکار وکلێشەکار بم نەمدەتوانی ئەم هەموو بەرهەمە جیاوازانە پێشکەش بکەم

**رامان : تۆ بڵێی کاک ئەحمەد بەم قسانەی بتوانێ خوێنەرانی گۆڤاری رامان قەناعەت پێ بێنێ؟!**

**ئەحمەد سالار** : با بەراوردی بەرهەمەکان بکەن و ئەوانەی چاپکراون ببینن، ئایا تا چ رادەیەک جیاوازی هەیە، یا ئەو دەورانەی کە بینیوومن، سەدان نموونە هەیە، (**لالۆکەریم**) لەکوێ ئاکاچی «**پالتۆ**» لە کوێ..

هەریەکە جیاوازی خۆی هەیە، ئەگەر دواش کەوتم لەهونەر دەوەستم، بەڵام کەم و کوڕی لەبەرهەمدا هەیە، من ئێستە هەموو بەرهەمێکم کەم و کوڕی تێدا دەبینم. هەموو هونەرمەندێ لە قۆناغی هەرزەیی هونەرییدا - هەڵپە دەکات، شت زۆر پێشکەش دەکات. هەندێکی چاک بێ زۆربەی خراپە ،بەڵام هەڵە دەکات گرنگ ئەوەیە لەسەر هەڵە بەردەوام نەبێ، جاری وا هەبووە شانۆنامەیەکم پێشکەش کردووە دوایی لێی پەشیمان بوومەتەوە، بەڵام پەشیمان نیم لەوەی کە کارەکەم ئەزموونێکە چونکە دوای ئەوە بەرهەمی باشترم پێشکەش کردووە لەنووسینیشدا هەروەها، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ بەرەو هەڵچوون رۆیی بێ نەک رۆچۆن، لە رۆچووندا بێ دەنگ بی باشترە..!

دیەنێک لە شانۆیی ڕەجەب و پیاوخۆران

**ڕامان : ئێستە لەهەولێر کەش و هەوایەک دروست بووە جموجوڵێک لەشانۆدا بەدی دەکرێ، بە بۆنەی ڕۆژی شانۆی جیهانیش بۆ ماوەی (٧ - ١٠) ڕۆژ کۆمەڵێک نمایشی شانۆیی ئامادە کراوە.. ئەی جەنابت بۆ بەشدار نابیت و بەتایبەتی کەش و هەواکەش سازگارە..؟**

**ئەحمەد سالار :** زۆر ڕاستە : کەشو هەواو هۆکارەکان گرنگە بۆ دەرهێنان ئێستە هەوڵێکی زۆر جیدی هەیە بۆ ئەوەی بتوانرێت ئەو پێداویستیانە کە پێویستن بۆ داهێنان و ئەفراندنی هونەرمەند بخوڵقێنرێ و دابین بکرێ، بەتایبەتی وەزارەتی ڕۆشنبیری، برای نووسەرو ئازیزمان کاکە فەلەکەدین یەکێکە لەوانەی کە هانی ڕەوتەکە دەداو وەک ئەدیبێکیش بەپەرۆشە بۆی .. من نووسینم هەیەو لەپرۆگرامەکەدا یەک دوو بەرهەمم هەیە، بەڵام وەکو کارە هونەرییەکە، ئەم ماوەیە ڕەنگە نەمتوانیبێ، بەڵام سەرپەرشتی هونەریم لەخۆگرتووە، دەقم داوە بە برایەکی هونەرمەند، دەرهێنەرە خۆم وەک کادیرێکی هونەری بەشداری لەگەڵ دەکەم وەک نەخشەکێشی دیکۆر یا سەرپەرشتی هونەری..!

**ڕامان : دوای ئەوەی باسی کارە هونەرییەکانی خۆت و شانۆی کوردیت کرد، کاریگەری شانۆی عێراقی لەسەر شانۆی کوردی چۆن هەڵدەسەنگێنی؟**

**ئەحمەد سالار:** شانۆی کوردی لەعێراقدا بەشێکە لە شانۆی عێراقی لەبەر ئەوە ئێمە ئەگەر مێژووی شانۆییمان سەیر بکەین ئەو بەرهەمانە زۆربەی لەڕێگەی عەرەبییەوە لای برا هونەرمەندە عەرەبەکانن، بۆ نموونەش بەرهەمەکانی مامۆستا (یوسف ئەلعانی) ڕەنگدانەوەی زۆری لەپەنجاکاندا هەبووە، لە (١٩٥٨) بەدواوە چەندەها بەرهەمی پێشکەش کراوە، یا ئەوانەی مامۆستا (عادل کازم) لەوانە «ئابڵووقە» کەمن بەختەوەرم کە دەوری داود پاشام تێیدا بینیوە کە بەرهەمێکی هاوبەشی تیپی پێشڕەو و تیپی نواندنی سلێمانی و لە دەرهێنانی برای ئازیزم غازی بامەڕنی بوو، کە یەکێکە لەو دەورانەی شانازی پێوە دەکەم و ئەمەش دیسان دەیسەلمێنێ کە من (چەشنە کار - نمطی) نەبووم

**ڕامان : دەکرێ جەخت لەسەر ئەوە بکەی کە مێژووی شانۆی کوردی هەیە؟**

**ئەحمەد سالار :** بەڵێ مێژووەکەی لەمەمی ئالانی - عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکارییەوە کە لە ئەستەمبوڵ لە ڕۆژنامەی ژینی ساڵی ١٩١٩ چاپ کراوە دەست پێدەکا، ئەوە بەرهەمێکی سەرەتاییە وەک دەق، پاشان لەساڵانی ١٩٢٠ بەدواوە بەرهەمەکان پێشکەش کراون و لەسەردەمی (قوتابخانەی زانستیدا) دەوری گرنگی بینیوە، ئەو هەوڵانە هەوڵی پچڕ پچڕی دابڕ بوو بووە بەپێی سەردەمەکان تا لە ساڵەکانی پەنجا، تیپ و کۆمەڵەکان پێکهێنران، لەهەولێر و سلێمانی و ناوچەکانی تر، ڕەنگ و ڕواڵەتی هەبووە وەک شانۆ و مۆسیقاو بوارەکانی تر،

## ململانێ دەبێ هەبێ، دەنا هونەر تووشی مەنگی و وەستان دەبێ

پاشان لە سالّی ١٩٧٠و لە کۆتایی شەستەکانەوە دەیان تیپ و کۆمەڵەو گرووپ پەیدا بوو، ئەمەو لەقۆناغی بزووتنەوەی راستەقینەی شانۆی کوردییەوەش زۆربەی کادیرانی شانۆی کوردی لەپەیمانگەو ئەکادیمی هونەرەجوانەکانی بەغدا لەبەردەستی مامۆستایانی شانۆی عێراقیدا دەرچوون و کاریگەرێتی مامۆستا لەسەر قوتابی هەیە لەسەر شانۆی کوردی و بەش بەحالّی خۆم من یەکێک بووم لەقوتابیەکانی مامۆستا ئیبراهیم جەلال و سامی عەبدولحەمید و ئەسعەد عەبدولڕەزاق و بەدری حەسوون فەرید و مامۆستا بەهنام میخائیل و دەیانی تر زۆربەی هاوەڵانیشم قوتابی ئەوان بوون..

**رامان: لەسەرەتاشەوە مامۆستا- حەقی شبلی- کاریگەری هەبووە لەسەر مامۆستا فوئاد رەشید بەکرو هونەرمەندانی تریش..**

**ئەحمەد سالار:** بەڵێ کاریگەری لەسەر خوالێخۆشبوو (کەریم زانستی) هەبووە کە پورزای منە، زۆر پێوەندی پێوە هەبوو و بەبەردەوامی مامۆستا حەقی شبلی پشتگیری دەکردین.. دیدارێکم لەگەڵ کردبوو بەداخەوە کاسێتەکانی دیار نەماوە پێش ئەوەی عەمری خوا بکات، یادگارەکانی لەگەڵ شانۆی کوردیدا دەور دەکاتەوە..

**رامان: ئەحمەد سالار خۆی وەک دەرهێنەر دەبینێ یا نووسەری دەقی شانۆیی یا هەردووکییان؟!**

**ئەحمەد سالار:** هەردووکییان، هەروا ئەکتەرو زۆربەی شانۆکانیش خۆم نەخشەکێشی دیکۆر بووم، چونکە نەخشە کێشانی دیکۆر بەلای منەوە گەوهەری دەرهێنانە هەرچۆن دەستنیشانکردنی بوارەکانی جوڵاندنەوەی سەرشانۆیە..

**رامان: کامەیان زیاتر؟**

**ئەحمەد سالار:** زیاتر دەرهێنان..

**رامان : رات بەرامبەر ئەو دەرهێنەرە لاوانەی کە دەرچووی ئەکادیمیان؟**

**ئەحمەد سالار:** دوو هەنگاو هەبوو هەندێکی شێوازی دواکەوتن و پێڕەوی ئەوی دەکرد لەبواری لاسایی کردنەوە، هەندێکی تر بەپەرۆش بوون بۆ نوێکاری، هەندێکیشی بەرەو ئەوە دەچوون بەرەو شانۆی کوردی و مۆرکی زانستی پەرە پێبدەن، لەهەندێ شوێندا رەنگە بەباش نەکەوتبێتەوە، یەکێ لەوانە حەز دەکەم بەیادی بکەم زۆر هەوڵدرا شانۆ لەپارێزگای دهۆکدا بکرێت، لەوێ هەندێ لەو برادەرانە راستەوخۆ بێ ئەوەی بنچینە دارێژن بەجیاوازی هەولێرو سلێمانی کە لەو دوو شارەدا شاکارەکە دێن و دوایی بە روخساری کوردەواری و ئەو شتانەی میللییەت دەبەخشێ پێشکەشیان دەکرد، تا زەمینەیەکی بۆ جەماوەر خۆش کرد، بەلام لەدهۆک زۆر راستەوخۆ کەوتنە نمایشی ئەو دیمەنە شانۆییانەی کە زۆر بەبینەر

## هونەرمەند لەو جۆرە نییە کە چووە شاری کوێرانەوە دەست بە چاوییەوە بگرێ

نامۆ بوون، ئەوانە شانۆی (نوخبەیە) یا ئەوەیە کە لە (شانۆیی گیرفان) - لەولاتان پێشکەش دەکرێت، ئەوە ناتوانرێ ببێتە هەنگاوی دەست پێکردن و بونیادنان، بەڵکو ئەوە سەربار دەبێ بەبینەرو لەخانەی سەربارداییە، نەک رەوتی سەرەکی، ئەوانە لای ئێمە توانییان کاریان پێ بکەن، چونکە خۆی لە خۆیدا ژیانی ئەو ململانێیە بوو لە نێوان کۆن و نوێدا،..

**رامان : ئەی شانۆی بازرگانی لەشانۆی کوردیدا هەیە؟**

**ئەحمەد سالار :** نەخێر نییە لەبەر ئەوە تا ئێستە شانۆ نەبووەتە پیشەمەندی لەناو کورد، ساڵەهایە کیانی سیاسی نەبووە لەباری ئارەزوومەندایەتیدا خوولی خواردووە، هونەرمەندەکە یا مامۆستا یا فەرمانبەر یا کرێکار بووە پاش ئیشی خۆی هاتووە لە شانۆدا ئیشی کردووە، بواری ئەوەی نەبووە شانۆیەکی پیشەمەندکاری موحتەریفی -ی هەبێ..

**رامان : لەپاش راپەرین شانۆ بەرەو خامۆشی رۆیشت مەسەلەن پانتۆماییم یا شانۆی منداڵانیش هەر لای لێ ناکرێتەوە هۆکارەکانی چییە؟**

**ئەحمەد سالار :** شانۆ کە لە شوێنێکدا سەقامگیر دەبێ کە دڵنیایی بەر کەماڵ بێ من دەڵێم کاتێ کوردستان ئاوەدان کراوەتەوە کە شانۆکانیش ئاوەدان بکرێنەوە ..

**رامان :بەقەد چاودێری خۆت لەمەیدانی شانۆدا رەخنەگری بەتوانای شانۆیمان هەیە یا هەبووە ؟**

**ئەحمەدسالار :** رەخنەگری دانسقەو کەم بووە، هەیە بەڵام بە قەوارەی بزووتنەوە شانۆییەکە نەبووە چەندهەوڵێکی جیدی هەبووە کەئێستەکە بۆی پەرۆشین ،

**رامان : ئەی ئەگەر ئەحمەدسالار خۆی ببێ بەبینەر چۆن پێوەندی درامای شانۆیی بەدرامای تەلەفزیۆنی کە نزیکن لە یەکتر ، چیژی لێ وەردەگرێ یان دەست نیشانی دەکات ..؟**

**ئەحمەد سالار :** دەقی شانۆیی کامێرایەکە وەهەموو چاوی بینەرە (برگمان) دەڵێ :ئەوکامێرایە دەبێ چاوێ بێ لەسەری شاعیردا ، بەواتای شاعیرییەتی تەواو ، لەوێوە لە چاوێکەوە دەروانێت ، دەتوانی دەسەڵاتت بەسەرییەوە هەبێ ، شانۆ ، راگرتنی کۆمەڵێ شتە ، ئەو لەدووتوێی چاوێکی ئەو کامێرایەوە دەتوانێت دەسەڵاتی بەسەر هەموویدا هەبێ ، بەڵام ئەمە لێک بدەرەوە فراوانترو گەورەترو زیندووترە . ، ئەو زیندویەتیەش پەرەسەندن و جیاوازی لە دوایە و دەژین لەگەڵی ، حەز دەکەم لێرەدا ئەزموونێ بەیاد بکەمەوە کاتێ - شانۆیی (**ئەڤجینیای یۆرپیدس** ) یەکەم بەرهەمی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی بوو لەهۆڵی

ئامادەیی سلێمانی کوڕان لەو شانۆ دێرینە پیرۆزەدا پێشکەشم دەکرد، من کە خۆم لەکاتی پرۆڤەدا راناگرم و وەک گلاراوم بێ دوو سەد جار لەکاتی پرۆڤەدا رام دەکردە سەر شانۆکەو دەهاتمە خوارەوە بەڵام رۆژێکیان دانم بە خۆمدا گرت ودوایی ئەکتەرەکان سەریان سوڕما، منداڵێکیان هێنا بوو خوشکەزای ئەکتەر بەیان رەشید بوو لەپۆلی یەکەمی سەرەتاییدا بوو، لەپرۆڤەی ئەو رۆژەدا تەنیا خۆم بۆ سەرنجدانی ئەو منداڵە تەرخان کردبوو، منداڵەکە لەپێشەوە دانیشتبوو، هۆڵەکەش سارد بوو زستان بوو، منداڵەکەش وردە وردە دەچووە پێشەوە، من سەرنجم دەدا لەکەیدا ئەو منداڵە واز لەشانۆکە دێنێ، من لەو مەوعیدەدا شانۆم پێشکەش نەدەکرد چونکە دەمزانی ناتەواوە چووم سەیرم کرد ئەو منداڵەم وەک جەماوەرێکی گەورە بینی، جەماوەر هەمە جۆرە پیرە، بێ تاقەتە، هەیە ئارەزووی نییە یا بۆ مەبەستی تر هاتووە، هەیە خوێندەوارو تێگەیشتووە، هەیە لەرادەی شیتەڵکردنەوە دایە، هەیە بەکۆمەڵێ گیروگرفت وتەنگ وچەڵەمەوە هاتووە، هەموویم لەو منداڵەدا کۆکردەوە کەمنداڵەکە دوای شانۆییەکە دێت وسەیرم کرد منداڵەکە لەگەڵ شانۆییەکەدا بەردەوام دەژیا، تاکۆتایی.. دوایی ئاهێکی پیاهاتەوەو ئنجا کەوتەوە جوولاندن وتم شانۆییەکە تەواو پێشکەش دەکرێت .. دوایی وتیان چی بوو وتم بەردەوام سەرنجی ئەو منداڵەم دەدا ئەوەم کردبوو بە پێوەری سەرکەوتنی شانۆییەکە، وتم مادەم ئەو منداڵە توانی بەبەردەوامی سەیری بکات ئەو شانۆیە سەرکەوتووە، بەتایبەتی وتم کە شانۆییەکە ٢٥٠٠ ساڵ لەوەو پێش نوسراوە، پاش ئەو ماوەیە ئایا جەماوەر ٢٥٠٠ ساڵیان لەنێواندایە دەتوانێ چێژی لێ وەربگرێ، دەرکەوت شانۆییەکە بوو بە شانۆیی جەماوەری، رۆژانە دارو بەرد دەبووە بینەران ولەو منداڵەوە مەزندەی خۆم کرد.

**رامان : باسی بینەرت کرد، ئایا شانۆی کوردی بینەری خۆی دروست کردووە، بەرامبەر بینەری شانۆی کوردی رات چییە ؟!**

**ئەحمەد سالار :** ئەو گۆڕانکارییەی پاش راپەرین بەخراپ بەسەر شانۆی کوردیدا شکایەوە، جاران جەماوەر هەبوو جەماوەرەکەی تەرەکرد، جاران ئەو جەماوەرە چەشە بوو بوو بەشیرینی شانۆیەک کە کێشەو خەم وخولیای خۆی تیا دەبینی ئەوەیان نەهێشت، بارێکی ئابووری خراپ و کۆمەڵێ هۆکاری تر جەماوەری نەهێشت، ئێمە کە لێرە تەباهی بەوەوە دەکەین« ٣-٤» رۆژ توانیمان شانۆیی «بەرەو خۆر» بەگەورەترین توانای شانۆی کوردییەوە پێشکەش بکەین، لەباشترین هونەرمەندی هەموو قۆناغەکان، هونەرمەندی گەورەی وەک مامۆستا سەباح عەبدولڕەحمان وقادر مستەفاو سەلام کۆیی وعەلی ئەحمەد ودەیانی وا بەشدارییان کرد، ئەو هەمووە تێکەڵ بوو، دەرهێنانێکی چاک بەدوو دەرهێنەری باش وپشتگیری تەواو توانیمان تەباهی بکەین بڵێین چەند رۆژ بەردەوام بوو، ئەو هۆڵی شانۆیە لەسەردەمی تردا گەلێ پتر بەردەوام دەبوو، لەبەر ئەوە ئێستە نیمانە..

**رامان : ئەگەر خۆت خرایتە بەردەم بەرپرسیاری دەرهێنانی مەم وزین یا قەڵای دم**

**دم چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەم دوو دەقەدا دەکەی ؟**

**ئەحمەد سالار:** مەم وزین بۆ رادیۆیش بەدوو جۆرم دەرهێناوەو کارم تیا کردووە بەکرمانجی ژوورو وە بە کرمانجی خوارووش بەزنجیرەیەک بە« ٣٠» ئەڵقە لەرادیۆدا، زۆر جار بیرم لێ کردۆتەوەو تا لەو سەردەمەدا کە دەقە عەرەبیەکەم پێشتر خوێندبووەوە ئەوەی مام هەژار، پاشان ئەوەی بە کرمانجی ژوورو زۆرجار خوێندومەتەوە، بەڵام بۆ ئامادەکردنی شانۆیی لێی سڵەمیومەتەوە، چونکە نەمتوانیوە حەقی بدەمێ وئامادە و پێشکەش بکەم.

**رامان : لەبەرچی؟**

گرنگی ئەو دەقەی- مەم وزین- لەوەدایە لەبەری ٣٠٠ساڵ ئەو بیر و بۆچونانەی تێدایە وەک چۆن حاجی قادرو ئەو سەردەمەی خۆی لەکۆیە، بە جوانی دەگەڕێتەوە بۆ هێزی شاعیری لەو وەسفە جوانانەدا و کۆمەڵێ قیەمی مێژوویی هەیە، بایەخی روائی وشیعری، هەرسێکی دەبێ لەبایەخە درامییەکەدا کۆ بکەمەوە، ئایا دەتوانم بایەخێکی دراماتیکی پێ بدەمەوە، ناتوانم،کەنەتوانم دەستکاری نەکەم چاکترە، بەڵام ئەوەی لەسینەمادا بینیم ئەوە تارادەیەکی چاک خۆشحاڵ و شادبووم پێی، بەڵام بۆ شانۆ نەمتوانیوە قەڵای دم دم کە داستانێکی زۆر دانسقەیە، زۆر شتی گەورەی تێدایە، بەتایبەتی ئەوەی کە باسکراوە لە ( توحفەی موزەفەرییە ) و رۆمانەکەی (عەرەبی شەمۆ) شتی زۆر دانسقەی تێدایە کە جیاوازەو تایبەتمەندی کوردی تێدایە جێی شانازییە رۆڵی ئافرەت وتێکۆشان لەپێناوی ژیان وخۆراگری، ئەوە رەنگە لەداستانی گەلانی تردا بەو ڕادەیە نەبووبێ..

**رامان : تۆ بڵێی ئەوەش بۆ سینەما بشێ زیاتر لەشانۆ ؟!**

**ئەحمەد سالار:** سینەما گیانی لەگەڵ رۆحیەتی رۆماندایە بایەخەکانی نزیک دەبێتەوە بەڵام شانۆ نەء وناتوانم ئەو وەسفە بە شانۆ بدەم، بەڵام وەسفەکە لەسینەما هاوشانی دەبێتەوە، یاهەندێ لایەنی مێژوویی هەیە وتمان گرنگی لەو بیرو بۆچوون و وەسفەدایە یا ئەو مەودا فراوانەی کەلەسینەما دەکرێ، سینەماش رەنگە گونجاوتر بێ بەڵام شانۆ نا، بەڵام من هاتم ئەمەی- قەڵای دم دم - لەشانۆیی- شەهێن لەسەختەندا هێلانە دەکات- شەهێن ئەو باڵندەیەیە دوژمنی زۆرە لەبەر ئەوە لەعاسی ترین شوێندا هێلانە دەکات کورد وەک نموونەی شەهێنە، هاتم بەکارم هێناوە تەوزیفی قەڵای دم دمم لەم شانۆییەدا کردووە..

**رامان : مەبەستت خانی لەپ زێرینە ؟!**

**ئەحمەد سالار :** بەڵێ کەقارەمانی سەرەکی شانۆییەکەیە..

**رامان : مامۆستا پێشتر وتت زیاتر خۆم لەنووسین ودەرهێنان دەدۆزمەوە ئایا هەر لەم قسەیەت واتێبگەین کە جەنابت نەتوانی تەمسیل بکەی یان ئەگەر تەمسیل بکەی ، ئێستە لە جاران باشتر نەبی ؟**

**ئەحمەد سالار :** نەخێر رەنگە لە رووی تەندروستی هەندێ هۆکار هەیە ، لەوانە تەمەن و نەخۆشی لە بارەی داهێنانی ئەکتەرییەوە ، نەخێر گەر واز بێنم مانای من

- ئەحمەد سالار - نەماوم، ئەوکەسە کە وازی لە پیشەسەرەکییەکەی هێنا ، بۆیە لە پەرلەمانیشم لەبەر ئەوەی هونەرمەندم چوومەتە پەرلەمان ، بۆیە سیاسەتیش دەکەم لەبەر ئەوەی هونەرمەندم ، ئەگەر وازم لە هونەرەکە هێنا مانای زەربم بەسەر بوونی خۆمدا هێناوە، بەردەوام دەبم و چاوەڕوانم بتوانم ئیشی خۆم بکەم رێگریش نییە لەهەموو ولاتێکدا کەسانێک هەیە لەسەرو کارەسیاسیەکەیاندا کاری تریان هەبووە، هونەرمەندی شانۆش لەچەندین شوێندا بەپلەی سەرۆکایەتی گەیشتوون وەک ڤاسلاڤ هاڤیل وریگن .. تاد..

**رامان : ئەگەر تەمسیل بکەی ئێستە وەک هونەرمەندێ کە تەقیمی خۆت بکەی ئەو تەمسیل کردنەت لەئاستی تەمسیلی سالانی حەفتا دەبێ؟!**

**ئەحمەد سالار :** رەنگە ئێستە ئەزموونی زیاترم هەبێ و لەوانەی پێشوو وەک کورد دەڵێ هەر عەقڵە لەخەساریّ عەرەبیش واتەنی: عەقڵ گەنجینەی ئەزموونە..

**رامان : لەسەرەتای دانیشتنەکە ئاماژەت بە بووکە بەبارانێ کرد ئەی چەمەری یا کۆتەڵ..؟**

**ئەحمەد سالار :** بەڵێ کۆتەڵ وچەمەری - م بەکارهێناوە، لەوەدا بەیتە کوردییەکان هەیە، بەیتی سوارە هەیە بەکارم هێناوە، من شانۆکەم شانۆییەکی بەیت ئامێزی کەلەپوورییە ...

**رامان : مەبەست لە بەکارهێنان نییە زیاتر مەبەست لەوەیە چەمەری یا کۆتەڵ، لەناو کوردەواری هەیە، سەرەتای شانۆ یا نمایش نییە؟**

**ئەحمەد سالار:** بەرلەوە ئێمە نمایشمان هەبووە بەناوی پاشا پاشایی ئەو شانۆییەم بەناوی پاشا پاشایی دارشتوۆە، لەژێر تارای سورمە چندا، میر میرێن یان پاشا پاشایی، ئەمە پتر لەناوچەی بادینانداا باو بووە، کەدەڵێم ئەوێ مەبەستم وەک وتم لەناوچەی جزیرەو بۆتان، ئەو ناوچەیە کانگەی کەلەپووری کوردە، نەریت و داب و رەسمی کوردە ، شوێن ئیمارەت و ناوجەرگەی کوردستان بووە، شوێنێکە زۆر شتمان بۆ ئەوێ دەگەڕێتەوە، یەکێ لەوانە پاشا پاشاییە بەخۆڕایی نییە ناوی زەوی پیرۆزی پێ رەوا دیتراوە..ئێمە پاشا پاشایێن رەنگ ورواڵەتی شانۆیی تێدایەو لای گەلانی تریش هەبووە ، هەروەها کۆسە بەبە یا بووکە بەبارانێ یا کۆتەڵ هەرسێکی موحاکاتی تیایە، کەیەکێکە لەوانەی ئەرستۆیە «گێرانەوە» پێناسەی دەکات هەرسێکی تیا دانایە لەکۆسەبەبەو بووکە بەبارانێ وچەمەرو کۆتەڵ وە لە میر میرێنا...

**هونەرمەندی کورد بەر لە راپەڕین جێگرەوەی هەموو سەنگەرێ بوون**

هەمان توخم هەیە..

**رامان : باشە ئەمە بۆ ناکەی بە لێکۆڵینەوەیەک؟**

**ئەحمەد سالار :** لەناو دوتوێی شانۆییەکدا تیایەتی، ئاماژەشم بۆ کردووە

# من نه له دەرهێنان و نه له نواندندا، نه ئەوقم، نه ئەو كلێشه بەندەم كه باس دەكرێم

لەبنیاد نانی شانۆی كوردیدا، بۆ نموونه - كۆتەڵ- بەیتێك دەڵێن ئەو بەیتانە- بەیتی جوامێرهەبووە- بەیتی شەریف هەمەوەند هەبووە بەیتی سوارە وبەیتی تر زۆرن، لەو ناوچانەی من شارەزاییم لەناو جافەتی وهەمەوەندو ئەوانه بەسەر كراوەتەوە دوا كۆتەڵ بۆ ئەحمەد سوختار جاف لەهەڵەبجه كراوە،(عەلی باپیر ئاغا - كەمالی) شاعیر دەیگێرایەوە دەیووت ئەو شەوەی كه كۆتەڵە. كراوە ئەو رۆژە هاتوون فیشەك دان و رەخت و تفەنگ شەدەو مشكی و كەلوپەلی ئەحمەد بەگیان هێنا لەگەڵ ئەسپەكەیدا دەیانگێرا بەناو خەڵكەكەدا و بەیتیان دەووتەوەو دەیانلاوەندەوەو جووڵەی تایبەتیشیان هەیه «بمرم لێ لێ هاوار لۆ لۆ» بەرامبەر یەكتر بەیتەكان دەڵێنەوە كۆرس هەیه، رووداوێك هەیه، موحاكاتی تیادایه، زۆر روالەتی شانۆیی تیایه، فرمانێك هەیه، كەرەسه درامییەكان تیایەتی بەتاك دەیلێ بەجووت و كۆ جواب دەدەنەوە، كۆمەڵێ شت زیندوو دەكەنەوە، نمایش دەكەن ئەمانه كارو كردەوەی نیمچه شانۆیین، رادەیەكی ماوە بۆ شانۆیی و هەر ئەوە بوو لای گەلانی تر بەڵام بارودۆخێكی تایبەتی بۆ دروست بووە.

**رامان: وەك لایەنی رۆژنامەنووسی تا چەند بواری رۆژنامەنووسی بەشداری لەپەرەپێدانی بزاڤی شانۆیی لەكوردستان كردووە؟**

**ئەحمەد سالار:** ئەوە بۆ حەق دەوترێ، من لەسەردەمی قوتابیەتیم لەزانكۆی بەغدا ئەو وەختە رۆژنامەكان چ وەك برایەتی یا هاوكاری چ ئەوانەی هەبوون بەیان و گۆڤارەكانی تر بەردەوام پشتگیرییان دەكرد هەواڵێكی گچكە هەبووایه بایەخیان پێ دەدان و هونەرمەندە كوردەكان لەسەرەتای دەست پێ كردنا بوون ئەوان وەك هونەرمەندی گەورە بایەخیان پێ دەدەن، مامۆستا مەحموود زامداریش یەكێك بوو لەو رۆژنامەنووسانه تەنانەت لەكتێبی ئەزموونگەریدا (دانا رەووف) ئاماژەی بەوە كردووە ئەو هاندانەی بەتایبەتی مامۆستا مەحموود زامدار و تەرخان كردنی ئەو گۆڤارو بڵاوكراوانەی كه شانۆیی پێشكەش كراوە لەو گیانه هاندەرییەوە لەساڵەكانی هەشتاوە گۆڤاری بەیان و كاروان و رۆشنبیری ئەمان لەبەرگەوە شانۆییەكەیان نمایش دەكرد، چەند جار لەرۆژنامەكاندا دوو لاپەرەی یا سێ لاپەرەی تەرخان دەكرد بەنووسینێ بۆ شانۆگەرییەك لەوانه -نالی و خەونێكی ئەرخەوانی- و زۆر شانۆیی وا كه هەموو ئەوانەی لەبواری رۆژنامه كاریان دەكرد دەبوونه بایەخێكی گەورە بۆ هونەر..

**رامان: لەشانۆنامەكانی جەنابت گۆرانیت تەوزیف دەكرد لەنالی و ئەوانەی تر بەشی زۆری گۆرانیت تەوزیف كردووە كەسانی تریش بەكاریان هێناوە تا چ رادەیەك گۆرانی خزمەتی ئەو شانۆییەی كردووە كه پێشكەشت كردوون؟**

**ئەحمەد سالار:** هەر لە دوا شانۆییەکەشمەوە دوبارە بگرە بارێکی تێدایە باسی کلۆلی دەکات، ڕووداوێک هەڵساوم دەسنیشانم کردووە دەڵێم قەتارو ئەڵلاوەیسی گەرمیانی- م دەست نیشان کردووە.

لەفلانە شوێندا وتوومە لاوکە، وتوومە لێرە حەیران دادەبەزێ، لێرەدا بەپێی- ئەی ئاغاو ئاغاو ئاغاو ئاغاو «گۆرانی دەڵێ»

گۆرانی بەشێکە لەهونەری شانۆیی بۆچی؟ لەبەرئەوەی لە باگراوەندی بینەرەکە پانتایی گەورەی گرتووە، کە گۆرانییەکەی بۆ لێدەدەم دەورووژێ بۆ نموونە گۆرانی «نەورۆز» لە- نالی و خەونێکی ئەرخەوانی- هەر لەگەڵ گوێی لەسروودەکە بوو یا (خوایە وەتەن ئاوا کەی) - بەگۆرانییەوە لە(بەرەو خۆردا) هەیە، یەکەمین: کەشێکی دەروونی دەدات، لەهەموو شت کاریگەرترە بۆ وروژاندنی چێژ، ئاوازێکی غەمگینت یان خۆشیت پێدەدا یەکسەر دەجوولێ.. بۆ شانۆ وەک وەسیلەیەکی کاریگەر بەکارم هێناوە+ ئەوەی مەبەستمە بۆ حاڵەتی نامۆ بوونەکە وەک دابڕبوونێک چونکە دەمەوێ باز بدەم و لەوێدا دەمێنێتەوە چونکە شتێکی ترم بەدەستەوەیە دوای ئەوە دێتە پێشەوە بۆ بیناکردنی فرمانێکی درامی- دی..

**ئەزموونگەری ڕێباز نییە، بگرە هەوڵی دۆزینەوەیە، ئەوژمیش نییە، بگرە خولیایە بۆ داهێنان**

**ڕامان: ئەو گۆرانییانە هەبووە پێشتر بەڵام تۆ تەوزیفت کردووە پێت باشتر نییە لە داهاتوودا ئەو گۆرانییانەی خۆت لەشانۆییەکاندا بەکاریان دەهێنی گۆرانی و مۆسیقای تایبەت بەشانۆیی تەئلیف بکرێ؟!**

**ئەحمەد سالار:** ئەوە یەکێک بووە لەگیروگرفتە سەرەکییەکان، من هەڵسام (٣-٤) مۆسیقاری چاکم هێنا ، مامۆستا (حەمە حەسەنی نای) کە یەکێکە لەمیرەکانی نای یا (سەباحی سەمتوور) کە پاشای سەمتوورە و هونەرمەندێکی دیش -دەف ژەن- ئەم ئالەتانە بۆ کوردییە کە تەواو دەگونجاو ئەمانەو گۆرانیبێژیشم بەکاردەهێنا ، هەندێ جار بۆ ئەکتەرەکان وا ڕێک کەوتبوو کە ئەکتەرەکان دەبوونە گۆرانیبێژ، ئێمە مۆسیقای کوردی کاتێ پەرەدەسێنێ بچێتە بواری تەئلیفی مۆسیقی یەکێک یادی بەخێر کاکە سەلاح ڕەووف هونەرمەندێکە توانای دانانی هەبووە، دانسقەن ئەوانەی توانای دانانیان هەیە.. لەبەر ئەوە نەمدەتوانی ئەو مۆسیقارە پەیدا بکەم کەبێ تەئلیف بکات..

**ڕامان: کەواتە دەردەکەوێ مۆسیقیەکە ڕۆشنبیری باشیان نییە، دەبێ وابێ ؟**

**ئەحمەد سالار:** بەدڵنیاییەوە،

**ڕامان: بۆچونێک هەیە، لەشانۆدا دەوری بچووک نییە بەڵکو کارەکتەری بچووک**

**هەیە، راستە... ؟!**

**ئەحمەد سالار:** لەفلیمی سپارتاکۆس -دا سێر لۆرانس ئۆلیڤێ خەلاتی ئۆسکاری وەرگرت دەورێکی زۆر بچووکی هەبوو، هەشبوو زۆر دەوری هەبوو، زۆر لەئەکتەرە گەورەکانی شانۆ دەورێکی بچووک دەبیننەوە، لەهۆلیۆد ئەکتەرە سینەمایی بەناوبانگەکان دەورێکی بچووک لەشانۆدا وەردەگرێت، چونکە لەو دەورەدا دەتوانێ ئیسپاتی بوونی خۆی بکات دەتوانرێ لەماوەیەکی کەمدا ئەفراندن بکرێت و مەرج نییە لە زۆریدا بێ.. زۆر راستە..

**رامان: ئەگەر ئێستە بتوانی پێگەیەک بۆ شانۆی کوردی دابنێی لەناو شانۆی عێراقی و عەرەبی کوێی بۆ دادەنێی؟!**

**ئەحمەد سالار:** شانۆی ئێمە وەک بەشداری مێژوویی لەئاستی شانۆی عێراقیدا لەچاکەکانیانە، بە نیسبەتی گەلانی دەوروپشتی ئێمە وێرای ئەو بارە ئالۆزە- ئەگەر بکەوێتە خۆی، شانۆ وەک ئەو شانۆییانەی بینیومانە لای هەموو گەلانی دی رەنگە ئەوان هەندێ شت خزمەتی کردوون بەلام هی ئێمە لەهەموو روویەکەوە هەژارە، لەگەڵ ئەوەشدا وەک توانا ئیبداعیەکە لە هونەرمەندی کورد کەمتر نییە هەروەک چۆن ئەدیبی کورد کەمتر نییە لەزۆر لایەنەوە، ئەوە لەهەموو بوارەکانەوە نەک هەر لە شانۆدا..

**رامان: بەیەک دێڕ.. شکسپیر؟!**

**ئەحمەد سالار:** خۆی شانۆیە لەشانۆ دا..

**رامان: مایرهۆلد..**

**ئەحمەد سالار:** مایرهۆلد بلیمەتێکی داهێنان و ئەزموونگەرییە..

**رامان: برێخت؟**

**ئەحمەد سالار:** باوکی شانۆی سەدەی بیستەمە..

**رامان: ئەپسن؟**

**ئەحمەد سالار:** باوکی ریالیزمە..

**رامان: ستانسلاڤسکی؟**

**ئەحمەد سالار:** خاوەنی قوتابخانەی زانستی و رەوشتی شانۆیە..

**رامان : گۆرکی؟**

**ئەحمەد سالار:** رابەری ریالیزمی سۆسیالیستە..

**رامان: ستر نبێرگ؟**

**ئەحمەد سالار:** لەمەزنەکانی سەدەی بیستەمە..

**رامان: کامەران رەئووف؟**

**ئەحمەد سالار:** بەتوانایە..

**رامان: فازیل جاف؟**

**ئەحمەد سالار :** هونەرمەندێکی بەتواناو دەرهێنەرێکی زیرەکە..

**رامان: ئەرسەلان دەروێش؟**

**ئەحمەد سالار:** سەرکەوتوویەکی بەپەرۆشە..

**رامان : تەڵعەت سامان؟**

**ئەحمەد سالار:** نووسەرو دەرهێنەرە، جێگەی گەورەیە لەشانۆی کوردی..

**رامان: سەباح عەبدولڕەحمان؟**

**ئەحمەد سالار:** ئەکتەرێکی بلیمەتە..

**رامان: سەفوەت جەراح؟**

**ئەحمەد سالار:** ئەکتەرو بەڕێوەبەری شانۆی بەتوانایە..

**رامان: جیهاد دڵپاک؟**

**ئەحمەد سالار:** وەک ئەکتەر، ئەکتەرێکی بەتوانایە..

**رامان: بەشیعر دەستمان پێکرد دەکرێ بەشیعریش کۆتایی بەم دانیشتنە بهێنین..**

**ئەحمەد سالار:** لەژێر تارای سورمە چندا..

**رامان: کەی نمایشی دەکەی؟**

**ئەحمەد سالار:** مانگی چوار پرۆڤەی دەست پێ دەکات و خۆم سەرپەرشتی هونەری دەکەم، دەرهێنەر- ئەرسەلان دەرویشە- ئەکتەرەکان کاک سەباح و دەستەیەک هونەرمەندی کوردن..

ئەحمەد سالار: دەمەتەقێیەکی تریفە لەدواشانۆییدا، شانۆیی لەژێر تارای سورمەچندا، کە مانگی چوار پرۆڤە دەست پێ دەکات و لەمانگی پێنجدا نمایش دەکرێ..

«بەدەنگەوە بەشێکی کورتی شانۆییەکەی خوێندەوە»

**رامان: تا چ رادەیەک لەم گفتوگۆیە رازی؟!**

**ئەحمەد سالار:** زۆرم پێ خۆش بوو لەبەر ئەوەی هەندێ لەوەی لەسنگمایە وتم.. وەڵامی کۆمەڵێ پرسیارم دابێتەوە و هەژاندمی و وروژاندمی، شتێک هەیە دەبێ چاکی لێ بەلایدا بکەم، رێرەوی شانۆییەکە بگرمەوە دەشڵێم :

«نە ئەوقم و نە کلێشەبەند..»

**سازدانی گفتوگۆ:**

**ئازاد عەبدولواحید ـ مەحموود زامدار**

**شێرزاد حەسەن:**

# «چاوەڕوانی گۆدۆ» هەموو ژیانی گۆڕیم .. حەزیش لەڕۆمانی کوردی ناکەم

***شێرزاد حەسەن ئەو ناوەیە کە لەناو پانتایی رۆشنبیری کوردیدا ئامادەبوونی خۆی هەیە، دەیەوێ لەنەریتی باو دەرچێ و لەرێی هونەرەکەیەوە جاری بنەمای نوێ بدات. گەرچی سەر لەزۆربەی بوارە جیاجیاکانی رۆشنبیری خواردەکاتەوەو دیدو بۆچوونی خۆی لەبارەیانەوە دەردەبڕێ، بەڵام بەردەوام کەرەستەی دەربڕینی خۆی لە چیرۆکدا پێدەگەیەنێ و ئەو خۆشەویستییەی لەگەڵ چیرۆکنووسین بە هیچ بوارێکی تر ناگۆڕێتەوە. (رامان) بە پێویستی زانی دیمانەیەک لەگەڵ (شێرزاد حەسەن) دا ساز بدات، تا لە تەنگژەی چیرۆک و کێشەکانی رۆشنبیری کوردی بدوێت.***

**رامان: بەر لەهەموو شتێک حەز دەکەین سەرەتای خۆ دۆزینەوەت لەناو جیهانی خوێندنەوەو نووسین باس بکەی..؟**

**شێرزاد حەسەن:** زۆر زەحمەتە بۆ رابردوویەکی دوور بگەڕێینەوە، وابزانم سەرەتای ئاشنا بوونم بەئەدەب و عیشقی یەکەمم، لەپاڵ سروودەکانی قوتابخانە، قەرزاری دەنگ و سەدای(شوکرولڵای بابان) م کە شیعری نوێ و کلاسیکی دەخوێندەوە، سەرەڕای گوێ گرتن لە چیرۆکەکانی رادیۆی (کرمانشاه) لە سالآنی (شەست) کە بەزنجیرە بلاو دەکرانەوە، جگە لە چیرۆکەکانی بەر ئاگردان کە لە پیرەژنەکان گوێ بیستی دەبووم، بەڵام هەست کردنم بە سیحری ئەدەب (لە قۆناغی سەرەتایی)دا بۆیەکەم جارو بەرێکەوت بوو، پیاوێکی سادە، شەوێکیان شیعرێکی (قانع)ی بۆ خوێندمەوە کە لەسەر لێفەیەکی زۆر شڕ نووسی بووی کە کت و مت لە لێفەکەی من دەچوو، ئای لەو زبانە ئەفسووناوییەی کە تا هەنووکەش سیحری لێ کردووم، من ئیدی لەو رۆژەوە بەچاوێکی دیکە سەیری ئەو لێفە شڕەی خۆمانم دەکرد، ئەو تاکە لێفە کون کونەی من و خوشک و براکانمی دادەپۆشی.

**رامان: ئەی لە قۆناغی دواتر چۆن بوو..؟**
**شێرزاد حەسەن:** لە قۆناغێکی درەنگتر و تۆزێ کاملتر، لەسەرەتای قۆناغی ناوەندی، دیسانەوە بەرێکەوت پیاوێکی نیمچە مەلا، بەڵام مارکسی، دراوسێمان بوو رۆمانی **(نێچیر)ی (ئەمیل زۆلا)**م دەست کەوت و بەتاسووقەوە خوێندمەوە، بەحوکمی ئەوەی خوێندنم عەرەبی بوو، هەر زووش قورئانم خەتم کردبوو، کەوتمە خوێندنەوەی چیرۆک و رۆمان بەعەرەبی (**یوسف السباعی، محمد عبدالحلیم عبدلله**)

شێرزاد حەسەن و ئازاد عەبدولواحید لەناوەراستی حەفتاکاندا

رۆمانی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیتالی وەرگێردراو بۆ عەرەبی، هێدی هێدی بووم بە کرمی کتێبان، پارەم نەبوو.. دەچوومە کتێبخانەی گشتی، مامۆستاکانی زمانی عەرەبیم بە دارشتنەکانم **(انشاء)** سەرسام دەبوون، لەوەوە هەستم کرد لەهاوەڵەکانم جیام، ئیدی بەدزییەوە شیعرۆکەو میعرۆکەم دەنووسی، شەرو گێچەڵەکانی دایک و باوکمم دەنووسییەوە. ترس و شەرمی خۆم دەنووسییەوە، مەراق و دڵەراوکێ، هەنووکەش ئەو دەفتەرانەم ماون، لەپاڵ شیعری زۆر سادە.. بەپەخشانی سادەتر خەون و خەیاڵ و ختوورەی خۆم دەنوسییەوە، هەر بەدزییەوە، چاک لە بایەخی ئەدەب نەدەگەیشتم، گرنگ دەربڕینی هەست و نەستم بوو. پتر لە دەساڵ بەدزییەوە بەشەرمەوە شتی بێ سەرو بەرم نووسی.

**رامان : ئێمە هەندێ لە شیعرە سادەکانتمان لە بڵاوکراوەی (رۆشنبیری نوێ) دا دیوە، ئەی چی لەبارەی چیرۆکە سەرەتاییەکانت ؟**

**شێرزاد حەسەن:** یەکەم چیرۆکم کە سەرنجی خوێندەوارانی راکێشا لە ساڵی ١٩٧٥، چیرۆکی (ریشۆڵە) بوو، دیارە لەپاش ئەوەی پتر لە دە ساڵ خەراپترین شیعرم دەنووسی، بەڵام خۆم پێیان رەحەت دەبووم، کەف و کوڵی جحێڵانەی من بۆ مەسەلە نەتەوایەتییەکان و مەسەلە سێکسی و سۆزدارییەکەی گەلێ گەورەو کوشندە بوو، تەعبیرم لەسەرەتای سەرسامیم **(لەپاش باڵق بوون)** و گۆڕانی جەستەو دەروون هیلاکیان کردم، لەدژایەتییەکی گەورەدا دەژیام، چونکە پتر لە (١٢) ساڵ غەریقی لاهووت و ئایین پەروەری بووم، بەشێک لەو پرسیارانەم بۆ دڵەراوکێیەکی فەلسەفی دەگەڕانەوە، گەران بەدوای حەقیقەت، من کێم و بۆچی هاتووم و دەبێ چی بکەم؟ میتافیزیکا یەکەم دەریای پڕ گێژەن بوو تێی کەوتم.ئیدی لە قۆناغی ئامادەیی عەودالی فەلسەفە بووم، هەر زوو کەوتمە خوێندنەوەی **(فارابی) و (غەزالی)و(کندی)و (ئیبن روشد)**، کەم کەمەش فەلسەفەو ئەدەبیاتی مارکسی... تا هەنووکەش گەران بەدوای وەڵامی پرسیارە زۆرەکانمدا بەری نەداوم، قەتیش واز لەم مەراق و دڵەراوکێیە ناهێنم.

باوكی شێرزاد حەسەن

**رامان: تەئسیری بەشی ئینگلیزی وەک نووسەرێک چ بوو لەسەرت..؟**

**شێرزاد حەسەن:** پاش تەواوکردنی(بەشی ئینگلیزی) زیاتر لە ئەرکی پیرۆزی ئەدەب تێگەیشتم، تا ئەو حەلە هەرچی خەمی هەمبوون لەلام پیرۆز بوون، بەڵام ئەوسا نەمدەتوانی لە قاڵبێکی هونەریی تۆکمەدا دایانبرێژم. من عاشق بووم، بەڵام هیچم لە هونەری دڵداری نەدەزانی.

**رامان: شیعر نووسین لەلای تۆ هەڵچوونێکی هەرزەکارانە بوو، یان بە ئاسان تێی گەیشتبووی؟**

**شێرزاد حەسەن:** شیعر بۆ من هەڵچوونێکی هەرزەکارانەبوو، باری ناهەمواری سیاسی ئێمە وەک نەتەوە، بوو بەسەرەتای هەڵچوونێک، خۆناسین و نەتەوە ناسین دوو ناوەرۆکی سەرەکی شیعرەکانی ئەو سەردەمەی من بوون، جگە لەوەی کە من ئەوەندە ترسنۆک و شەرمن بووم دەبوو دەروازەیەک بۆ تەقاندنەوەی مەراق و ئارەزووە کپ کراوەکانم بدۆزمەوە، داب و نەریت و خولق و رەفتاری خێزان ، پێوەندییە نارێکەکانی نێو گەڕەک و کۆمەڵگە زۆری بۆ هێنام، خەراپ بەریەکدی کەوتین، دیارە ئاسانتر بوو هەواو هەوەس و هەستی شۆڕشگێڕانە و توورەیی خۆم لە قاڵبێکی شیعر ئاسادا دابڕێژم .. من پتر لەمانە لە خەمی سەرواو کێشدا بووم.. ئەو نامەیەی کەنەمدەوێرا بیدەمە دڵخوازەکەم دەمکرد بە شیعر، ژیانی پڕ لە نائومێدیم لە گەڕەکە میللییەکانی وەکو(گڵکەندو کووران) هەستی تیژتر کردم.

**رامان: ئەی گەڕەکی کوران و گڵکەند تا چ رادەیەک کار تێکردنیان بەسەرتەوە هەبوو..؟**

**شێرزاد حەسەن:** لە گەڕەکێکی میللی وەک ـ کوران ـ زۆربەی مێرد منداڵەکان شیعریان دەنووسی.. تا هەنووکەش نازانم سەرچاوەی ئەو مەیلە لە کوێوە هاتبوو، هەریەکەو شیعری بۆ کچۆڵەیەکی شەرمنی گەڕەک دەنووسی تەنها من نەبێ.. غیرەتی ئەوەم نەبوو ناوی کچێک بخەمە نێو یەکێ لەشیعرەکانمەوە، من بۆ کچێکی خەیاڵی شیعرم دەنووسی.. لە قۆناغی زانکۆ بووم .. ئەوسا وێرام بەدزییەوە حەز لە پلکەزایەکی خۆم بکەم.. ئیدی کە بەشیعر تەعبیرم لەو هەرایە نەکردایە، شێت دەبووم.. من وتم: بە شیعر .. شیعری کاڵ و کرچ مەراق و قەهری خۆم دەنووسییەوە.

**رامان: رووکردنە شیعر نووسین لە لایەک هەڵچوونێکی هەرزەکارانە بووە لەلایەکی دی واتزانیوە کارێکی ئاسانە، چۆن دوایی وازت لە شیعر هێنا ؟**

**شێرزاد حەسەن:** شیعر لەناو کوردو میللەتانی دیکەش باوە، هەر هەمووان بەشیعر دەستیان پێ کردووە ، خەڵک بە ئاسانتری تێدەگات، لەراستیدا ئەرکی

شاعیر قورستره، خەڵک وا دەزانێ تەنها دەربڕینی هەست و سۆزێکی پەنگ خواردوو بەسە بۆ ئەوەی شاعیر بێت، ماوەی پتر لە (١٠) ساڵ ئەو گەمەیەم کرد، دوایی زانیم خەمەکانم لەشیعردا جێگەیان نابێتەوەو پاش تێرامانێکی فیکری و هونەری و خوردبوونەوە لە ژیان هەستم کرد پانتاییەک هەیە ناوی چیرۆکە و دەتوانم شەڕی پێ بفرۆشم، دەتوانم شتی گەورەی تێدا بکەم، دیارە(٣-٤) چیرۆکی بەناوەرۆک جوان و بەشێوە ناشرینم لەو قۆناغەدا بڵاوکردەوە، دوای ئەوە تێگەیشتم کە بێ رۆشنبیرییەکی بەرفراوان و شارەزا بوون لە لق و بوارە جیاکانی ئەدەب و زانست و بێ خوردبوونەوە لە ژیان مەحاڵە چیرۆکی جوان بنووسم، دەبوو راستگۆ بم، کتێبەکان فێریان کردم جوان لە ناشرین جیا بکەمەوە، لەرێی کتێبەوە سەفەری خۆشم دەکرد، ماڵەکەمان تەنیا ژوورێک بوو، تەقینەوەی خەیاڵی من بۆ دنیای چیرۆک و رۆمان لەو ژوورە تاریک و داخراوەوە هات، سوپاس بۆ خەم و مەراق و ژوورە تاریکەکانی رۆح کە هەزار پەنجەرەیان پێکردمەوە، سەرەتا بەشیعر حەیای خۆم برد بە چیرۆک ئەو ئابڕووە تکاوەم کڕییەوە، وابزانم دوای «**ریشۆڵە ـ ١٩٧٥**» نەموێرا چیتر شتی ناشرین بنووسم، لە نهێنی رەگەزو سیحری چیرۆک گەیشتم کە کارێکی گرانە وەک ـ **کاترین مانسفیلد** ـ گەیشتمە ئەو قەناعەتەی چیرۆک ئەو باڵەخانە، یان دیوارەیە ئەگەر خشتێکی لێدەر بهێنی زەق دیارە، دەبێ حیساب بۆ هەر رستەیەک و وشەیەک لە چیرۆکدا بکەیت، چیرۆک لە چامەیەکی لیرکی ـ غنائي ـ دەچێت، بەهەناسەی شیعر چیرۆکێک نەنووسیت ناگاتە خوێنەر..

**رامان: ئینجا پێش ئەوەی بچینە سەر کێشە هونەرییەکان، باسی ئەوە بکەین تۆ لەو دەستپێکردنە چۆن ڕووبەڕووی دەوروپشتی خۆت بوویتەوە، تا چ رادەیەک بەرەنگاربوونەوەت لەگەڵ دەوروپشتی خۆت هەبووە؟! ئەو دەوروپشتەی زۆر جار ئیستیعابی ئەوە ناکات کەسانێک خۆی بۆ ئەدەب و رۆشنبیریی یان بۆ خەمی نووسین تەرخان بکات..؟**

**شێرزاد حسەن:** هەڵبەتە من لەخێزانێکی نەخوێندەوار گەورە بووم لەگەڕەکەکەی ئێمەش «کووران» وابزانم یەکەمین کەس بووم چوومە زانکۆ، هونەرمەند ـ دارا محەمەد عەلی ـ پێش من چوو بوو بۆ ـ هونەرە جوانەکان ـ، لە ژینگەیەکی وادا پێیان وایە کە تۆ نەخۆشیت گەر خەریکی خوێندنەوەی کتێبان بیت، من جەژنانیش دەچوومە دارستانەکەی ـ کوران ـ و دەمخوێندەوە، بێ بەرگ و پارە بووم، شتێکی سەیرو سەمەرە بوو تۆ خەریکی ئەدەب بیت، مامۆستای وام هەبوو کە هەستیان کرد بەهرەم تێدایە یارمەتییان دام، گۆڤارو نامیلکەیان پێدەبەخشیم، بەتایبەتی هی زمانی عەرەبی و کوردی، من قەرزاری هاندانی دوو مامۆستام (**مەلاعوسمان**) و (**تەحسین عومەر**) لە هەولێر.. بیرمە لەبەر چاوی قوتابیان بۆ «**انشاء**» خوێندنەوە هەڵیان دەستاندم، هەندێ لەو خزم و هاوڕێ کۆنانەم ئێستەش گاڵتەیان بەمەیلە ئەدەبییەکەم دێ، ئەدەب و هونەر لە جیهانی سێیەمدا.. لای ئێمەومانان کەمالیاتە، کەمالیات ئەوەیە تۆ دەتوانی فەرامۆشی بکەیت، بەڵام لای من ئەدەب پیرۆزترین مەسەلەیەو زووش هەستم پێکردووە کە هەرچی دڵشکاو، و

رووشکان و سەرشکان و رۆح شکان هەیە لەناو ئەدەبدا تەعویزم پێداوە، لەقۆناغە ناسکەکانی جحێلێمدا زۆر جار بیرم لە ـ **خۆکوشتن** ـ دەکردەوە، بەڵام ئەدەب نەی هێشت خۆم بکوژم.

**رامان: ئەگەر نەبوویتایە بە نووسەر، بیرت بۆ چ پیشەیەکی دی دەچوو...؟**

**شێرزاد حەسەن:** ئەگەر خۆم لەناو ئەدەب و هونەردا نغرۆ نەکردایە ئەوە کەسێکی دیکە دەبووم، رەنگە چەقۆکێش.. بەدمەست.. یان ـ دزێک ـ بوومایە، سوپاس بۆ ئەدەب کە رزگارکەرە.. بەلامەوە ئاینێکی نوێیە پاکی کردمەوە، لەخۆم و لەخەڵکی حاڵی کردم، ئەدەب تەنیا دەروازەیەکە ئەو حەقیقەتانە دەڵێ کە زۆر کەس درکی پێناکات و بەو حەقیقەتانەشت دەناسێنێ کە تۆ لەمێژە بۆی **عەودالیت ـ سەلمان روشدی ـ دەڵێ « ئەدەب حەقیقەتەکەی لەوەدایە ئەو شتانە تۆمار دەکات کە مێژوو فەرامۆشی کردوون»**.. من ئەو شتە فەرامۆشکراوانە دەنووسمەوە کە مێژوو نایڵێت، چیرۆکی کورت فەلسەفەکەی ئەوەیە پاڵەوانی فەرامۆشکراو بهێنێتە ناو دنیاو فرێی دەیتە بەردەمی خەڵک و بڵێی هانێ لەبوون و نهێنییەکانی ئەم زاتە فەرامۆش کراوانە رابمێنە..

**رامان: خوێندنەوەی ئەدەبیاتی ئینگلیزی بە تایبەتی شانۆنامەی ـ لەچاوەڕوانی گۆدۆ ـ دا هۆیەک بووە بۆ گۆڕینی رێڕەوی فیکری و رۆشنبیری تۆ.. ئایا ئەمە راستە..؟**

**شێرزاد حەسەن :** من لەسەرەتادا غەریقی لاهووت بووم، تا ئەو ساتەی «چاوەڕوانی گۆدۆ»م لە قۆناغی چوارەمی بەشی ئینگلیزی کۆلێژی ئاداب خوێندەوە، لەو پیاوە دەچووم کە بڕوات و هەمیشە سەیری ئاسمان بکات، هەرگیز نەزانێ زەوی چی تێدایە، واتە من بەرپێی خۆم نەدەدیت تا ئەو ساتەی بەو پیاوە مەزنە ئاشنا بووم کە ناوی ـ صەمۆئیل پکیت ـ ەو یەکێکە لە موریدانی یان نووسەرانی شانۆیی ـ عەبەس ـ، بەرای من فیکری ئەم نووسەرە پڕە لە مەسەلە ئینسانییەکان جگە لە بینینی ئەو نهێنی و حەقیقەتانەی کە زۆر جار ئایدۆلۆژیا رەسمییەکان کوێرانە دەیبینن، رەنگە گەشبینییەکی درۆزنانەت بدەنێ، راستە ئەمیش رەشبینی دەدوێنێ، بەڵام رەشبینییەک کە لەو دیوەوە هانت بدات باوەش بەژیاندا بکەیت و بۆ حاڵەتێک لە گۆڕان بگەڕێیت ، **ـ صەمۆئیل پیکیت ـ** دەڵێ « هیچ بەزەییەک نە لە ئاسمانەوە دێ و نە لە زەوی، تۆ لە ناوەڕاستی ئاسمان و زەویدا هەڵواسراویت، من لەو پیاوە دەچووم کە بەردەوام سەیری حەوا بکات تا دەکەوێتە ناوبیرێکی قووڵ، ئیدی لەوە بەدوا فێر دەبێ سەیری بەرپێی خۆی بکات، دیارە ـ صەمۆئێل پیکیت ـ کە تێیگەیانم دنیا پڕی لە مەرگەساتە، دیدێکی کارەساتاوی بەخۆرسکی کە هەمبوو لەرێی ئەو تۆزە رۆشنبیرییەی خەریکی بووم، ئەم بەتەواوی دیدە کارەساتاوییەکەی لام بەرجەستە کرد، یەکەم راچەنین، یەکەم شەپازللە کەوا ، لەو خەوە خۆشەی کەتیایدا دەژیام لەو سەردەمەدا بەئاگای هێنام ـ گۆدۆ ـ و فەلسەفە تراژیدیەکەی ـ بیکیت ـ بوو، فیکری ئەو کابرایە هەموو ژیان و روانینی گۆڕیم.

**رامان: کەواتە پێت وایە هونەرمەند دەبێ دیدێکی تراژیدیانەی هەبێ بۆ ژیان..؟**
**شێرزاد حەسەن :** دیدێکی تراژیدیانە بۆ هونەرمەند زۆر پێویستە، زۆر ئەدیب و هونەرمەند هەن گۆرانی بۆ خۆشنوودی دەڵێن، بەس کەسێکی تر هەیە پێت دەڵێ تۆ دەتەوێ خۆش خەیاڵ بیت، سەیری گۆی زەوی بکە بزانە چۆن غەرقی خوێنە غەرزی کارەساتە، زۆرن ئەو ئایدۆلۆژیاپەرستانەی فریوت دەدەن.. بەڵام تائێستە ئادەمیزاد لەنێو زەلکاوەکاندا مەلە دەکات، من لەسەر ئاستی مرۆڤایەتی دەیڵێم نەک بەتەنیا لەسەر ئاستی کوردو خۆرهەڵات، رەنگە کورد تاکە میللەتێک بێت کە بەگیانێکی عەبەسیانە لەگەڵ مێژووی خۆیدا مامەڵە بکات، ئەو رۆحە عەبەسییەی لای - صەمۆئیل بیکیت - ە مێژووی کوردم پێ خوێندۆتەوە، چاوێ بە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆماندا بگێڕەو بزانە چ عەبەسێکە.. بەڵام بێ فەلسەفە..
**رامان: یەکەم رۆمان - نێچیری - ئەمیل زۆلا بوو کە خوێندووتەوە، ئایا ئەوە دەگەیەنێت کەتۆ لەگەڵ کەلتووری رۆشنبیری کورد بەتایبەتی لایەنە ئەدەبییەکەی دابڕانێکت هەبووبێ، ئایا ئەوە بەئەنقەست بووە یان مەبەستت بووە وا بێ ؟**
**شێرزاد حەسەن :** لەگەڵ خوێندنەوەی رۆمانی عەرەبی و بیانی لە قۆناغی زانکۆش هێدی هێدی بەیارمەتی زمانی ئینگلیزی و هەر لەو قۆناغەدا کەوتمە خوێندنەوەی ئەدەبی کوردی، بەڵام هیچ شتێکی ئەوتۆ سەرسامی نەدەکردم.. سەرەتا بە ئەدەبی کوردی ئاشنا نەبووم، تەنیا ئەو ئەدەبە نەبێت کە لە قوتابخانەکان خوێندبوومان، پتر ئەدەبی غەیرە کوردی سەرسامی دەکردم.. لە سەرەتاوە من کەوتبوومە گومانەوە کە ئەدەبێکی باشمان هەبێ، بەڵام کۆمەڵێ شاعیرم دەناسی لەتازەوە تا کلاسیک رەنگە ئەو دڵەراوکێیەی کە هەمبوو تینووی شتی نوێ دەکردم کە سەیری کتێبخانەی کوردیم دەکرد ئەوشتانەم تیادا نەدیت کەتینوێتیم بشکێنێ بۆ نموونە: من هەر زوو خولیای دەروونزانی و فەلسەفە بووم لەپاڵ رۆمان کوا ئەو رۆمانە جوانانەی لەو کات و سەردەمەدا بەکوردی نوسرابوون؟ ئیتر بەحوکمی عیشقی خۆم لەگەڵ شیعر و چیرۆکی نوێ کەوتمە چاودێری کردنی ئەو جووڵە ئەدەبییەی ئەو سەردەمە، روانگەو هەراکانی، بەڵام هەستم دەکرد لەناو کۆمەڵێ گەمەی شکڵبازیدام، لەکاتێکدا من هەمیشە ناوەرۆک لەلام زۆر پیرۆز بووە، گەران بەدوای مانا، لەبەر ئەوەی کورد زۆری ماوە بەدوای مانادا بگەرێ، گەرانی من بەدوای مانا لەمەیدانی ئەدەبی کوردیدا ماندووی کردم، ئەو مانایەم بۆ نەدۆزرایەوە، مەبەستم یەک مانا نییە بەڵکو چەندین مانا، دەگەرام دەستم نەدەکەوتن، بۆ نموونە: کۆمەڵێک چیرۆکی کوردیم خوێندەوە کەئەو کات عاشقی چیرۆک خوێندنەوە بووم هیچ تامێکم لێ نەکردن.. تاک و تەرا نەبێت.. هەمانە چوار کۆمەڵە چیرۆکی هەیەو چوار رستەی جوانی تێدا نییە..
**رامان: تۆ ئەو کاتە ئەو هەستە رەخنەییەت هەبوو ئەو بڕیارە توندە بدەی..؟**
**شێرزاد حەسەن:** دیارە بەدبەختی من لەوەدا بوو کەدەستم بۆ چیرۆکنووسە زۆر خراپەکان برد.. ئەویش پتر وای لێکردم برەومەوە.. حەزناکەم ناویان بێنم، چونکە لیستەکە زۆر درێژە، سەیرە لەپاش خوێندنەوەی کۆمەڵە چیرۆکەکان هیچ سیحرێک

بەجێ نامێنێ، کەچی بۆ چەندین جار چیرۆکەکانی **(چیخۆف)**و **(مۆپاسان)** م دەخوێندەوە، بەهەرحاڵ زۆرکەم بوون و هەنووکەش دەگمەنن ئەو چیرۆکانەی من شاگەشکە دەکەن، لەم رووەوە کتێبخانەی کوردی هەژار بوو، تا ناوە درەوشاوەکانی سالآنی حەفتاش زۆر کەمن، بەڵام پاش تۆرانێکی کەم هەر زوو هاتمەوە ناو ئەدەبی کوردی چ بەنووسین و چ بە خوێندنەوە، تەنیا سەرچاوەیەک لە کەلتوری کوردیدا کە من قەرزارباری بم گەڕانەوەمە بۆ نێو داستان، گەڕانەوەمە بۆ یادەوەری منداڵی و حیکایەتەکانی داپیرەو پیرێژنەکان..

**رامان: تۆ تەئکید لەسەر گەڕان بەدوای مانا دەکەیت، یان باشتر وایە بڵێین کۆمەڵێک ناوەرۆک، ئەوەی موتابەعەی ئەدەبی داهێنەرانەی دنیای کردبێت هەر لەسەردەمی گریک و یۆنانەوە تا بەرۆژی ئەمرۆ دەگات.. سەیر دەکا ئەو بابەتانەی کە داهێنەر بەکەڵکی هاتوون بۆ نووسین لە (٥) بابەت ناترازێت، لەوانەش میحوەری ئینسانە لە رووبەڕوو بوونەوە و ئایندەی خۆی کە نادیارە.. مەسەلەی زەمەن بە هەموو ئەبعادەکانییەوە، مەسەلەی خۆشەویستییە، دادوەری کۆمەلآیەتی و ئیغترابە، گەر بتەوێت لە هەر چیرۆکێکدا مانا بدۆزیتەوە لەیەکێک لەو خانانەدا دەتوانین جێگەی بۆ بکەینەوە، رەخنەگرانی ئەدەب تەئکید لەسەر (مانا) ناکەنەوە بەقەد ئەوەی چۆنیەتی وتن وتەرح کردنیان مەبەستە، پێت وایە تۆ دیدی تایبەتی خۆت هەیە بۆ دەربڕین و بۆچوون و گۆشەنیگات لەگەڕان بەدوای مانادا..**

**شێرزاد حەسەن:** راستە گرنگ نییە تۆ چ دەڵێی بەڵام چۆنی دەڵێیت گرنگە؛ وابزانم زۆر دوودڵم لەتەکنیک تۆ خوازیاری مانایەکی جوان بیت بەبێ شێوەیەکی جوان ناشێت، دیارە ئەو دووشتە بە گۆشت و خوێنی دەشوبهێنم، نەمویستووە کوێرانە لاسایی کەس بکەمەوە، من ـ جێمس جۆیس ـ م خوێندۆتەوە دەزانم شەپۆلی هۆش چییە مۆنۆلۆژ چییە، بەڵام چاک تێدەگەم گەر لاسایی **(جیمس جۆیس)** بکەمەوە هیچ بەهیچ ناکەم، دەزانم خاسیەتی کاراکتەری سەرەکی و لاوەکی لەچیرۆکدا چۆنە، بەڵام زۆر لەخەمی ئەوە دام ئەوەی دەیڵێم لەبەرگێکی هونەریدا بێت، تۆ خۆت رەخنەگریت و زۆر چاک هەستت پێ کردووە کە مانا بەقوربانی تەکنیک، یان تەکنیک بەقوربانی مانا ناکەم، نموونەی فانتازیای ئەدەبی ئەمەریکای لاتینی دەناسم، بەڵام ئەو فانتازیایەی گەرەکمە رەگ و ریشەی دەگەڕێتەوە سەر خورافەو ئەفسانەو ژیانی ئێستەی کورد کەپڕە لەسیحرو ئەفسانەو خورافات، وەک شێرزاد رەگ و ریشەم لە کلتوری خۆمدا هەیە وەک کوردێک، کەسانێک شتێکیان کردووە من لاسایی کەرەوەی ئەوان نیم، دەبێ شتێ بکەم من تیایدا زاڵ بم، فانتازیاکەم لاسایی کەرەوەی (مارکیز) نەبێت، فانتازیای کوردانە بێت. لەم دەساڵەی دواییدا خەریکی گەمەیەکی لەو

**ئەو لایەنە فەرامۆش کراوانە دەنووسمەوە کە مێژوو پشت گوێیان دەخات**

بابەتەم «حەسار» نموونەی بەرجەستەی ئەم حاڵەتەیە..

**رامان: ئەم فانتازیا کوردانەیەی باسی دەکەیت، محەمەد مەولودمەم ـ یش هەیەتی بەتایبەتی لە ـ پایزە خەون ـ دا هاتووەو سوودی لە ئەفسانەی کوردی وەرگرتووە بۆ ئەوەی هونەرییانە لەناو نۆڤلێتێکدا بەکاری بهێنێ، مەبەستمان ئەوە نییە باسی ئەوە بکەین چیت زاڵ کردووە بەسەر چیدا، بەقەدەر ئەوەی مەبەستمە مانا هەرچییەک بێت، ئەوەندەی گرتنی مانا مەبەستە، ئەوەندەش چۆنیەتی تەرح کردنی ئەو مانایە مەبەستە کە خۆی بۆ خۆی تەرح کردنەکە دەبێتە تەکنیک بۆ چیرۆکەکەو چوارچێوەیەکی هونەری پێک دەهێنێ، لە باسی مارکیزو ئوستریاسدا باسی محەلییەتیشت کرد، زۆربەی ئەو رۆمان و نۆڤلێتانەی بەردەستمان کەوتوون و خوێندومانەتەوە هەمووی ئەدەبێکی زاڵن بەسەر ئەدەبی جیهانیدا، لەم چەند ساڵەی دواییدا هەر ئەوان ئیحتیکاری خەڵاتی نۆبلیان کردو سوودیان لە محەلییەت و کەش و هەوای خۆیان و کولتوورو ئەفسانەو داب و نەریتی دێرینەیان وەرگرت، لەوەوە قووڵ بوونەوەیان دایە ئەو مەوروثە و مامەڵەیەکی هاوچەرخانەیان لەگەڵدا کرد، دوای ئەوەی بووە بەشێک لە دیدو تێڕوانین و خەیاڵ و زەوقی ئەوان، تا چ رادەیەک وەک چیرۆکنووسێک و کەسانی تریش لە دەوروپشتی خۆت توانیوتانە ئەو مەوروث و داب و نەریتانە لە محەلییەتی خۆتانداو لەناو چیرۆکەکانتاندا مۆرکی هاوچەرخانەی بدەنێ..؟!**

**شێرزاد حەسەن:** تۆ چەند پابەند بیت بەناوچەی خۆت و بە گەڕەک و شاری خۆت ئەوەندە زیاتر روو لە دنیا دەکەیت نەک بەپێچەوانەوە، هەمانە دەیەوێ بیسەلمێنێ کە جیهانبینییەک لە بۆچوون و فیکری ئەمدا هەیە، واز لە شتە تایبەتییەکانی خۆی دێنێ، بە قەرز لە کۆشکی خەڵکیدا دەژی نەک لە کەلاوەی خۆی، دەیەوێ بە درۆ شاگردێکی تەمبەڵی **(رامبۆ)** و **(ئیلیەت)** بێت، بۆیە نەخۆیەتی و نە خەڵکە، بۆ مەسەلەی جیهانبینی من.. تەقەڵلامە کە هەمبێ، رەخنەگران و خوێنەران ئەو بڕیارە دەدەن نەک من، بۆ فانتازیا یان هەر رەگەزێکی تری ئەدەب و هونەربێت من دیسانەوە دابڕ نەبووبمە لە فروفێڵەکانی، لە خەڵک و لە ژیان و لە خۆدیتنەوەو لە گەڕان بەدوای نهێنییەکانی خەڵکدا عەودالم.. من وێنەیەکم دەربارەی خۆم هەیە و لای خوێنەریش دەزانم چۆنە، ئاگام لە هەموو کاردانەوەیەکە، پابەستی ئەم ژینگەیەی خۆمم، دەمەوێ بێمەوە سەر فانتازیاو بڵێم لە کتێبە ئاینییەکانیشدا هەیەو رەگ و ریشەی گەلێ دوورو قووڵە کە رەنگە میللەت نەبێت ئەدەبی بێ فانتازیا بووبێت، دەتوانیت بڵێی ـ گۆگۆڵ.. کافکا.. دۆستۆیڤسکی.. هەموو فانتازیا خواز بوون، بەڵام من بۆ خۆم زۆر لەخەمی ئەوەدا بووم کە بەراستی کەسەکان، شوێنەکان، زەمەن وەک کەس و شوێن و زەمەنی کورد وەسف بکەم، زەمەنی خۆرهەڵات و زەمەنی خۆرئاوا جیایە، من هەرگیز ناچم لاسایی **«ئالان رۆب گریێ»** بکەمەوە تا بیسەلمێنم جیهانیم، قەتیش چێژم لێ وەرنەگرتووە، بەڵام ئەو هەر رۆماننووسە، من وەک شێرزاد تێڕامانی خۆم هەیە، بۆ مەسەلەی محەلییەت قەرزاری زۆری **(چیخۆف)** و **(مۆپاسانم)**، لەرێی ئەم دوو زاتەوە کە مامۆستای

هونەری کورتە چیرۆکن، عاشقی کورتە چیرۆک بووم و بینیم هەردووکیان زۆر پابەستن بە ژینگەو خەڵکی خۆیان و شتە تایبەتمەندییەکانی روسیاو فەرەنسا، بۆیە سیحری ئەدەبی ئەمەریکای لاتینیش لەوەدایە کە زۆر محەلییە، دۆستۆیفسکی تا سەر ئێسقان روسییە بۆیە جیهانیشە، سەرتاپای جیهانیش لەبەر ئەوە دەیخوێننەوە، چونکە زۆر روسییە، تۆ چەند پابەستی ئەو ژینگەیەی خۆتی سیحر لەوێدایە، وابزانم لە ماڵەکەی خۆتەوە دەتوانیت هێرش بەریتە سەر دنیا، نەک لە دنیاوە هێرش بەریتە ناوخۆت، لای من هاوکێشەکە دەبێ بەو وردییە سەیر بکرێت ئەگینا لینگەو قووچ دەردەچێت..

**رامان: لەسەردەمی لاوی خۆت ئەو کەشوهەوا رۆشنبیرییەی لە هەولێر هەبوو، چۆنی تێگەیشتی، ئایا توانیت تێکەڵاوی بیت، چ کاریگەری لای تۆ جێ هێشت، ئەو بزاڤەی لەو سەردەمەدا هاوتەمەن و هاوخەمەکانی تۆ هەیانبوو چۆنی دەبینی؟!**

**شێرزاد حەسەن: وەک وتم بەترس و شەرمەوە تێکەڵ دەبووم، ئەوە خەسڵەتی خۆم بوو، دوورە پەرێز بووم، بەڵام بەوردی چاودێری هەموو جووڵەیەک بووم لە کوردستانداو من نەخشەیەکی لەت و پەتم لەو سەردەمەدا لەلابوو، نەخشەیەکی ناکامڵی داهێنان، من لە نزیکەوە تۆ و گۆشاد حەمە سەعیدو مەولود ئیبراهیم** حەسەن ـ م دەناسی، لە دوورەوەش سوپایەک لە ئەدیبی دەم بەهەرا، هەر لەو سەردەمەدا ئەلف و بای مارکسییەت لە شەهید **(حەیدەر کەریم)**ەوە فێر بووم، محەمەد مەولود **(مەم)** لەوەچەی پێشین وێستگەیەک بوو.. **عەبدوڵڵا پەشێو** ئەستێرە بوو.. من دەمویست بزانم **سەعدوڵڵا پەرۆش و شەهید جەمیل رەنجبەر** چ دەڵێن.. زەندەقم لە پلارەکانی **(مەحموود زامدار)** چوو بوو.. لەگەمە شیعرییەکانی **(عەباس عەبدوڵڵا)** رادەمام، ئیدی من لەو ئاشەدا دەمویست باراشێکم هەبێ.. وەلێ زۆر زەحمەت بوو.. ناکرێ مامۆستا (عەزیز گەردی)م لەیاد بچێ.. لەو وەچەیە بووم کە بەشەرمەوە تێکەڵ بە ئەدەب بووم، وەکو ئەوەی خەریکی قاچاغچییاتی بین، نازانم رەفتارمان کەمێ شەرمنانە دەینواند، رەنگە هۆی ئەوەش بێت کە ئەدەب کەشفی شتەکانی ناوەوەیە، ئێمەیش هێندە لەو سەردەمەدا بەغیرەت نەبووین، جووڵەیەکی بەرچاو هەبوو هەندێکیان ئێستەش لەکەش و هەوای هەرایەکدان، لە شەرێکدان، بەشێکیان توانییان بگەنە ئەو ئاستەی بخوێنرێنەوە، بەڵام هەندێکیان تا ئێستەش هاوار دەکات، دەیەوێ بیسەلمێنێ ئەدیبە یان نووسەرە یان شاعیرە کەم و زۆر من بەشەرمەوە چاودێری ئەم مەیدانەم دەکرد، تۆ وردتر لەمن موتابەعەی ئەوانیشت کرد، لە هەولێر مەبەستم نییە ناو بژمێرم، بەڵام بۆ خۆم چاودێری هەموو هەوڵێکی باش و خراپم دەکرد..

من یەکێک بووم لەوانەی سوور بووم و وازم نەهێنا، بەڵام لەو سەردەمەدا کەشوهەوایەکی خۆش هەبوو، لە ساڵانی حەفتا، هەراو هوریایەک پەیدا بوو، کلکی کەری تێدا دەپچڕا کەمێک ئاگامان لە هەرای سلێمانی هەبوو، بەڵام زۆر ناخۆشە بۆ من ئێستە بەو پەلەپەل و بەسەرپێی بتوانم نەخشەیەکی زۆر جوانی

جوولّەی رۆشنبیری ئەو سەردەمە بکێشم، چونکە ئەگەر بکەوینە ناوهێنان رەنگە پێم بڵێی قەرزاری کێ بوویت بڵێم قەرزاری کەسێک بووم کە کتێبێکی دابێ بەمن بیخوێنمەوە.. خۆ زۆر کەس هەبوو لەو سەردەمەیدا قۆناغێکی باشیان بڕی، هەشیانبوو وازیان هێنا، هەندێ لەو برادەرانە کە ژنیان هێنا، ئیدی وازیان هێنا هەندێکیش گەرداوی ژیان لەگەڵ خۆی بردنی...

**رامان: بێینە سەر قۆناغی زانکۆت، تۆ لێرە وێستگەیەک لە ژیان و رۆشنبیریت و لە نووسینت دەست پێدەکات، کە پێوەندی بە ئەدەبەوە هەیەو پەنجەرەیەکیشە کە لەوێوە ئەدەبیاتی جیهانیت ناسیوەو بە شتی باش ئاشنا بووی، ئەمە کاریگەری راستەوخۆی بۆ پێکهاتەی کەسێتیت هەیە، لەرووی رۆشنبیرییەوە حەز دەکەین باسی ئەو قۆناغەمان بۆ بکەیت کە جوداوازە لە قۆناغی گەنجایەتی و منداڵیت، وەکو رۆشنبیرێ کە کاریگەری هەبوو بێت لەسەرت.. زۆر مامۆستای وەکو عەبدولواحید لوئلوئەو ئەوانەی وانەیان پێ دەوتی چ کاریگەرییان هەبووە لەسەرت..؟!**

شێرزاد حەسەنی مێردمناڵ

**شێرزاد حەسەن:** ئەو چوارساڵە گەیشتمە قەناعەت کە من باش لە ئەرکی ئەدەب نەگەیشتبووم هەمووی نووسینەوەی هەندێ ختوورەو خەون و ترس و شەرمەکانی خۆمن و هیچی تر، تا ئەو حەلە بەسەقەتی لە کێشە نەتەوەیی و سۆزدارییەکان دەدوام.. دیارە ئەدیبی سەقەت زۆرن کە تەمبەڵانە پەنا بۆ سێکس و نیشتمانپەروەری دەبەن، ئەوانە دوو شتن گەر بتەوێ ناچیزانە خەڵک بوروژێنی و لە خۆتیان کۆ بکەیتەوە پشتت دەشکێ و ریسوا دەبیت، بەڵام ئەدیبی زۆر خاوەن ئەزموون گەمە لەناو ئەو دوو مەسەلەیەدا دەکات، گوایە سبەینێ ئەدیبێکی ناوداری لێدەردەچێت، لەبەرئەوەی باسی پیرۆزیی نیشتمانی کردووە یان باسی سێکس و مەسەلەکانی ئافرەتی کردووە، زوو زانیم هیچ شتێکی پیرۆز نییە، هەموو شتێک دەکرێت، ئیبلیسترین و سادەترین و پیسترین شتی ئەم دنیایە گەر تۆ هونەرمەند بیت دەتوانی پیرۆزی بکەیت ـ ئیدیث ستوێل ـ دەڵێت: (شیعر جێگەی پەپوولەو شێری تیا دەبێتەوە) رەنگە ئەم پێناسەیە بەگشتی بۆ ئەدەب زۆر چاک بێت، چۆن جێگەی پەپوولەو شێر دەکەیتەوە کە دوو شتی سەیرو دژوارن بەیەکتر، لەو چوارساڵەدا فێربووم بە شەرمەوەو کەمتر بنووسم، لە خۆم خوردبمەوە، بۆ ماوەیەکیش وەستام ئیتر من زانیم گاڵتە بەخۆم و خەڵکیش دەکەم، ئەو چوارساڵە ئەزموونێکی پڕ بوو بۆ من، ئیدی فێربووم ئابڕووی شیعر نەتکێنم، مامۆستا زیرەکەکانی ئەدەب فێریان کردم لەگەڵ (ئەدەب) بە ئەدەب بم. دیارە لەرێی شیکردنەوەی گۆرانییەکی فەیرووز تا شیکردنەوەی وێرانە خاکی (ت. س ـ ئیلیوت).. د. عەبدولواحید لوئلوئە فێری دەکردین، هەر لەوێ بە دیکنزو

## دیدێکی تراژیدیانه بۆ هونەرمەند زۆر پێویستە

لۆرانس و جۆیس و میللەر ئاشنابووم، زۆرجار پرۆگرامی زانکۆم فەرامۆش دەکردو تەنیا لەبەر ئەوەی نووسەرێکی باشتر بناسم، ئەو چوارساڵە رەنگە گەر بچووبامایە بەشێکی تر نازانم بایی چەند قازانج و زەرەرم دەکرد، بەڵام بەراستی دارشتنی هەیکەلی ئەدەبی من لەو چوارساڵەدا زۆر پێگەیشت، دیارە من عیشقی ئەوەم هەبوو دوای ئەوەش واز نەهێنم و لەسەر گەمەی داهێنان سوور بووم، زۆر رۆمان هەبوون بەعەرەبی دەمخوێندنەوە بەرلەوەی لە زانکۆ بیانخوێنمەوە، کە گفتوگۆ دەکرا من باگراوندێکم لەبواری ئەو رۆمانە یا شانۆگەرییە یا شیعرە هەبوو، زۆر شاعیرو چیرۆکنووس و رۆماننناس کە نەمدەناسین لە زانکۆ ناسیمن، من ـ لۆرەنس ـ م نە دەناسی، لە زانکۆ بە خزمەتی گەیشتم..

**رامان: ئێستە باسی ئەوە بکەین کە تۆ لە ماوەی زانکۆدا وەک ئەزموونێک سوودت وەرگرت، تا چ رادەیەک ئەو کاریگەرییە لەسەر بەرهەمەکانت رەنگی دایەوە..؟**

**شێرزاد حەسەن:** بڕواناکەم تۆ بەبێ دەروازەی تر هیچ ببینی، چەند پەنجەرە بکەیتەوە، چەند دەرگە لەسەر خۆت بکەیتەوە، ئەوەندە زیاتر هەوای سازگارت بۆ دێت، لەرووی فیکری و ئەدەبی و هونەریشەوە هەروایە، نازانم هیچ ئەدیب و نووسەرو چیرۆکنووس و شاعیرێک لە دنیادا نییە پەنجەرەی لە خۆ داخستبێ و فێری هیچ بووبێت، دەکرێت بەژمارەی ئەو کتێبانەی دەیخوێنیتەوە پێوانە بکرێت چەند کەڵکت بینیبێ، من گەر نەبوومایە بە کرمی ئەو کتێبانە نازانم ئێستە چیم دەکردو چۆن دەمتوانی کۆمەڵێ عاشق لە دەوری خۆم کۆبکەمەوە، من چوومە بەشی ئنگلیزی تا دەروازەیەکی تر لەسەرخۆم بکەمەوە، رۆمانووس و چیرۆکنووس و شاعیرمان هەیە دەڵێ چ ئیشم بە دەروونزانی هەیە، چ کارم بە کۆمەڵناسی و مێژووەوە هەیە، لە تەنیا بازنەیەکدا گیری خواردووە بۆیە نازانێ چی بکات، لە چیرۆک و شیعرو رۆمانەکەشدا سەقەتە، چونکە ئاسۆی ترو پەنجەرەی تری بەسەرخۆدا نەکردۆتەوە، ئەگەر ئینسکلۆپیدی نەبیت قازانج ناکەیت.. من دەمەوێ هەموو شتێک بزانم، دەمەوێ بزانم ئەخلاقی جاڵجاڵۆکە چییە، زۆر خولقم لەگەڵ باڵندەو ئاژەڵدا هەیە، نازانم بۆ..؟ بەڵام ئێستە ئەو خولیایەم هەیە، لە قۆناغی دڵەراوکێی فیکریدا فەلسەفە خولیام بوو، قۆناغی خۆناسینم بە دەروونزانی بوو، شتێک کە بایەخی نەبێت بۆت تۆ دەبێ بڵێی گەورەترین بایەخی بۆم هەیە، تۆ نازانی لەکوێ و چۆن کەڵک وەردەگریت، لەکام کتێب و سەرچاوەو شوێن کەڵک وەردەگریت.. مەسەلەی دەقیش، دەقێک نییە ساغ و سەلیم، دەقێک هەیە پشت

ئەستوور بە هەزاران دەقی پێش خۆی، تۆ دەبێ چەندین پلەو قۆناغ و چین بەناو ئەو دەقە شۆڕبیتەوە، ئەو دەقە چەندین چینی هەیە..

وەک ئەوە وایە بڵێی چیرۆکی عیشق هەمووی لەیەک دەچن، بەقەد ژمارەی چیرۆکەکانی عیشق، عیشقی جیاوازو حاڵەتی جیاواز هەیە، ئەمە خوێندنەوەیەکی خراپە، یان کورت هێنانە لە خوردبوونەوە، تا ئێستە خوێنەرو تا ئەدیبی کوردیش سەرئاو کەوتووەو نەچۆتە ژێر ئاو، ئەگەر دەق بەدەریایەک بشوبهێنین چ فایدەیە نەتوانی بچیتە چینەکانی ژێرەوە تا هەموو گەوهەرو ماسی و نەهەنگ و شتە بزرەکانی ئەو دەقە بخوێنیتەوە..

**رامان: ئەزموونت لە مەیدانی نووسینی چیرۆک هەیە، لە چیرۆکی کوردیدا شارەزاییت پەیدا کردووە بەشێوەی گشتی لەکۆن و ئێستەدا واقیعی چیرۆکی کوردی چۆن دەبینی، کە بەرای من چیرۆکی کوردی ئێستە لەتەڵەزگەدایە؟**

**شێرزاد حەسەن:** زۆر بە کورتی و بەوردی، چونکە ئەو پرسیارە بۆ خۆی گفتوگۆی درێژ هەڵدەگرێت، ئەگەر تەڵەزگەیەک هەبێت یان حاڵەتێکی نالەبار بۆ چیرۆکی کوردی هەبێت لە ئێستەو کۆندا ئەوە پێوەندی بە کۆمەڵێ شتەوە هەیە یەکێ لەوانە: زۆربەی ئەو برادەرانەی چیرۆکیان دەنووسی لە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدەوە تا ئەوانی ئەمڕۆو گەنجەکانیش لە خەمێکی سیاسییەوە هاتوون و لەبازنەی خەمە سیاسییەکان دەرنەچوون، وەک وتم مەسەلەی نەتەوەیی و نیشتمانی یەکە خەمی زۆربەیان بووە، هەر هەموو بەرنەفرەتی سیاسەت کەوتوون، زۆربەشیان لە خانەکانی حزبی شیوعی دەرچوون و یەکەم کتێب و یەکەم رۆمان تەنیا **(دایک)ی ماکسیم گۆرکیی** بووەو تا ئێستە نموونەی پاڵەوانی ئازاو ساغ و سەلیم لە مێشکیاندا **(باڤل)**ە، ئەمە وەزعێکی سەقەتی خوڵقاند، لەگەڵ هاتنی ریالیزمی سۆسیالیزمی پاشان پاڵەوانی ئیجابی و سلبی و پاڵەوانی باش و خەراپ و گەشبین و رەشبین و کۆتایی رەش و سپی و لەو قسە بێ ماناو بێ سەروبەرانە پەیدا بوون، واقیعی ئەدەبی نەک چیرۆکی شێواند، ئایدۆلۆژیایەکی رەسمی زاڵ ببوو بەسەر ئەدەبدا، هەر نووسەرێ غیرەتی ئەوەی هەبوایە لەو نەخشە رەسم کراوە لابدات، یان لە بازنەی پیرۆزی ئەو برادەرانە بچێتە دەر دەبوایە باج بدات، دەیەها جار پێیان وتووم وجودییە.. عەبەسییە.. بۆرژوازییە.. تەنیا لەبەر ئەوەبووە لەژێر تەئسیری ئایدۆلۆژیایەکی رەسمی چیرۆکم دانەرشتووە، من خۆم سەر بە چینێکی برسی و چەوساوە بووم، بەڵام من نایەم قوپییە لە فەلسەفەی مارکسی بکەم تا لەسەر پەرگال و مەستەرەی مارکسیەت چیرۆکێک دابڕێژم، ئەم هەموو یاسا دروستکراوانەی لە دەرەوەی ئەدەب بوون، من هەر هەموویم رەتکردنەوە، خۆشحاڵم بەوەی هەرگیز فریو نەدراوم و هەڵنەخەڵەتاوم بۆ ئەوەی پێم بڵێن نووسەرێکی پێشکەوتوخوازە.

دەزانم ئەدەب ئایندەی هەیەو دەیسەلمێنێ کێ زۆر ئینسان دۆست بووەو کێ قوپییەی لە خۆی و خەڵکی کردووە دەگەڕێمەوەو دەڵێم: ئەدیبی کورد هەمیشە کەلاوەیەکی سیاسەتی پێ خۆشتر بووە لە کۆشکی پڕ لە سیحری ئەدەب، هەر

نوشوستی و شکستییەکانی نێو دنیای سیاسەتیش بووە وای کردووە ئەدیبە سیاسییەکان چیرۆکی زۆر سەقەت و پڕ لە شکەست بنووسن.. لەنێو ئەو هەموو شکەستەدا حەزیان کردووە بە خەیاڵ گەشبین بن و سێبەرمان دروست بکەن..

**رامان: کە روو بە رووی نووسین دەبیتەوە نیگەران نابی..؟**

**شێرزاد حەسەن:** ئەدیبی کورد کەمتر دڵەراوکێی هەیەو تەماعە فیکری و هونەرییەکانی کەمن، تەماعی ئەوەی هەیە کە ناوی دەربچێت **(جۆرج ئۆرویل)** دەڵێت «تا تەمەنی( ٣٠ ) ساڵ خۆپەرستی رەنگە رەوابێ بۆ ئەوەی بناسرێیت، بەڵام مەرجە دوای ( ٣٠ )مەسەلەکانی تر بێنە پێشەوە، چ مەسەلە مێژوویی و چ مەسەلە ئەخلاقییەکان دەبێ گەورەترو پیرۆزتر بن» لەوکاتەی زۆر ستایش دەکرێم زیاتر دەترسێم لەوەی ئەو ستایشە پشتم بشکێنێ و غەڕابم لە خۆم، من هەموو چەپڵەکان دەمترسێنن رەنگە تانەو تەشەر مەسەلەیەک نەبن، بەڵام زۆر ترسم لە ستایش هەیەو زۆر لەوە دەترسم خرف بم و ئاگام لە خۆم نەمێنێ، بۆیە دڵەراوکێی بەردەوامم هەیە و نەشبێ دروستی دەکەم، رەنگە من وەک جاران برسی و رووت نەبم، بەڵام هەمیشە دەمەوێ لەو حاڵەتەدا بژیم کە من ئێستەش برسیم و رووتم، من زۆر جار سوپاسی سەردەمی پڕ لە قەهرو دەردی قۆناغی منداڵی دەکەم.

ئارەزووە خەفەکراوەکان، بەوە تۆمەتبارم دەکەن کە ئارەزووی خەفەکراوم هەبێت، کەواتە سوپاس بۆ ئارەزووە خەفەکراوەکانم، چونکە هەندێ شتی جوانی بە من نووسیوە، کپ کردنی هەموو ئارەزوو مرۆییەکانم کە رەنگە وەک مرۆڤ نەخوازم بەم شێوەیە بن، حەزم دەکرد لە کۆمەڵگەیەکی پاک و تەمیز گەورەبم کە ئەو هەموو مەراق و خەمەم نەبێت، بەڵام مەسەلەیەک نییە گەر تۆ داهێنانت لە پشتەوە بێت، هەمووومان دەزانین ـ فرۆید ـ دەڵێ (داهێنان بەشێکە لە باڵا بوون) لەوەی ئارەزووە سەرەکییەکان و پێویستییەکانت برسی کراون و کوژراون، ئەو کاتەی باسی بێوەژنێک دەکەم، دەچمە ناو ژیانی بێوەژن و بۆ خۆم دەبمە بێوەژن، رەنگە قەیرە کچ لە چیرۆکەکانما زۆر بێت ئەگەر بەرستەیەکیش بێت، بەڵێ من زۆر هەست بە قەیرەیی دەکەم لەبەر ئەوەی ( ٣٠ ) ساڵ تەماسم لەگەڵ مێینە نەبووە، لەرێی کتێبەوە ئافرەتم دەناسی، ئەمە کۆمەڵگەی منە، بۆچی من قەیرەیەک نەبم، پێش من کەسێکی وەک (گۆستاف فلۆبیر) دەڵێ من (مەدام بۆ ڤاری)م، بەس بۆچی وا دەڵێ «شیکردنەوەی ئەوە زۆری دەوێ» ، تۆلستۆی دەڵێ من (ئاناکارنینا )م، زۆرجار تۆ دەچیتەوە بەرگی ئەو کچ و بێوەژنانە، گەرچی تۆ نێریش بیت، ئەدیبی کورد نەیتوانیوە ئەو پێنج هەستەی کە هەیە لای ئینسانی ئاسایی خزمەتیان بکات، نەک پێنج هەست، تۆ دەبێ سەدان هەستی تر قەرز بکەیت بۆ ئەوەی شتێکی جوان بنووسیت، وابزانم ئەدیبی کورد زۆر لەوە تەمبەڵ ترەو لە چایخانەکان بێ ئومێد کەوتووە، لە بارەکان دەخواتەوە، خۆ فۆکنەرو جیمس جوێسیش دەیانخواردەوە، بەس ئەوان کە دەیانخواردەوە باش دەیاننووسی، ئەدیبی کورد گەر پایەو پلەیەک وەربگرێت لە رووی کۆمەڵایەتی یان سیاسی، ئەوە بۆ خۆی پاڵ دەداتەوە شوکرانە بژێرە، بەرای خۆم زۆربەی ئەدیبی کورد هیچ دڵەراوکێی فیکرییان

نییە، ئەگەرچی مێژووی ئێمە پڕە لە دەردەسەری و گرفت و کارەساتی گەورە، بەڵام هیچ خوێندنەوەیەکی بۆ ئێستە نییە، چاک کۆمەڵگەی خۆبشی ناخوێنرێتەوە تا ئێستە ئەوەندە نەژیاوە بەوردی تەماسی هەبێت، تەنانەت هەستەوەریش نییەو هەست بەشتەکان ناکات، کە لە دەوروبەری دەژین، کاتێ باسی خۆشەویستی دەکات کۆمیدیانە دەکەوێتەوە، چونکە لای ئەو ئەصڵەن مەسەلەیەک نییە ناوی خۆشەویستی بێت بەو مانا پیرۆزەی کە هەیە، راستە وەک پاڵەوان پێشمەرگەی خۆش دەوێ، بەڵام لە چیرۆکدا زۆر ناشیرینی دەکا هیچ خەمێک نییە تۆ لە رووی فیکرییەوە خۆت پەروەردە بکەیت و پێبگەیت، بەڵێ ئەو خەمە لای چەند کەسێک هەیە چ لە نەوەی تازە یا کۆن، ئەدیب و هونەرمەندی کورد کورسی پەرلەمانی پێ لە کورسی ئەدەب گەورەترە، زۆر زوو قەناعەت دەگۆڕێ و بەزرنگانەوەی ناوی خۆی شاگەشکە دەبێت، زۆریان لەسەر شکۆمەندی رابووردوویان دەژین.

**رامان: ئێستە وەک دیارە ئاوابوونی سەردەمی بلیمەتەکان بێ، لە گۆڕەپانی شیعریشدا ئەوانە نەماون وەک ـ ئەرزاپاوەند و ئیلیوت و دیلان تۆماس و بیتهۆڤن ـ کەمتر دەبینرێن، رەنگە بە سەدان ناوی تر هەبووبن لە گۆڕەپانی ئەدەبی ئینگلیزی و ئەمەریکی بەڵام سەرنج راکێش نەبوون..**

شێرزاد حەسەن بە منداڵی

**شێرزاد حەسەن:** من شەرم لەکەس ناکەم زۆر کەمن ئەو چیرۆکنووسانەی لە نەوەی کۆن و نوێ سەرسامم دەکەن، تا لە بواری ئەدەبی بیانیش ناوە درەوشاوەکان یەکجار کەمبوونەتەوە.. من دەیەها رۆمان و چیرۆکم پێ دەگات، کەمن ئەوانەی سەرسامم دەکەن..

**رامان: تا چ رادەیەک رات لە چیرۆکەکانی خۆتە؟!**

**شێرزاد حەسەن:** لە دوای ـ ریشۆڵە ـ وە هیچ شتێکم نەنووسیوە خۆشم نەویستبێ و بڕوام پێ نەبووبێت، هەر چیرۆکێکیش گەیشتبێتە خەڵک دەزانم کاردانەوەی چۆن بووە.. من هەقی قسەم نییە.. پتر رەخنەگران و خوێندەواران خاوەنی بڕیارن.. نەخشەیەکی زۆر وردی چیرۆکی خۆم لایە، گەیشتوومەتە ئەو حاڵەتەی بزانم چیرۆکێ ناشرینە یان جوانە، هەر دوای چیرۆکێکی خۆم کە دەینووسم( ٢٠ ـ ٣٠ ) جار دەیخوێنمەوە، ئەو چیرۆکە دەخوێنمەوە نەک وەک خاوەنی چیرۆک، دوای سییەمین جار گەرسەرسامم نەکات ئامادەم فڕێی بدەمە تەنەکەی زبڵەوە، من لەو ( ٢٥ ) ساڵە «٢٥» چیرۆکم نووسیوە، ئەگەر «٤٠» چیرۆکم نووسیبێ هەر ساڵەو چیرۆک و نیوێکی بەر دەکەوێت، بەترس و شەرم ورەهبەتێکەوە دەنووسم..

من تا بەرەژانی گەورە نەمگریٚ ناهێڵم چیرۆکم لە دایک بیٚ..!

**رامان: بێینە سەر بابەتی رۆمان، لە رەحیمی قازییەوە تا دەگاتە ئیبراهیم ئەحمەد چەند هەوڵێکی عەرەبی شەمۆ لەم دواییەشدا نووسەری کورد هەستی کرد بۆشاییەک هەیە لە بەشی نووسینی رۆماندا، بۆیە هەوڵ درا پڕی بکەنەوە، چەند چیرۆک نووسێک هەوڵی خۆیان خستە بازاڕەوە تەنیا بۆ پڕ کردنەوەی بۆشاییەکە، بەلاّم ئەوەی رۆمان بێت و بخوێنرێنەوە رێگا ـ ی مەم و ـ پایزە خەون و (مەرگی تاقانەی دووەم)ی بەختیار عەلییە کە مرۆڤ ناتوانێت لە یادیان بکات و پێویستیان بە لەسەر وەستان هەیە تۆ لەم بارەیەوە چی دەڵێی..؟**

**شێرزاد حەسەن:** من هیچ سەرسام نیم بەواقیعی رۆمانی کوردی، ئەگەر شتێک هەبێت ناوی رۆمانی کوردی بێت، دیارە وێستگەی یەکەم لە تورکیاو سوریاش وایە و هەوڵی وا هەبووە سەلیم بەرەکات کە ئێستە بە عەرەبی

**هەمانە چوار کۆمەڵە چیرۆکی هەیە کەچی چوار رستەی جوانی تێدا نییە**

دەنووسێت، یەشار کەمال «پاڵەوانەکانی کوردن»و بە تورکی دەنوسێت، دێمەوە سەرخۆمان تا «شار»ی حوسێن عارف، من لە دیدارێکدا وتم: ئەمە گێڕانەوەی مێژووی حزبی شیووعیبە، لە مێژوو نەترازاوەو هەندیٚ بەشی جوانی تیادایە وەکو دیمەنی دەروێشە شەهوەتبازەکە، رەنگە ئەو بەشە بۆ خۆی چیرۆکێک بێت، بەلاّم وەک رۆمان هیچ رۆمانێکی کوردی سەرسامی نەکردووم، «رێگە»م نەخوێندۆتەوە بەداخەوە چەند ژمارەیەکی کەمی لێدەرچووە، لە دەیان کۆڕوکۆبونەوەی ئەدەبیدا وتوومە جوانترین رۆمانێکی کوردی کە هاوچەرخ بووبێت و خوێندبێتمەوە «مەرگی تاقانەی دووەم»ی- بەختیار عەلی ـ یە من ئومێدم بەو کوڕە زۆرە، بەلاّم ناتوانم ئەوەندە بیٚ ئەدەبیش بم گاڵتە بە هەوڵەکانی کەسانی تر بکەم، ناتوانم گاڵتە بە هەوڵەکانی بۆ نموونە موکری بکەم بەلاّم دەنێو هەمووان پتر من «سەگوەڕ»م خۆشویست..

یەک عەیبی هاوبەش دەنێو رۆماننووسەکانی کوردا هەیە کە دەیانەویٚ وەکو خۆی مێژوو بگێڕنەوە ـ دیارە **(ژانی گەل)** بە پێی هەوڵی سالاّنی پەنجاکان پێی سەرسامم و جوانە، هەتا ـ **قەلاّی دم دم ـ ی (عەرەبی شەمۆ) وتا (پێشمەرگە)** تەماشا دەکەی خەمە سیاسییەکان زاڵن، ئەوەی کوشتومی خەمی سیاسی لای (مارکیز)و (ئوستریاس) هەیە، لای **(جیمس جۆیس)** هەبوو، بەس وەختیٚ ئەو رۆمانانە دەخوێنینەوە زۆر هەست بە هونەر دەکەین ـ تۆ سەرۆکی فەرماندەی ئۆستریاس دەخوێنینەوە سەرسام دەبیت، نغرۆیە لە شیعر وەختیٚ ـ پایزی پەتریارک

**ـ ی ـ مارکیز ـ** دەخوێنیتەوە باسی سیاسەت و دیکتاتۆرەکانی ئەمەریکای لاتینە، بەڵام غەرقە لە هونەرو فانتازیاو شیعرییەت، پێم خۆش نییە بەراو د بکەم، چونکە مێژوویەکمان نییە لە رۆمان، داستان و حیکایەتی درێژی گوێ ئاگردانمان هەبووە، ئەم هەولانەش هەمووی پیرۆزن، هەموو هەولێک بێ ئاکام نییە.

**– میشێل بۆتۆر– رۆماننووس** و رەخنەگری فەرەنسی دەڵێ: **من بۆیە پەنام برد بۆ رۆمان چونکە لە نێوان شیعرو فەلسەفەدا دامابووم**، کام رۆماننووسی کوردمان هەیە کە لە بایەخی شیعرو هونەری شیعر تێبگات و دڵەراوکێی فەلسەفی لە پشتەوە هەبێت تا ئەو دوو شتە لێک بدات و رۆمان بنووسێت، ئەدیب و رۆماننووس و چیرۆکنووسی کورد نە لە خەمە فەلسەفییەکەدایە نە لە وەزیفە گەورەکانی شیعر تێدەگات، تا ئەم دوو دنیایە تێکەڵ بکات و شتێک بە شتێ بکات. قەناعەتی تەواوم هەیە، رۆمانی کوردی لە هەوڵی شەریف و نیازی پاک بێ بەری نییە، دەزانم لە پشت رۆمانەکانەوە ئامانجی شەریف هەیە، بەشێک لەو نیازانەی جەنابت پەنجەت خستە سەری.

**رامان: خۆت هەولی رۆمانت هەیە..؟**

**شێرزاد حەسەن:** من دەمتوانی(١٠) ساڵ لەمەوبەر رۆمانێک بخەمە بازارەوە، بەڵام قەت ئەوەم نەکردووە، لە (١٩٩٦) دوای دڵەراوکێیەکی زۆرو شەش ساڵ هێنان و بردن ئینجا توانیم (حەسار) فرێ بدەمە بازارەوە، دەزانم رۆمان هونەرێکی بالاومەزنە دەبێ شەرمی لێ بکەی، مانای ئەوە نییە شەرم لە شیعرو چیرۆک ناکەم، وتم رۆمان خەونێکە، ئێستە تۆش خەون دەبینی بەوەی رۆمانێک بنووسیت، پێوەندی بەوەوە نییە تۆ بە رەخنەگر ناسراویت، رەنگە چەند ساڵی تر هەوڵی وا بدەیت، بەڵام چەند سەردەکەویت و چەند ژێر دەکەویت ئەوەیان مەسەلەیەکی ترە.

هەندێ وادەزانن فرێدانی رۆمانێک بۆ ناو بازار بۆ ئەوەیە مێژوویەک بۆ خۆیان تۆمار بکەن، هەولەکانی رۆمانی کوردی ئەوە نین، چونکە رۆماننووس یەکێک لەو شتانەی پێویستی پێ هەیە ئەوەیە چاوی چۆلەکەی هەبێ، کە یەکێکە لەو چاوانەی کە پشت و سەرو ژێرو چواردەور دەبینێ، بەداخەوە رۆماننووسی کورد زۆربەی زۆریان لە قۆناغی سورانەوە بە بازنەی مێژوودا دەرنەچوون و نەیانتوانیوە ئەو تەفاسیلە فەرامۆش کراوانە تۆمار بکەن کە مێژوو جێیان دێڵێ.

**رامان: هەندێ لە چیرۆکەکانت نەفەسێکی درێژی تیایە کە ئەو نەفەسە هی رۆماننووسینە، تۆ لە (١٩٩٦) نۆڤلێتێکت خستە بازار، لێدوانی زۆری دروست کردو یەکێکە لە بەرهەمە جوانەکانی ئەم چەند ساڵەی دوایی کە نووسراون ئایا هەولی رۆماننووسیت هەیە؟**

**شێرزاد حەسەن:** جارێکیان لە (جەلیل قەیسی )م پرسی کە بۆچی رۆمان نانووسیت، وتی رۆمان پیاوی خۆی دەوێت.. وتی: جارێکیان (٦٠) لاپەرەم نووسی پاشان دڕاندم، چونکە زانیم رۆمان نییە، کابرا بە ئەدەبە ـ جەلیل قەیسی ـ یەکێکە لەوانەی کە دەزانێ هونەری رۆمان و چیرۆک چەند پیرۆزو گەورەیە، ئەمە

مانای ئەوە نییە جەلیل قەیسی نەتوانێت رۆمان بنوسێت، بەڵکو دەڵێ کەی ئەوەم کە رۆمان بنووسم، چونکە دەزانێ هونەرێکی باڵایە. نۆڤلێتیش دیارە کارکردنە لەسەر رەمزو وێنەکە رەگ و ریشەی هەیە لە کورتە رۆمانی ئەڵمانیی، ئەڵمانەکان بەناوبانگن بەو جۆرە چیرۆکە درێژانە یان کورتە رۆمانانە، مەسەلەی زاراوە گرنگ نییە بەڵام ئەوە فەزای رۆمانە، هەرایە، قەڵەباڵغی و بەیەکداچوونی شتەکان و ئیش کردن لەسەر رەمزو هێمای **(باوک)** لای من کە رەنگە ئەوە وام لێبکات ناوی لێبنێم «**نۆڤلێت**»، بەڵام هەوڵێکی تریشم هەیە کە جارێ بڵاو نەبۆتەوە، رەنگە هەر درێژ کراوەی پاڵەوانی **(ریشۆڵە)** یان گوناهی سپی بێت کە تا ئێستەش لەگەڵمدا دەژی، چ وەک کاراکتەرێک کە لە ژیاندایە، یان وەک کاراکتەرێکی ئەدەبی، خەونی زۆر تریشم هەیە دەگەمە کوێ.. نازانم..؟!

**زۆربەی چیرۆکنووسانی کۆن و نوێ بەر نەفرەتی سیاسەت کەوتوون**

**رامان: ئامادەیی باوک لە زۆربەی چیرۆکەکانت و یادەوەری منداڵیت هەر لە تەنیایی و گوڵی رەش و تا چیرۆکەکانی دوایی زۆر بە ئاشکراو بەزەقی دیارە، چۆن ئەو ئامادەبوونە ـ لێکدەدەیتەوە..؟**

**شێرزاد حەسەن:** رەنگە بەیەکەوە پێوەند بن. وا بزانم بۆدلێرە دەڵێت: مرۆڤایەتی لە لەعنەتی باوک رزگاری نەبووە، هەوڵێکی زۆری کوشندەی هەیە بۆ ئەوەی لە لەعنەتی باوک رزگاری بێت، مەبەست لەوێنەی باوک ئەو دەسەڵاتە پڕ زەبرو زەنگەیە کەمرۆڤ تیایدا دەخەسێنێ و دەترسێنی و لەوانەیە بگاتە هێزە باڵاکانیش کە ئیش کردنە لەسەر خەساندنی (تاک)، تاکی کوردیش لە کۆمەڵگەی باوکسالاری یان **پەترپارکی** ـ کەسێک نییە گیرۆدەی ئەم حاڵەتە نەبووبێت، بۆیە من شتێکی سەیرو سەمەرەم نەکردووە، وەک هەمنگوای دەڵێت: هەموو نووسەرێک رەنگە پێویستی بە منداڵییەکی پڕ لە ئازار بێت، زۆر شانازی بەو منداڵییە پڕ لە ئەزیەتە دەکەم، ئەگەر نەگەڕێمەوە قۆناغی مناڵیم کە دوورو دێرینە خۆم زۆر بە زەرەرمەند دەبینم، زۆریش باسم لەوە کردووە کە من تەمبەڵترم لەوەی سوودم لەو گەنجینەیەی سەردەمی گەنجی و مناڵی وەرگرتبێ، چونکە ئەوەی کردوومە لە بازنەی هەوڵ و تەقەللادایە.

**رامان: بۆدلێر دەڵێ «شیعر گەڕانەوەیەکی دەستی ئەنقەستە بۆ منداڵی»، بۆ چیرۆکیش هەر وایە..؟**

**شێرزاد حەسەن:** رەنگە لای من وابێت ـ بلیمەتی ئەگەر لە ئەدەب و هونەردا هەبێت ئەوەیە کە تۆ نەک بەدەستی ئەنقەست، بگرە بە زۆرداریش بێت بگەڕێیتەوە قۆناغی منداڵی، لە قۆناغی منداڵیم راستە برسی و رووت بووم، بەڵام بە هۆشیاری ئەمڕۆوە هەستم نەکردووە برسی و رووت بم، واتە هەموو ئەو شتە

ناشرینانەی لە قۆناغی مندالّیمدا بەسەرم هاتن کاریگەری و جێ پەنجەو پەڵەو لەکەی لەسەر بوونی من بەجێهێشت، ئێستەش زۆرجار گەر نەتوانم بنووسم، هەندێ جار دەگەڕێمەوە مندالّی خۆم و بۆی دەگریم رەنگە وەکو **صەمەدی بەهرەنگی دەلّێ: هەموو کەس خۆزگە بەمندالّی دەخوازێت.. تەنیا من نەبێت..»**

رەنگە ئەو قسەیە لە منیش بوەشێتەوە، چونکە من بەمانای وشە لە خێزانێکی هیلاک و ماندوو و پڕ لە هەراو شەڕو شۆڕ پەروەردە بووم و برسییەتی (٢٠) ساڵ پتر، دڵشکانی گەورەم دی، پتر باوکە سیاسییەکانیشم مەبەستە، سوورم لەسەر ئەوەی باوکەکان رەت بکەمەوە، تەنانەت لە ژیانی رۆژانەمدا رەتیان دەکەمەوە هەست دەکەم مامۆستاکانم هەر لەو باوکە دلّڕەقانە دەچوون، دووبارەبوونەوەی وێنەی باوک لای ئێمە بێ شومارە.. ئەم پێوەندییە، پێوەندییەکی سادی ـ ماسۆشییە ـ ئەگەر لەرووی دەروونزانییەوە بدوێین کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەگشتی و ئێمەی دواکەوتووش بەتایبەتی، هەمیشە کەسێک هەیە لەسەرەوە دەمانچەوسێنێتەوە، تۆش لەبەر ئەوەی چەوساوەی کەسێکی تر دەچەوسێنیتەوە، کەسایەتی کوردی لای من کەسیەتی دەسەلاّت خوازە، ئیشی من لە ئەدەب و هونەردا ئەوەیە ئەم حالّەتی پێوەندییە بەرجەستە بکەم، کەسایەتییەکان سوڵتەوین، کەسێتی سوڵتەوی ئەوەیە کەسێک هەیە لەسەرەوە ئازاری ژێر خۆی دەدات، ژێرەوە لەزەت لەو ئازارە وەردەگرێت، ئەویش بۆ ئەوەی لەزەت بکات ئازاری ژێر خۆی دەدات، ئەمەش لە حەساردا رەنگی داوەتەوە، بۆیە کەسایەتی کوردی کەسایەتییەکی (سادی ـ ماسۆشییە) بەگشتی، لەزۆر وڵاتی دنیا ئەم کەسایەتییە هەیە بەس چاودێری دەکەم لای ئێمە بە حوکمی باری ناهەمواری کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەم جۆرە کەسایەتییە زۆر دووبارە دەبێتەوە، بەکورتی: وا بزانم رۆژئاوا مۆسۆلۆنی و هێتلەری دروست کردووە.. بەری سۆشیالیزم کاسترۆ و تشاوشیسکۆ لەگەلّ ستالین لە بەری رۆژئاوا نازیزم و فاشیزم کە هێتلەرو مۆسۆلۆنییان دروست کرد، ئەوانەی حوکمیان کردووە هەر هەمووی بە مانای وشە باوکن.. مرۆڤایەتی و سەراپای وڵاتانی جیهان بەر ئەم لەعنەتە کەوتوون «لەعنەتی باوک» ئەگەر بەشێوەیەکی شەرمنانەش بێت.

**رامان: ئەی ترس لە سەربەستی..؟**

**شێرزاد حەسەن:** لە حەسار زۆر باسی سەربەستیم کردووەو ترسی مرۆڤ لە سەربەستی، ئەو گۆڕانکارییەی دوای راپەڕین سەلماندی کە ئێمە لە ئازادی دەترسین، لە چیرۆکەکەدا باسی ناکەم، بەلاّم رەنگدانەوەی لەسەر ژیانی من و بۆچوونی من هەیە، سەربەستی و ئازادیمان بەدەست هێنا بەس فرێماندا، وەک پشکۆیەک کە لە چنگا نەوێرین هەڵیگرین، من باسی شکستی مرۆڤی کوردیش دەکەم بەرامبەر بەوەی کە ناتوانێت رزگاری بێت لە باوک. ئازاترین پیاو تا ئێستە نەیتوانیوە لە دەسەلاّت و هەیبەت و هێزی باوک

رزگاری بێت ، نەک ئێمەش هەموو مرۆڤایەتی گیرۆدەی دەستی باوکە، چ جای بۆمن کە لە خێزانێکدا ژیاوم باوک تێیدا وەک هەر باوکێکی کوردی چەوسێنەر

ئاغا و دیکتاتۆرێکی بچکۆلە بووە، تا ئەمڕۆش بە هەستی منداڵی سەیری دوێنێ دەکەم، منداڵ ئەو بوونەوەرەیە راستە شیکردنەوەی بۆ شتەکان نییە، بەڵام هەمووشتێ رەت دەکاتەوە.

**رامان: ئەی منداڵیت و یادەوەرییەکانی، چۆن لەگەڵ ئەو باوک سالارییەدا کۆ دەکەیتەوە..؟**

**شێرزاد حەسەن:** منداڵ هەموو جۆرە ناحەقی و ستەمییەک رەت دەکاتەوە من تا ئێستەش لەو جۆرە کەسانەم کە ئامۆژگاری **(نیکۆس کازانتزاکی)م لەگوێ گرتووە «منداڵێک لە ناو ناختایە مەهێڵە گەورە بێت»** ئەگەر منداڵیش پابەست بێت بە پاکییەوە، بەوەی کە شەرە لەسەر مانەوەی پاکی و جوانی.

ئێشکردنی من لە سەر وێنەی (باوک)و(وێنەی منداڵ)ئێشکردنێکە زۆر لایەنی فۆتۆکۆپی هەیە و رەنگە لەو دنیایەدا من تازە پێرەوکە بم، رەمزەکانی باوک و گەرانەوە بۆ قوناغی منداڵی، دیارە تا تەمەنم دەکشێ دەگەرێمەوە بۆ دوورترین قۆناغی منداڵیم، ئەوەش ئێشکردنی نەک من، بگرە هی زۆر لە برادەرانی تریشە، من رۆژانە پرسیارێکم لە دایکم دەکرد« وەختێ من لەزگتا بووم چۆن بیرت دەکردەوە»باوکم چەند جار لێیدای، ئێمە بەکام شوێندا سەفەرمان کرد، بۆ من قۆناغی ناورەحمیش مەبەستە.

**رامان: بەرای من یەکێک لە نهێنی سەرکەوتنت لە چیرۆکدا ئەوەیە کە تۆ ئەزموونێکی حسییت بەرجەستە کردووە.. ئەزموونی تۆ لە چیرۆکەکانت ئەزموونی تەنیا ناو کتێب نییە، بگرە چەند فەسلێکە لە ژیانی خۆت، لەوەدا منداڵیت، مێرمنداڵی و جحێڵی، تێکشکانەکانت. لەوەدا ئینسانی کورد خۆی لە ناویدا دەبینێتەوە، ئەمە یەکێکە لە نهێنییەکانی ئەو سەرکەوتنە، دووەم نهێنی ئەوەیە کە وادیارە پێدزکەیەکت بە مەیلی خۆت کردووە کە هەتبووە بۆ شیعر و گۆیزاوتەتەوە بۆ ناو چیرۆکەکانت..**

**شێرزاد حەسەن:** چاکە قۆناغی یەکەم کە باسی ئەوەت کرد پڕ بایەخە.. توانیم ئەو پێنج هەستەی هەمە خزمەتیان بکەم، چۆن شت دەبینم، چۆن بۆن دەکەم، چۆن هەست دەکەم، چۆن گوێ دەگرم، گوێ لە چی دەگرم و چی لێ هەڵدەگرم، زوو فێر بووم پەروەردەی هەستەکانم بکەم، من لەبەر خاتری ئەوەشم نەبووە تا وەک ئەدیبێکی باش بنووسم، چونکە زوو هەستم بەوە کردووە وەک ئینسانێک پێویستە ئەو هەستانە پەروەردە بکەم، ئەشکەنجە درابم بۆ ئەوە خۆم نەخستۆتە ناو ئەشکەنجەوە تا دوایی چیرۆکێک لەسەر ئەشکەنجە بنووسم، من ئەشکەنجەم دیوە، لە دوای کامڵ بوونی فیکری و هونەریم ئەو ئەشکەنجەیە بۆ خۆی هاتۆتە چیرۆکێکەوە، نازانم کەی دێتە دنیای ئەدەبی من، بەڵام وەک ئەوەی وتم من هەستی تریشم پێویستە کە قەرزی بکەم، یەکێک لە گرفتەکانی چیرۆکنووسی کورد کە دیارە( لە دنیاش وایە) ئەوەیە کە باش نابینێ، باش نابیستێ و هەستەکانی خۆی چاک پەروەردە نەکردووە، دەمەوێ بلێیم بینینی هونەرمەندێکی شێوەکار بۆ درەختێ جوداوازە لە هی جووتیارێک بۆ هەمان درەخت، وەختێ جووتیار سەیری

گوڵەگەمەکانی دەکا شاگەشکەیە و دەیدوڕێتەوە و ژن بۆ کورەکەی دێنێ، بەڵام هونەرمەندەکە کە سەیری گوڵەگەمەکان دەکا تەنیا ئەو دیوە نابینێ **(گۆستاف فلۆبێر)** دەیووت ئێوە هەمووتان قاچ و پوز و سنگی ژنان دەبینن، گرفتی من ئەوەیە پەیکەری ئێسکەکانی دەبینم، ئەم دیدە کارەساتاوییەی(گۆستاف فلۆبێر)ە کردوویەتی بەو پیاوەی **(مەدام بۆڤاری)** بنووسێت سەیری ئەم دیدە **(لەپشت هەموو جوانیەکەوە مەرگیش هەیە)** تۆ نایبینی، بۆچی ڤلۆبێر لە پشت هەموو جوانیەکانەوە مەرگ دەبینێ؟ وەک ئەوەی کازانتزاکی دەڵێت «تکایە ئەو منداڵەی ناخت مەهێڵە گەورە ببێت» سەیری ئەم ئامۆژگارییە گەورەیە بکە، منداڵ و خودا لەیەک دەچن لەبەر ئەوەی هەموو بەیانییەک هەڵدەستن سەیر دەکەن: ئەم جیهانە تازە خوڵقاوە، منداڵیش وا هەست دەکا یەکەم جارە بینیویەتی، هونەرمەندیش یا ئەدیبێک دەبێ بەم دیدەوە سەیری جیهان بکات، پەروەردەکردنی هەستەکان و قەرزکردنی هەستی تر کارێکە هەموو پیاوێک پێی ناوێرێت.. چاک لە سیمفۆنیا تێناگەم تا لەرووی زانستییەوە شیبکەمەوە، بەڵام زۆر حەز دەکەم گوێ لە ئیقاعاتی جیاوازی سیمفۆنیا بگرم،لەولاوە گوێ لە رەسووڵ گەردیش دەگرم و چێژی لێوەردەگرم،گوێ لە داخیل حەسەن وەک عەرەبێکی سەحرا نشین دەگرم و چێژی لێوەردەگرم، چیرۆکم نووسیوە و گریاوم بە دەم گوێ گرتن لە رەسووڵ گەردی و داخیل حەسەن و سیمفۆنیەکانی بتهۆڤن سەیری ئەم هەرایە، من بۆ خۆم ئیقاعێ لەناو ئەوانەدا دەدۆزمەوە شتێک بە من دەبەخشێت، پەروەردەکردنی ئەم هەستانە، چۆن گوێ دەگری، چۆن دەبینی، چۆن بۆن دەکەیت.. وردییەک و زیرەکییەکی دەوێت **(کۆلن ویلسن)** جوان باسی ئەوە دەکات مرۆڤ هێزی شاراوەی هەیە و جوان نەیدۆزیوەتەوە، ئەگینا تۆ دەتوانی تەپڵەکی جگەرەیەک یان پەرداخێک لێرەوە بۆ ئەوێ بگوێزیتەوە.

تۆ دەتوانی بە تیشکەکانی چاوت ئەم پەرداخە لێرەوە بۆ ئەوێ بگوازیتەوە، رەنگە هێزی شاراوەی وا لە هەموو کەسێکدا هەبێت..

**رامان: ئەی بوونی شیعرییەت لە چیرۆکەکانتدا، یان لیریک وئیقاع چۆن لێکدەدەیتەوە..؟**

**شێرزاد حەسەن:** من کە لە خۆمەوە دەستم پێکردبێت واتە لە شکستەکانی زاتی خۆمەوە دەستم پێ کرد، سەیرم لە چیرۆکێ دێت باسی سۆپەرمان دەکات و بەس من سۆپەرمان نیم، پیاوێکی زۆر چکۆلەو قوڕ بەسەربووم، باسی چکۆلەیی و شەرم و ترسەکانی خۆمتان بۆ دەکەم، من لە خۆمەوە سەیرم کرد چەندە شکستباڵ و قوڕ بەسەرم، ئازایەتی تۆ لەوەدایە لێرەشەوە تۆ لەگەڵ هەزاران کەسی وەک خۆت یەکانگیر دەبی، بەڵام یان ناتوانن دەری ببڕن یان شەرمیان کردووە دەری ببڕن، بۆیە هەمیشە چیرۆکنووسی کورد خۆی و پاڵەوانەکانی سۆپەرمانن،هیچ کەسێکیش نییە عەیبی هەبێت، ئنجا ئەگەر ئەو پیاوە هۆشیارو ئازایە بوو لەشکستی خۆی تەواو بوو، ئەوسا لە شکستەکانی خەڵک بدوێ، ئێستە من گەیشتمە قوناغی ئەوەی چاودێری شکستەکانی خەڵک و دەوروبەرم بکەم و ئیشم لەسەر کردووە، بەڵام

هەمیشە بیرم ناچێت بگەڕێمەوە سەر شکست و نائومێدییەکانی خۆیشم تا ئێستە ئەم تەقلیدە باوە، قسەکردن لەسەر شکستەکان سەر ئاستی تاک و کۆمەڵ تائێستە قسەی لەسەر نەکراوە،شیعرییەت ئەوە نییە تۆ لە چیرۆکدا شیعران بڵێی، ئیقاعێک و جوانکاری و هەناسەی جوان هەیە، چیرۆک نانووسم لە قەسیدەی لیریکی نەچێت و بەرۆحی شیعر نەخوێندرێتەوە، من لە سلێمانی(حەسار)م خوێندەوە و خەڵکی بە دیارمەوە ورد گوێیان گرت، ئەگەر ئەو شیعرییەتە نەبێت چۆن خەڵک سەرسام دەبێت، شیعرییەت قسەکردنە لەگەڵ ویژدان، چونکە نووسینی ئەدەب بە شیعر و چیرۆک و رۆمانەوە بەتەنیا قسەکردن نییە لەگەڵ عەقڵ بەڵکو قسەکردنە بۆ ویژدان،لەگەڵ کانگاکانی سۆز، من بۆ کانگاکانی سۆز ئیش دەکەم، لەوێوە قسەش بۆ عەقڵ دەکەم، واتە دوو جەمسەر لای من هەیە، جەمسەرێک قسەکردنە لەگەڵ عەقڵ، بەڵام من ناتوانم خوێنەر یان بینەر کەلەبچە بکەم بە خۆمەوە و فێڵی لێبکەم، شیعرییەت ئەو فەزا فراوانەیە کە قسە لەگەڵ کانگاکانی سۆزی ئادەمیزدا دەکات وەختێ من لەگەڵ خۆم دەیجوڵێنم و دەیوروژێنم تا دەیخەمە ناو دنیای خۆم و ئەوساش لە پاڵ دۆزینەوەی گەوهەرە فیکرییەکان گفتوگۆ لەگەڵ هونەرەکەی من دەکات..

**رامان: جگە لەوەش چیرۆکەکانت گەرم و گوڕی ژیانی تێدایە و لە قووڵایی ئینسانیی خوێنەر دەدەیت، بۆیە دەجووڵێن و تەفاعوولت لەگەڵ دەکەن، چونکە خۆی تێدا دەبینێتەوە و دەبێتە بەشێک لە ئەزموون و ژیان و دیدی خۆی..؟**

**شێرزاد حەسەن:** ئێستە چیرۆکنووسی کۆن و نوێ هەن یاری دەکەن گوایە هەندێ وێنەی شیعری دێنی و هەندێ رستەی سەیرو سەمەرە دروست دەکات گوایە ئەمە شیعرییەتە لە چیرۆکدا، حەز دەکەم شتێک بڵێم: هیچ رستەیەکم نییە ئەگەر وێنەیەکی بەرجەستە نەدا بە تۆ، شیعرییەت تەنها ئەوە نییە وشەی جوان و رازاوە لەرستەیەکدا دایڕێژیت و بە چەند وشەیەکی ئیقاعدار بۆ ئەوەی تۆ بهەژێنن..

**رامان: شیعرییەت زیاتر زمانێکی خەون ئامێزە، بەرای من ئەو زمانە لە زمانی چیرۆکنووسێکی خاوەن تاقیمانەی هونەرمەندی وەک(زەکەریا تامر)دایە کە زۆرتر چیرۆکی (ئیقاعی) دەنووسێت، ئەو شێوازەی تۆش زەبت کردنی ئیقاعی رستە و کاراکتەرو سەرجەمی ئیقاعەکان. سەمفۆنیایەک یان نەزم و ریتمێک دروست دەکات کە کاریگەری لەسەر وەرگر بە جێدێڵێ..**

**شێرزاد حەسەن:** دیارە هەر چیرۆکێک ئیقاعی خۆی هەیە، حەز دەکەم شتێک بڵێم رەنگە مۆسیقاژەن نەبم، بەڵام زۆر جار هەست دەکەم چ ریتمێک بۆ ئەم چیرۆکە دەست دەدات.. خێرایە.. خاوە یان چ ئیقاعێکە..؟!

چ فەزایەکە، چ سەرەتایەکە، چ کۆتایی و قفڵێکە، مۆسیقاژەنێک، سیمفۆنیا دانەرێک زۆر چاک هەست بە لێدانی یەکەمین رستەی خۆی دەکات و زۆر چاک هەست بە لێدانی دوایەمین رستەش دەکات لە کۆتاییدا .

**رامان: سەرەتای چیرۆکەکانی تۆ بەدڵم نەبوون بە تایبەت لە (تەنیایی)دا، بەڵام لە-گوڵی رەش- بەتایبەتی بەشێک لە چیرۆکەکان لە شەشیان سێیان لەگەڵ**

**ئەوانەی دوای(گـــــولـی رەش)دەیبـــــینـم، چارەســــەرت بۆ دروست کـردنی(کۆتاییەکراوەکـان) زۆر هونەرمـەندانە ترو چیـرۆکنووسـانەتر لەو سـەرەتایە دێتەبەرچاو..**

**شێـرزاد حـەسـەن:** لەسەر قسەی خەون ئامێز و ئیقاع و ئەوانەی باسمان کرد من جۆرە چیرۆکێک دەنووسم کە پێی دەڵێن **(چیرۆکی سایکۆلۆژی)** زۆر ئیش لەسەر شتە شاراوەکانی دەروون دەکەم، گرنگ نییە من باسی ئەم ژووره بکەم کە من و تۆی تێیدا دانیشتووین، من و تۆ چین و کێین و بۆدانیشتووین، لەو ساتەوەی گفتوگۆ دەکەین تائێستە دەزانم تۆ لە چ حاڵەتێکی دەروونیدایت، ئەوەش لای من مەتڵەبە، واتە چیرۆکی ئیقاعدار کە غەرق بێت لە شیعر و فەزای فانتازی و خەون ئامێز وەک ناوت برد و خەیاڵ تا ئەوپەڕی کە دەڕوات. ئەمە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی من چیـرۆکێ بنووسم چەند چین نازانم، بەڵام حــەز دەکـــەم بۆ ناخی پاڵەوانەکان و شتە شاراوەکانیان شۆڕببمەوە.

**رامـان: پەیامی هونەر ئەوەیە، چونکە هونەر ئەوەندەی مەبەستی نهێنی گریانە و نهێنی زەردەخەنە و نهێنییەکانی تری ئینسانە، ئەوەندە مەبەستی شتە زانراوەکان نییە، گریان و زەردەخەنە کە مەبەست نین.. بەقەد ئەوەی نهێنییەکانی گریان و زەردە خەنە مەبەستن!! سروشت نهێنییەکانی گرنگە، ئەو ئەوین وحەزی زانینەی لە مرۆڤدایە بەتایبەتی خوێنەر کـە بایەخ بەو نهێـنییـانە دەدات، ئەوە یەکێکە لە هۆکاری ئەوەی مەیلێک لەلای دروست بکات بۆ کەوتنە دووی ئەو جۆرە نووسینە، چونکە بەشێکی گـرنـگ لە کـاری داهێنان دۆزینەوەی نادیارە، تا نادیار بکاتە دیار..**

**شـێـرزاد حـەسـەن:** نادیار بکەیتە دیار، پەردە هەڵماڵین، یەکێک لە ئیشە گرنگەکانی چیرۆک و رۆمانەو ئیشکردنە لەسەر کەشف کردنی فەزاحەت، نازانم چیـرۆکنووسێ یان رۆمـانـنوسێک چ کـەڵـک دەبینێ لە وتنی ئەو شـتـانەی کـە هەمـوومـان دەیزانین، ئیـشـکردنەکـە ئەوەیە ئاسـایی بکەیتـە نا ئاسـایی و بەپێچەوانەشەوە، ئیش کردنە لەسەر ئەوەی ئەو فەزاحەتانەی لە کۆمەڵگەدا لای خـەڵکەکـان هەن، کـە خـەڵکی پێی نازانێ یان نایەوێ بیـزانێت تۆ دێیت پەردە لەسەر ئەو شتانە هەڵدەماڵیت، وەک وتەکەی (چیخۆف) «من دەمەوێ پێت بڵێم لە ژێر پێتا دۆزەخێک هەیە»سەیری ئەو رستە سادەیەی (چیخۆف)رەنگە هەندێ لە مارکسییە وشکەکان بڵێن جا چییە ئەم دۆزەخە گرنگ ئەوەیە بیکەینە بەهەشت. ئەوە ئیشی نووسەر نییە باسی بکات، چونکە هێشتە مەترسی لەوەدایە کەس نازانێ لەژێر پێی ئەودا دۆزەخ هەیە، من وابزانم هێشتە ئێمە خۆمان نەناسیوە، ئەرستۆ دەڵێ: خۆت بناسە، چەند سادەیە، بەڵام ئیشی منە خۆم و پاڵەوانەکانم بناسم، ئیشی من ئەوە نییە بزانم باڵای چەند سانتیمەترە چاوی شینە یان رەشە، ئیشکردنم لەسەر ئەو شتە شاراوەو نهێنیانەیە کە تەنها لە خەونەکانتا جاروبار سەرهەڵدەدەن، گەر بیینەوە شاگردی (فرۆید)رەنگە خەون حەقیقەتی ئادەمیزادەکان بن، وەختێ تۆ شیکاری خەونەکانت دەکەیت من دەزانم تۆ کێیت، تۆ ئەوە نیت کە

له بەرامبەرم دانیشتوویت، تۆ ئەوەیت
که خەونەکانته، خەتورەکانته، شته
شاراوەکانته، تەنانەت ئەخلاقیش
ئەو شتەیە کەشاراوەیە، نەک
ئەوەی تەقلیدییە و زانراوە له
دەرەوە، بۆیە دەبێ بگەڕێینەوە سەر
شتە نهێنی و شاراوەکان کە
چەندین چین ژێر لم و ژێر خۆڵ و
فەرامۆش کراون.

## کە باسی ئافرەتێ دەکەم هۆیەکەی ئەوەیە ئافرەتێکی مەبەستداری زۆرم ناسیوە

**رامان: دەربارەی هەندێ لە کەرەستەی چیرۆکەکانت بریتیە لە چەند بابەتێ کە خوێنەری بۆ دروست کردوویت، قۆستنەوەی ئەو بۆشاییە دەروونیانەیە کە گەنجی کورد بەدەستیەوە دەناڵێنێ ئەمە یەکێکە لە هۆکاری قۆستنەوەی چیرۆکی تۆ لەلایەن لاوانەوە، کە ئەوەیە زۆر شتی بۆ دەخەیتەروو پێوەی دەتلێتەوە، ئەو کەپتی هەیە ،یان مەسەلەی سێکسی زەق دەکەیتەوە، یان هەندێ پرسیارە کە ناوێرێ بیکات، کەرستەی فەزائحی بۆ چیرۆکەکانت کە(سێکس) بەشێکە لێی و لە چیرۆکی تۆدا رەنگی داوەتەوە، کە ئەو چیرۆکانە دەخوێنێتەوە کەمێ تینوێتی دەشکێنێ، لەبەرئەوە مەیلی بەلای چیرۆکی تۆدا دەبێت، یان تەعاتوفی لەگەڵ دەکات، تەنانەت ئەمە زۆر کەموکوڕی هونەری تۆ دەشارێتەوە تۆ لەمبارەیەوە دەڵێی چی..؟**

**شێرزاد حەسەن:** دیارە هەموو نووسەرەکانی دنیا تەنانەت پیاوێکی وەک (مارکیز) غەفلەتی خۆی هەیە لە نووسین، بۆ نموونە (مارکیز) (٣٦) هەڵەی هونەری لە (سەد ساڵ دووره پەرێزیدا) هەیە، هەروەها دۆن کیشۆت -- کە سرفانتس نووسیوویەتی، بەڵام مارکیز رۆمانووسێکی گەورەیە، هەموو دنیا پێی سەرسامەو دەڵێ منم کە (٣٦) هەڵەم لە (سەد ساڵ دووره پەرێزیدا) کردووە. رەخنەگرەکان کەسیان پەیان پێ نەبردووە، بەڵام من خۆم پێتان دەڵێم غەفلەتەکانم چین.

سەد دەرسەد نازانم غەفلەتەکانی من چین، بەڵام وەک وتم لای من زۆر گرنگە سیحرێ بکەم، خۆ هێزێکی خودایی نییە تا سیحرباز لە خودای قەرز کردبێت و بینەرانی پێ سەرسام بکات، ئەوە فێڵ و هونەرێک و تەکنیکێکە کاتێ بەخۆت دەزانی لە شەبقەیەکدا کۆترێک دەفرێ، مەحاڵە ئەم کۆترە لەو شەبقەیەوە هاتبێتە دەر، یان دەستەسرێ بووبێتە کۆتر، من لەو گەمەو یارییە خۆشەدا ئیش دەکەم، حەزم لەم گەمەیەیە، بەرادەیەک قسەکەی تۆ بەراست دەزانم کە من لە رستەی یەکەمی چیرۆکەکەمەوە هەتا کۆتایی، نەک بە بەرنامەرێژی، نازانم چۆنیش بەڵام دەمەوێ سیحرت لێبکەم و هەر نەزانی چۆنم نووسیوە، مەنەلۆژ چی بوو، دایەلۆژو شەپۆلی هۆش چی بوون، بەڵام سەرسام بێت بەم فەزا سەیرو سەمەرەیەی کە لە چیرۆکێکمدا دروستی دەکەم، سەرچاوەکانی من بۆ ئەو شتانە تێرامان و ورد

بوونەوەیە، لە ئینسانی خۆمان و ژیان و شتە شاراوەکان، ئایا خوێندنەوەی من بۆ کۆمەڵێ کتێبی جیا لە مارکسییەتەوە بۆ لاهووت ئەوەیە چۆن بتوانم سیحرێک بکەم و سەرسامت بکەم، بەڵام تەنیا سەرسامیم مەبەست نییە، دەمەوێ لەرووی ویژدان و عەقڵیشەوە قسە لەگەڵ ئەو پیاوە بکەم، نامەوێ نەمانا بە قوربانی تەکنیک بکەم و نە تەکنیک بە قوربانی مانا بکەم، دیسانەوە لە نهێنی ئەوە تێناگەم چۆن ئەوشتانە دەکەم،

**رامان: هونەرمەندی گەورە هەر ئەوەیە (ئەنشتاین) کە خاوەنی تیوری نیسبییە، بەڵام مامۆستایەکی زۆر فاشیل بووە لە دەرس وتنەوەی ماتماتیک، هونەرمەندی چاک ئەوەیە بتوانێ لوتکەو بنار پێکەوە کۆ بکاتەوە، بتوانێ ئەوهونەرەی بەقەد ئەوەی کە چێژدارێکی هونەر رازی دەکات، لەلای مرۆڤێکی ئاساییش سەرنج راکێش بێت و کاریگەریی خۆی هەبێت..؟!**

**شێرزاد حەسەن:** ببورە، دەبێ بەشەرمەوە شتێک بڵێم، چونکە قسەکردن لەسەرخۆت خراپە بۆم نییە مەقام و پلە بۆخۆم دابنێم، خەڵکی تر بۆی هەیە لەم گفتوگۆیەدا یەکەمجارە شێوەی پرسیارەکانت وای لێکردم کە باسی ئەوە بکەم چیم کردووەو چیم نەکردووە، ئەوە یەکەمجارە تووشی شتی وا دەبم، یەکێک لە مەرجەکانی چیرۆک ئەوەیە کە خوێنەر بە تاسووقەوە بیخوێنێتەوە، گەورەترین چیرۆکنووس خەون بەوەوە دەبینێ کە زۆرترین خوێنەر یان ژمارە لە خەڵک بیخوێنێتەوە، وەختێ کۆڕێک دەگریت هەست دەکەیت و حەز دەکەیت هەموو هۆڵەکە بهەژێ، بەڵام من دەزانم هەندێ چیرۆکی جیهانی هەیە بەکەڵک نایەت لە کۆڕێکدا بخوێنرێتەوە نموونەش زۆرە، بەهەرحاڵ هەرگیز بۆم نییە مەقام و پلە بۆ خۆم دابنێم، چونکە ئەوانن کە دەزانن من چیم کردووەو کێم، بەڵام مانای ئەوە نییە تۆش و منیش و ئەدیبانی کورد نازانن پلەو مەقامی خۆیان لە کوێ دایەو چییە، ئەم مەسەلەی بنارو لوتکە کە باست کرد راستەو دەبێ لە ژنێکی عەبا بەسەرەوە بزانم چۆن دەیهەژێنم، نەک بە بەرنامەریژی، پرۆگرامێکم نییە نازانم چۆن، بەڵام دەبێت من ئەو شتە شاراوانەم تیابێ کە ژنێکی عەبا بەسەر گوێم لێ بگرێت، لەگەڵ ئەوەی بەزەوقترین خوێنەری رۆمان و چیرۆک گوێم لێدەگرن، بەڵام زۆرمان هەیە نەژنە عابا بەسەرەکە، نە پۆلیسەکەی کە بەرێکەوت لەناو دەرگە وەستاوە، نە ئەو کەسەی کە رەخنەگری یەکەمی چیرۆکی کوردییە سەرسام دەکات، ئەی باشە لەنێو ئەوانەدا چی کردووە بە چی، کە نەتوانێت هیچ کام لەوانە سەرسام بکات، تۆ وتت سێکس و هێزە کپ و شاراوەکانی مرۆڤی کوردو جحێڵەکان، بەتەنیا قسەم بۆ جحێڵان نەکردووە، لەرووی کلتووری و لەرووی داب و نەریت و تەقالید و هەرهەموو شتەکان ئیش کردنە لەسەر (کەبت)، زۆربەی ئایدیۆلۆژیاکانی ئەم وڵاتانەی لای ئێمە بانگەشە بۆ مەرگ دەکەن و زیندەگانی دەکوژن و جوانی دەکوژن و ئیرۆس دەکوژن و تاناتۆس پەرستی بڵاودەکەنەوە، زۆر ئیش لەسەر ئەوە دەکەم باسی کوشتنی ئیرۆس بکەم کە خوداوەندی عیشق و ئەڤینەو باس لەوە دەکەم چەندە پیرۆزە لامان، تاناتۆس فەرمانڕەوا بێت کە دەکا خودای مەرگ، زۆر لە

ئایدیۆلۆژیاکانی کە لەسەر زەوی ئیشی پێدەکرێت ئەمڕۆکە ئەوانەن کە مەرگ دەچێنن و زیندەگانی لە گۆڕ دەنێن، ئیشم لەسەر ئەم دووانەییەیە. باسی سێکسم نەکردووە، من باسی بالا دەستی مەرگ و کوشتنی هێزە سۆزدارییەکان دەکەم، من لە پێوەندییە شاراوەکان و نهێنی پڕ لە فەزاحەتی ئینسان دەدوێم، شتە پڕ لە شەرمەکانی، پێوەندی نا دروستی شێوە دەستەڵاتەکان بۆ سەر کوشتنی غەریزە حەیاتییەکان ئەوەیە کە من ئیشی لەسەر دەکەم، ئەم مەرگدۆستییە مانای چی؟ ئەم زیندەگانی لە گۆڕنانە مانای چی؟ وەختێ گوڵی رەش دەنووسم باسی شکست دەکەم، وەختێ لۆزان دەنووسم باسی شکستی مرۆڤی کورد دەکەم، **(کەڵە کوڕان و ئاسکە کچان) ململانێی ئیرۆس و تاناتۆس** ـ ە.. مەرگ و ژیان پاڵەوانی لۆزان **(لاس)** نوێنەری کوردە کەشکستە باڵە، چونکە نازانێ خۆشەویستی بکات و ئیرۆس لەلای کوژراوە، ئەوی تریان دەخوازێت باوەش بە ئیرۆسدا بکات وەک کچێکی سویسری کە لە کۆمەڵگەی خۆرئاوادا ژیاوە، بەڵام ئەوە ئێمەی کوردین بە چیرۆکی پڕ لە تراژیدی خۆمان دەمانەوێ سۆزی خۆرئاوا وەربگرین، تا ئێستە گفتوگۆی ئێمەی کورد لەرووی سیاسی لەگەڵ خۆرئاوا بەدیوی ئەوەیە باسی ئەنفال و کیمیاباران دەکەین ئەمە چیرۆکی لۆزانە، تۆ دیالۆگت لەگەڵ خۆرئاوا نییە.. تۆ لەرووی ئەوەی بەزەیی بەتۆدا بێتەوە دیالۆگ پێک دێنی، ئێستە دیالۆگی سیاسی کورد لەگەڵ خۆرئاوا دیالۆگێ نییە کەسێک هاوشانی کەسێک بکات، بەڵکو من لەرووی مەسەلە مرۆییەکانەوە دەمەوێ خۆرئاوا بزانێت چەندە چەوساوە و قوربەسەرم، دەمەوێ ئەوەت پێ بڵێم، ئیش کردنی من لە لۆزان سێکس نییە، تۆ سەیر بکە چەند دەلالاتی رەمزی هەیە کە لەو چیرۆکەدا نەخوێندراوەتەوە، تەنیا ئەوە زەق بووە لای خوێنەر یان ئەو دیوە بینراوە کە کوڕێک شەوێک ناتوانێت لەگەڵ کچێکدا بنوێت، کوڕەکە کوردەو کچەکە ئەورووپی، من باسی شتی قووڵترو دوورتر دەکەم، باسی دیالۆگێ دەکەم لەسەر ئاستی مێژوویی لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا نییە لە نێوان کوردو خۆرئاوادا ونە، باسی هەموو دیکتاتۆرو رەمزی باوکەکان دەکەم هەر لە دەزگا سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانەوە تا ئەوانی تریش لە چیرۆکی ـ کەڵە کوڕان و ئاسکە کچان - دا کە لە ژمارە (٥)ی (رامان)دا بڵاوبۆتەوە، کە لە هۆڵێکدا لە سلێمانی خوێندمەوە وتیان ئەمە چییە؟! ئەمە تێکەڵبوونی کوڕو کچانە کە شێرزاد دەیەوێ شۆڕشی سێکسی تێدا بەرپا بکات، من باسی ئەو خەونە شاراوانەی کوڕو کچەکانی ئەم وڵاتە دەکەم، تا ئەوانەی خودا پەرستی دەکەن ئەو خەونانە کە بەیانی هەڵدەستێ بینیویەتی و دەڵێ ئەوە منم ئەو خەونە پڕ لە عەیبەم دیوە، بەڵێ ئەوە تۆی دیوتەو حەقیقەتی شاراوەی تۆیە کەمن دەمەوێ ئیشی لەسەر بکەم، بۆیە **(سێکس)** وەک مۆراڤیا دەڵێ یان لە ئەدەبی **(لۆرەنس)دایەو (جێمس جۆیس) و (گۆستاف فلۆبێر)** هەندێک لەوانە لەسەری دادگایی کران ئەمانە لەرێی پێوەندی سەیری نێرو مێ دەیانویست هەموو لایەنە سەیرو سەمەرەکانی کۆمەڵگەی خۆیان بە خەڵکی بناسێنن، ئەگەر سێکس غەریزەیەک بێت لەدوای باڵقبوون بۆچی مایەی مەزاق و گاڵتە پێکردن و

سووکایەتی بێت؟ غەریزەی زیندەگانی غەریزەیەکە ئایین پەرستەکان بڕوایان پێیەتی، باشە بۆ سووک سەیر بکرێت، بەڵام من ئیشم لەسەر ئەوە نییە پێوەندی نێوان نێرو مێ باس بکەم چۆن پێکەوە دەنوون، بەڵکو ئیشم لەسەر ئەوەیە هەموو لایەنەکانی تری کۆمەڵگەی لە پێوەندیی شەهوەتبازاتە تا عاشقانە شی بکەمەوەو ئیشیان لەسەر بکەم، خۆ من فلیمی رووت دەرناکەم. هەندێ کەس کە بەدیدی سەلەفیانە سەیری ئیشەکانی من دەکەن زۆر بە سەقەتی دیخوێننەوە، رەنگە من دوورترین کەس بم لە بواری مەسەلە سێکسییەکان کە باسم کردوون، من دیوێکی زۆر سۆفییانەی پێوەندی نێوان نێرومێم مەبەستە، ئەوان رووکەشانە دەخوێننەوە، ناچن چینەکانی ژێرەوەی دەقەکە تەماشا بکەن..

**رامان: وەکو نوێخوازێک دێیتە بەرچاو کە ختوورەی نوێخوازیت لەلا بەدی دەکرێ، بەڵام نوێخوازێکی ئیسلاحیت، چۆن بەرگری لە خۆت دەکەیت؟..**

**شێرزاد حەسەن:** لە هیچ چیرۆکێکدا دروشمێکم نییە، لە هیچ نووسینێکدا ئامۆژگاری و ڕێنماییم نییە، بە پێچەوانەوە من بەوە تاوانبار کراوم کە هیچ جۆرە خۆشنوودی و گەشبینیم بۆ ئایندە نییە، چارەسەرێکم بۆ شتەکان پێ نییە، هەتا لە کۆڕە فیکرییەکانی سلێمانی و هەولێر ئیشم لەسەر ئەوە بووە گوایە من پیاوێکم تەنیا شتە شاراوەکان دەڵێم و چارەسەرم بۆیان نییە، بەڵام لێت ناشارمەوە ڕەنگە هۆیەکەی ئەوە بێت من لە خەمە کۆمەڵایەتییەکان دەدوێم و لەو مەیدانەی کە فەرامۆشکراوە ئیش دەکەم. گەڕانی من بۆ مانایەک ڕام لێدەکات لەو خەمانە نزیک ببمەوە کە ئیشی لێنەکراوە، بەڵام مانای ئەوە نییە هیچ جۆرە ئیعجازو ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکم پێ بێ، هەتا ئیسلاحی بم، بە پێچەوانەوە زۆر تاوانبار کراوم بەوەی چارەسەریم بۆ شتەکان نییە و ئایدیۆلۆژیای ڕەسمیم لە ئەدەبدا پێ نییە، چونکە لای من ئەدەب ئیشکردنە لەناو سەربەستی و بۆ سەربەستی.

**رامان: تۆ یەک ئایدیۆلۆژیات هەبێت بەسە بۆ شڵەقاندن و دروست کردنی حافیزی گۆڕان لە ئینساندا، کە ئەویش ئایدیۆلۆژیای داهێنانە؟**

**شێرزاد حەسەن:** مارکیز وتەنی گەر ئیلتیزام هەبێ ئەوەیە جوان بنووسیت جوان نووسینیش گەڕانە بەدوای هەموو مانا شاراوەکانی پێشتر کە وەک تۆ کەس نەیوتبێ.

**رامان: خوێندنەوەی دەقە ئەدەبییەکانی تۆ، تا ئێستە تا چەند پانتایی رەخنەی کوردی گرتووەو بەسەر کردۆتەوەو خوێندنەوەی بۆ دەقەکانت کردووە کە تۆ پێی رازی بیت؟!**

**شێرزاد حەسەن:** لەرووی رەخنەییەوە بۆ سەرجەم ئیشەکانم بەشێوەیەکی گشتگیر شتێک نەکراوە کە خۆشحاڵم بکات، بۆ هەموو ئیشەکانم لە (تەنیایی) تا (گوڵی ڕەش) و تا (حەسار)، بەڵام هەوڵی جوان هەیە، هەبووە لە نیازپاکی ئیشی کردووە ویستیەتی سەرسامی خۆی دەربڕێ لەم سنوورو بازنەیەدا دەرنەچووە، بەڵام هیچی بەمن نەوتووە کە سەرسام بکات، کە (گوڵی ڕەش) دەرچوو یەکێ لە خوێندنەوەکانی تۆ خۆشحاڵی کردم.. خوێندنەوەی بەختیار عەلی بۆ (میم)

خۆشحاڵی کردم.. خوێندنەوەی (مەریوانی وریا قانیع) بۆ (گوڵی رەش) خۆشحاڵی کردم.. خوێندنەوەی عەتا قەرەداغی بۆ (تێک ئاڵان).. خوێندنەوەی ئازاد سوبجی بۆ (تووتی ستان)، رێبین هەردی بۆ (حەسار) رەخنەگرو نارەخنەگر، شاعیرو چیرۆکنووس، قسەیان لەسەر من کردووە، بەڵام هەستم کردووە زۆر دوورن و نەیانتوانیوە لەو دنیا چکۆلەیەی من نزیک ببنەوە. گەر پێم شەرم نەبێ رەنگە خۆم قسە لەسەر خۆم بکەم و بزانم چی دەڵێم، بەڵام ئەوە ئیشی من نییە خۆم شی بکەمەوە..

**رامان: تا چەند نووسینی رەخنەی بونیاتگەرانە لەلایەنی سازکردنی خشتەو ئیحصائیاتەوە بەدڵتە، ئایە ئەو (صرامە) زانستییەی لەلای ئێمە بۆ دەق بەدی هێناوە؟**

**شێرزاد حەسەن:** من زۆر تێی ناگەم، بە ئینگلیزی و عەرەبیش خوێندومنەتەوە، بەڵام چاک تێی ناگەم، ئەو خشتەکارییانەی کە دەکرێن زۆریان لێ حاڵی نابم چی دەکەن، وابزانم گەمەیەکە رەسمی ئەم سێگۆشەو چوارگۆشەیەی کە دەیکەن بەدەر نییە لەوەی هەندێکیان جدین و لەو مەسەلانەوە شتی جوانیان کردووە، خشتەکارییەکەی (**مەریوان وریا قانع**) لەرووی بونیادگەری تێی گەیشتم کە بەو شێوەیە (**گوڵی رەش**)ی شیکردەوە چی دەڵێ، کەمتر شتی ترم لەرووی بونیادگەرییەوە خوێندۆتەوە کە من حاڵی بکات، هەوڵی (**عەتا قەرەداغی**) بۆ شیکردنەوەی چیرۆکی (**تێک ئاڵان**)م پێ جوانە شیکارییەکەی (**مەریوان**) لەسەر (**مەحوی**) و لەسەر (**پایز)ی** گۆرانیش دیسان تێی گەیشتم، لە مەریوان حاڵی دەبم چیدەکات، بەڵام لە زۆرکەسی تر حاڵی نابم، رەنگە کورتی یان نوشوستیش بێت لە بۆچوونی من.. ئیتر نازانم، لەوانەیە کابرایەک بم ئەم قوتابخانەیەم چاک هەرس نەکردبێت، عەیبیەک نییە بۆ من..

**رامان: ئەو خشتەکارییەی مەریوان بۆ گوڵی رەش بونیادگەری پێکهاتەییە کە گوڵدمان زیاتر بایەخی پێداوە، ئەویش سوودی لە مارکسییەت و فرۆیدییەت وەرگرتووە، بۆیە وەزیفەی کۆمەڵایەتی ئەدەب بەلاوە نانێ. لەبەر ئەوە ئەو بابەتە باشتر ئیستیعاب دەکەیت، چونکە وەک پێشتر وتت بەدوای مانادا دەگەڕێی و مەبەستت هەیە مانا بگەیەنی.**

**شێرزاد حەسەن:** رەنگە من چاک لەو قوتابخانەیە وەک پێویست قووڵ نەبووبێتمەوە، یان ئەوان ناتوانن بەمنی بگەیەنن مەبەستیان لەم شیکارییە چییە، بەڵام ژمارەیەکی زۆر سەیر لەو لاوانەی کە بەحیساب رەخنەگرن دەیکەن بێ ئەوەی بزانن ئەمە چییە، سێگۆشەو چوارگۆشەو بازنە دروست دەکەن، دڵنیام کە هیچی نەوتووە، چونکە ئەو لاساییکەرەوەیە.

**رامان: لەناو عەرەبیش ئەزموونێکی قووڵەو هەموو کەس تیایدا سەرکەوتوو نابێت، یەک دوو کەس هەیە لە دەقە پراکتیکییەکاندا سەرکەوتنێکیان وەدەست هێناوە، دوکتۆر کەمال ئەبو دیب، دوکتۆر مالیک مەتڵەبی، لە وڵاتانی عەرەب زۆر لەو بازنەو سێگۆشانە دەبینی کە بەبێ هۆ دانراون، ئەوە کارێک دەکات لای**

**خوێنەر باری سەرنجێکی ناهەموار لەسەر ئەو قوتابخانە رەخنەییانە دروست بکات، ئەگەر بەراستەرێی خۆی بکاتە خوێنەری کورد سوودی باشی دەبێت..**

**شێرزاد حەسەن:** کەمن ئەو رەخنەگرانەی چاک لە بونیاتگەری گەیشتبن.. وابزانم مەسەلەکە پتر تەقلیدە.

**رامان: دریدا یەکێک لە کتێبە هەرە گرنگەکانی ـ الكتابة والأختلاف ـ ە کە بڕوا ناکەم زۆر لەوانە ئەو کتێبەیان بینیبێ، لەوانەیە هەندێ پەرەگرافی ئەو کتێبە یان وتارێکی بینیبێ لەسەری، کەچی رای لەسەر دەدات و دەبێتە نوێنەری دریدا رەخنەی (تفكيكي) دەنووسێت.**

**شێرزاد حەسەن:** لەگەڵ ئەو لاساییکردنەوانە نیم، من بۆچی لە گوڵدمان و فۆکۆو رۆلان بارت تێ دەگەم کەچی لە گەنجێکی کورد تێناگەم کە لەوانی قەرز کردووەو دەیەوێ دەقێک شیبکاتەوە، لە فۆکۆ باشتر تێدەگەم لەلاوێک کە دەیەوێ بڵێ من قوتابیەکی فۆکۆم، ئەمە لاسایی کردنەوەی کوێرانەیە بۆ قوتابخانەکان، رەنگە من هێشتا مەیلێکی خۆم بۆ قوتابخانە تەقلیدییەکانی رەخنە هەبێ.

**رامان: خوێنەر چاکە لەگەڵ خۆی راستگۆ بێت ـ نەجیب مەحفووز - دەڵێ من چێژ لە جیمس جۆیس وەرناگرم**

**شێرزاد حەسەن:** ئەوە ئەو کاتە بوو کە نۆبڵی وەرگرت و وتی نووسەرێکی گەورەیە دەیخوێنمەوە بەڵام تێیناگەم، ئەمە شورەیی نییە تۆ بڵێی لە شتێک تێناگەم، من هەندێ لە شتەکانی (**لاکان**)و (**دریدا**) چەندین جار بەسەریاندا دەچمەوە، کەچی لێیان حاڵی نابم، رەنگە رەگ و ریشەی ئەم فەلسەفەو فیکرانەم پێنەگەیشتبێ، دەرئەنجامی فیکری (**فۆکۆ**)م پێ دەگات، دەرئەنجام و شیکارەکانی (**لاکان**)و (**جاک دریدا**)بە من دەگات، بەڵام ئەم ئەلف و بایەکی هەیەو من یائم پێ گەیشتووە، دەرئەنجامەکان تاکە شتێک نین من حاڵی بکەن تۆ تەنها لە چیرۆکێکەوە من ناناسیت بەڵکو سێ چوار کۆمەڵەی منت دیوە بۆیە قسەم لەگەڵ دەکەیت، بەتەنها چیرۆکێکت بخوێندمایەوە قسەت لەگەڵ من نەدەکرد، کۆی شتەکانی من دەزانی چییە بۆیە گفتوگۆم لەگەڵ دەکەیت..

**رامان: یەکێک لە کاراکتەری چیرۆکەکانت ـ ئافرەتە کە بایەخی زۆرت پێداوەو ئامادەبوونی هەیە، تەفسیرت بۆ ئامادەبوونی ئافرەت لەناو ئەو دەقانە چۆنە..؟!**

**شێرزاد حەسەن:** زۆرجار ژینگەو وڵاتی خۆمان بە بەندیخانەیەکی گەورە تێدەگەم بۆ ئافرەت، بوونەوەرێک هەبێ چەوساوە بێت، لەدایک و خوشکانی خۆم و ژنانی گەڕەک هەستم پێکرد هەتا ئەو کچانەی دەرسم پێ وتنەوە تەنانەت هاوڕێیانی زانکۆم تەنیا ئەوەیە مەکیاژی خۆی کردووەو دەیەوێ بیسەلمێنێ بۆ من کە ئازادەو قەناعەتم پێبکات کە چەوساوەو زیندانی نییە، هەتا بەشێکی یەکجار زۆری ئافرەتی ئەم وڵاتە بە مەینەتبار دەبینم لە دانیشتنێکی تردا باسم کرد ژنە دەوڵەمەندەکانیش هەر دیل و چەوساوەن، ئەوان لە قەفەزی ئاڵتونیدان ژنە هەژارەکان لە قەفەزی تێل و تەنەکەدان، واتە من دیدێکی کارەساتەویم هەیە بۆ

باری ئافرەت، رەنگە لەسەر گۆی زەوی من ئارام نەبم بەحاڵی ئافرەت، ژنانی رۆژئاوا، هەنگاویکیان ناوە بەرەو دۆزینەوەی زاتییەتی خۆیان و جۆرە سەربەخۆییەکیان بەدەست هێناوە، رەنگە لە ئەوروپا یا لە ئەمەریکا لەرووی تەکنیکییەوە، لەرووی هونەرییەوە، لەرووی شێوەو رووکەشەوە رەنگە باسی سەربەستیەک بکەم کە لە گەوهەردا لەناوەوە مرۆڤەکان ئازاد دەکات، ئەو ئافرەتەم لەلا ئازاد نییە کە دەزانێ دە دۆست بگۆرێ ئەو ئافرەتەم لەلا ئازادە کە دەزانێ عیشق بکات لەگەڵ یەک پیاودا، بۆیە بوونی ئافرەتی مەینەتبار لە چیرۆکەکان و سورانەوەی من لەدەوری ئەو بازنەیەدا وابزانم هەمووی دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی ژمارەیەکی زۆری ئافرەتی مەینەتبارم ناسیوە. دیسان مەبەستمە بچمە ناو شتە نهێنییەکانی ئافرەت و ژمارەیەکی زۆری چیرۆکەکانم ئەگەر بەیەک رستەش بێت باسی بێوەژنێک یان قەیرە کچێک دەکەم، دوا چیرۆکم (مارلین) بوو هەر کێشە کێشەی ئافرەتە، لە حەسار نێرو مێیەکان دەخەسێنرێن، رەنگە پیاو بە چەند پلەیەک ئەگەر کەمیش بێت ئازادو سەربەسترو، کەمێک خەمی سەرشانی سووکتر بێت، بەڵام رەنگە نێرومێی ئەم وڵاتە بە زیندانی کراو تێبگەم، بەڵام مێیینەکان زیندانەکانیان تاریکترو شیشی ئاسنەکانی ئەستوورترە، رەنگە وا بروانمە نێرومێی ئەم وڵاتە لەدوو قەفەزی بەندیخانەدان و نێرو مێیەکان لەبەرامبەر یەکتر لەناو قەفەزەکانی خۆیانەوە سەیری یەکدی دەکەن، ئەم حاڵەتە زۆر بەدیدێکی کارەساتاوی دەبینم، ئافرەتان خۆشیان دەڵێن ئێمە هێندە نەگبەت نین کە تۆ باسمان دەکەیت، بەڵام من بۆ خۆم زۆر جار هەرە نەگبەتەکانیان دەگرم و لەسەریان دەنووسم، زۆر جار کەنانووسم لەژوورەکەمدا بۆ حاڵی پەرێشانی ئەوان دەدەمە پرمەی گریان.

**رامان: دەربارەی هەڵسەنگاندنی گۆڤاری رامان بیروڕات چییە؟**

**شێرزاد حەسەن:** گۆڤاری (رامان) م لەژمارە یەکەوە خۆشویستووەو بەنووسین پشتگیریم کردووە،رامان لەوەوە خۆشم دەوێ تاکە گوڤارێکە لەدوای راپەرین لەرووی ئەوەی مەیدانێکی چۆڵ وهۆڵ هەبوو لەبواری ئەدەبی، هیچ لەو هەوڵانەی پێشتر پڕی نەکردەوە، بەداخەوە ئەم بارە ناهەموارەی سیاسەتی کوردی و کێشەکان وایکرد کەدوو ناوچە هەبێ، سۆران وبادینان یان هەولێر وسلێمانی، کە ئێمە نەتوانین ئەو پردە توندو تۆڵە دروست بکەین لەنێوان ئێمەو خوێنەواران رامان لەبەر هەندێ هۆی تایبەت بەسلێمانی ناگات، بەڵام( رامان) لەوەدا درێغی نەکردووە کەسانسۆری نەبووە، بەدوورو نزیک پێوەندی بەدنیای سیاسەتەوە نەبووە وتێوەی نەگلاوە، ئەدەبێکی ویستووە و سانسۆری نەبووە، تۆ ئەگەر داهێنانت هەبوبێت کەس مەقەستی لێنەداوەو رێی لێنەگرتوویت، لەنەوەی تازە تانەوەی کۆن. بۆیە رامانم خۆش دەوێ حەزەرێک نییە لەسەر هیچ ناوێک، سەر بەهەر حیزب ولایەنێک بێت، ئەو حاڵەتەم پێخۆشە،(رامان) هەموو ئەو دەنگانەی کۆ کردووەتەوە کە هەن، ئەگەر رامان -خراپ بێت، هۆیەکە ئەوەیە ئێمە دەنگەکانی ناو داهێنانی کوردین، گوناهی رامان نییە، وەک ئەوەی پاشکۆی کوردستانی نوێ

هەبوو ئێمە دەنگەکانی بووین، لەئالای ئازادی و لەرزگاری و هەر رۆژنامەیەک ئەوە دەنگەکانی کوردستانە، ئیتر ئەگەر رامان لەرووی بابەتەوە لاواز بێت، ئەوە ئێمەین کەزەلیل وزەعیفین...

لەرووی شێوەی هونەریشەوە(رامان) یەکێکە لەو گۆڤارانەی لەشێوەی هونەری خەریکە پێدەگات، ژمارە بەژمارە هەست بەوە دەکەیت کەخەریکە خوێنەری زۆر لەدەوری خۆی کۆ دەکاتەوە، ئەگەر باری سیاسیمان لەداهاتوودا باشتربێت دڵنیام دەبێتە یەکێک لەو گوڤارە دانسقانەی کەلە کوردستان رەنگە قەڵەمەکانی لەوەو پاش بەرەو گۆڤارێکی زۆر بابەتی بەرن، بەداخەوە( رامان) عەیبێکی هەیە کە ژمارەی کەمە خۆزیا بەچەندین هەزار لە چاپ بدرێت و بقۆزرێتەوە، تا دەروێش وعاشق وموریدی خۆی لەدەوری خۆی کۆ بکاتەوە، پێم باشە هەموو دەنگەکانی ئەدەبی کوردی لەئامێز نێت، ئەگەر لاوازیش بن ئیتر ئەمەیە حاڵی ئەدەبی کوردی..

**رامان: تاچ رادەیەک ئەم چاوپێکەوتن و دیانەیەت بەدڵ بوو، یان چەند توانیت گوزارشت لەو شتانە بکەی کەلە لای خۆت هەبوون؟!**

**شێرزاد حەسەن:** لەوتوێژەکان زۆر راستگۆو نیازپاک بووینە، من ئارامم بەوەی کە بەپرسیارەکان وگفتوگۆکە وروژام و کێشمە کێشەکە خۆش بوو، ویستوومانە جوان وحەق بڵێین، ئارامم بەوەی منم کە بەم شێوەیە قسەکان دەردەبرم، کێمان لێ دەتۆرێ وکێ ئێمەی خۆشدەوێ بۆ کەسانی تر خۆیان دەگەڕێتەوە. گەر لەو هەزارەها رستەیە نهێنییەکی خۆم یان هی خەڵکی یان هونەری چیرۆکم درکاندبێت، گۆشەیەکم رووناک کردبێتەوە کەپێشتر تاریک بووە ئەوە هەوڵێک بووە دوور لەپەشیمانی، نزیک لە جوانی.. هەربمێنن

**سازکردنی گفتوگۆ:**
**ئازاد عەبدولواحید**

**مامۆستا ئەحمەد دڵزار:**

# عیبرەت لەوەدا نییە زۆر بنووسیت، بەڵکو باش بنووسیت

***مامۆستا ئەحمەد دڵزار شاعیرو خەباتکارێکی ناودارە. دانیشتن لە گەڵیدا گرینگی و بەهای خۆی هەیە، نەخوازە لە پاش دوو مانگی تر تەمەنی دەبێتە حەفتاوحەوت ساڵی رێک، بەڵام لەگەڵ ئەوەشەوە هێشتا یادو مێشکێکی تیژو زیندووی پێماوە، بۆیە حەز دەکەی زیاتر بە جیهانی بەربڵاوی ئەم شاعیرە خەباتکارەدا شۆڕبیتەوە..***

***بۆ ئەم مەبەستە رۆژی (٢٥)ی مانگی تشرینی دووەم لە ماڵی مامۆستا دڵزار لە هەولێرو لەگەڕەکی رووناکی بە مەبەستی دەستخستنی هەلێک و زۆر بە خێرایی دانیشتین و ئەم دیمانەیەمان سازدا، مامۆستاش بەوپەڕی راشکاوی لە دنیای خۆی دووا.. هیواداریین لایەنێکی بچووکی کارەکەمان پێکابێ.***

**رامان: مامۆستا چۆن خۆت لەنێو جیهانی ئەدەب و بەتایبەتی شیعردا دۆزییەوە؟**

**دڵــزار:** لەسەرەتای ژیانمەوە کە هەستم بزواندووەو دەرکم بە ژیان کردووە، لە ناو ئەزموونێکی شیعریدا ژیاوم، باوکم زمانی تورکی و فارسی زۆر باش دەزانی، بە درێژایی شەوانی زستان شاهنامەی بۆ دەخوێندمەوەو بۆی دەکردمە کوردی، لەوساوە ئەو هزرە ئەدەبیانە کاریان تێکردووم و شاعیرم بەشتێکی گەورە زانیوە، هەموو هیواشم ئەوەبوو رۆژێ لە رۆژان شیعر بنووسم و ببمە شاعیر، جگە لەوەش بنەماڵەی ئێمە زۆر شاعیری چاکی تێداهەڵکەوتووە وەک: حاجی بەکر ئاغای حەوێزی (**قاصد**) کە نۆ کوڕی هەبووەو هەموویان شاعیر بوون، هەروا (**ئەختەر**)ی شاعیر و (**پلکە سوراحی**) کە دەکا نەنکم شاعیربووە و هەندێ لە شیعرەکانی لای منە.

**رامان: ئەی کەشوهەوای سروشت و کەلەپووری یەکجار دەوڵەمەندی کۆیە، چ کاریگەریی لەسەرت هەبووە؟**

**دڵــزار:** جوانیی کۆیەو ژیانی ئێمە لەنێو باخەکانی خۆمان زۆر کاری تێکردووم،

## ماوەی حەوت ساڵ وازم لە شیعر هێنا لەسەر داوای بەرپرسی حزبیم

هەروا کەلەپوورە زیندووەکەشی، چونکە هەرچی دیوانی شیعری فارسی هەبوو، بە تایبەتی شاعیرە گەورەکان لە ماڵی ئێمەدا هەبوون وەک: حافزو سەعدی و گەنجەوی و مەولانای رۆمی..تاد.. جگە لە دیوانی حاجی قادرو نالی و سالم و حەریق و ئەدەب و شێخ رەزا.. تاد، هەر هەموو ئەمانە دەوریان لە شاعیرایەتیمدا هەبووە، ئەوەبوو لە دەورو بەری ساڵی ١٩٤٠ دەستم بەنووسینی شیعر کرد، ئەوانەی هاوتەمەنی من بوون، زۆریان نەیاندەوێرا شیعر بنووسن، بەڵام کە من شیعرم دەنووسی یەکسەر بڵاوم دەکردنەوە.لە بیرمە یەکەم بەرهەمم لە ساڵی ١٩٤٣دا ئەوەبوو کە دەڵێ:

**لەناو باغی ژیان هەردەم گوڵێکی سوورە سەربەستی**
**لە ناو گشت کۆمەڵی عالەم گوڵێکی سوورە سەربەستی**

**رامان: هەر هەمان شیعر تایەر تۆفیقی رەحمەتی کردوویەتی بە گۆرانی؟**

**دلزار:** نەخێر، گوڵی سەربەستی شیعری بەختیار زێوەرە.

**رامان: وەک دیارە یەکەم هەوڵێکی شیعریت بە چوارین دەست پێکردوە، ئەمەیان بۆ؟**

**دلـــزار:** نەخێر.. چوارینەکان پێشتر نووسیومن، من لە ساڵی ١٩٤٣ وە بڵاوکراوەم هەیە، راستە پێشتر زۆر ساکارانەم دەنووسی، بەڵام لای خەڵک پەسەندبوو.. لە بیرمە ئەو ماوەیە بورهان جاهید هاتە کۆیە و چاوی بە هەندێ شیعرم کەوت و هەندێ دەسکاریی لە شیعرەکاندا کرد خۆ چ شەرمی تێدانییەو ئەوە واقیعە.. هەروا لە بیرمە ماوەی (٧) ساڵ وازم لە شیعر هێنا، ئەویش لەسەر داوای بەرپرسی حزبیم و رێنمایی ئەودا..!

**رامان: ئەی بیستەکان تا چلەکانی باری رۆشنبیریی لە شاری کۆیەدا؟**

**دلـزار:** بیستەکانم باش لە یاد نەماوە.. بەڵام کە چاوم بۆ دنیا هەڵهێنا گوێم لە شیعری صافی هیرانی بوو، شیعری صافی لە کۆیەدا لای هەموو کەسێک ناسرابوو، بە تایبەتی کە دەروێشەکان دەهاتن و دەفیان لێدەداو شیعری ئەویان دەوت، هەروا شیعرەکانی **عوسمان عەونی و سامی عەوداڵ و ملا محەمەدی حەتک** زۆر باوبوون، حەتک مرۆڤێکی ئاشتیخوازو نیشتمانپەروەربوو.. دەڵێن: جارێکیان کە مەندووبی سامی ئینگلیزەکان هاتبووە کۆیە، ئەو شیعرێکی سەیری لە سەر نووسیبوو، ئەم شیعرە بووە هۆی ئەوەی ماوەیەک خۆی بشارێتەوە.. نابێ (راجی) شاعیریش لە یاد بکرێ کە ئەمیش ناوبانگێکی باشی هەبوو.

**رامان: وەک بۆمان دەرکەوتووە، حەقی تۆ لە بواری رەخنەو لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا نەدراوە، تەنانەت لە کاروانی شیعری نوێی کوردیدا کاکەی فەللاحیش ئاماژەی بۆ دەوری تۆ نەکردووە، ئەمەیان چۆن و بۆ؟**

**دلزار:** بەر لەوەی کاکەی فەللاح ئەو کارەی خۆی بڵاو بکاتەوە، بەمنی وت دەبێ

مەحموود زامدار، مامۆستا دلزار، ئازاد عەبدولواحید

شیعری باشمان بۆ ئامادە بکەیت، کەچی دوای ماوەیەک بارودۆخی سیاسی نێو وڵات گۆڕرا و ئێمەش لەلایەنی بیروباوەڕەوە لە یەکتر جودابووین، سەرەڕای ئەوەش من خۆم لای حکوومەتی بەعس خۆشەویست نەبووم، ئەویش چ من و چ (ع.ح.ب) و کۆمەڵە شاعیرێکی چاکی خستە پشت گوێ!!

**رامان: وەک بیستوومانە ،لە ساڵی ١٩٤٦ کتێبخانەی کۆیە کراوەتەوە تۆش یەکێک بووی لە کارگێڕانی و هەر ئەو مەکتەبەیەش بەندبووە بەگیانی حیزبایەتییەوە ئەمەیان چۆن؟**

**دڵزار:** لە ساڵانی (٤٣ -٤٦) لەسەردەمی شەڕی دووەمی جیهانی لەحەبانییە سەرباز بووم، گەلێ سەربازی فەیلیشمان لەگەڵدا بوون، منیش بەو سیفەتەی شاعیرێکی کوردم، دەربەستی ئەوە بووم کوردییەکەم بەهێزبکەم ساڵی ١٩٤٦ کە لە سەربازیی گەڕامەوە کۆیە، برادەرانی ناسیاوم هاتن و دەورەیان دام لەوانە: عوسمان مستەفا و فاتیح رەسووڵ و گەلێکی تر.. ئەوساتە دوو حزب لەگۆڕێ دا هەبوون (پارتی دیموکراتی کورد)و (حزبی رزگاری نیشتمانی). من هەر زوو چوومە نێو ریزەکانی حزبی رزگاری لەو ساڵەدا، دوو مەکتەبە هەبوو، مەکتەبەی حاجی قادرو مەکتەبەی کۆیسنجاق، مەکتەبەی (حاجی قادر) ساڵح شەمس بەڕێوەی دەبرد کە خۆی پارتی بوو، لە پاشا وەک چەپرەوێک من بۆ ماوەیێ مەکتەبەی کۆیەم بەڕێوە دەبرد.. بەڵام هەموو لامان تەبابووین، بیرمە جارێکیان شیعرێکم نووسی، برادەرانی پارتی ئەو شیعرەو چەند شیعرێکی تریان بەخەتێکی سوور نووسیبووەو هەڵیان واسیبوو، ئەوان بە شیعری خۆیانیان دەزانی!!

**رامان: لەسەرنجدانا دەردەکەوێ کە جەنابت بایەخت بەلایەنی هونەریی شیعرت نەداوە، ئایا ئەوە بە هۆی ئایدیۆلۆژیایە، یان مەبەستت بووە ناوەرۆکی جیا جیا هەڵخەیت؟**

**دڵــزار:** بەڵێ ئەمەیان وایە.. بەڵام هاوکات شیعری هونەریم نووسیوە.. من لام وایە دەبێ هەردوو دیو گرینگی پێبدرێت..!

**رامان: کۆپلەیەک کە خۆت بە دڵتە؟**

**دڵزار: ئەی کچی جوانی شەنگو شۆخ**

**ئەی چاوگەشی ئەبرۆ تێرو تۆخ**

**باڵا بەرزەی قەد باریکەی سنگ پڕ**

**گەردن بلوور سنگ نەرمونۆڵ مەمک خڕ...** تاد

ئەمەم لە ١٩٦٥/١/١٦ وتووە...!!

**رامان: مامۆستا هەر بە ژمارە، چەند ساڵ زیندانت دیوە؟**

**دڵزار:** سێ ساڵ و دەمانگ لەسەر یەک بەندکراوم، کە دەربش چووم نزیکەی پێنج مانگ خۆم شاردەوە.. لە ١٩٥٣/٤/١ گەیشتمە سلێمانی و تا ١٩٥٤/٨/٦ لەوێ مامەوە.. هەر لەو ماوەیەشدابوو، مامۆستا (گۆران)م ناسی..!

**رامان: گەر بکرێ هەندێ باسی (گۆران) مان بۆ بکەیت؟**

**دڵــــزار:** کە گەیشتمە سلێمانی، چەندین جار خانووەکەمان گۆڕی، تاچووینە خانوییەکی تر بەرامبەر بە ماڵی عارفی قەرەچەتانی، شەوێ عارف و ژنەکەی هاتنە لامان و زۆر رێزیان لێگرتین.. ئا لەو وەختانەدا نامەیەکم بۆ (گۆران)

## گەر روانگە لێکدانەوەی نوێ بێ بۆ دنیای شیعر ئەوە زۆر باشە بەڵام واز هێنان لە کەلەپوور گوناهێکە نابێ بکرێ

نووسی کە خۆی پاڵێوراوی حزب بوو، زوو یەکترمان ناسی و زۆر جاریش لە ماڵی ئەوان یا لە گردی سەیوان کۆدەبووینەوە.. بیرمە جارێکیان لە ماڵی دیلانی شاعیر بانگ کراین بۆ کۆبوونەوە، باوکی دیلان هاتە لامان و زۆر قسەی خۆش و نەستەقی بۆ کردین تا دیلان هاتەوە.. بیرمە ساڵی ١٩٥٣ بڕیارمان دا سەیرانێک بکەین، تا لە خەڵکەکە دووربکەوینەوە، چونکە ئەو ساڵە ساڵی (تەتویج) کردنی مەلیک فەیسەڵ بوو.. من و گۆران و دیلان چووینە (کانی قەلان) و سەیرانێکی جوانمان رازاندەوە.. لە بیریشمە من مەم وزینەکەی خانیم لەلابوو، بە زاری کرمانجیم دەخوێندەوە، مامۆستا گۆرانیش لێی تێدەگەیشت و زۆر کەیفی پێدەهات، بەڵام دیلان دەیوت: من تێی ناگەم.. هەر لەو سەروبەندانەشدا شیعرم دەنووسی و نیشانی گۆرانم دەدا، ئەویش راو سەرنجی خۆی لەسەر دەدا.. لە پاشا من بۆ کەرکووک گوێزرامەوە مامۆستا گۆرانیش گیرا.. ئیتر من و دیلان پێکەوە ئیشمان دەکرد، لە پاشان دیلانیش گیرا.. من جارێکی تر گۆرانم لە بەندیخانەی بەغداو لە مەوقیفی سەرادا بینی، کە ئەوم بینی، هەمرو ماندوویەتیم رەوایەوەو

تەواوێک حەسامەوە...!

**رامان: ئەی چەند ساڵ لە شاخ بوویت؟**

**دڵـــــزار:** من لە ساڵی ١٩٦٣ چوومە شاخ، لە (کلکە سماق) بووم لە پاشان گەڕامەوە کۆیە، ئەو کاتە حکوومەت پاشەکشەی کردبوو لەو ناوچانە کشابوونەوە دەوروبەری هەولێر.. تا ساڵی ١٩٧١ هەر بەوجۆرە مامەوە، دوای ئەوە لە پایزی ١٩٧٢ چوومە یەکیەتی سۆڤیەتی- جاران- بیرمە لە یەکەم کۆبوونەوەی یادی بەیاننامەی ئۆتۆنۆمیدا بەشداریم کرد، کە چووم بارزانی مەلا خالید و سەعید خەتاتم دی کە خەریکی میکرۆفۆن بوون.. بۆ یەکەمجاریش عەبدولخالیق مەعرووف و ئینجا شێخ رەزای گولانیم لەوێدا دی.

ئەحمەد دلزار

**رامان: خەباتت بە سلبی و ئیجابی چەند کاری کردۆتە سەر شیعرەکانت؟**

**دڵـــــزار:** لایەنی سلبی ئەوەیە، ماوەیەک شیعرم نەنووسی، چونکە داوایان لێکردم شیعر نەنووسم.. ئیجابیەکەش ئەوەیە کەمن بەردەوام شیعری سیاسیم هەر نووسیوە!!

**رامان: ئەی پرۆژەی وەرگێڕانی شیعری بابا تایەری هەمەدانی لە ساڵی ١٩٦٠ دا؟**

**دڵـــزار:** ئەو ساڵانە خەڵکێکی زۆری کوردستانی ئێران لێرەبوون، بەشێکیان لوڕ بوون، منیش زۆر حەزم دەکرد لوڕی بخوێنمەوە و فێری بم، من لەوماوە لەشێوەی زمانی لوڕەکان دەگەم، فارسیشم نەدەزانی، کەچی لە ئەو شێوە زاری بابا تایەر باش تێدەگەیشتم.. هەر چەندە رۆشنبیران لەو باوەڕەدابوون کە شیعرەکانی ئەو زۆر پێچراوەن و تێگەیشتنیان قورسە، کەچی شیعری فارسییان بەلاوە ئاسانتربوو.. ئەو ساتانە من باش لە کرمانجی سەرووش دەگەیشتم و قسەشم پێدەکرد، هەر چەند لەقسەکردندا کەمێ تێدەگەیشتم بەڵام لە خوێندنەوەی کتێبدا باشی لێ حاڵی دەبووم..! ئا ئەوکاتانە توانیم چەندین چوارینی بابا تایەر بە دەست لێدانێکی کەم بکەمە سۆرانی، هەندێ چوارینی وای تیدابوو، بە دوو وشە یاسێ کردوومە بە سۆرانی، لایشم وابوو گەر بە میزاج دایبرێژمەوە ئەو تام و چێژەی نامێنێ.. بەڵێ ئەو چوارینانە گەوهەرێک بوون تۆزیان گرتبوو، من تۆزەکەم لە سەریان لادا..!!

**رامان: ئەوەندەی بزانین لە کۆیە ئەوانەی حەزیان لە ئەدەبیات و بواری رۆشنبیریی بوو، ببوون بەدوو سێ گرووپ و هەر گرووپەی خزمەتی لایەنێکی دەکرد و دەیانویست لە شاری کۆیەدا زانستانە خزمەتی رۆشنبیریی بکەن، هەندێکیان خەریکی لێتوژینەوەی مێژوو، هەندێکیان خەریکی بواری هونەری و بووژانەوەی فۆلکلۆر بوون، ئایا جەنابت ئاگەداریت لەو بابەتانە هەیە؟**

**دڵـزار:** من ماوەیەکی زۆر لە بەندیخانە دابووم، بۆیە زۆر دەرفەتی رۆشنبیریم لە

دەست چوو، زیاتریش خەریکی سیاسەت بووم..!
**رامان: دووره ولاتی چەند کاری کردۆته سەر خۆت و شیعرەکانت؟**

## شیعر لای من وەسیلەیە بۆ چاککردنی هەموو بارێک

**دلـزار:** کاری هەر ئەوەندەیە کە مـرۆڤ دووربێ لە کـەسـوکـارو نیشـتـمـان، بەلام شـاعـیـر ئەو هەستەی کە هەیەتی هەر هەیە.. من کـە هەندەرانم جـێـهـێـشـت، زانیم هیچ خـەتەرێکم لەسـەر نەماوە، تا بشتوانم لێرە دەژیم و دەبم، کوردیش وتەنی:
بەرد لە جێی خۆی سـەنگینە، ئێـمـەش لە ولاتی خـۆمـان سـەنگینین، نەک لە دەرەوە.. لەو باوەڕەشدام کەم تا زۆر ئەو دووره ولاتییە کار لە شـاعـیـر دەکات و سۆزو خەیالّ و یادی جیا جیای لەلادا دەخولّقینێ..!
**رامان: ئەی چۆن لە شیعری لاوان و لە ئاسۆی پاشەرۆژیان دەڕوانی؟**
**دلـــزار:** شـیـعریش بە پێی بارودۆخی رۆژگـار دەگـۆڕێ، بەلام شـاعـیری باش لە هەمـوو دەورێـک هەر دەمێنێ، جـا چ بەشێوەی کـلاسیـک بێ، یا رۆمـانسی، یا بە شێوەی واقـیـعی شـیـعـر بنووسێت.. بەداخەوە ئەوانەی ئێـسـتـە شـیـعـر دەنووسن گەلێک زۆرن، کەچی ئەوانەی شاعیری باشن کەمن، عـیبرەت لەوەدانییە مرۆڤ زۆر بنووسێ، بەلّکو لەوەدایە باش بنووسێ..!
رامان: ئەی رات دەربارەی شاعیرایەتی کاک ئازادی کوڕت؟
**دلزار: زۆر جار ئەم پرسـیـاره قـورس و سـەخـتـەیان لێکردووم.. من بەراشکاوی دەلێم: ئازاد شاعیرێکی باشە، ئێوەش دەتوانن هەلّیسەنگێنن..!**
**رامان:** لای جەنابت، مامۆستا هەژاری موکریانی چۆن دەکەوێتەوە؟
دلزار: شاعـیـرێکی دلّسۆزی کورده، بەلام لە رووی هونەرییەوە مامناوەنجی و لە سەرووی مامناوەنجییە.. لەرووی زمان و وەرگێڕانەوەش لە هەمووان بالادەستترە.. بەلام لە رووی داڕشـتنی زمـانەوە من (هێـمن) بەپلەی یەکـەم دادەنێم.. هەروا لە رووی زمانپاراوییەوە، مەلا شوکر و ئیبراهیم ئەحمەد زۆر باشن..!!
**رامـان: لەسـەرەتای حەفتـا- گـەر بیرت مـابێ- لەمـالّی دوکـتـۆر مـارف خەزنەدار باسی تـەیاری روانگە دەکـرا، وا چارەگـسـەدەیەک رابورد، رای جەنـابت ئێـسـتـە و ئەوسا چۆن بوو؟**
**دلـــزار:** روانگە وەنەبێ لە خۆیەوە رسکابێ، ئەوان چاویان لە دەسـتـەی شـاعـیـرە عەرەبەکانی (٦٩) کرد.. ئەوساو ئێستەش دەلێم:
گـەر روانگە بۆچوون و لێکدانەوەی نوێ بێ بۆ دنیـای شـیـعـر، ئەوە زۆر باشـە.. بەلام وازهێنان لە کـەلەپووری نەتەوایەتی گـوناهێکەو نابێ بکرێ، مـن خـۆم لە رەفیق سابیرم بیستووه کە دەیگوت: (من شیعری قافیەدار هەر ناخوێنمەوە).. ئێمە هەمیشـە شانازیی بە شاعیرانی وەک نالی و مەولەوی و خانی و حاجی و وەفـایی و مـەحـوی دەکـەین، شـاعـیـری نوێش ئەو کـەسـەیە تەجـاوزی ئەو کـەلّە

شاعیرانە بکات..!

**رامان: ئەی لە بواری رۆژنامەنووسیدا چیت کردووە؟**

ئەحمەد دلزار

**دلـــزار:** بۆ ماوەیەک لە رۆژنامەی ئازادی و لەگەڵ گۆران و حەمەی مەلاکەریم و حەمەکەریم فەتحوڵڵاو حوسێن عارف کارم کردووە، من ناڵێم رۆژنامەنووسێکی سەرکەوتووبووم، بەڵام شتم دەنووسی.. لەم بوارەدا تەنیا (٣-٤) مانگ ئەزموونم هەیە.. لە نووسینگەی رۆژنامەنووسیدا کە لە هەولێربوو، لەگەڵ ئەحمەد حامید و سەعدی مالیح و رەئووف زوهدی و ئەحمەد رەجەب، ئەندام بووین و بەرهەممان لە (بیری نوێ)دا بڵاو دەکردەوە.

**رامان: پێت وانییە، رۆژنامەنووسیی سلبیانە کار لە مرۆڤی ئەدیب دەکات؟**

**دلـــزار:** بەڵێ ئەو کارە دەکا گەر بەردەوام بێ لە نێو ئەو کارەدا.. یانی وەکو کارمەند.. چونکە ئیشی رۆژانەی رۆژنامەنووسی زۆر چڕو جەنجاڵەو کار لە ئەدیب دەکات!!

**رامان: ئەی رەخنەی ئەدەبی ئەمڕۆو دوێنێت چۆن دێتە بەرچاوان؟**

**دلزار:** ئێستە رەخنە زۆر باشترەو رەخنەگریشمان هەن و لەکاری خۆیان تێدەگەن.. پێشان گەر کابرایەک برادەرێکی خۆشبویستایە، شتێکی باشی بۆ دەنووسی و هەڵیدەکێشا، یەکێکی تر مونافیسی بوایە دەیشکاندو لە قوڕاویی دەبرد.. دیارە ئەوەش رەخنەنییە.. ئێستە لەگەڵ پێشکەوتنی شێوازەکانی ئەدەبی، باری رەخنەش بەرەوپێشەوە دەچێ..!

**رامان: راپەڕین پیرۆزبوو، کەسیش نکووڵی لە بنەماکانی ناکات، بەڵام دوای شەڕی ناوخۆ، باری رۆشنبیریی بە جارێ شێوا، تۆ چۆنی دەبینی؟**

**دلـــزار:** ئەم بارە نالەبارەو زۆر شتی تر کاری تێکردم.. چونکە گەر بوار هەبێت ئەدیب بە ئازادیی بنووسێت ئەوە حاڵەتەکە پێشدەکەوێت.. بەڵام بە مەرجێک ئەو ئەدیبە نانی هەبێ و یارمەتی بدرێ و بەرهەمەکانی بۆ چاپ بکرێت.. لە سۆڤیەتی جاران، چاکترین کۆشک کۆشکی ئەدیبان بوو، باشترین یارمەتی دەدران، کاری ئەوان تەنیا نووسین بوو، بەڵام لێرە ئەدیب زیاتر لە هەوڵی نان پەیداکردنە و بەس..!

**لاوان پێویستە راستگۆیانە بنووسن و دوور بکەونەوە لە ململانێی بێ مانا**

**رامان: کەواتە: لە باری رۆشنبیری ئەمڕۆ رازی نیت؟**
**دلزار:** نەبەخوا، هیچ رازی نیم..!
**رامان: ئەی پێت وایە شیعر وەسیلەیەک بێ بۆ مەبەستی سیاسی، بۆیە زۆر جار خۆت لە رەخنەدا بەسەر ناکرێیتەوە؟**
**دلزار:** ئێ خۆ هەموو شیعرەکانم سیاسیی نین.. ئەو ماوەیەی لە هەندەران بووم، زۆربەی نووسینەکانم سیاسیی نین..!

مامۆستا گۆران و ئەحمەد دلزار

**رامان: یانی شیعر لەلای تۆ وەسیلەیە یا ئامانج؟**
**دلزار:** شیعر پێویستە تەعبیر لە شتێ بکا، بەپلەی یەکەم شیعر وەسیلەیە بۆ چاککردنی هەموو بارێک، چ سیاسی و چ کۆمەلایەتی و چ ئەدەبی و چ بەرەو پێشەوە بردنی ژیان.. من بڕوام بە شیعر بۆ شیعر و هونەر بۆ هونەر نییە.. گەر شیعرێک خزمەت نەکا، شیعر نییە..!!

**رامان: ئەی یادداشتنامەکانی ژیانت؟**
**دلزار:** لە هەرسێ بەشیدا کەچاپکراون، زۆربەی رووداوەکانی تێدایە، من زۆر بە هیوام شتێکی تر بنووسم، بەلام دەرفەتم نییە.. سەرباری ئەوەش تۆ ناتوانی هەموو شتێ بنووسی، چونکە لایەکت لێ زویر دەبێ، زۆر کەسیش پێت دەلێن: ئێوە هەلوێستتان نییە..! ئەی باشە لەوەزیاتر کە ئێمە دژی شەڕین و نەفرین لە شەڕ دەکەین و دەمانەوێ ئاشتی و برایەتی سەربگرێ..

**رامان: پێت خۆشە خەباتی خۆت باسبکرێت کە: بۆ کۆمەلگەی کوردەواری بووە، یا زیاتر بۆ دیموکراتیەت بۆ عێراق بووە؟**
**دلزار:** من ئەمەم لە زۆر شوێن ونووسین باس کردووە، باری ولاتیش لەگەل ئەوەدایە کە دیموکراتیەت بۆ عێراق بێت و گەلی کوردیش بە ئامانج بگات، گەربێت و ئەو وەزعە لەبەرژەوەندیی ئێمەدا بێ، من دەبمە شاعیرێکی کوردستانی نەک

وەستاوەکان لە ڕاستەوە بۆ چەپ: محەمەد ئەمین کەبابچی، بورهان محەمەد ئەمین، عەبدولواحید حەمە سدیق، مام ئەسعەد، ئەحمەد دڵزار
دانیشتووەکان: فاتیح ڕەسووڵ، ڕۆستەم حەویزی شاعیر

عێراقی..!

**ڕامان: جەنابت ئەزموونێکی زۆرت هەیە، ڕاوسەرنجت بۆ لاوان چییە؟**

**دڵـــزار:** سەرنج و ڕاسپاردەم ئەوەیە کە بەردەوام هەوڵبدەن جووڵانەوەی شیعرو ئەدەب و هونەری کوردی بێتە مەیدان، ڕاستگۆیانەش بنووسن و دووربن لە ململانێی ی بێ مەعنا..!

**ڕامـان: باسی ئەوەت کردووە کە لە کۆیە ماوەیەک خەریکی کۆکردنەوەی کەلەپوورو فۆلکۆر بوویت؟**

**دڵـــزار:** بەڵێ هەندێ شتم کۆکردەوە، ڕەحمەتی عەبدولواحید حەمە سدیق هاوکاریی دەکردین، بەڵام نەماندەتوانی لە چاپی بدەین.. ئەوەی کۆشمان کردەوە زۆربەی زۆری فەوتا..!

**ڕامان: کۆیە چەقی مەقاماتە.. ئەمەیان چۆن؟**

**دڵـزار:** کۆیە خاوەن میرنشینی خۆی بووە، پێش هەزار ساڵیش شاربووەو دەوری مێژوویی خۆی هەبووە، بۆیە گەنجینەیەکی گەورەی لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە.. هەر بۆنموونەو بەس: (ئەمین ئاغای ئەختەر) نەک هەر لە شیعر مامۆستا بووە، بەڵکو لە مەقامیش دا، مەقامناسێکی گەورەبووە.. جاران کۆیە شوێنی زەوق بوو، ئێواران پێش جەنگی دووەم، ئەو باخانەی کۆیە پڕدەبوون لە پیروگەنج و هەموو گۆرانییان دەگووت و دەنگیشیان زۆر بەسۆزو خۆش بوو.

**کۆری ئەحمەدی مەلاو عەونی** زۆر بە ناوبانگ بوو.. لەناو کۆیەش **عومەری مام عەوڵاو هەروا (حەنیل)و (مەربێن) و تایەرو مەلا ئەسعەد** لە دەنگ خۆشەکان

بوون سێوەش ئێمە قەدرمان نەدەزانی، کەچی سلێمانییەکان زۆر ڕێزیان لێدەگرت و زیاتر خۆشیان دەویست..! نابێ دەوری (**باکووری**)یش قەت لە بیر بچێ..!

**رامان: تۆ لەگەڵ بارزانی نەمردا دانیشتوویت، خۆت ئەو کەڵەرابەرە وەک سەرکردەیەکی نەتەوەیی چۆنی هەڵدەسەنگێنی؟**

دلزار: بارزانی پیاوێکی لەسەرخۆو خاکەڕابوو، زۆر بە هێمنی گوێی لە قسەی بەرامبەرەکەی رادەگرت.. هەمیشە بە تەنگ کێشەکانی خەڵکەوەبوو.. زۆر کێشەی ئێمەشی چارەسەر کردووە.. من بە دورو درێژی باسی (بارزانی)ی نەمرم لە دەسنووسێکی خۆمدا کردووە.

**سازدانی گفتوگۆ:**

**شازاد عەبدولواحید - مەحموود زامدار**

## حەمە کەریم عارف:

# شاکاری گەورە وەردەگێڕم، چونکە نووسینەکانم خۆیان لەقەرەیان نادەن

***حەمە کەریم عارف کە وەک چیرۆکنووس و وەرگێڕ ناسراوە، قەڵەمێکی بەبرشتەو چالاکانە لە بزاڤی رۆشنبیری کوردیدا کار دەکات. ئەگەرچی بەرهەمێکی زۆری بەچاپ گەیاندووە، بەڵام ئەو کتێبانەی بەچاپی نەگەیاندوون لەبەرهەمە بڵاوکراوەکانی زیاترن.***

***ئەم نووسەرە بە بێدەنگی سەرقاڵی کاری وەرگێران و نووسینە، کەمتریش چووەتەبەر رووناکی. وەک نووسەرێکی خاوەن بیروڕای تایبەتی خۆی ئەو دیمانەیەمان لەگەڵدا ساز کرد.***

**رامان: بەخێر بێن ...**

**حەمە کەریم عارف:** پەندێکی رووسی هەیە دەڵێ دۆستەکەت لەژیاندا گوڵێکی بەیەخەدا بکە لەوە باشترە بەمردوویەتی گومەزێکی بۆ دروست بکەی، بەراستی ئەم رێبازەی کە ئێوە وەک کادیرانی گۆڤاری (رامان) گرتووتانە بەر رێبازێکە یەکجار بەدڵمە، کە کۆمەڵێ ئەرک لەسەر مێژووی ئەدەبی کوردی کەم دەکەنەوەو کۆمەڵێ کاریش بۆ خەمخۆرانی وشەی ئەدەبی کوردی سووک دەکەن...

**رامان: وەک ئێمە بزانین ناوەندی رۆشنبیری کوردی شایەدی بۆ ئەوە دەدەن کەم کەس بەقەد تۆ رووی لەوەرگێران کردووە، بەتایبەتی شاکارەکانی جیهانی لەبواری رۆمان و چیرۆک و جاروباریش شانۆنامە، ئەم چرپرپەت لەلایەنی وەرگێرانەوە بۆچی و سەرەتاکەی بۆ کوێ دەگەڕێتەوە؟**

**حەمە کەریم عارف :** ئێمەی کورد وەک رۆڵەی میللەتی ستەمدیدە زۆر جار لەدەرەوەی دەسەڵاتی خۆمان بە پێشمەرگایەتی مەحکووم بووین، دیارە هەر میللەتێ ستەم کێش بێ رۆڵەکانی بەپێشمەرگایەتی مەحکوومن، منیش لە

هەشتاکان کە چوومە شاخ زانیم پیاوی مەیدانی چەک هەڵگرتن و سەنگەر نیم، بەڵام هەستم دەکرد قەڵەمێکی بچکۆلەم پێیە، بەو قەڵەمە بچکۆلەیەش هەر هیچ نەبێ دەتوانم غوربەت و نیگەرانی ناخی خۆمی پێ بسپێرم، رەنگە غوربەت و نیگەرانی ناخی منیش لە غوربەت و نیگەرانی ناخی هەر رۆڵەیەکی تری ئەو میللەتە نزیک بێ، چونکە ئاستی بیرکردنەوەو گوزەران و ئازارمان لەیەکترەوە نزیکە، لەوێوە لەگەڵ زمانی فارسیدا تۆزێ قاڵبوومەوەو حاڵی بووم، لەوباوەڕەشدا بووم کە کتێبخانەی هیچ میللەتێکی تێگەیشتووی دنیا لە وەرگێڕان بەدەر نییە، ئەو کتێبخانەیەی کە وەرگێڕانی تێدا نەبێ لام وایە: کتێبخانەیەکە پەرژینێکی زۆر بێ مانای لە دەوری خۆی دروست کردووە، پێشم وا نییە ئەمڕۆ لەدنیادا زمانێک بێ وەرگێڕان ببێ بەزمانی بەخشش، چ ئەدەبی، یان زانستی، یان بەخشش لە مەیدانەکانی تری ژیاندا.

**رامان: مانای وایە بەلای تۆوە وەرگێڕان دیالۆگی نێوان شارستانیەتیەکانە...؟**

**حەمە کەریم عارف:** بەڵێ وایە جگە لەوەی تەقاندنەوەی کوێرەکانیی بەهرەی لای ئەو میللەتەیە، مانای تۆ لە میللەتێکی رۆشنبیری گەورەوە شت وەردەگێری، چیرۆکێک یان رۆمانێک یاهەر بابەتێکی ئەدەبی و هونەری تر ئەمە گوێزرانەوەی ئەزموونە بۆ میللەتەکەی خۆت، ئەگەر سووکە بەهرەیەکیش لەنێواندا هەبێ ئەو بەهرەیە دەوڵەمەندتر دەبێ، وەک ئەوە وایە تۆ ئاوێکی زۆر زوڵاڵ بێنی بیرژێنیتە ناو گۆمی رۆشنبیری خۆتەوە، دەتوانی بڵێی تۆ ژوورێکت هەیەو پەنجەرەیەکی پێوەیە خۆ نابێ دایبخەی، لەو پەنجەرەیەوە پێویستە هەوای سازگار بێتە ژوورەوە، ئەوەش بۆ ئەو مەبەستەیە کەشوهەوای ژوورەکەت خۆش و سازگار بکات، بەڵام تۆ دەبێ تایبەتمەندی خۆیشت نەدۆڕێنی ئەو هەوایە بنمیچ و ساپیتەت نەڕووخێنێ و نەیشێوێنێ، من وەرگێرانم ئەوەها بینیوەو ئەوهاش دەستم پێکردووە، زۆربەی کارەکانی کە کردوومن خۆم هەڵمبژاردوون، وەنەبێ کەسێ، یان دام و دەزگایەک بەسەرمدا فەرزی کردبێت، تەنانەت بۆ بژێویش نەبووە، چونکە من لەوکارانەدا وەک بژێوی هیچم دەستنەکەوتووە، بەڵام کەوی کردنەوەی غوربەت و نیگەرانی لەنووسیندا هەیە، چونکە نووسین لای من مانای بەرزبوونەوەیەکی ئینسانییە کە مرۆڤ بەرەو جۆرە هەڵکشانێک دەبا.

**رامان: دیارە چێژ وەرگرتن لایەنەکی تری وەرگێرانە؟ ئەمەیان چۆن؟**

**حەمە کەریم عارف:** ئەو بەرهەمانەی کەخۆم هەڵمبژاردوون لە خوێندنەوەکەیدا چێژم لێوەرگرتوون ئەمجا بەچێژەوە خۆم لە قەرەیان داوە، من ئێستە هەر بۆ نموونە: ئازادی و مەرگەکەی کازانتزاکی ـ م بەکوردی هەیە، ئەگەر دەشتانەوێ دەتاندەمێ بەبەلاش بۆ خۆتان و ناوی منیشی لێ بسڕنەوە بەس بچێتە کتێبخانەی کوردییەوە، حەوت سەد لاپەڕەیە بەفارسی -محەمەدی قازی- یادی بەخێر- وەری گێڕاوە کە ئەویش یەکێکە لەوەرگێرە گەورەکانی ئێران، لە هاندەرە رۆحییەکە بترازێت هیچ شتێک ئەمەی بەمن نەکردووە، ئەگەر رێم بدەن بڵێم ئەو بابەتە کارکردنەی دنیای ئەدەبیات و نووسین بالاترین و رۆمانسیترین پرۆسەی سێکسیشە،..

**رامان: مەرجە وەرگێڕ قەناعەتی بەو ڕێبازە فیکرییە هەبێ کە وەریدەگێڕێ؟**

مەحموود زامدار ـ حەمە کەریم عارف ـ ئازاد عەبدولواحید

**حەمە کەریم عارف:** نەخێر مەرج نییە، تۆ کە سەیری کتێبخانەی خۆت دەکەی وەک ستراتیژی نەتەوەیی بیر دەکەیتەوە، ئەمە مافێکی ئاسایی خۆتە بەپێی پێداویستیەکان کاربکەی، پێم وایە ئێستە کورد لە قۆناغێکی زۆر سامناک دایە، چونکە سەردەم سەردەمێکی زۆر خێرایە، پێم وایە ئەو دام و دەزگایانەی لەبواری بڵاوکردنەوەدا دەستیان هەیە، خەڵکانی زمانزان هان بدەن لەدوا بابەتی دنیاوە بێنە خوارەوە بۆ بابەتە کۆنەکان، چونکە سەردەمی خێراییەو لەرۆژێکدا ملیۆنەها کتێب لەدنیادا چاپ دەکرێت، تۆ تازە بەتازە بگەڕێیتەوە بۆ کتێبێکی (٥٠٠)ساڵ لەمەو پێش، دەبێ لەدوا کتێبەوە دەست پێبکەین و بێینە خوارەوە بۆ کتێبەکانی سەرەتا هەرچەندە ئێمە میللەتێکی بێ دەرەتانین، بەڵام مانای وانییە دەستەو ئەژنۆ دابنیشین دەبێ هەوڵ بدەین و نەوەستین..!

**رامان: بەژمارە چەند کتێبت تا ئێستە وەرگێڕاوە؟**

**حەمە کەریم عارف:** بەچاپکراوو چاپنەکراوەوە نزیکەی (٦٠) کتێبە و (٤٢)ی لێ چاپکراوە، بەڵام بەداخەوە بە دانەی یەکجار کەم بۆ نموونە: (غەریبەکەی) (ئەلبیرکامۆ) لەهەشتاکانەوە تەرجومەکراوەو هاتۆتە بازاڕیشەوە ئەمەش ـ ئازاد مستەفا ـ ی رەحمەتی پاسۆک بە(٥٠) دانە بۆی چاپکردووم، ئینجا یەکێ لەمەترسیەکانی ئەم دیاردەیە ئەوەیە کە کاریگەرییە رۆشنبیری و فیکرییەکە، یان ئەفراندنەکەی ئەوەندە نابێت، ئێستە غەریبەکەی کامۆ هیچ کتێبخانەیەک نییە لەدنیادا تیایدا نەبێت، من سەیری کتێبخانەی کوردی دەکەم لەو بابەتە چیرۆکەی تیا نییە، لەوبابەتە بۆ چوونە فیکرییەی تیا نییە، بۆیە مافی خۆمە بیر لەوە

بکەمەوە ئەوە بێتە کتێبخانەی کوردییەوە، بەڵام ئەمە گەر شەش هەزار دانەیەکی لێ چاپ ببوایە و هەر دانەیەکیش بەروبعێ یان نیو دینار بوایە، ئەوە دەچووە ناوەندەکەوە و بێگومان خەڵکانێک لاساییان دەکردەوەو تێکچڕژانە رۆشنبیرییەکەش زیاتر دەبوو...!

**رامان: ئەوەی بینیومانە تەرجومەکانت هەمووی لەبواری رۆمان و چیرۆکی کورتە و لێکۆڵینەوەشی تیایە و کەمتر شیعرت وەرگێڕاوە؟ ئایا تەرجەمە نەکردنی شیعر لەلای تۆ هۆی ئەوەیە چونکە خۆت چیرۆکنووسیت، یان لەبەر ئەوەیە کە هاوسۆزیی زیاترت لەگەڵ رۆمان و چیرۆک کردووە؟**

**حەمە کەریم عارف:** من پێم وایە شیعر هونەرێکی زۆر بەرزە لە ئاستی مۆسیقادایە شیعر لای من نە پێناسەو نە وەرگێڕان قبووڵ ناکات، لەبەرئەوەی نەموێراوە خۆم لەقەرەی شیعر بدەم، شیعری وا هەبوو کە خوێندوومەتەوە لە چیرۆکێک زیاتر کاری تێکردووم و لە چیرۆکێکیش زیاتر چێژم لێوەرگرتووە، شاعیرێکی فەرەنسی بەزمانی خۆی شیعرێکیم بۆ بخوێنێتەوە رەنگە ئیقاعەکەی کۆمەڵێ چێژم بداتێ..! لەبەر ئەوەشە بەلای شیعردا ناچم..!!

**رامان: تۆ خۆت تەرجومەت بە دیالۆگی شارستانیەتەکان دانا، ئەی بۆ رۆمان و چیرۆک و هەموو کێڵگە مەعیریفیەکان تەرجومە بکرێن، میللەتێکی وەک عەرەب و یان فارس، دنیایەک شیعریان تەرجومە کردووە، بۆ ئەم کارە بۆ ئێمە رەوا نەبێ؟**

**حەمە کەریم عارف:** بۆ ئێمە رەوایە بەڵام بەقەناعەتی خۆم بەرەوای نابینم، رەواو ناڕەوا بۆ خودی خۆمە نەک بۆ خەڵکان، رەنگە خەڵکانی تر جاری وایە بە ناچاری دەبێ هەر تەرجەمە بکەن، بەڵام ئاخۆ شیعرە تەرجەمە کراوەکە رۆحی شیعرییەت وەردەگیرێ..؟! بۆیە دەبێ حیساب بۆ ئەوەش بکرێ، رەنگە شیعرێک بەزمانە رەسەنەکەی وزمانەکەشی نەزانم ئیقاعەکەی چێژێکم بداتێ، بەڵام نەوێرم وەک وەرگێڕێک پەلاماری تەرجەمەی شیعر بدەم ،...!

**رامان: بۆ نموونە ئەدۆنیس و سەیاب شیعری جیهانیان بۆ سەر زمانی عەرەبی تەرجومە کردووە، دەبێ وەرگێڕەکەش بەقەد شاعیرەکە شاعیر بێت و بەقەد هەردوو زمانەکەش زمانزان بێت، بەڵام ئەگەر تەنیا خۆت لەتەرجومەی شیعر دەترسیت ئەمە باسێکی ترە..، وەرگێڕان وەک دەزگاکەی جۆرج تەرابیشی دایناوە لای کورد ئەوە نییە، بەڵام لەناو کۆڕو کۆمەڵی ئێمە هەوڵی تاکە کەسانێ وەک عەزیز گەردی و شوکر مستەفاو هەژار هەیە، بەڵام بەشێوەیەکی بەرنامەرێژکراو کار بۆ تەرجومە نەکراوە، بەرای تۆ چ بکرێت باشە؟**

**حەمە کەریم عارف:** ئێمە گەر لەو مەیدانەدا کاربکەین و مەیدانەکەش جۆرە بژێوییەکی بۆ دروست کردین، ئەوکاتە جۆرە بەرنامەدارییەکت دەبێ، بەڵام ئێمە تا ئێستە وەک دەزگا بایەخمان بەو بوارانەی ژیان نەداوە بۆ نموونە: عەزیز گەردی هەندێ فرسەتی دەستکەوتووەو جێی دەستی دیارە، چونکە نیمچە بەرنامەدارییەک لە کارکردنی ئەودا هەیە، ئەگینا چەند شتێکی پەراگەندەی بکردایە، چیرۆکێکی کورت لێرەو شیعرۆکەیەک لەولا هیچ کاریگەریی ئەوتۆی نەدەبوو، یان مەلاشوکر

جـــۆره بەرنامـــەدارییـــەکی هەیە لەوەرگـــێـــڕاندا، یـان هەژاری ڕەحـمـەتی، سەیر دەکـەی ئەم سێ کـەسـە لەمـەیدانی وەرگـێـڕاندا جـێـگە دەسـتـیـان بە ئـاشـکـرایـی دیـــــارە، سـوودیـشـیـــان لە زاراوەکانی زمانی کوردی وەرگـــرتووە، ئـێـمــــە بێ بەرنامـەین، زۆر لە نـووسـەران یان وەرگـێـڕەکان هەناسەیان کـورتە، خۆیان بەشیعرێکی کورتەوە خەریک دەکەن و بەپەلە پروزێ وەریدەگـێـڕن و دەینێـرن بۆ ئەم یان ئەو ڕۆژنامـەیە، من بمەوێ شاعـیـرێک بناسم تەنیا بەشیعرێک ئەو شاعیره ناناسرێ، چونکە کێ دەڵێ هەڵبژاردەکەی من بۆ ئەو شاعیره هەڵبژاردەیەکی ڕاستـە، ڕەنگە خراپترین شیعری ئەو شاعیرەم هێنابێ و تەرجـەمـەم کـردبێ، ئەوە نـابێ بەنموونە، حـەزدەکـەم ئەوانەی لەبواری وەرگـێـڕاندا کـار دەکـەن لەجـیـاتی شـیـعـرێک با دیوانێک تەرجـەمـە بکەن، یان شاعیرەکە پێنج دیوانی هەیە، لەهەر دیوانە شیعرێک یان دووان هەڵبژێرن تا ببێتە نیمچە دیوانێک و بەوەرگێڕاوی نموونەی قۆناغـەکانی شیعری و تەمەنی و جیاوازی بیرکردنەوەی ئەو شاعیرەش لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێک بە ئاشکرایی دەردەکەوێ..

**ڕامان: ئەی لەبواری دانانی دەزگایەک بۆ تەرجەمە؟!**

**حەمە کەریم عـارف:** بە ڕای من بوونی دەزگـایەکی تەرجەمە بەگرنگ دەزانم، من ئێـسـتـە لەوەزارەتی ڕۆشنبـیـریی دەسـەڵاتم هەبێ تا ئەدیبـێـکی کـورد ڕۆمـانێک تەرجەمە نەکا شتی بۆ چاپ ناکەم..

هەر ئەدیبـێـکی کـورد بتـوانێ یەک ڕۆمـان چاپ بکا ئەوە کـورد بۆخـۆی دەبێ بە خـاوەن کـەلتـووری ڕۆمـانێکی زۆرو زەبەند، شـاعـیـرێک کە بەشـێک لە بەرهەمی شاعیرێک تەرجەمە بکا ناچم یەک شیعری بۆ بڵاو بکەمەوە، نەخێر با دیوانێکی نایاب و نازدار وەربگێڕێ ئەوجا بۆی چاپ بکەم، جگە لەمەش بابەتی خۆماڵیش دەبێ پشتیوانی زۆری لێ بکرێت.

**ڕامان: ئا لەم بوارەدا بەرهەمی کوردیت بۆ زمانی عەرەبی یان فارسی وەرگێڕاوە؟**

**حەمە کەریم عارف:** یەک هەوڵی بچکۆلەم لەبواری فارسیدا هەیە ئەویش لەخۆمەوە دەستم پێ کـردووەو نەمـوێراوە لەخـەڵـکـیـیـەوە دەست پێبـکەم، بۆ نموونە «کـۆچی سوور» تاقە چیرۆکێکە لەگۆڤارێکی حیزبی دیموکراتی ئێران بڵاوبۆتەوە، هاتم خۆم کردە کێڵگەی ئەزموون و نەموێرا خەڵکانی تر بکەمە ئەو کێڵگەی ئەزموونە...!!

**رامان: پێت وا نییە کە سەندیکایەک هەبێ بۆ وەرگێڕەکان تا هەم مافیان بپارێزێ و هەم هەوڵ بدا بۆ چاپکردنی بەرهەمەکانیان؟**

**حەمە کەریم عارف:** شتێک نییە ئەمڕۆکە، دەبێ خەڵکانێک لەدەسەڵاتی رەسمیدا بتوانن ئەو شتە بکەن، حەق وایە وەزارەتی رۆشنبیریی بەڕیوەبەرایەتییەکی زۆر تۆکمەو چاکی هەبێ بەناوی وەرگێڕان، خۆشبەختانە هەرکەسێ بگری بە خوێنەوارو نەخوێندەوارەوە دوو زمان دەزانێ، هەموو کوردێکی عێراقی عەرەبی و کوردی دەزانێ لەتورکیا کوردەکان تورکی و کوردی دەزانن، لە ئێران فارسی و کوردی دەزانن، ئەمە بۆ کەم میللەت رێک دەکەوێ ئەگەر خۆمان تەمەڵ نەبین، بەتایبەت کەسانی خوێندەوارو ئەدەبدۆست و خاوەن قەڵەم، ئەوە دەبێ شارستانییەتی ئەوان بێنن وای لەگەڵ خۆماندا موتوربە بکەن، تورک و فارس و عەرەب بەغیلی بە ئێمە بەرن، چونکە هەرمیللەتێک کەوتە سەر راستەرێی بیرکردنەوە ئیتر رێی لێ ناگیرێ، کتێبێکی بچکۆلە، قەڵەم جافێکی دوو دیناری، تۆ شتێکی سادەی پێ بنووسیت گەلێ لە کلاشینکۆفێک چاکترە...!

**رامان: لە سالانی دوای راپەڕین دەستەیەک پێکهات بۆ وەرگێڕان، بەلام تەنیا یەک ژمارەیان بەچاپ گەیاندو بێ ئاکام دەرچوون، کەواتە دەبێ هەر ئەو دەزگایە بێت کە وەزارەتی رۆشنبیریی ئەرکەکەی بگرێتە ئەستۆ؟**

**حەمە کەریم عارف:** من پێم وایە کورد نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی ئەم و ئەو، ئەم ئەرک و بەرنامە جوانە راپەڕێنێ هەر دەبێ دەزگای رەسمی بێت، چونکە دەزگایەکی رەسمی بیکات میزاج رۆڵی خۆی تیا نابینێ، بەڵکو یاسا دەوری تیا دەبینێ، بەلام ئەگەر کۆبوونەوەیەکی میزاجی بێت ئەمڕۆ من و تۆ میزاجمان پێکەوە ناگونجێت، من هەوڵ دەدەم ویرانی بکەم، تۆش هەوڵ دەدەی ویرانی بکەیت، دەبێ بە راکێشانی پەت لە نێوان یەکتریدا، ئینجا ئەو ریخۆڵە بەکێشکردنە بۆ..؟

**رامان: ئەی پێت وا نییە تەرجەمە هەم هونەرەو هەم زانستیشە؟!**

**حەمە کەریم عارف:** وایەو دەبێ بەلای کەمیشەوە ئەمانەتێکی زانستی لەهەست و نەستی تۆدا هەبێت، من نایەم فروغی فروخزاد وەک ئافرەتێکی خاوەن دەنگی شیعری خۆی بە پەنگ بکەم، کە بە زۆر بەپەند کراوە، ئەو ئافرەتەش بێ بەختە، چونکە زمانەکەی لەدورەوە وا دەنوێنێ کەسادەو ساکارە، بۆیە خوێنەواری لای ئێمە هەر ئەلف و بێی فارسی زانی یەکسەر پەلاماری ئەوی داوە و بە پەندی کردووە!!

**رامان: تا ئێستە زیاتر ئەوەی تەرجومە کراوە شیعرو چیرۆکە، ئەی تەرجومە نەکردنی لێکۆڵینەوەی قووڵ؟**

**حەمە کەریم عارف:** ئەوە بۆ زمانی کوردی دەگەڕێتەوە، چونکە یەکێکە لەو زمانانەی بەداخەوە «خزمەتی» نەکراوە، زۆربەی زۆری ئەدیبەکانی کەلەو بوارەدا کاردەکەن یەک زاراوەی ناوخۆیی زمانەکە دەزانن ئەوە نەبێ هەموو زاراوەکان بزانن و هەموو ئەو جۆگەلانە بێنین و بتوانن رووبارێکی لێ دروست بکەین، جاری وایە ئەو شتەی بەزمانی ئینگلیزی نووسراوە شتێکی فەلسەفی و لێکۆڵینەوەی قورسە دەیهێنی بە زمانێکی زۆر بچووک باری دەکەیت، زمانەکەی پێوە دەتەپێ، لەبەر

حەمە کەریم عارف

ئەوە سەیر دەکەی ئەوانەی لەو مەیدانەدا کاردەکەن سەرقاڵ نین بەو جۆرە کارانەوە، ئەو کوردییەی ئەو برادەرە وەرگێڕە دەیزانێ بەرگە ناگرێ، بۆ نموونە: هەژاری موکریانی جۆرە تایبەتییەکی خۆی هەیە و توانیویەتی خۆی لەقەرەی هەندێ شت بدا ،وەک قورئان، ئەمەش هەژار نەبێ هیچ کوردێکی تر ناویرێ خۆی لەقەرەی بدا، هەر بۆیەش ئەو فەرهەنگە چرو پڕەی لای هەژارو، مەلا شوکرو، عەزیز گەردی، هەیە لای خەڵکانی تر نییە،زۆریشن ئەوانەی نایانەوێ خۆیان لەشتی قورس بدەن...!

**رامان: بەشێکی ئەوە ناگەڕێتەوە سەر ئەوەی لەهەموو بوارەکانی ئەدەب و هونەردا ئێمە هەر فەرهەنگێکی تێکراییمان نییە؟**

**حەمە کەریم عارف** : راستە بێگومان وایە، مامۆستا هەژار چونکە زمانزان و زمانناس بووە بیری لەوە کردۆتەوە و خۆی هەوڵی داوە فەرهەنگ بنووسێ، ئەمە یەکێکە لەو هۆکارانەی ئەو پیاوە لەزمانا زۆر دەوڵەمەند بووە... ئێستە کادرێکی کشتوکاڵی فەرهەنگێکی کشتوکاڵی لا نییە، هەروا کادری ئایینی و کادری ئەدەبی، شاعیرە، رۆشنبیری شیعری لە لا نییە، ئەمانە هەر هەموو لەلای کورد تەڵەزگەیان دروست کردووە.

**رامان: ئەوانەی لەتەرجومە ئیشیان کردووە، یان چەند هەوڵێکیان داوە جگە لەو ناوانەی کە دیارن لەزمانی کوردی زۆر قووڵ نەبوونەتەوە ئەگینا زمانی کوردی توانای هەیە تەرجومەی دەقە فەلسەفییەکانی پێ بکەی، بۆ نموونە کتێبی (زاراوە سازی پێوانەیی) یەکێکە لەو کتێبانەی کە سەلماندوویەتی زمانی کوردی زمانێکی بەتوانایە تا بکرێتە زمانی فەلسەفە، یان زانست و کێشەکانی سەردەمی پێ باس بکرێ بەڵام نووسەری کورد خەمی پەرەپێدانی زمانی زۆر کەمە، تۆ وەک وەرگێڕێک چ کێشەیەکی زاراوەت لەلادا هەیە؟**

**حەمە کەریم عارف:** من وەک وەرگێڕێک زیاتر چیرۆک و رۆمان و هەندێ لێکۆڵینەوەم هەیە شتی مێژوویی‌م هەیە بەڵام وانییە هەموو مەیدانە بەرفراوانەکەی تەرجەمەی گرتبێ، ئێستە بابەتێکی فیزیاوی بێنی بەهیچ جۆریک ناوێرم خۆم لەقەرەی بدەم، بەڵام ئێمە خۆمان تەمەڵین، هەر یەکێ لە ئێمە بەزەماڵە بنێرن بۆ فەرەنسا بە شەش مانگ زۆر ئاسایی فێری زمانەکەی دەبێ، چونکە زمانێکی جیهانییە...! مامۆستایەک دەتوانێ پشووی هاوین لەسلێمانییەوە بڕوا لە دهۆک

بژی، بەو سێ مانگە زۆر چاک زاراوەی بادینی فێر دەبێ کە بۆ کارەکەی خۆی قازانجێکی باشی لێوەردەگرێ، تۆ ئامادەیی ئەوەت هەیە فێری زمانە بێگانەکە بی، بەڵام ئامادە نیت بۆ قازانجی خۆت بچیتە ناو زاراوەکانی کوردییەوە، ئەمە یەکێکە لەکارەساتەکان، من ئێستە پێم شەرمە سلێمانییەک بە لەهجەیەک بنووسێت تۆ یەکسەر بڵێی ئەمە خەڵکی سلێمانییە، کەرکوکییەک بە ئسلووبێ بنووسێت و بڵێیت ئەم پیاوە خەڵکی کەرکووکە، هەورامییەک بڵێی ئەمە خەڵکی هەورامانە، تۆ ئێستە دەبێ ببی بەخاوەنی زمانێکی ستاندارت... ئەمە پێی دەڵێین زمانی کوردی، هەژاری موکریانی راستە هەوێنی نووسینەکانی لەهجەی موکریانە، بەڵام کوردییە، مەلا شوکر و گەردیش ئەمانە لە پێشڕەوانی دامەزراندنی زمانی ستاندارتی کوردین.

**رامان: بە (ناو) کامە چیرۆک و کامە رۆمان سەرنجی راکێشاویت، ئەوەی تەرجومەت کردبێت و نەتکردبێت، هۆی چییە و لەبەرچی..؟**

**حەمە کەریم عارف: (هاومالەکان)** رۆمانێکی **ئەحمەد مەحموودە**، کە خۆی کوردەو بە فارسی دەنووسێ و هاومالەکان یەکێکە لە رۆمانە هەرە گەورەکان، بەفارسی (٥٠٢)لاپەڕەیە، هەر لاپەڕەی (٣١) دێڕی تێدایە، من لە خۆشەویستی تەکنیکەکەی ئەو رۆمانەم تەرجومە کردووە، بەرگی یەکەمی (٢٠٠) لاپەڕەیە، ئەوەم بەهەزار شەڕەشەق لەچیا چاپکردووە بڵاوبۆوەو هەندێ دانەی تری لێ گەیشتۆتە دەست..

پێم وایە گەر **(حوسێن عارف)**ی خۆمان ئەوەی بخوێندایەتەوە هەرگیز شاری وابە پەند نەدەکرد!!! بەرگی دووەمیشی بەدەستنووسی لەلامەو دیسانەوە دەیلێمەوە کێ ئامادەیە چاپی بکات و ناوی منیشی لەسەر بسڕێتەوە ئامادەم بیدەمێ...

**رامان: جگە لەم ناوە کێی تر لە رۆژهەڵات سەرنجی راکێشاویت؟**

**حەمە کەریم عارف: «دوورە وڵات»** رۆمانی کابرایەکی ئازەربییە بەناوی **«قاسموف»** یەکێکە لەوانەی کە سەرنجی راکێشاوم، ئەو رۆمانە بەو زاراوە سیاسییە حیزبایەتییەی کە ئێمە خوومان پێوە گرتووە، **(بەرگری و مقاوەمەت)** هەمان ئەو بابەتەیە، بەڵام زۆر هونەرمەندانەیە و تا حەزیش بکەیت جوانە، من ئەو رۆمانەم تەرجومە کردووەو بریتییە لە(٣٨٠) لاپەڕەی خورشیدی و هەر لاپەڕەی (٣١-٣٢)دێڕە، کێ چاپی دەکات و بڵاوی دەکاتەوە بۆخۆی و باناوی منیشی لێ بسڕێتەوە دەیدەمێ..

**رامان: ئەی لەبواری جیهانیدا؟**

**حەمە کەریم عارف: بەلزاک لە «بابە کۆریۆ»، تۆلستۆی لە «جەنگ و ئاشتی» بەفارسی «جەنگ و صولح»**م خوێندۆتەوە، نەک بەعەرەبی کازمی ئەنساری کە خۆی ئەندازیارە، کەچی شاکارێکی ئەدەبی«١٨٠٠» لاپەڕەی تەرجومە کردووە، هەر لاپەڕەیەکی لە (٣٠) دێڕ کەمتر نییە و دوو بەرگە.

**رامان: ئەی لەگەڵ «الحرب والسلام» عەرەبییەکەی بەراوردت نەکردووە؟**

**حەمە کەریم عارف:** نەخێر، بەڵام زۆربای یۆنانی بەعەرەبی و فارسییەکەیم

خوێندۆتەوەو بەراوردم کردوون، عەرەبییەکەی ئەمانەتی تیا نییە، بەڵام فارسییەکە گەورەتریشە و زۆریش بە ئەمانەتەوە تەرجومە کراوە.

**مادەم تەنگژەمان هەیە دەبێ بیر لە شکاندنی بکەینەوە**

**رامان: ئەی کامە تەرجومە زۆری ماندوو کردوویت؟!**

**حەمە کەریم عارف: شکستی (ئەلکسەندەر فیدائیوف)** رۆمانێکە کە خۆی ئەندامی لیژنەی مەرکەزی حیزبی شیووعی سۆڤیەتی جاران بوو، ئەلکسەندەر لە ١٩٥٦ یان پێشترە خۆی کوشت، رستەکانی زۆر درێژن، لەوەوە هاتمە سەر ئەو قەناعەتە زمانی چیرۆک لای ئێمە ئاسان و سادەو ساکارە.

گەیشتمە ئەو قەناعەتەی زمانی چیرۆکی گەورە دەبێ رستەکانی درێژ بن، رستەی وایە (٨) دێڕە یەک فەرمانی تیایە، ئینجا وەرە دەرەقەتی بێی..؟ بەراستی ئەمەیان شەکەتی کردووم...!!

**رامان: وەرگێڕانی هونەرمەندانە تا ئێستە لەناو کورد کەم رێکەوتووە ببینی، وەک خێزانی (سامێ الدروبی) کە لە یاداشتەکانی خۆی باس دەکات و دەڵێ کە خەریکی تەرجەمەی دستۆیڤسکی بووە بەیانیان کە هەستاوە پێڵووی چاوانی خوێنی تێزاوە، یان یەکێک لەهۆیەکانی تووش بوونی بە نەخۆشی دڵ بوو و کوشتی، لەلای ئێمە زۆر تەرجومە وەک پێویستی دەستنیشان نەکراوە، واتە کورد پێویستی بەو بوارەیە تا زیاتر خەریکی بێ، هەوڵەکان تاکە کەسی بوون، وەرگێڕ لەپەنای خوێندنەوەی خۆی شتێکی دیوەو تەرجومەی کردووە، کورد بۆ ئەوەی خۆی لەو کەمبوونی وەرگێڕانەی شتێک بکات و لەداهاتووشدا کتێبخانەی خۆی پێ دەوڵەمەند بکات، دەبێ بە حوکمی زەروورەت کار بکات و بایەخ بەشتێ بدات کە نییەتی، بەڕای تۆ چی بکرێ تا لەم کاتەدا ئەوە بەدی بێ؟**

**حەمە کەریم عارف**: ئێمە نەک هەر لەوەرگێڕانا لەهەموو مەیدانەکانی ژیانیشدا بەعەشقەوە مومارەسەی ئەو مەیدانە ناکەین، ئەمە یەکێکە لە مەترسییەکان، من کە تەرجەمە دەکەم پێش هەموو شتێ دەبێ عاشق بم، خۆ ئەگەر هەر بێکاری بێ، ئەوە کارەکە نە رەسەن دەردەچێ، نە خزمەتیش دەکا، ئەوەی بەعەشقەوە و لەدڵەوە دەرنەچێ بەهەمان عەشقەوە ناچێتە دڵی بەرامبەرەکەی ئەمە جگە لەوەی هەرگیز لەگەڵ رێکخراوی ئەهلیدا نیم، مەبەستم رێکخراوی پیشەیی و نازانم چی وئەم جۆرە شتانەیە، چونکە هیچمان بۆ ناکەن، کورد فێری ئەوەیە خەڵکێک بیبا بەڕێوە، ناحەقیشی نییە هەزاران ساڵە خۆی خاوەنی خۆی نییە خەڵکانێک بردوویانە بەڕێوە، تۆ دەبێ دەزگایەکت هەبێ تا ئەو میللەتە تۆزێ روو لە شارستانی بکاو ئینجا دەزگای ئەهلی دروست دەبێ، بۆیە پێم وایە دەزگایەکی تایبەتی هەبێ باشترە، لەبەڕێوەبەرایەتییەکی گشتیدا خەڵکانی دڵسۆز هەبن

بەجیهانبینیەکی کوردانەی مرۆڤانەوە بڕواننە هەموو بوارەکانی ژیان و کتێب دەستنیشان بکەن، دەزگا رەسمییەکانی کورد دەبێ هەوڵی ئەوە بدەن ژیان بۆ وەرگێڕەکان دابین بکەن، باوەڕ بکەن بەدابین کردنی ژیانیان بەرنامە خۆی دروست دەبێ..!

**رامان: تۆ تەرجومەی کۆمەڵێ شاکاری جیهانی جوانت کردووەو خۆشت شت دەنووسی، ئایا لەناو ئەو هەموو شتە جوانانە زۆرجار تووشی دڵەڕاوکێ نابیت و هەست ناکەی لەرووی هونەرییەوە نەتتوانیوە شتێ بکەی لە ئاستی رۆمانی جیهانیدا بێت، یان ئەو شتانەی خۆت کارت تێدا کردوون؟**

**حەمە کەریم عارف:** ئەو هەستە لای من هەیە، ئەگەر بمزانیبا شتی لەوە باشتر دەنووسم، یان لەو ئاستەشدا دەنووسم هەرگیز نەدەچووم بەلای وەرگێڕاندا..

ئەوە یەکێکە لە هۆیەکانی دامرکانەوەی حەزەکانم، وەرگێڕان دامرکانەوەی حەزەکانە.. زۆرجار کە شاکارێک دەخوێنمەوە، تووشی نائومێدی دەبم و دەڵێم کورد هەر بەهرەی تێدا نییە، بۆ کورد دەگریم، بەپێخاوسی ملمان ناوە، لەم رۆژانەدا رۆمانێکی فارسیم بەدەستەوە بوو «سەمفۆنیای مردگان» هی کابرایەکە ناوی -عەباسی مەعروفیە- نەک هەر بەنیسبەت کوردەوە، رەنگە لەناو عەرەبیشدا شتی وا نەبێ، هەندێ جار کە ناوی جیهانی دەبینم سەراسیمە دەبم، بەڵام نابێ کورد بێ ئومێد بێ و دیارە عەشقەکەش زۆر پێویستە، عاشق نەبی نەچیرۆکنووس دەبی نە شاعیر...

**رامان: ئەگەر بەو مەسئولییەتە گەورەیە سەیری ئەدەب و تەرجومە و فیکرو جوانی دەکەی، خۆت لەناو ئەو هەموو چیرۆکنووسە کوردانە، لەماوەی ئەم پەنجا ساڵەدا هیچ چیرۆکنووسێک هەبووە بتوانێ دووبارە و سێ بارە بیانخوێنیتەوە.. ؟ وەک دیارە جۆرە نائومێدییەکت لەلادا هەیە؟**

**حەمە کەریم عارف:** تاقە چیرۆکێک کە زۆر دووبارەو سێ بارە خوێندبێتمەوە **-حەسەنی قزڵجییە-** تەنیا تاقە چیرۆکێکە کە دوو لاپەڕەیەو مێژوویەکی ویژدانی قۆناغێکی نیشتمانی گەورەیە، هی تر هەبوون سەرنجیان راکێشاوم، بەڵام دووبارەو سێ بارە بیخوێنمەوە ئەوە نەء، بۆ نموونە: پەنجا فلسەکەی **- محەمەد مەولود - مەم - سەرنجی راکێشاوم - شەفەقەکەی حوسێن عارف- هەروا، هەتکی رۆحەکەی جەبار جەمال غەریب** یەکێکە لەو چیرۆکانەی خۆشم ویستووە، بەشێوەیەکی گشتی هەست دەکەم چیرۆکێکی کوردی لەناو بزووتنەوەی ئەدەبی کوردیدا هەڵدەکشێ بۆ ئەو ئاستەی کەوا لە خوێنەر بکا بیخوێنێتەوە

**رامان: ئەی لەبواری رۆماندا؟**

**حەمە کەریم عارف:** ئەوانەی بەردەستم کەوتبێ خوێندوومەتەوە، بەڵام پێم وایە بەمانا بەرفراوانەکەی - **رۆمان** - لای کورد نییە، **قەڵای دم دم** - ەکەی عەرەبی شەمۆ رەنگە لەسەردەمێکدا خوێندبێتمەوە چێژم لێ وەرگرتبێ، بەڵام ئەمە پاکانەی ئەوە نییە بڵێم لە ئاستی رۆمانەکانی دنیایە، لەچاو ئەوانەی دنیادا ئەمانەی لای خۆمان سووکە هەوڵن و بەس، هەر لە (**عەزیزی مەلاڕەش**)و (**عەبدوڵڵا سەراج**)

و( **حوسێن عارف**) و (**موکری**) و (**خەسرەو جاف**)ەوە بیگرە، ئەمانە کۆمەڵێ هەوڵن و ڕێگە لەهەوڵیش ناگیرێ، بەڵام بەدڵنیاییەوە دەیڵێم : بەمانا بەرفراوانەکەی ئێمە (ڕۆمان)مان نییە؟!

**ڕامان: ئەی لە لاوەکان وەک چیرۆکنووس، کامیان سەرنجیان ڕاکێشاویت؟**

**حەمە کەریم عارف: جەبار جەمال غەریب**، نەمدیوەو ناشی ناسم، بەڵام لەکاروانی کۆنیش چیرۆکێکم بینیوە - هەتکی ڕۆحەکەشی - نایابە..!

**ڕامان: ئەی یەکەم کۆمەڵە چیرۆکت تا چەند حەزو ئارەزووە هونەرییەکانی تۆی بەدی هێنا؟!**

**حەمە کەریم عارف** : یەکەم کۆمەڵە چیرۆکم هەوڵێک بوو خۆ ئەگەر لەو سەردەمەدا هەندێ وەهمی گەنجانەم لەلای خۆم دروست نەکردایە ڕەنگە هەر چاپم نەکردایە، ئەگەر حاشا کردن جائیز بێت ئێستە حاشا لەو کۆمەڵە چیرۆکە دەکەم، بەڵام ئەگەر لەدادگەش حاشای لێبکەم خەڵک هەر بە هینی منی دەزانن...

**ڕامان: لەمساڵانەی دواییدا خۆت لەقەرەی هونەرێکی گەورە داوە، ئەویش (گۆشە نووسین)ی ناو ڕۆژنامەیە، ئەمەیان چۆن بوو؟**

**حەمە کەریم عارف:** پێم وایە گۆشە نووسینەوە هونەرێکی گەورەیە، بەڵام من لە گۆشەکان لایەنە ئەدەبییەکانم گرتووە، جاری وا هەیە ئەو گۆشەیە لەبەر تەمەڵی بێ، یان من خۆم لەقەرەی لێکۆڵینەوەیەکی قورس نەدابێت و دەرفەتم نەبووبێ بەدوای سەرچاوەدا بگەڕێم، ڕەنگە گۆشەیەکی من بۆ خۆی لێکۆڵینەوەیەکی باش بێ، بەڵام منی تەمەڵ قەناعەتم بە گۆشە کردووەو.. تاسەم شکاوە، بەڵێ: تاسە شکاندنەو بەس..!!

**ڕامان: ئەی چ هەوڵێکت لەبواری ڕۆمان نووسیندا هەیە؟ ڕات لەم بوارەدا؟**

**حەمە کەریم عارف:** چیرۆکێکی درێژم هەیە بەناوی **(کۆچی سوور)** بەچاپکراوی کاتی خۆی چەند دانەیەکی زۆر کەمی لێ چاپکراوە «١٠٤» لاپەڕەیە، ئەوە ڕەنگە بچێتە خانەی هەوڵێکی زۆر بچووکەوە..

جاری وایش هەیە دێمە سەر ئەو قەناعەتەی کە ڕۆمانی قەبارە گەورە لە دنیاشدا بەرەو ئاوابوون دەچێ، سەیر دەکەی لەجیهاندا ڕۆمان بەرەو بچکۆلەیی دەڕوا، هاتۆتە سەر (٥٠-٦٠) لاپەڕەیی و ئەمانەو خەڵک لەوێ وازیان لێ هێناوە، شتێک کە خەڵک وازی لێبێنێ ئێمەی کورد هەر لە ئێستەوە با وازی لێبێنین، بۆچی قۆناغێکی زۆری ڕۆشنبیریمان بەو شتانەوە بکوژین، پێم وایە گەلێک لەو برادەرانەمان کە ناوم هێنان چەند سووکە هەوڵێکیان داوەو هیچ هاندەری ڕۆحی لەپشت نووسینەکانەوە نییە تەنیا مەسەلەی خەیاڵی دەست پێشکەری نەبێ کە خۆی هەر کەسێ لە بواری ئەدەبی و ڕۆشنبیریدا کاریکا دەسپێشکەری بەلاوە گرنگە، کاریگەری ڕۆشنبیری، یان ئەدەبی و هونەریی بەلاوە گرنگ نییە، ڕەنگە من (٥٠)ساڵ لەمەو پێش ڕۆمانێکی بە قەوارە گەورەم نووسیبێ، بەڵام ئەمڕۆ گەنجێک دێت شتێک دەنووسێت و(٥٠) لاپەڕەیە کاریگەریەکەی چ ئەدەبی و هونەری و ڕۆشنبیری زۆر لەوەی من زیاترە، ئینجا با بەو دەستپێشکەرییە

هەڵنەخەڵەتێین و هاندەری ڕۆحی لەپێش هەوڵەکانمانەوە بێت، ڕۆمانیکی کورتی(٦٠-٧٠) لاپەڕەیی بابەتێکی ڕۆمانت ئامادەکردووە، مانای وایە بووی بەخاوەنی زمان، مانای ئەوەیە زمانێکی چڕوپڕت بەکارهێناوە، حەز دەکەم کەمێ **باسی مامۆستا عەبدوڵلا سەڕاج بکەم لە(هەڵکشان بەرەو لووتکە)کەیدا،** خوا شاهیدە من بۆ کەمکردنەوەی پایەی ئەدەبییەکەی ئەو برادەرە ئەم قسەیە ناکەم و وەک نموونەیەک: هات بەخەیاڵما، دەتوانم بڵێم (هەڵکشان بەرەو لووتکە) قووتوی عەتارە زۆر شتی تیا دەبینیتەوە.. ڕۆمانی زۆر کەم تیا دەبینی!!! ..

**ڕامان: کەواتە ئێمە هیچ پرۆسەیەکمان نییە، نە لەبواری ڕۆمان، نە لەبواری چیرۆکی کوردی، وەک پرۆژەیەک تەرجەمەی سەرزمانێکی جیهانی بکەین، ئەی تۆ نائومێد نیت لەمە؟**

**حەمە کەریم عارف:** فەرموو ئێوە خەڵکێکی شارەزاو ڕەخنەگرو ئەدیبن و لەڕۆژنامەدا کارتان کردووەو ڕەنگە ئەوانەی ئێوە دەیزانن خەڵکێکی خوێندەواری باشیش ئاگای لێ نەبێ، فەرموو کام نووسەری کورد یا شاعیر و چیرۆکنووسی کورد بەدەقێک سەرنجی ڕەخنەگرێکی کارامەی عەرەبی ڕاکێشابێ؟ پێم وایە ڕەخنەگری چاک خۆی عاشقێنی لەگەڵ دەقدا دەکا، ڕەخنەگر کە دەقێکی چاکی بینی وەک ئەسپێک کە سوار دەبینێ ئیتر سمکۆڵانی بۆ دەکا، ڕەخنەگریش ئاوا بۆ دەقی چاک سمکۆڵان دەکا، بەڵام چی دەکەی کە دەقی وات لەهەردوو بواری چیرۆک و ڕۆماندا نییە...!

**ڕامان: ئەو ڕایەی کەتۆ وەک چیرۆکنووسێک لەسەر نەبوونی ئەفراندنی چاک لە ناو چیرۆکنووساندا دەیدەیت ئەگەر ڕەخنەگرێک ئەو ڕایە بدا ڕەنگە بەتوندرەوو بێ ئینساف لەقەڵەم بدرێ..**

**حەمە کەریم عارف:** من یەک گلەییم لە ڕەخنەگرەکان هەیە، یەکێک لە خەوشە گەورەکانیان ئەوەیە کەمتر گیانی ڕووبەڕوو بوونەوەیان هەیە، تۆ کە لەسەر دەقێکت نووسی واتە: دەق لەمن جیابووەتەوە، مانای وا نییە هەجووی منت کردووە، پێوەندی لە نێوان من و دەقدا دەسڕێتەوەو دەبێتە پێوەندی لەنێوان ڕەخنەگرو دەق بۆیە دەبێ ئێمە ئەم ڕاستییە پەسند بکەین، ڕەخنە لەسەر حیسابی مەرگی دانەر لەدایک دەبێ، ئەو کاتە پێوەندییەکە لە نێوان دەق و ڕەخنەگرە.. تۆ تاوانت چییە چیرۆکەکەم لەهەموو پێوانەیەکی ڕەخنەگرانەی تۆ دەرناچێت، تۆ هیچ گوناحێکت نییە من بێم لێت زیز بم، یا ئەمە ڕاکێشمە سەر پێوەندی کۆمەڵایەتییەوە، بەپێچەوانەوە تا ئێمە باوەڕ بە بنەماکانی دیالۆگ نەهێنین هیچ بە هیچ ناکەین، چونکە ئەدەب خۆی دیالۆگە..!

**ڕامان: ئەی چۆن دەڕوانیتە ئەو تەنگژە ئیبداعییەی لەهەموو بوارەکاندا هەیە،لەهەردوو وەرزەکەدا واتە: پێش ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕینیش؟**

**حەمە کەریم عارف:** حاڵەتێکی زۆر دروستە، ئێمە مادەم تەنگژەمان هەیە، دەبێ بیر لە شکاندنی بکەینەوە، من ئەم تەنگژەیە بەژانی لەدایکبوونەوەی دەزانم، نائومێدیش نیم...!

**رامان: کۆمەڵەی یەکەمت کە (تیرێژ) بوو زۆر کەس نەهاتن بەلایدا لەبەر ئەوەبوو کە نەیانویستووە تووشی بەرەنگارییەک بن کە لەوانەیە تۆ پێی سەغڵەت بیت، یان خەڵکێک بەغەدر لێکردن ناوی ببەن، بەڵام هەن هەر لەو ئاستەدا شتیان نووسیوە ئێستەش واجاڕ دەدەن کە گوایە غەدریان لێکراوە، تۆ لەرووی رەخنەو بەسەرکردنەوەی رەخنەدا ئەوتێگەیشتنە چۆن لێک دەدەیتەوە..؟**

**حەمە کەریم عارف:** من لێرەوە جارێ ئەوە دەدەم بەهەموو رەخنەگرەکان دەڵێم گەردنتان ئازاد بێ و بەئارەزووی خۆتان ئەو دەقانە **(ئەگەر بوێرم بڵێم ئەو چیرۆکانەی من بوون بەدەق)**، فەرموون بۆ خۆتان دەقی لەسەر بینا بکەن. ئەی رەخنە چییە، گەر بریتی نەبێ لە موناقەشەیەکی جیدی ئەو دەقە بەمەبەستی بینا کردنەوەی دەقێکی تر، تۆ خزمەتی من وەک حەمە کەریم عارف ناکەی لەمەیدانێکا پێی دەوترێ چالاکی رۆشنبیری و ئەدەبی لەوێدا ئیسپاتی بوونی خۆت دەکەی، رەخنەگر پێویستی بەدەقە و رەخنەگریش بەبێ دەق بوونی نییە، رەخنەگری چاکیش ئەوەیە دەقێک هاوشانی ئەو دەقە دروست بکات، من جاری وابووە بۆ هاندان بە عەبدوڵڵا تایەر بەرزنجیم وتووە: بۆ ئەوەی ترست بشکێنم وەرە لەسەر من بنووسەو بەڵێنیش بێ هەرچی خراپە بینووسە وەڵامیشت نادەمەوە..!!!

**رامان: تەنگژەی رەخنە لەبواری چیرۆک و رۆماندا زیاتر تیۆرییە، پێت وایە کەرەخنەی پراکتیکمان نییە، یا رەخنەیەکیشمان نییە تیۆری و پراکتیکی بێت، زیاتر کێشەکە لێرەوە دروست دەبێ..؟**

**حەمە کەریم عارف:** ئێمە شتی پراکتیکیمان نییە، دەق مانای مێژووی تایبەت دەگەیەنێ نەک مێژووی گشتی، من وەک کوردێک ئەگەر بوێرم بڵێم: بووم بەخاوەنی دەق کە ئەو دەقەم هەیە، تایبەتمەندی کوردەواری وەردەگرێ، ئێ تۆ ئایدۆلۆژیایەکت هەیە کلیلی سیحرییەو هەموو قفڵێکی پێ دەکەیتەوە، دەق قفڵە ، هەموو قفڵێک کلیلی تایبەتی خۆی هەیە، یەکێ لەکێشە گەورەکان ئەوەیە رەخنە گرەکانی ئێمە هاتوون کلیلی سیحرییان گرتۆتە دەست، ئەوە لە گیرفانیانەو خواخوایانە لێرەولەوێ دەقێکی ئیفلیجی بەستەزمانی داماو، یا قفڵێکی ئا لەو جۆرە ئاوا بەئاسانی بکرێتەوە یەکسەر دێن پێی دەکەنەوە، ئەوەش لێکۆڵینەوەی دەقەکە نییە، رەخنەش تەفسیر نییە، بەڵکو شیکردنەوەو ئاوێتەکردنە ..

**رامان: کێشەی مرۆڤی کورد لەناو کورتە چیرۆک و رۆماندا چارەسەر کراوە یانا؟ خۆت توانیوتە چارەسەری بکەیت..؟!**

**حەمە کەریم عارف:** ئەوە یەکێکە لە تەنگژەکانی دنیای چیرۆکی کوردی، سەیر دەکەی چیرۆکەکە لەرووی تەکنیکییەوە جوانە، بەڵام لە مۆڵەق وەستاوە، لەدەرگای ئەدەبی ئەوروپی و جیهانی دەدات و لێی ناکەنەوە، چونکە ئەمە شمەکی خۆیانەو بۆیان دەنێرنەوە، لای ئەوان دەمێکە سواوەو کۆن بووەو یان دەیەوێ خۆی بکا بە باوەشی کێشەی مرۆڤی کوردو سەیر دەکەی هیچ پێناسەیەکی نییە، ئەمە یەکێکە لەخەوشە گەورەکانی چیرۆکی کوردی..!

**رامان: خۆتیش هەر هیچت پێ نەکراوە؟**

**حەمە کەریم عارف:** یەک دوو چیرۆکم هەیە رەنگە تەنگژەی مرۆڤی کوردی تیابێ ..لەوانە چیرۆکی -ناوک- کۆچی سوور- بەیداغ- کەم و زۆر لەوێدا هەندێ هەولّم هەیەو هەڵسەنگاندنی کۆتاییش هەر بۆ خوێنەر دەبێ...!

**رامان: ئەی هاوکێشەی قورسی رەسەنایەتی و هاوچەرخایەتی لەبواری ئەفراندندا؟**

**حەمە کەریم عارف:** ئەو هاوکێشەیەی رەسەنایەتی و هاوچەرخایەتییە بەندە بەجیهانبینییەوە نوێخوازی لای من ئەگەر بوێرم پێناسەیەکی بچکۆلەی وەک خۆی بکەم: مانای سەرتاپا دەگەیەنێ، زۆربەی چیرۆکنووسەکانمان جیهانبینییان نییە، کە تۆ ئەو جیهانبینییەت نەبێ هیچت پێ ناکرێ، چونکە ئەوە با بلّێین چرایەکە یان کامێرایەکی شاراوەیە بەدەستی تۆوە، ناخی خەڵکەکان دەخوێنیتەوە، وای لێ دەکەیت چۆن ئێستە -لەم دانیشتنە- دەتانەوێ بمخەنە کەمینەوە، ئەو نووسەرەش ئەو کۆمەڵەی کە تیایدا دەژی وای لێدەکا بەئارەزووی خۆی دڵی بکاتەوە، ئەم پرۆسەیە زۆر قورسەو پڕ لەداهێنانەو تەنیا بەزەبری جیهانبینی دەکرێت ..!!

رامان: کەواتە تۆ (داهێنەری کورد) بەناڕۆشنبیر دادەنێی؟ حەمە کەریم عارف: راستە، سەیر دەکەیت چیرۆکنووسە بەرێکەوت چیرۆکێ دادەنێ هونەری جوانی تێدایە، بەڵام وەرە بیدوێنە وەک فیکرو جیهانبینی، ئەوە هیچی پێ نییە، ئێستە سەیر دەکەی -جەبرا ئیبراهیم جەبرا- کابرایەکە لە رووی رۆشنبیرییەوە زل و زەبەلاحە، ئەمجا زۆر جار ئەو رۆشنبیرییەی جەبرا هەیەتی خۆی داوە بەسەر قارەمانەکانی چیرۆکەکانیا، سەیردەکەی چیرۆکەکانی وەک مامۆستایەک لە زانکۆدا بلّێتەوە وایە، پێم وایە جەبرا چونکە زۆر بایەخی بە تەرجەمە داوە، ئەمەیش بووە بە یەکێک لەهۆکارەکانی...!!

**رامان: بەس ئەو رۆشنبیرییە زیاتر لە رۆمان - دا دەتوانێ فریای مرۆڤی داهێنەر بکەوێ، لە -البحث عن ولید مسعود- و -غرف اخری- توانیویەتی سوود لەو رۆشنبیرییە گەورەیە وەرگرێ، بەڵام لەهەوڵەکانی تریدا نووچی خواردووە؟ لێرەدا ئەم پرسیارە تەقلیدییە دەڵێینەوە، خۆزگە رای هەموو ئەدیبانی کورد وەربگیرێ، تا گەلالە بکرایە، ئەی دوای راپەڕین بۆ ئەم تەنگژە گەورەیەی نێو بواری داهێنان چی دەڵێی؟**

**حەمە کەریم عارف:** کە راپەڕین بوو بەرنامەی دیاریکراو نەبوو. بەقەناعەتی من ئایدۆلۆژیەتێکی دیاریکراو چ نەتەوەیی، یان ئایدۆلۆژی رابەرایەتی نەکرد، جۆرە ئانارشیزمێک دروست بوو، هەموو ئانارشیزمێک یا گۆڕانێک یان هەموو چوونە قۆناغێکی نوێ جۆرە هەراو ئاشوبێکی خۆی هەیە، ئەم جۆرە ئاژاوەو ئاشووبە گەر ئاگات لێ نەبێ و میللەتێک نەبی خاوەن بەرنامە بێت، و گەر نەیبڕی، دەتبڕێ. ئێمە کێشەکەمان ئەوەیە ئەمڕۆ لایەنە سیاسی و حیزبییەکەو رۆشنبیری و ئەدەبی و هونەرییەکە هەمووی لەو حاڵەتە بەدەر نییە ، ئێستەش دوای راپەڕین هەر لە ئەناریشیزمەداین، جلەومان پێ نەگرت و، ئەسپێکی چەتوونە هیچ سوارێکیشی قبوڵ نەکردو تیاشماندا سوارێ هەڵنەکەوت تا رامی بکات و بیخاتە سەر رەوتی

ئەسپ، ئێستە چەپۆکانێکی بەهەراو ئاشووبەو رەوتێکی خۆشبەزی ئەسپانە نییە..!!
**رامان: فەللاح مەزنە!! بەڵام وادیارە عەقڵییەتی فەللاحیش بەسەر هەمووماندا زاڵە، ئەمەش بەشێکە لەدەردەکە..؟**
**حەمە کەریم عارف:** رۆشنبیری کورد زۆرجار لەوانەیە نەزانێ ئەرکی نووسەر چییەو تووشی فەوزا بووە، کەئەمەش یەکێکە لەبەڵاکان، نووسەر مانای پەیڤداری ئیعتراف پێنەکراو یان - **ناطقی غیر رەسمی**- زۆربەی خەڵکەکە بێ دەنگە، ئەوەندە بێدەنگبە تا خوا حەز بکات، ئەو بێدەنگییە ئیشت پێنەکا، ئینجا کە بێدەنگ بووی ئەفراندنی چی؟ هونەر روو لەکەسێ دەکا کە ئەهلی هونەر بێ، تۆ کە ئەهلی هونەر نەبی.. بۆ نموونە: ئەسپێکی رەسەن بدەرە دەست کابرایەک کەسواری نەزانێ چییە بەسێ مانگ بۆتی دەکا بە بارگیر، بارگیریش بدەرە دەست سوارێکی رەسەن بەسێ مانگ بۆت دەکات بە ئەسپێکی رەسەن...!!
**رامان: ئەی لەبواری شانۆیدا چۆن چۆنی..؟**
**حەمە کەریم عارف:** بەڵێ بەرهەمم لەو بوارەدا زۆر وەرگێڕاوە -دادپەروەرانی- ئەلبێرکامی - **بەدحاڵیبوون-ی ئەلبێرکامی- چشم گەر برادری چشم** - هی گەوهەر مورادە کەناوی ئەدەبی غولام حوسێنی ساعیدی بووە لەبەر سانسۆر ئەو ناوەی لەخۆی ناوە، هەروا (**بەدوعا شاعیران -هی جەلیل قەیسی و .. -جوولەکەکەی ماڵتا- یا -ریتشاردی سێیەمی شەکسپیر** - گەلێکی تریش هەر ون بوون، یا (**گەمەی پاشاو وەزیری)عەبدوڵلا بوسەیری..!**
**رامان: لەو شتانە جگە لە جوولەکەکەی ماڵتا - هیچی تری لێ نمایش کراوە؟!**
**حەمە کەریم عارف:** نایەتە خەیاڵم، مەگەر نموونەی بچووک بچووک ئەویش لەپەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی کەمن لەشاخ بۆم بیستوومە کراوە..!!
**رامان: بۆ حەمە کەریم خۆی لەناو چیرۆک دۆزییەوە و بۆچی لەبوارێکی تری ئەدەبیدا لەخودی خۆی نەدوا..؟**
**حەمە کەریم عارف:** جاری وا هەیە مرۆڤ لەنەستیا هەندێ شتی کۆن دەمێنێتەوە و لەقۆناغێکی تەمەندا لەوانەیە ببێ بەمایەی ئەوەی هانت بدا بڕیارێک بدەی، جاری وایە کاری داهێنان بەرنامەی تایبەتی بۆ دانانرێ و بە بڕیاریش ناچێتە ئەو مەیدانەوە و کتوپڕ یەخەت دەگرێ و ئەوەندە دەزانی دەستت داوەتە قەڵەم و چیرۆکێکت نووسیوە، هەستت کردووە سووکە بەهرەیەکت هەیە ئیتر تەماع گرتوویت و رۆیشتووی بەدوایدا، باپیرم -یەکێک بوو لەو پیاوانەی کە خۆشی دەویستم و لەناو کوڕەزاو کچەزاکانیا بایەخی پێدەدام، زۆرجار بەمنداڵیش حەکایەتی بۆ دەگێڕامەوە، ئەو حەکایەتانەش سەرنجی راکێشاوم زۆریش بەلەزەت بوون.. رەنگە ئەوانە لەنەستمدا کەڵەکە بووبێ و لەقۆناغێکدا هاتبێتە دەرەوەو یەخەی پێ گرتبم بێ ئەوەی بەخۆم بزانم لەبنەڕەتەوە شتەکە ئەمەیە، ئیتر کاری (داهێنان) ئەگەر بوێرین ئێمە بەخۆمان بڵێین (داهێنەر) بەرنامەی نییە و کتوپڕە..!!

**رامان: موتڵەقی ئیستاتیکا لای تۆ بەو جیهانە فراوانەی خۆی بەچی دەزانی؟**
**حەمە کەریم عارف:** تەنیا لەمرۆڤ پەروەریدا ئەو جوانییە دەبینم ئەم گەردوونە هەر هەمووی وەرگرە مرۆڤی لێدەربێنە بایەخی نامێنێ!!
**رامان: ئەی گوێ بۆ چ سیمفۆنیایەک، کۆنشرتۆیەک، گۆرانییەک-و ئاوازێک دەگری..؟!**
**حەمە کەریم عارف:** لەگۆرانی کوردیدا -محەمەد عارفی جزیری- کەزۆر چێژی لێوەردەگرم و یەک وشەشی لێ تێناگەم، بەڵام رۆحم بە ئاوازەکانی تازە دەبێتەوە، لەگۆرانی جیهانیشدا کەسی وا بەخەیاڵما نایەت..؟!
**رامان: چیرۆکنووس و رۆماننوسی گەورە هەبوون لەجیهاندا مۆسیقا کاریگەر بووە لەسەریان، لەوانە هیرمان هیسە کە زۆربەی هەرە زۆری نووسینەکانی لەژێر کاریگەری مۆسیقادا بووە، ئەی تۆ تا چەند سوودتان لەمۆسیقا وەرگرتووە، یان کاریگەری چی بووە لەسەرتان..؟**
**حەمە کەریم عارف:** ئێمە رۆشنبیری مۆسیقای ئەوتۆمان نییە، ئێستە سیمفۆنیایەکی جیهانی ئینکار ناکرێت بەمن وتۆ ناسرێتەوە، بەڵام رەنگە من لەزەت لەشمشاڵ زیاتر وەربگرم، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ کەلەبەری رۆشنبیری مۆسیقیمان.
**رامان: دیسان چیرۆکنووسی کورد، هەندێ شت لەناو میللەتدا خۆی نەیویستووە بەدوایدا بروات بۆ نموونە لەناو کەلتووری -ئێزدیدا- هەر هەموویان لەگەورەو بچووک گۆرانی دەڵێن و تەمبوورە دەژەنن و هەموو سرووتی ژیانیشیان تەنانەت مردن و ژیانیان- خەتەنە کردنیان چوونە سەر قەبرانیان، هەر هەمووی ئاوازی خۆی هەیە، ئەمە بەشێکە لەکەلەپووری ئێمە، بەڵام نووسەری کورد نەیتوانیوە سوود لەو کەلەپوورەی خۆیشی ببینێ، لەکاتێکدا ئەدەبیاتی جیهانی کەلەپوورێکی بۆ نموونە: لەچیرۆکی - ئوستریاس و مارکیزەوە بگرە تا ئۆکازاو ئەوانە سوودیان لەئەفسانەو کەلەپووری خۆیان وەرگرتووە و بینای رۆمانیان لەسەر کردووە و هەر ئەوەیشە ئەمرۆکە سەرنجی دنیای راکێشاوە و خەڵاتی گەورەیان بەدەست هێناوە..؟**
**حەمە کەریم عارف:** ئەوە دەگەرێتەوە بۆ خۆمان.. خۆمان خەڵکێکی تەمەڵین و بەعەشقەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو حاڵەتەدا ناکەین، ئێمە کەوتووینەتە سەردەمێکەوە لە رووی بوونی سیاسی و کۆمەڵایەتی سەربەخۆییمان نییە، کەسێتی کورد شێوێنراوە، جۆرە ترسێک لای مرۆڤی کورد پەیدا بووە، ئەوەی ئێوە دەیڵێن لەهیچ چیرۆکێکی کوردیدا ئەو بزاڤە نییە، یەکێک لە کێشەکانی چیرۆکی کوردی ئەوەیە سستە -خاوە- بزاڤی تیا نییە، قارەمانێکی پڕ لەکێشە و پرژەنگ لەچیرۆکێکی کوردیدا نییە، رەنگە ناوی دیستۆیڤسکی لەبیر بچێتەوە بەڵام ناوی راسکۆلینیکۆف- قەت لەبیر ناچێتەوە- ، دەبێنە ناوی قارەمانێکی وا لە سەرتاسەری چیرۆکی کوردیدا بدۆزەرەوە کە نییە.. بۆ؟ تۆ مێژووت هەیە مێژووەکەت پەرش و بڵاوە، عەقڵیەتی ئەوەشت نییە جارێکی تر گرێی دەیتەوە و بڵێی ئەوە درێژکراوەکەیەتی، کە دەست پێ دەکەیت لەسفرەوە دەست پێ دەکەیت،

ئێمە هەموو لەشاردایین و بەجادەو بەکارەباو بە بیناکان نیمچە ژیانێکمان هەیە، بەڵام بە عەقڵ دواکەوتەو خێڵەکین، چاکەت و پانتۆڵمان لەبەردایە، بەڵام بەعەقڵ فەللاحین..!! وەرە یەک قارەمانم بدەرێ لەڕۆمان و چیرۆکی کوردیدا کەپڕ بێ لە جووڵە و قارەمانێکی مەزن بێ..!؟

**رامان: فۆکنەر چی دەگەیەنێ لای تۆ، هیچ قارەمانێکی فۆکنەرت لەبەرچاوە؟**

**حەمە کەریم عارف:** فۆکنەر ئەوپەڕی مەنگیی ئەدەبە بەرادەی ئەوەی خەڵک ناوێرێ خۆی لەقەرەی بدا..!

**رامان: مارکیز؟**

**حەمە کەریم عارف:** مارکیز فەنتازیای ئەفسانەیە..!

**رامان: نەجیب مەحفووز؟**

**حەمە کەریم عارف:** چیرۆکنووسێکی گەورەی «عەرەبە»..

**رامان: شێرزاد حەسەن؟**

**حەمە کەریم عارف:** هەوڵێکی چیرۆکنووسینی ناو هەوڵەکانی تری چیرۆکستانی کوردییە و بەس..!

**رامان: کانتزاکی؟!**

**حەمە کەریم عارف:** پێم وایە پێغەمبەرێکی سووتاوی نێو دنیای ئەدەبە..!

**رامان: یەشار کەمال؟**

**حەمە کەریم عارف:** ئەوەندەی من ئاگەدار بم دیوێکی تری ستاندالە..

**رامان: موکری؟**

**حەمە کەریم عارف:** هەوڵێکی تری چیرۆکستانی کوردییە و بەس..!

**رامان: عەزیز نەسین؟**

**حەمە کەریم عارف:** گریانێکە بە پێکەنین دەریدەبڕێ!

**رامان: لەو ناوانەی ئێستە تۆ باست کردن کەسایەتی زیندوو لەناو چیرۆکی کوردیدا نین، رۆمان و رۆماننووسی وا گەورە هەیە وەک ئالان رۆب گرێ- فرجینیا ولف ، فۆکنەر بەڵام بەبێ ئەوەی قارەمانەکانیان لەمێشکتا بمێنێننەوەو ناشتوانی بڵێی رۆمان نییە بۆ ئەمە تەفسیرت چییە؟!**

**حەمە کەریم عارف:** پێم وایە ئەوە تەیارێکی نوێیە، گەر پێمان بکرایە بەو تەیارە بێینە پێشەوە قەدبڕمان دەکرد، حەقی خۆمانە ئەو مەودایانە قەدبڕ بکەین و چڕتری بکەینەوە، ناڵێم ئەوانە رۆمان نین، مەرج نییە قارەمانەکەت مرۆڤ بێ جاری وایە سروشتە- بایە، درەختە، کانییە.. ئەمانە قارەمانن.. سادق هیدایەتیش لە **(سەگی وێڵ)**دا قەت لەبیر ناچێ، **-جەنگیز ئیماتوف-** رۆمانێکی هەیە بە فارسییەو ناوی **« رۆیەهای مادەگرگ»** مانای **«خەونەکانی دێڵە گورگ»** گورگێکی تیایە هەرکەسێ بیخوێنێتەوە دەبێ بە هاوسۆزێکی گیانی بەگیانی ئەو گورگە، دەجولێ.. دێ، پەلامار دەدا.. بێچوو بەخێو دەکا.. بێچوو دەشارێتەوە.. بەگژ دار و بەردوچیا دەچێ، چیرۆکی لای ئێمە حەکایەتێکی بێ گیانە.. (ئەدگار ئالان پۆو کافکاو جۆیس و چیخۆف)یش ئەمانە چیرۆکنووسن، ئەمانە لەپێشەنگ و

دامەزرێنەرانن..

**رامان: مەسەلەی حیکایەتیش ئێستە لای بۆرخیس و محەمەد خزەیر چەمک و مەدلوولی نوێی وەرگرتووە، زۆریش بایەخی پێدەدرێ و بە روانینێکی هاوچەرخانە مامەڵەتی لەگەڵدا دەکرێ، نەک بەچەمکی گوێی ئاگردان و حەقایەت گێڕانەوەی کوردەواری، باشە ئەمەیان وا، ئەی رۆڵی تەکنەلۆژیا و کاریگەری لەسەر ئەدەب و داهێنان؟**

**حەمە کەریم عارف:** باوەڕ ناکەم ئیلغای ئەدەب و داهێنان بکاتەوە، بەڵام رەنگە کەمیان بکاتەوە، هیچ شتێک بەقەد وشە ناتوانێ خەون و ترس و ئازارە مرۆییەکان، یان نیگەرانی و نامۆیی ناخی ئینسان ئاوەژوو بکا، لە تەکنەلۆژیادا دەبیتە بەندەی ئەو تەکنەلۆژیایەی کە خۆت دروستت کردووە، غوربەت و موعاناتت زیاد دەکات، تۆ بتەوێ ونەتەوێ ناتوانی واز لە دنیای ئەدەب بێنی، ئەوەی لەناخی ئینسان دەدوێ ئەدەب و داهێنانە، من زۆر جار بیر دەکەمەوە خۆزگە ئێستە ئامێرێک هەبوایە لەم چرکەیەدا ئەو شتەی بە مێشکی ئەو ئینسانەدا دەڕوات پیشانی بدایە، بیر لەچی دەکاتەوە، تۆ مادەم حاڵەتی نامۆیی و نیگەرانیت هەیە پێویستت بەوەیە لایلایەی بۆ بکەیت وبیلاوێنیتەوە، ئەدەب مانای لاواندنەوەی ئینسان و لایلایەی نامۆ بوونیەتی..!

**رامان: ئەو نیگەرانی و نامۆ بوونە جاری وا هەیە لەسینەما دەتوانی بیخەیتەڕوو،ئایا رۆژانە کە تۆ چوار پێنج فلیمت لەسەتەلایتەکانەوە دی دەتوانی واز لە خوێندنەوەی رۆمان بێنی کە وەختێکی زۆرت لێ دەگرێ..؟**

**حەمە کەریم عارف:** کزی دەکات، بەڵام پێم وانییە لەناوی ببات، ئێستە ئەوروپییەک لەوانەیە بەو هەموو شارستانییەت و جەنجاڵییەی خۆی رەنگە سەرقاڵ بێ بەخوێندنەوەی کورتە چیرۆکێکی (ئەدگار ئالان پۆ) و لە کونجێکدا بیخوێنێتەوە.

**رامان: بەڵام رۆمان جیایە دەڵێن ئێستە خەریکە شارستانییەتی وشە ئاوادەبێ و شارستانی وێنە جێی دەگرێتەوە؟!**

**حەمە کەریم عارف:** بەنیسبەت رۆمان لەدنیادا وەک قەوارە بەرەو بچووک بوونەوە دەچێ، تۆ ناچاری لەم حاڵەتەدا بایەخی خۆت بدەی بە چڕی زەمەن..!

**رامان: راستە بەرەو چڕی دەڕوا بەڵام شیعرییەت کاریگەری خۆی هەیە بۆ نموونە رۆمانی (راما الشحاذ)ی ئوستریاس دەڵێ ماوەی چەند ساڵ خەریکی ئەو رۆمانە بووە، وەک لە پێشەکییەکەدا نووسیوویەتی دەوری ٦٠-٧٠ لاپەڕەیە، زۆر چڕی کردووەو بەزمانێکی شیعری و خەون ئامێز نووسراوە لەکاتێکدا رۆمانەکانی تری (پاپا الاخضر) و (سید الرئیس) ئەمانە ئاسایین، ئەو دەڵێ تێگەیشتنی بۆ ئەورۆمانە دەبێ کاتێکی زۆر لەتەمەنی خۆت تەرخان بکەی، مانای ئەوەیە بەرەو چڕ بوونەوە دەڕوا، بەڵام لای ئەو کەسانە زیاتر کە دەیانەوێ پێدزەیەک بەشیعرییەت و خەون ئامێزی خۆیان بکەن و بیهێننە ناو رۆمانەوە..**

**حەمە کەریم عارف:** رۆمانی ئێستە و لە ئەدەبی سەردەمدا لە ژێیە ئینسانیەکان

دەدا، تۆ ساتە زیندووەکانی ئینسانییەت هەڵبژێری و دەسەڵاتی هونەریشت هەبێ ئەوە زیندوو دەبێتەوە، گەر بتوانی ئەوە بکەیت باشە، بەڵام یەکێک لە خەوشەکانی تری چیرۆکی کوردی ئەوەیە ناتوانی ساتە ئینسانییە قووڵەکان هەڵبژێریت، چیرۆکێک یا شیعرێک بەبایەک بژی و بەبایەک برووخێ قەد نابێ بە شیعرو چیرۆک- لای من دەمەوێ بەزەبری هونەر داهێنانی راستەقینە دەچێتە ناو خەڵکەوە، بەدۆزینەوەی ساتە زیندووەکانی ئینسان سەرهەڵدەدا و دەخوڵقێ..!

**رامان: هەر لەبواری سینەمادا- جەنگ و ئاشتی- تۆلستۆی کە (بەندەرچۆک)ی بلیمەتی رووسی دەریهێناوە، ئەوەندەی ئێمە لە سینەمادا لەزەتمان لێوەرگرت، لەخوێندنەوەی رۆمانەکەدا ئەوەندە چێژو سوودمان لێ وەرنەگرت، ئەوەندەش چێژمان لە (لانەوازان)ی هۆگۆ وەک فلیم وەرگرت، ئەوەندە بە خوێندنەوەی چێژمان لێوەرنەگرت، هەروا دۆن کیشۆتی- سرفانتس کە (١٦٤٠) لاپەڕەیە دەرهێنەرێک هاتووە بۆ فلیمێک و لەماوەی سەعات و نیوێکدا چڕی کردووەتەوە؟**

**حەمە کەریم عارف:** ئەمە لایەنی ئیجابیەتی تەکنەلۆژیایە کە سینەمایە، جگە لەوەی زەمەنەکەت بۆ کورت دەکاتەوە، تۆ لەسەر دەمێکدایت پێویستت بەزەمەنە، زەمەنیش گرنگە، سینەما تەنیا دەقی رۆمانەکە نییە تەفسیرو خوێندنەوەی دەرهێنەرە بۆ ئەو رۆمانە، دەقاو دەق رۆمانەکە نییە... بۆ خوێنەرێکی رووسی لەوانەیە شت هەبێ لە (**شەڕو ئاشتی**)دا زۆر نایاب بێ، بەڵام لای تۆ وانەبێ، تووشی جۆرە بێزار بوونێک دەبیت، بەڵام سینەماکە بزاڤەو چاو و مێشک کاری تێدا دەکا.

**سازکردنی گفتوگۆ:**

**ئازاد عەبدواحید - مەحموود زامدار**

**محەمەد عارف:**

# قەناعەتم بە هونەری تەجریدی نییە

***مامۆستا محەمەد عارف هونەرمەندێکی ناسراوی کوردە، وەک هونەرمەندێکی کورد لە سەرتانسەری جیهانیشدا هەر ناسراوە، جێ پەنجەی بەسەر جوولانەوەی هونەری کوردییانەوە دیارە. وەک مامۆستایەکی ئەکادیمیش رۆلی بەرچاوی هەیە لە بلاوکردنەوەی هۆشیاری هونەری و پێگەیاندنی نەوەیەکی بەتوانا لەبواری هونەری شێوەکاریدا. بۆ ئەوەی لە نزیکەوە لەو مێژووە بدوێین کە بۆ خۆی دروستی کردووە. بەچاکمان زانی ئەم دیمانەیەی لەگەلدا ساز بکەین.***

**رامان: مامۆستا محەمەد عارفی هونەرمەند ئێستە خۆی بووە بەمێژوویەک لەنێو هونەری شێوەکاری کوردییدا پاش سی و چل و پەنجاکانی ئەم هونەرە لەهەولێردا چۆن دەست نیشان دەکەن ؟**

**محەمەد عارف:** دەتوانم دەستنیشانی جولانەوەی هونەری لەهەولێر لەسەرەتای پەنجاکانەوە بکەم، چونکە پێش ئەوقۆناغە من شارەزاییەکی ئەوتۆم نییە.بەراستیش ئەوساتە هیچ کەش و هەوای هونەرێکی راستەقینە لەهەولێر نەبووە، جگە لەئاراستەکردنی چەند مامۆستایەکی هونەرپەروەر نەبێ، کەخاوەنی فەزلن لەسەرمان ئەوسا شێوەکاری هەر لە چوارچێوەی (راگوێزان) دابوو.. لەوسالانەدا ئاشنای چەند مامۆستایەکی گەورەبووم وەک (جواد ناجی) کەمامۆستای نیگارکێشان بوو، لەکۆیەش مامۆستا (جابر پیرداود) ئێمەی فێری هونەری پەیکەرتاشین دەکرد، (سلێمان شاکر ) ی هونەرمەندی ئامۆزاشم زۆر هانی دام تا خوێندنی خۆم لەبەغدا تەواو بکەم ..

**رامان: بەرلەهاندانی ئەو مامۆستایانە، ئەی خۆت پێشتر ئارەزووی هونەریت نەبوو ؟**

**محەمەد عارف:** بەلێ ئەو ئارەزووەم هەبوو بەلام چەند هەولدانێکی ساکارانە بوو ، نەشگەیشتبووە رادەی ئەوەی بریاری ئەوەبدەم هەموو ژیانی خۆم بۆ هونەر تەرخان بکەم بەلام کەئامۆژگەی هونەرە جوانەکانی بەغدام تەواو کرد هونەر بوو بەپیشە لەلامدا، کەسالی (١٩٥٩) ش بۆفیستیڤالی لاوان چومە ڤیەننا، چەندین گەلەری

محەمەد عارف لەگەڵ باوکیدا

ومۆزەخانەی بەنرخی ئەوێم بینی، وای لێکردم هەربەخوێندنی ئامۆژگەی بەغدا رازی نەبم، بەڵکو روو لەخوێندنی بالا بکەم، ئەوەبوو ئاواتەکەم هاتەدی.

**رامان: ئەی هەندەران چی پێ بەخشیت ؟**

**محەمەد عارف :** من خۆم لەهەندەران دۆزییەوە و هەستی نەتەوایەتیم لەوێدا بەتەوژمتر بوو، لەوێدا هەر کەسێک بۆ میللەتەکەی خۆی کاری دەکرد ...لەبەر ئەوە لەساڵی (١٩٦١) وە بڕیارمدا ژیانی خۆم بۆ هونەری نەتەوەکەم تەرخان بکەم هەر لەسەرەتای شەستەکانەوەش ئەرشیفێکی تایبەتی خۆم داناو یەکەم پێشانگەشم لەزانکۆی (لۆمۆتۆسف) بوو لەمۆسکۆ، ئەو زانکۆیە بەیەکگەیشتنی هەموو قوتابییانی جیهان بوو ...بەرهەمی ئەو پێشانگەیەم بەچاوێکی زۆر روون و بەگیانێکی بەرزەوە تەماشای کرا ...بۆیە گەیشتمە ئەوقەناعەتە گەربێ و رێگەی هونەرێکی نەتەوایەتی بگرمەبەر، بەهیچ جۆرێ پەشیمانی لەدوادا نییە ..

**رامان: دیسان هەولێر ئەی (دانیال قەساب) ی هونەرمەند ؟**

**محەمەد عارف:** هونەرمەندێکی بەتوانا بوو لەبەکارهێنانی رەنگدا چەند تابلۆیەکی لەیانەی فەرمانبەرانی هەولێر هەڵواسرابوو .

**رامان: لەمۆزەخانەی (رواد) ی بەغداش دا دوو تابلۆی هەیە ؟**

**محەمەد عارف:** بەڵێ وایە .

**رامان: جگەلەئەو ؟**

تاوێرانی هونەرمەندو تابلز

**محەمەد عارف:** مامۆستا فؤاد ناجی ، ئەمیش بەپالیتنایت وێنەی دەکێشا ، هونەرمەندێک بوو رۆحی داهێنانی خۆی هەبوو پشتی بەراگوێزانی تابلۆ نەدەبەست .**رامان: جگە لەئەم ؟**

**محەمەد عارف :** ئەسکەندەر عشمان هونەرمەندێکی بەهرەدار بوو، قوتابی من بوو زۆر پشتگیریم دەکرد لەم ساڵانەدا کەمەرگ رایپێچا من پێشنیارم کرد بەرهەمەکانی لەنێو مۆزەخانەیەکدا کۆبکرێتەوە، چونکە بەشێکن لەبزاڤی هونەری شێوەکاری لەم شارەدا .

**رامان: ئەی موفید کەسرە؟**

**محەمەد عارف:** بەداخەوە گەر بەردەوام بووایە، هونەرمەندێکی بەهرەداری لێدەکەوتەوە.. لەیادمە

تابلۆیەکی **هونەرمەندی ئیتالی (کەرەڤادجۆ)ی** زۆر بە ئەمانەتەوە نەقڵ کردبوو، زۆر وەستایانەش کاری تێدا کردبوو.

محمود زامدار ـ محەمەد عارف ـ ئازاد عەبدولواحید

**رامان: ئەی پەیوەندی و تێکچڕژانی هونەری نێوان هونەرمەندانی ئەو ساڵانەی هەولێر لەگەڵ شارەکانی تری وەک سلێمانی و کۆیە لە چی دابوو؟**

**محەمەد عارف:** بەراستی جووڵانەوەی هونەریی لە (سلێمانی) دا بەهێزبوو، ستافێکی باشی نیگارکێش و مۆسیقار و ئەکتەر هەبوو.. من خۆم چەند کەسێکم دەناسی وەکو **خالید سەعیدو ئازاد شەوقی هونەرمەند** کە لەگەڵ من قوتابیُ بوون لە ئامۆژگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا.. ئاشنایەتیشم لەگەڵ قادر دیلان و شەماڵ سائیب و ویلیەم یۆحەننا هەبوو.

**رامان: گەر هاتوو خۆت رەخنەگری خۆت بوویت کێ کاری تێکردووی؟**

**محەمەد عارف:** بەخاکەڕاییەوە دەڵێم: کاریگەریی کەسم لەسەر نییە چ کورد چ عەرەب، بەڵام هەندێ لە هونەرمەندانی ئەوروپا کاریان تێکردووم.. من پڕوپاگەندە بۆ خۆم ناکەم، **بەڵام (ئوتروحەکەم) لە زۆربەی بەڵگەنامەکانی (استشراق)ی سۆڤیەتی جاران باسکراوەو هەڵسەنگێندراوە .. لەبنەڕەتەوەیش من پشتم بەهونەری کۆنی میزۆپۆتامیا و میناتۆری ئیسلامی و فارسی بەستووە بەڵام لەهەموو کارەکانمدا مۆرکی کوردیم پێ بەخشیون،** کەهەرهەمووی سەرنج راکێش بوون .. لەراستیشدا من بە تێڕوانینێکی ئیستاتیکی فەلسەفی ، هونەری ریالیزمی سۆشیالیست کەمێ کاری تێکردووم .

**رامان: باشە بۆ ئەورێبازە ریالیزمە ؟**

**محەمەد عارف :** جوانە.. گەر هاتوو من لەگەڵ ئێوە بەزمانێکی سادەو رەوانی

کوردی قسە بکەم، ئەوە هەرسێکمان زۆر بەباشی لەیەک دەگەین، بەڵام بەرووسی قسەتان لەگەڵ بکەم ئایا هیچ لەیەک حاڵی دەبین، جا کەمن زمانێکی شیرینی خۆم هەبێ، بۆیچم بەزمانێکی بێگانە بدوێم ... بۆیە دەڵێم : هونەری نیگارکێشان هونەرێکی جیهانییەو پێویستی بەوەرگێڕان نییە ... مەبەستیشم لەریالیزم نییە... چونکە ئەو هونەرە هیچ جۆرە نرخێکی لەلامدا نییە..

**رامان: کەواتە: سەد دەر سەد تۆ ریالیزمی نیت . ئایا بڕوات بەئەبستراکت هەیە؟**

**محەمەد عارف:** گومان لەوەدا نییە کەدەبێ هونەرمەند کۆمەڵێ قەناعەتی لەلادا هەبێت وەک قەناعەتی ئەوەی چۆن لەهونەر دەگات وجۆری جوانناسیەکەی چییە وەبەچ زمانێک لەگەڵ دەوروبەر دەدوێ، هەروەها دەبێ پێگەیەکی ئایدۆلۆژیشی هەبێ و بڕوای پێ هێنابێ، ستایدێکی ئەوتۆشی هەبێ کەخەڵک بڵێن ئەوە ستایدی فلان هونەرمەندە، تابتوانێ شتێکی چەسپاو دابنێ ، نەک شتی تەمومژاوی کەخەڵک تێی نەگات ، گەرمن لەچامەیەک ، چیرۆکێک رۆمانێک تێ نەگەم چۆن بۆم دەکرێ هەڵیسەنگێنم ، من هەموو ژیانم لەناو هونەردا بەسەر بردووە، زۆر جار هەموو چەمکە هونەری و ئیستاتیکیەکان بۆ ئەو کارە تەمومژاویانە بەکاردێنم کەچی تێی ناگەم ، لەئەنجامیشدا دێمە سەر ئەو قەناعەتەی بڵێم : ئەو بەناو هونەرمەندە، ئەکتەرێکی رووالەت بازو فاشیلەو زانستەکانی هونەر نازانێ ، کارەکەیشی نەهێلکاری و نەرەنگ و نە کۆمپۆزیشنە، نەپەرسپەکتیڤەو نە ئەنەتۆمیە.. هاتووە هەموو زانستەکانی هونەری پێشێل کردووە، خۆیشی بەکەسێکی بەهرەدارو مۆدێرنیزم دەزانێ ..!

تابلۆیەکی محەمەد عارف

**رامان: گوناهەکە لەتۆیە یالەئەو؟**

**محەمەد عارف:** زیاتر ئاماژە بۆئەمە دەکەم ، من لەم تەمەنەدا کەزۆربەی ژیانم بۆ هونەر تەرخان کردووە و چەندین کتێبم هەیە کەباسی زۆربەی زۆری قوتابخانە هونەرییەکان دەکاو رێبازە جیا جیاکانی هونەر شیدەکاتەو، جا گەر منێک بەم حاڵەتەوە لەوکارە تەمومژاوییە نەگەم، ئەی کێ تێی بگات !!

**رامان : لەبەرهەمەکانتا ،رەنگی کوردەواری رەنگی داوەتەوە، بۆ؟**

**محەمەد عارف :** تێگەیشتنی رەنگی کوردی و چێژی جوانناسی کوردی دەربارەی رەنگ لەسروشتی جوانی کوردستانەوە هەڵقوڵاوە ... گەر هەر چوار وەرزی ساڵ لەکوردستان بەراورد بکەی گەلێ دەرئەنجامت لەبارەی ئەو سروشت و رەنگەکانەوە دەست گیر دەبێ، رەنگی رەنگینی کوردستان زۆر دوورە لەرەنگی خۆڵەمێشی

ئەوروپا.. لەئەوروپادا جارهەبووە شەش مانگ (هەتاو) مان نەدیوە، کەرۆژ هەڵاتووە بەحەپەساوییەوە گوتوومانە: ئەم شتەمان دیووە. لێرە لەکوردستاندا ، بینینی بەرجەستە لە (٥) بەش پێکهاتووە. **بەقەناعەتی خۆم-یەکەمیان: هەرێمی رووناکییە، دووەمیان : هەرێمی نیوە رووناکییە، سێیەمیان: هەرێمی تاریکییە، چوارەمیان: ریفلیکسە- یا رەنگدانەوە،پێنجەمیان : هەرێمی بریسکەدارە.** بۆیە گەر بەچاوێکی هونەرمەندانە تەماشای هەرشتێکی ئەم کوردستانە بکەی، ئەوا ئەو پێنج خاڵەت دێتە بەرچاو، بەڵام لەئەوروپادا بەلایەنی کەمەوە دوو خاڵ لەو پێنج خاڵانە بەدەر ناکەوێ و نییە ، بۆیە گەر لەم بنەمایە گەیشتی و بەشێوەیەکی ریالیزمیش پێشکەشت کرد نەک هەرەمەکی، ئەوا یەکسەر مەبەستی خۆتت پێکاوە ..!

تابلۆیەکی محەممەد عارف

**رامان: ئەی رەنگە بنەڕەتییەکانی ئەم کوردەوارییە؟**

**محەمەد عارف:** یەکێک کەدێ مافورێک یا جاجمێک یا بەڕەیەک دروست دەکا، ئەوا ئەو بنەمای رەنگەکان نازانێ، بەڵام چونکە هەر لەمنداڵییەوە لەنێو سروشتی رەنگینی کوردستان روەردە بووە، ئەو سەلیقە رەنگاوییەی لەلا دروست بووە، بۆیە بەرهەمەکەی هەمووی رەنگی گەشن وەک :سوور، زەرد، مۆر بنەماکانیشی هەموو تەواون . بۆنموونە: گەر بێ و شیکەیتەوە و بلێیی ئەوە رەنگی گەرمەو ئەوە سارده و ئەوە شلەتێنە، نازانی گەرمەکە سوور و زەردەو ساردەکە رەنگی شین و کەسکە و بێلایەنەکە سپی و رەشە، بەڵام کە بەچاوی ئەکادیمی سەیری مافوورەکە دەکەی، هەموو بنەماکانی راست دەردەچن.. ئەم کوردەوارییەی خۆمان وڵاتی رەنگە.. بەڵام هەندێ دێن روو لە کاندینسکی یا لە سیزان و ماتیس و مالیێڤیچ دەکەن کە هەموویان لە ژێر تەئسیری خۆرهەڵاتدان. من نازانم ئەم هەراو بەزمەی مودێرنیزمە لە چ سەرچاوەیەکەوە سەری هەڵداوە، نازانم بۆ ئەوانەی لە کەلەپووری رەسەنی خۆیان دابڕاون، نایەنەوە و بەچاوی عیشقەوە سەیری ئەو سروشتە جوانەی وڵاتەکەی خۆیان ناکەن، بۆ دەچن چاو لە کەسێک دەکەن، کە ئەو کەسە خۆی چاولێکەری زێدو میللەتەکەی ئەوانە..!؟

**رامان: ئەی هۆی گەڕانەوەت بۆ داستان و مێژووی کورد؟**

**محەمەد عارف:** مرۆڤ چەند هەست بە مەسئوولیەت بکا ئەوەندە بارەکەی قورستر دەبێ.. داستان و مێژووی کوردو موغامەراتی مرۆڤی کورد پڕن لە بابەتی مرۆڤانەی جۆراو جۆر، بەڵام دەبێ بەقووڵی تێی بگەین، بەراستی ئەو کەرەستانە جیهانێکی زۆر تێرو تەسەل و بەرفراوانن.. من لە پاشساڵی (١٩٦٥)وە ئەو

قەناعەتەم لا چەسپا، **لە ساڵی (١٩٦٧)یشدا ئۆتروحەکەم لەسەر (سەڵاحەدین ئەیووبی) بوو کە ئێستە لە کۆلێجی سەربازییە لە بەغدا..** لە کاتی خۆیشی لە ئیستکوتسڤا واتە: گۆڤاری پسپۆری هونەری لە یەکیەتی سۆڤیەتی جاران بەرەنگەوە بڵاو کراوەتەوە، لەو ساتەوە من هەستم بە حەسانەوە کردووە، چونکە لەناوەندێکی بەرزی هونەریدا شتێکی کوردیم چەسپاند، کە لە (لەندەن)یش گەڕامەوە داستانی دوانزە سوارەی مەریوانم نیگارکێش کرد، ئێستا تابلۆکە موڵکی من نیەو لە (سەلمان پاک) لەگەڵ دیواربەندیەکی پانۆرامەکە دانراوە، منیش زۆر سەربەرزم بەو بەخششەم.. هەروا تراژیدیای (قەڵای دمدم)م لە کۆتایی حەفتاکاندا لە تابلۆیەکی سێیانەی گەورەدا نەخشاندووە..!

**رامان: ئەی چۆن تەماشای (ژێر نیکا)ی پیکاسۆ دەکەیت؟**

**محەمەد عارف:** (پیکاسۆ)ی مرۆڤ کە بینی هێزی فاشی گوندی (ژێرنیکا) یان بەفرۆکە بۆردومان و تەخت کرد، یەکجار وروژاو هەڵایساو ئەو رووداوەی لە نێوان ریالیزم و سیمبۆلیزم دا بەرجەستە کرد.. (ژێرنیکا) لەم سەدەیەدا، شاکارێکی گەورەی جیهانییە.. من خۆم زیاتر چێژ لە لایەنی فیکرەکە وەردەگرم نەک راپەڕاندنی کارەکە.. هەروا من بەباشی لە هەردوو قۆناغی (شین و پەمەیی) پیکاسۆ گەیشتووم، بەڵام زیاتر چێژ لە قۆناغی شین وەردەگرم و پێم باشترە..!

**رامان: مۆزەخانەی لۆڤەر، ئارمیتاژی رووسی، مۆزەخانەکانی ئینگلیزی و ئەمەریکی و بینالی ڤینناو فاتیکان و سان پاولۆ چیان پێ بەخشیت؟ هەریەکەیان چۆن دەسنیشان دەکەی؟**

**محەمەد عارف:** کە لە لینینگراد ئارمیتاژم بینی، بەتەواوی حەپەسام، چونکە (٢) ملیۆن و پێنج سەد هەزار بەرهەمی هونەری تێدابوو، کەچوومە پاریس و مۆزەخانەی (لۆڤەر)م بینی، تێگەیشتم کە ئەمە لە ئەوەکەی تر مەزنترە، لە مۆزەخانەی بەریتانیش دا ئەو کەت گۆریایەم هاتەوە یاد کە دەڵێ: **(ئەو ئیمبراتۆریەتەی کە خۆر لە خاکەکەی ئاوا نابێ)** لەوێدا ئەو راستیە بەرجەستە بووە، کە گەلەرنی ناشناڵ پۆرتریتشم دی بەتەواوی لەرازی گەورەیی هونەر گەیشتم و هونەرمەندی کوردم زۆر بە بەشخوراوو بێدەسەڵات هاتە بەرچاو، بەتایبەتی هونەرمەندی داهێنەر، لە سەفەری ئیتالیاشمدا ئەو بوارەم بۆ رێکنەکەوت، تا ئەو شتانە بەوردی ببینم، لە ڤاتیکانیش گەورەترین و شاکارترین کاری هونەرمەندی مەزنی جیهانی (مایکل ئەنگیلۆ)م لە تابلۆی (رۆژی قیامەت)دا بینی و حەپەساندمی..!

**رامان: با ئەوروپا جێ بهێڵین و بگەڕێینەوە کوردستان، باشە ئەی شێوێنەوارەکانمان لەبارەی هونەری شێوەکاریەوە چیمان بۆ دەدرکێنن؟**

**محەمەد عارف:** بەداخەوە، هەموو شوێنەوارەکانمان بە دەستی بێگانە تاڵان کراون و خۆیان کردۆتە خاوەنی، هەموو دەرو دراوسێکانمان گەر پاشماوەیەک سەد دەر سەدیش کوردی بێت، بەهینی خۆیانی دەزانن و بەجارێ کەسایەتی کوردیان سڕیوەتەوە..!

**رامان: ئەی تۆ وەکو هونەرمەندێکی گەورە، چ سوودت لەو شوێنەوارانە وەرگرتووە؟ بەتایبەتی نەخش و نیگارەکانی سەرتاشەبەردی چیاکان؟**

**محەمەد عارف:** سوپاستان دەکەم، من قوتابی هونەرم و خۆم بە هونەرمەندی گەورە دانانێم و رۆژانەش وەک قوتابییەک تێدەکۆشم.. بەهەرحاڵ لە مۆزەخانەی عێراقیدا، چەند پاشماوەیەک هەیە کە رێنمایی لە مرۆڤی نیاندرتاڵ دەکا، کە لەچیای برادۆست و لە ئەشکەوتی شانەدەر دۆزراوەتەوە بەڵام لە رووی هونەرییەوە سوودی زۆر کەمە.. نەخشو نیگاری سەرتاشەبەردی چیاکانیش، بەداخەوە دەڵێم: بۆم نەلواوە لێیان بکۆڵمەوە، مایەی سەرنجیشە وەختی خۆی چەند هونەرمەندێکی جیهانی وێنەی مرۆڤی کوردیان کێشاوە و بەشێکیان رەنگاو رەنگن و ئامادەشم پێشکەشی (دەزگای گولان)ی بکەم..!

**رامان: ئەی حیواری شارستانییەتە مرۆڤایەتییەکان؟**

**محەمەد عارف:** ئەو حیوارە بەراستی شتێکی پیرۆزە.. راستە مرۆڤ پێویستە لە چوارچێوەیەکی خۆماڵیدا بجووڵێ، بەڵام هاوکات دەبێ سوود لە شتی جیهانی وەربگرێ، چونکە سامانی هەموو مرۆڤایەتییە.. ئێمە لە ناخماندا قەرزاری (چایکۆڤسکی و بیتهۆڤن)ین.. ئەو دەوڵەمەندکردنەی خۆمان لەرێی بلیمەتێکەوە، نیگارکێشێکەوە، مۆسیقارێکەوە، دەبێتە مایەی تێرو تەسەلبوونی رۆحیمان و بەردەوامبوونی پردی بەیەکگەیشتن..!

**رامان: نیگەرانی رەوای هونەرمەند ـ بەتایبەتی لای تۆ ـ چی دەگەیێنێ؟**

**محەمەد عارف:** بەرای من کەس بەقەد هونەرمەندی کورد نیگەران نییە، چونکە بەراستی دەوروبەرەکەی زۆر نالەبارو ناهەموارە، لەم دەوروبەرەدا دەبێ زۆر بەهێزبێت، تا بەردەوام بێت، مەبەستم خۆم نییە، چونکە **ئێستە من لە کارەکانی خۆم رازی نیم و بەردەوام ئەو نیگەرانیەم هەیە**.. ئەمەو لە نێوەندێکی وا نالەباری هونەریدا هەندێ کەس هەن یا لایەنێک هەن، جاروباز نەخشەو پیلان دادەرێژن تا هەستت بریندار بکەن، چونکە تۆ سەرکەوتوویت و مرۆڤێکی بەتاڵ نیت.. نیازخوازم ئەو بارە نالەبارە بنەبڕ بکرێ و دیاردەی **(پیلانی بێدەنگ)**یش بفەوتێ..!

**رامان: روخسار یا ناوەرۆکت لەلادا گرنگە؟**

**محەمەد عارف:** گەر من (١٠٠) سەعات قسەتان بۆ بکەم، گەر ناوەرۆکی نەبێ، بەچی دەچێ، رەحمەت لە مام (هێمن)ی شاعیر کە وتویەتی: جوانترین روخسار ئەوەیە کە باشترین ناوەڕۆک بەرجەستە بکا..!

**رامان: (محەمەد عارف)ی هونەرمەند، کەسایەتیەکە و پڕە لە دڵەڕاوکێ و خەوبینین و پاشەرۆژو ئازادی، گەرانێکە بەدوای کەسایەتی نەتەوایەتی کە لەم جیهانە نوێ و جەنجاڵەدا سەری هەڵداوە، ئەمەیان چۆن؟ ئەی پۆرترێتی ئەم و ئەو؟**

**محەمەد عارف:** مرۆڤ ناتوانێ لە مێژووی کوردەوە، یا تەنیا لەرێی پاڵەوانە فۆلکلۆریەکانەوە خۆی بسەلمێنێ، **سەبارەت پاڵەوانەکانی سەردەمیش ـ لەگەڵ رێزم بۆیان ـ راستە رۆڵی گرنگیان هەیە، بەس بەراستی زۆربەیان نابنە کانیاوی**

**سروش بۆ من**، لەو قسەیەشم بەرپرسیارم، رەنگە زۆربەیان شایەتی ئەوەبن پۆرتریتیان بۆ بکەین یا بیانخەینە نێو بابەتێکی سەردەمەوە، بەڵام ئەمە زۆر مەترسیدارە، چونکە ئەوکاتە ئەو هونەرمەندە بەراراو هەلپەرست دێتە بەرچاو.. رەنگە تۆ کەسێکت خۆشبووێ، بەڵام گەر پۆرتریتێکت بۆ کێشا، ئەوا بە هەلپەرست لەقەڵەم دەدرێی.. بۆیە هونەرمەندی راستەقینە لەرێی سوارچاکێک، یا تێکۆشەرێکی گەورە، یا عاشقێکی گەورە خۆی دەسەلمێنێ، من خۆم زنجیرەیەک تابلۆی جۆراو جۆرم لە بەردەستە کە هەمووی باسی ئەڤین و دلداری دەکا.. خەوبینینشم بەئازادی و بە پاشەرۆژ بەشێکە لە خەمەکانم، خەمی بەرجەستە کردنی قەوارەی نەتەوەکەم لەم جیهانە جەنجاڵەدا..!

**رامان: تۆ لەولاتێکی رێباز ئیلحاددا خوێندووتە، ئایا بڕوات بەخوا هەیە؟ ئەی سۆفیزم لەلای تۆدا چی دەگەیێنێ؟**

**محەمەد عارف:** راستە وایە.. هەرچەندە لە نوێژو رۆژووگرتنا من کەمتەرخەمم، بەڵام بڕوایەکی پتەوم بە خوا هەیە، هەروا بە هونەر.. لیستێک دوعاشم هەیە رۆژانە دەیلێمەوە وەک: خوایە نهێنیەکانی هونەرم لەلا ئاشکرا بکە، ئەی خودایە وابکە ئەمرۆ شتێکی نوێ فێربم، ئەی خودایە بەهێزترم بکەی تابتوانم نیگارێک بکێشم..! **بۆ سۆفیزمیش دەڵێم: ئەمەیان زۆر جۆری هەیە: رۆحی، دینی، هونەری..... تاد، من کاری هونەری بەجۆرە تەسەوفێک دادەنێم**، پەرستنی خوا لەسەر هەموو جۆرە پەرستنێکە بەڵام هەڵکشانە نێو هونەر و پەرستنی، لەلای من لە پاش پەرستنی خوا، شتێکی زۆر پیرۆزە..!!

**رامان: هونەری قوتابخانەی رووسی لەگەڵ ئەوانەی تری ئەورووپادا چ جیاوازیەکیان هەیە؟**

**محەمەد عارف:** دیستۆیفسکی دەڵێ: **(ئێمە هەموومان لەناو پاڵتۆی گۆگۆلەوە دەرچووین)**. کەس لە ئیمە ناتوانێ بلێ: تۆلستۆی کاری لە ئێمە نەکردووە، یا دیستۆیڤسکی، یا ئیرەنبۆرگ، پۆشکین یا لیرمەنتۆف و چایکۆڤسکی چێژی پێ نەبەخشیوبن کەس نییە لە هونەرمەندانی بلیمەت ـ قەرزاری مەعنەوی کەلەپووری رووس نەبێ، سەبارەت بە رۆژئاواش هەمدیس قەرزاری ئەویشین..!

**رامان: محەمەد عارفی نووسەر بەرەوکوێ؟**

**محەمەد عارف:** من خۆم بە نووسەری هونەری دانانێم بەڵکو وەکو نیگارکێش دەژیم.. هەرچەندە لە سەرەتای حەفتاکانەوەش بەشداریم لە رۆشنبیری هونەری کردووە گۆڤارو لە رۆژنامەکانی وەک (بەیان) و (هاوکاری) و (التآخي) و ئێستەش (برایەتی) ..!

**رامان: زۆر بەخێرایی.. پیکاسۆ کێیە؟**

**محەمەد عارف:** نیشانەی هونەرمەندێکی لیتۆژەرو موغامیرە، متمانەی بەخۆی هەیە..!

**رامان: داڤنشی؟**

**محەمەد عارف:** ئیسپاتی بلیمەتیی مرۆڤی رێنسانسی کردووە، لە بوارەکانی

زانست و هونەردا بلیمەتێکی بێ هاوتایە..!

**رامان: ماتیس؟**

**محەمەد عارف:** هونەرمەندێکی جەربەزەیە، نەک هەر لەرەنگدا، بەڵکو لە هاتنی بۆ رۆژهەڵات تا شت فێر بێ..!

**رامان: کۆکۆشکا؟**

**محەمەد عارف:** هونەرمەندێکی تەعبیرییە، جۆری .

**رامان: ئایا بزاڤی شێوەکاری هونەرمەندانی کوردی هەندەران بەشێکە لە بزاڤی نێو وڵاتەکەمان؟**

**محەمەد عارف:** بوونی ئەو هونەرمەندانە لە هەندەران بە هەر جۆرێ بێ، پروپاگەندەیەکە بۆ کورد، بەڵام من پرسیارێک دەکەم: ئایا هونەرمەندێکی کورد هەیە، لە مۆزەخانەیەکی ئەوروپادا بەرهەمێکی هەبێ؟

**رامان: ئەی بزاڤی شێوەکاری لەلای خۆماندا؛ بەتایبەتی لاوان؟**

**محەمەد عارف:** لاوییەتی، یانی توانا، یانی رووبار، بەڵام ئایا ئەو روبارە رێی راستەقینەی خۆی گرتووە؟ بێگومان نەء نەیگرتووە! هۆیەکانیش زۆرن.. بەتایبەتی کارەساتی پڕ لە تراژیدیای سیاسی زوڵم و زۆرێکی گەورەی لە بزاڤی لاوان کردووە.. هەربۆیەشە دەبێ بەرپرسەکان یارمەتییان بدەن و بژێویان بۆ دابین بکەن، تا بەهرەیان گەشەبکا.. ئەمەو دەبێ ئەو لاوانەش روو لە رۆحی لێتوێژینەوە بکەن، بەڵام بەداخەوە هەستکردن بەمەسئولیەتی مێژوویی و هونەری لەنێویاندا کەمە..! هەروا هەوڵدانی بەردەوامی گۆشکردن بە زانست و بنەما هەرە قورسەکانی هونەر..!!

فڵچە وەشاندنی، دینامیکیەتی تێدایەو سەرنج راکێشن..!

**رامان: ئازاد شەوقی؟**

**محەمەد عارف:** هونەرمەندێکی راستگۆو بەهرەدارە، لە چارەسەرکردنی دیمەنەکانی کوردستان دا بەشێوەیەکی تەعبیری زۆر راستگۆیانەیە..!

**رامان: ئیسماعیل خەیات؟**

**محەمەد عارف:** لای ئەم برادەرە، دووفاقییەک لەنێوان بەرهەم و ژیانی رۆژانەیدا ـ وەکو مرۆڤێک ـ دەیبینم.. بەراستی لە پێشانگەی هونەرمەندانی کورد لە پاریس، غەدرێکی زۆری لە هونەرمەندە داهێنەرو لێهاتووەکانی کورد کرد..!

**رامان: نامیق عەلی؟**

**محەمەد عارف:** هونەرمەندێکی نوێخوازە و هەوڵدەدا تابلۆکانی روخسارێکی تازەیان هەبێ..!

**رامان: دارا حەمە سەعی؟**

**محەمەد عارف:** لەو ماوەیەی کە لە ئیتاڵیابوو، بەرهەمەکانی زۆر جوان بوون، هەروا بەرهەمەکانی لە پێشانگەی (رواق)ی بەغدادا.. بەڵام ئێستە ئەو جموجووڵەی جارانی نەماوە خۆزیا بەهەمان رۆحیەتەوە بەردەوام بووایە..!

**رامان: ئازاد ئەحمەد نانەکەلی؟**

**محەممەد عارف:** قوتابی خۆمەو ئیسپاتی بوونی خۆی لە ئەوروپادا کردووە، مرۆڤێکی زۆر وەفاداریشە..!
**رامان:برسیەتی؟**
**محەممەد عارف:** خراپترین حاڵەتە کە مرۆڤ لە مرۆڤایەتی خۆی دادەماڵێ..!
**رامان: نیوە شەو؟**
**محەممەد عارف:** ئەمەیان وەلامم بۆ نییە، چونکە من هەر لە ئێوارەوە دەنووم..!
**رامان: ماچ؟**
**محەممەد عارف:** زۆر جۆری ماچ هەیە، دیارە ماچی هەرزەکاریبیش لەهی پیری جیاوازە..!
**رامان: جوانی؟**
**محەممەد عارف:** بەرجەستە بوونی ژیان و کانیاوی سروشان و داهێنانە..!
**رامان: خوا؟**
**محەممەد عارف:** تەماشای هەرشتێ بکەی خوای تێدا دەبینی..!
**رامان: یاسەمینی هاوسەرت؟**
**محەممەد عارف:** هۆی بەردەوامیمە لە جیهانی هونەردا..!
**رامان: ئەسپ لە تابلۆکانتا؟**
**محەممەد عارف:** لە مێژووی ئێمەدا دەورێکی گرینگی بینیوە.. لە کاتی راوەستان و غاردان دا جۆرە دینامیکیەتێکی وای تێدایە کە بەرەو ئامانج هەنگاو دەنێ.. من هیچ کاتێ ئەسپێکی فۆتۆگرافیم نەکردووە، هەمیشە لەلای من ئەسپ بەشداری لە رووداوەکان دەکا.
رامان: رامان؟
محەممەد عارف: رامان وەک یووکێکی رازاوەیەو ناوەرۆکیشی تێروتەسەلە.. سوپاسی ئەو رێبازە پاکەشتلێ دەکەم کە بایەخ بەو کەسانە دەدەن، کەماندووی رێگەی هونەرو زانست و ئەدەبیاتن.
رامان: بەدیع بابەجان؟
محەممەد عارف: مردنی هونەرمەندێکی گەورەی کورد بە تراژیدیای برسییەتی...!
رامان: سەرو سۆراخی هۆڵە سەیرەکەت؟
محەممەد عارف: زۆر نهێنییە، نەوەک دزەکان تابلۆکانم لێ بدزن..!
رامان: ماندوومان نەکردی؟
محەممەد عارف: حەزدەکەن تا بەیانی لە بارەی هونەر بۆتان دەدوێم..!

* * *

**محەممەد عارف لە سیمفۆنیای هونەردا**

*** ١٩٣٧ لە رەواندز لە دایک بووە**
*** ١٩٦٧ ماجستێری لە ئەکادیمیەی هونەرە جوانەکانی مۆسکۆ وەرگرتووە.**
*** ئەندامی نەقابەو کۆمەڵی هونەرمەندانی شێوەکاری عێراقییە**
*** ئەندامی کۆمەڵی هونەری سەردەمی بەغدایە**

* ئەندامی کۆمەڵی هونەرمەندانی جیهانییە لە پاریس
INIERNATIONAL ARTISTS ASSOSATION
* مامۆستای هونەر بووە لە ئامۆژگەو هەردوو ئەکادیمیای هونەرەجوانەکانی زانستگەی بەغداو بابل
* مامۆستای هونەری نیگار کێشانە لە زانستگەی سەلاحەددین.

پێشانگە گشتیەکانی:

* زۆربەی پێشانگە هونەریەکانی ناوخۆوو ساڵانەی کۆمەڵی هونەرمەندانی شێوەکار لە بەغدا ـ ١٩٦٩ ـ
* پێشانگەی گشتیی هونەرمەندانی کورد لە هەولێر
* بینالی یەکەمی هونەری جیهانی لە بەغدا ـ ١٩٨٦
* بینالی دووەمی هونەری جیهانی لە بەغدا ـ ١٩٨٨
پێشانگەی هونەری عێراقی سەردەم لە: کوێت، قەتەر، بەحرێن، لوبنان، جەزایر، سوریا، مەغریب، توونس، یەکیەتی سۆڤیەت، ئەڵمانیای رۆژهەلات، ئەڵمانیای رۆژئاوا، بەریتانیا، فەرەنسا، هیندستان

* * *

پێشانگە تایبەتیەکانی:

* سێ پێشانگەی هونەری لە یەکێتی سۆڤییەت (١٩٦١ ـ ١٩٦٧)
* چوارەم پێشانگەی هونەری لە هۆڵی مۆزەخانەی هونەری نەتەوایەتی سەردەم لە بەغدا (١٩٧١)
* پێنجەم پێشانگەی هونەری لە هۆڵی کۆمەڵەی رۆشنبیری کورد لە بەغدا (١٩٧٦)
* شەشەم پێشانگەی هونەری لە هەولێر (١٩٧٧)
* حەفتەم پێشانگەی هونەری سەردەم لە بەغدا (١٩٧٩)
* هەشتەم پێشانگەی هونەری لە هۆڵی (الرواق)ی بەغدا (١٩٨١)
* نۆیەم پێشانگەی لە هۆڵی مۆزەخانەی سەردەم لە بەغدا (١٩٨٤)
* دەیەم پێشانگەی لە هۆڵی (الرواق)ی بەغدا (١٩٨٩).
* یازدەمین پێشانگەی گشتیی لە هۆڵی (میدیا)ی هەولێر (١٩٩٣)

* * *

کتێبە چاپکراوەکانی:

مایکل ئەنجیلۆ - رووسی بۆ کوردی
دیلاکروا - رووسی بۆ کوردی
میلێ - رووسی بۆ کوردی
روبنس - رووسی بۆ کوردی
گۆگان - رووسی بۆ عەرەبی
فن الرسم اليدوي
محەمەد عارفی هونەرمەند- لێکۆڵینەوەی رۆژهەلاتناس و رەخنەگران
ئاماژە :(١٠) دەسنووسی هونەری ئامادەیە بۆ چاپ

لەتیف هەڵمەت:

# ڕوانگە هێلکەیەکی پیس بوو هیچی هەڵنەهێنا

***لەتیف هەڵمەت شاعیرێکە لەسەرەتای ساڵانی حەفتاوەوەک شاعیرێک دەرکەوتووە، تا ئەمڕۆ چەندین دیوانە شیعری بڵاوکردووەتەوە، شیعرەکانی هەمیشە جێگەی دەمەتەقێ و لێدوان بوون و ئەو گفتوگۆیانە ڕۆڵی خۆیان هەبووە لە شڵەقاندنی گۆمی ڕۆشنبیری و وروژاندنی چەمک و بۆچوونی نوێ. گۆڤاری ڕامان لە دیمانەیەکدا لەگەڵ لەتیف هەڵمەت زۆر باس و بابەتی خستە بەرباس و لێکۆڵینەوە.***

**ڕامان: لە زۆر بۆنەدا وەک کۆڕو بڵاوکردنەوە باستان لەوە کردووە ئێوە وەک گرووپی کفری هەنگاوەکانتان لەبەرهەم و بڵاوکراوەکانەوە دەکەونە پێش بەیاننامەی ڕوانگە، لە هەندێ بۆنەشدا گوتووتە ڕوانگە هێلکەیەکی پیس بووەو هیچی هەڵنەهێناوە، ئەم دوو هەڵوێستە چۆن لێک دەدەیتەوە..؟**

**لەتیف هەڵمەت:** لە ڕاستیدا دەتوانم بڵێم لە چەندین کۆڕیشدا بەنووسین گووتومە، گرووپی کفری کە بریتی بووین لە ئەنوەر شاکەلی و ئەحمەد شاکەلی و لەتیف هەڵمەت لە دواییدا ـ کەنعان مەدحەت ـ هاتە ڕیزمانەوە. هەروەها ئەندامێکی ترمان هەبوو سەرەتا لە هەولێرو دووایی بۆ کەرکووک هات، بەڵام هەر لێمانەوە نزیک بوو، ئەویش چیرۆکنووسی جوانەمەرگ ـ لەتیف حامید ـ بوو، کە لە کفری سەردانی کردین و وەک هاوولاتی خۆی بەخەڵکی ـ کفری ـ دەزانی، چونکە لە پەنجاکاندا هەردوو قۆناغی خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی لە ـ کفری ـ تەواو کردبوو، جگە لەم ناوانە دەتوانم بڵێم عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی لە یەکێ لە ژمارەکانی ـ ئاڵای ئازادی ـ دا ئاماژەی بۆ کردووە، ئەندامێکی ترمان بەناوی ـ هیشام تاهیر بەرزنجی ـ هەبوو کە ئەویش هەمان بیروبڕوای ئێمەی هەبوو بە تایبەت لە مەسەلەی تازەگەریدا، ئێمە گرووپەکەمان بەگشتی و منیش بە تایبەتی لەگەڵ ئەنوەر شاکەلی و هیشام تاهیر بەرزنجی ئەم سییانەمان بەزۆری بەرهەمە تازەکانی خۆمان لە بەرنامەکانی ئێزگەی کوردییەوە دەخستە ڕوو، تەنانەت کاتێ ـ

جەمال شارباژێریم ـ بینی پێمی وت «: **تۆ بەلامەوە غەریب نیت، زۆربەی ئێواران گوێبیستی هۆنراوەکانتان بووم، ئەوانەی لە ئێزگەی کوردی پەخش دەکران..**»

مانای ئەوەی دەربڕی کەشتێکی تازەمان خستۆتە روو، هەروەها لەگەڵێ رۆژنامە و گۆڤاردا بەنووسین و بەڵگەو مێژوو ئەمەم خستۆتە روو، لەسەر ئەوە ناڕۆم، بەدوورو درێژی باسی ئەزموونی شیعری گرووپی کفربیم کردووەو بۆ وڵاتی سویدم ناردووە، هەر لە گۆڤاری ـ مامۆستای کورد ـ کە فەرهاد شاکەلی دەری دەکات گەلێ حەقائیقم بڵاوکردۆتەوە، سەبارەت بەوەی ئێمە دەسپێشکەر بووینەو روانگەش هێلکەیەکی پیس بوو، هیچی هەڵنەهێنا، بۆ نموونە **«پرۆژەی کودەتایەکی نهێنی»** بەرهەمی ئەنوەر شاکەلی و ئێستە بەناوی فەرهاد شاکەلی بەرهەمەکانی بڵاودەکاتەوە، ئەوە دەنگدانەوەیەکی گەورەی دوواوە بوو، هەروەها **(خواو شارە بچکۆلەکەمان)** یەکەمین بەرهەمی خۆمە کە ئەویش هەر ئاژاوەیەکی گەورەی نایەوە، هەروەها چیرۆکەکانی ئەحمەد شاکەلی ئاژاوەیەو دڵداری یان ژوورە لە ناویەکەکان، ئەوانیش ئاژاوەیەکی گەورەیان لە بواری چیرۆکی کوردییدا نایەوە، یان چیرۆکەکانی لەتیف

**جارێکی تر دەیڵێمەوە روانگە هێلکەیەکی پیس بوو هیچی هەڵنەهێنا گرووپی (کفری)ش زۆر پێش روانگە دەستمان بەنوێ بوونەوە کرد**

حامید لەوانە **«قوڵپی رشانەوەی رەش»**، بەشێکی تر لە داستانی **«سواڵکەرە ناسراوەکە»** و یەک تا دوو چیرۆکی تر، دیاردەیەک بوون لە دیاردەکانی چیرۆکی نوێی کوردی، ئەو شیعرانەش کە هیشام تاهیر بەرزنجی هاوڕێمان لە دوزخورماتوو بۆ ئێزگەی کوردی دەنارد، زۆر نوێگەری و باسی نوێگەری تیا بوون، لەوکاتەدا کە شێرکۆ بێکەس **«تریفەی هەڵبەست»** و **«کەژاوەی گریانی»** دەنووسی، لە کاتێکدا جەمال شارباژێری، دیوانی **«فرمێسکی نهێنی»** و .. **«پارچەیەک لە جگەرمی»** دەنووسی، ئەمانە لەژێر کاریگەری شیعری کامەران موکری و ساڵح دیلان و گۆراندا بوون، کەچی ئێمە ئەو سنوورانەمان تێک و پێک شکاند بوو، بۆ نموونە ئەنوەری شاکەلی لە پێشەکی دیوانی پرۆژەی کودەتایەکی نهێنیدا ئەوە دەردەبڕێ کە ئەزموونی ـ گۆران ـ ی تێپەڕاندووە، ئەمە خۆی لە خۆیدا قسەیەکی گەورەیە، من لە پێشەکی **«خواو شارە بچوکۆلەکەم»** دانووسیومە ـ بە پێچەوانەی باوێشکی دڕکی تاریکە شەوەوە جێی هەنگاوەکانم دەکەمەوە **«ئەمە رستەیەکە »** دوو قسەیە، بەڵام لەناوخۆیدا بەیاننامەیەکە..

ئەوەمان تەجاوز کردووە لاسایی **(کامەران) یان (گۆران)** یان هەر شاعیرێکی تر بکەینەوە، جگە لەوە من لە گۆڤاری (رزگاری) دا لە ژمارەیەکی ساڵانی ١٩٦٩ی

یدا داوای ئەوەم کردووە کە شیعری کوردی هەنگاوێکی گەورە بنێ و لە قاوغە تەقلیدییەکەی خۆی دەربچێت، بەڵام روانگەییەکان بۆ نموونە «شێرکۆ بێکەس» ئەگەر گرووپیشیان نەبوایە بەناوی ـ روانگە ـ ئەو هەر دەیتوانی دیوانێک بەناوی ـ کازیوە ـ بنووسێت..
مەنهەجیان بۆ تازەگەری نەبوو، بەڵام ئێمە دەیان نامەمان پاراستووە، لە ساڵی ۹٦٤ەوە تا حەفتاکان، باسی ئەوەمان کردووە کە دەبێ شیعرو چیرۆکی کوردی، لەم سنوورە تەسکەی ئێستای دەربچێت و تابچێتە سنوورێکی بەرفرەوانەوەو فریای خۆی بکەوێت بچێتە ئاستێکی جیهانییەوە، من بە شانازییەوە دەیڵێم، بەرهەمەکانی ئێمە تەجاوزی کلتووری پێش حەفتاکانی کردووەو کۆمەڵێ شیعرو ئەدەبیاتی تازەن لەسەر ئەتڵەسی شیعری کوردی و لە بواری ئەدەبی چیرۆکنووسیدا «جیاوازیەکەش لەوەدایە ئێمە مەنهەجێکمان هەبوو، ئەوانیش گەرچی بەیاننامەیەکیان دەرکردبوو، بەڵام کۆمەڵی وتە بوون تەجاوزی قسەکانی ئێمەیان نەکردبوو بۆ سەلماندنی ئەمەش دەڵێم: روانگەییەکان دووای ئەوەی بەیاننامەکەی خۆیان دەرکرد کە وتیان ئێمە داوای ئەدەبێک دەکەین لەوەی لەتیف هەڵمەت کە لە «خواو شارە بچکۆلانەکەمان» دایە ئەمە وتارێک بوو بەدوو ئەڵقە کە یەکێک لە روانگەییەکان لە ساڵانی ۹۷۰دا لە هاوکاریدا نوسیوویەتی..
**رامان: تۆ دەتوانی باسی کاریگەرێتی بەیانی شیعری ۹٦۹ لەسەر ئێوەو روانگە بکەیت، چ وەک گرووپی کفری و چ وەک روانگەش؟**
**لەتیف هەڵمەت:** مەسەلەی تازەگەری بەنیسبەت ئێمەوە، ناڵێم شتێکمان کردووەو دەسپێشکەرییەکەمان ناوچەییە یان جیهانییە.. ئێمە سوودمان لە گەلێ بەیاننامەی تر «کە پێش خۆمان باسی تازەکردنەوەیان کردووە» وەرگرتووە... لەوانە ـ بەیاننامەی سوریالییەکان .. دادائییەکان ـ بەیاننامەی شیعر ٦۹ی عێراقی کە فازل عەزاوی و سامی مەهدی و فەوزی کەریم و خالید عەلی مستەفا کە بە رەگەز فەلەستینی و لە عێراقدا دەژیا ـ ئەو بابەتانەی کە لە گۆڤاری شیعری ٦۹ ـ دا دەردەچوون، (بەش بە حاڵی خۆم نەک وەک گروپەکەم) دەڵێم ئەو بابەت و بەیاننامانە زۆرکاریان تێ کردم هەر بۆ نموونە هۆنراوەی ـ هنا هو اسمی ـ ئەدۆنیس کە یەکێک بوو لە هۆنراوە مەزنەکانی ئەو سەردەمە کە بەزمانی عەرەبی نووسرابوو تەنانەت ژمارەی پێش **دەرچوونی گۆڤاری ٦۹ ـ پێش دەرچوونی قەسیدەکەی (ئەدۆنیس)** ـ ئیدعای ئەوە دەکا کە بەوە لەسەرجەمی شیعری عەرەبیدا تێدەپەرێت،ئەو قەسیدەیە زۆر کاریگەر بوو لە تەمەنی شیعری مندا، حەزم دەکرد رەخنەگرەکان بتوانن تارمایی ئەو شیعرە لەسەر شیعری **«ئەم کولەکانە ئەشکێنم» و «لە باولێکی کلیل ونبوودا» و «پەیکەرێ بۆ خۆم ئەتاشم» و «هۆنراوەیەکی تازە لە چەند پشکۆیەکی شین»** ئەم کۆمەڵە هۆنراوانەم لەژێر کارتێکەری ئەو قەسیدەیەی ئەدۆنیسدان، چونکە قەسیدەکە زۆر درێژەو شەش تا حەوت لاپەرەی چرووپری گۆڤارەکەی گرتۆتەوەو کاریگەری تەواوی هەبوو لەسەر بیرکردنەوەو هەست و نەستی من دەربارەی شیعر، ئەگەرچی پێش ئەویش - المسرح والمرایا - کەی

ئەدۆنیس خۆی کارێکی تەواوی تێ کردم و هەموو بۆچونە شیعریەکانی گۆڕی بوو، ئەو بەرهەمانەی کە دەمخوێندنەوە برادەرانی تریش دەیانخوێندەوە، بۆ نموونە گۆڤاری شیعر، ٦٩ کە خوێندومەتەوە فەرهاد شاکەلیش خوێندویەتییەوە هەروەها لەتیف حامید و ئەحمەد شاکەلیش خوێندویانەتەوە..

دیوانی ـ **المسرح والمرایا** ـ لە رێگەی **«ئەحمەد شاکەلی»**یەوە لە جەلال زەنگەبادیم وەرگرتبوو کە ئەوسا بەناوی ـ جەلال وەردەوە ـ دەینووسی.. بەڕاستی ـ جەلال وەردە ـ ئەندامێکی نەناسراوی گرووپی کفری بوو، ئەویش هەر لە حەوزی کفریدایە سەر بەناوچەی پالانی نزیک جەلەولایە.. جەلال وردە ـ برادەری نزیکی ـ ئەحمەد شاکەلی ـ بوو، ئەو رۆشنبیرییەی کە جەلال وردە هەیبوو ئێمە لە رێگەی ئەحمەدشاکەلی یەوە زۆر قازانجمان لێ دەکرد، چونکە گەلێ جار ئەحمەد شاکەلی سەرچاوەی لەوەوە بەدەست دەکەوت و ئێمەش دەمانخوێندەوە، ئەمە کاریگەری گۆڤاری شعر ٦٩ بوو لەسەر ئێمە، ئەمما لەسەر برادەرانی روانگە رەنگە من نەتوانم زیاتر روونکردنەوەیان لەسەر بدەم، لەوەدا شێرکۆ بێکەس یان شاعیری بەتوانا -جەلالی میرزا کەریم ـ بەرەحمەت بێ ئەگەر بمایە، ئەو بەچڕوپڕی لەسەر کاریگەری ئەو بەیانە بۆسەر روانگەییەکان قسەی دەکرد، ئەوەندە دەزانم برادەرانی روانگە تا ساڵی ٩٧٤ هیچ کاریگەرییەکی نوێگەری لەسەر شیعرەکانیان نەبوو تەنیا چەند برووسکەو بزیسکەیەک نەبێت، ئەگینا قەسیدەی ـ داڵ ـ ی شێرکۆ بێکەس زۆر هاکەزاییەو شاعیرێکی پلە حەوتیش دەیتوانی بینوسێت، ئەو هۆنراوەیە لە ناوەندی هەشتاکاندا نوسیوویەتی و وەک شێوەو ناوەرۆکیش زۆ لە خوار تریفەی هەڵبەست و کەژاوەی گریانەوەیە، من لە ناوەندی هەفتاکاندا بۆ نموونە **«گۆرانی پاشە رۆژ» یان «بەیاننامەی شاعیرە شێتەکە»**م نووسی کە قەسیدەیەکی پەنجا لاپەڕەییە، تازەترین تەکنیک و فۆرمی شیعریم تیا بەکارهێناوە، هەروەها لەوکاتەدا فەرهاد شاکەلیش «ژێ» و ـ نیگار دەکێشم لەسەر دیواری زیندانەکەم ـ ی چاپ کردووە، تەنانەت ئەو چیرۆکانەی کە برادەرانی روانگە لە هەشتاکاندا نووسییان با بەراورد بکرێت لەگەڵ ـ **ئاژاوەیەو دڵداری ـ و ـ ژووره ئاوییەکانی ـ ئەحمەد شاکەلی** یان لەگەڵ چیرۆکەکانی **لەتیف حامیدی رەحمەتی** ـ کە بە ناوی ـ قولپی رشانەوەی رەش و زەردو سورو سەوز ـ بڵاوی کردونەتەوە.. ئەمانە هەمووی بەڵگەن بۆ جۆرە یاخیبوونێک، بەڵام برادەرانی روانگە گەڕانەوە بۆ دواوە نەک پێ بەپێی پەیامەکە تەنانەت لە ئاستی شیعری خۆشیان هاتنە خوارەوە...

**رامان: تۆ دەڵێی تا ساڵی دوو هەزار شیعر بڵاوناکەمەوە، هۆیەکەی چییە؟ هەندێ دەڵێن لەتیف هەڵمەت پێ دەچێت شیعری تازەی پێ نەمابێت..**

**لەتیف هەڵمەت:** بەرلەوەی بچمە سەر ئەوەی بەرهەمی تازەم هەبێ یان نەبێت، دەمەوێ لە کۆتایی پرسیارەکەوە وەڵام بدەمەوە، هەر ئەمساڵ ٩٩٦ کۆمەڵە هۆنراوەیەکی عەرەبیم بەناونیشانی ـ المدن الحدیدیة ـ کە بریتییە لە چل لاپەڕە بڵاو کردەوە، بە تەحەدداوە دەیڵێم با رەخنەگران ئەو کۆمەڵە هۆنراوەیەم لەگەڵ سەرجەم شیعری عێراقیدا و کوردیشدا بەراوورد بکەن.

ڕەنگە شان بەشانی من هاوڕێی خۆشەویستم ـ **عەبدوللا تاهیر بەرزنجی** ـ دوو دیوانی شیعری بەناوی ـ **الجدار** ـ و ـ **صيد الامواج** ـ لە ١٩٩٥دا بڵاوکردۆتەوە، ئەو دوو دیوانە لەگەڵ دیوانە شیعرییەکەی خۆم تەحەددای شیعری ناوچەکە بە عێراقەوە و تەحەددای شیعری کوردیشی پێ دەکەم، کە ئایا کامیان لە ئاستێکی باشتردایە..

**ڕامان: بە نیسبەت ئەم بەرهەمە عەرەبییەی ئێستاتەوە کە دەڵێی تەحەددای شیعری عەرەبی پێ دەکەم ئەوە شتێکە، بەڵام ئایا تەحەددای شیعری کوردی چۆن پێ دەکەی لە کاتێکدا بونیادی زمانێک لەگەڵ بونیادی زمانێکی تردا زۆر جیاوازە..؟!**

**لەتیف هەڵمەت:** ئەمە بە مەبەستی وەڵامی ئەوانەی کە دەڵێن ـ لەتیف هەڵمەت -ڕەنگە هیچی پێ نەمابێت، بۆیە تا ساڵی دوو هەزار هیچ نانووسێت، ئەم شیعرە عەرەبیانە بۆ زمانی کوردی وەردەگێڕم، ئەوسا بزانن ئەمانە شیعرن یان ئەوانەی کە ئەم شاعیرانە بڵاوی دەکەنەوە کە ئێستە لە مەیدانەکەدا پۆز لێدەدەن و خۆیان بەنوێخواز دەزانن، ئەوەی بەرامبەرم وتراوە کۆڵم پێ نادات، چونکە من بۆ شیعر لەدایک بووم و بۆ شیعریش ئەژیم، هیچ مەسەلەیەکی ترم نییە، لەو بارەیەوە ـ عەباس عەسکەر ـ شتێکی لەسەر نوسیوم و دەڵێت ـ ئەم کوڕە بۆ شیعر لە دایک بووەو بۆ شیعریش دەژی و هەر بە شیعریش دەمرێ ـ ئەوە هەڵسەنگاندنی ئەوە، بە ڕاستی کاتێ دەخەوم و لە خەو رادەپەڕم لە شیعر زیاتر هیچ غەمێکی ترم نییە، ئێستە خەریکی قەسیدەیەکی درێژم «تەبایی و ململانێی نێوان هاوولاتیە ئەلکترۆنیەکانی کۆماری لەتیف هەڵمەت» ئەم قەسیدەیە زۆر بە شانازییەوە دەیڵێم **«گۆڕانکارییەکە چ لە فۆرم و چ ناوەڕۆکدا چ لەسەر ئاستی سەرجەمی شیعری ڕۆژهەڵات ئەگەر گۆڕانکاری نەبێت لەسەر ئاستی سەرجەمی شیعری ڕۆژئاواش، ئەم قسەیەش خودا تەمەن بدا بۆ ساڵی دوو هەزارو زۆر دووریش نییە، دەردەکەوێت کە شتێکم کردووە لە بواری نوێکاریدا ڕەنگە شاعیرێکی تر نەتوانێ بیکات، ئێستە کاری من ئەوەیە هەرچی شیعرێک هەیە لە هەر شوێنێکدا بیخوێنمەوە بۆ ئەوەی نەکومە داوی تەقلیدییەتی ئەو شیعرانەوە،** ئەو سەرە دەزووەش کە دۆزیومەتەوە، لەبواری نوێگەریدا هەموو کرێی ئەو فەرشەی کە ئێستە دروستی دەکەم و لە ئێستەوە رایدەخەم لەبەر پێی ساڵی دوو هەزاردا هەر هەمووی نەخش و نیگارێکی نوێ بێت و تەقلیدی نەبێت.. وەک لە مانگی پێنجی ئەمساڵدا لە کۆڕێکدا کە ـ کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی ـ کەرکووک بۆی سازدام وتم: ڕەنگە بە «دە» دانیشتن ئەو کۆڕە تەواو بکەم و لە هۆڵی میدیا لە هەولێر سازی دەدەم و هاتنیش بە پارەیەو بلیتی لە ١٠٠ دینار کەمتر نییە، گرنگ نییە با دەکەس بێت بەسە، من حەزم لە چەپڵە ڕێزان نییە، حەزم لە راگەیاندن و هەراو زەنای هیچ لایەنێک نییە زۆر بە کپی ئیشی خۆم کردووەو دەیکەم، چوار لەوانەی چێژ لە شیعر وەردەگرن کە دەڵێن ئەم بەرهەمەمان پێ جوانەو تازەیە، ئەوەم پێ خۆشترە لەوەی هەزاران خوێنەر کە لە شیعر نازانن چەپڵەم بۆ لێدەن..

**رامان: ئێوە شان بە شانی شیعر زۆرجار چیرۆک و بەرهەمی منداڵانیشتان بڵاوکردۆتەوە، دیارە تا ئێستە لایەنی شیعرتان ڕۆژێ لە ڕۆژان بیرتان لەوە نەکردۆتەوە لای تۆ چیرۆک نووسین تەنگ بە شیعر هەڵبچنێت..**

**لەتیف هەڵمەت:** شان بە شانی شیعر، چیرۆکیش و بەرهەمی منداڵانیشم نووسیووە، یەکەم چیرۆکم بەناونیشانی «کەی ئێسترەکەی ئاغا ئەزێ» لە ژمارەیەک لە ژمارەکانی ڕۆژنامەی برایەتیدا لە ساڵی ٩٧٠ یان ساڵی ٩٧١ بوو بڵاوم کردەوە، ئەو چیرۆکە وا دەزانم لە یەکێتی نووسەرانی لقی کەرکووکیش لە کۆڕێکدا خوێندمەوە، تا ئێستەش ١٠ ـ ١٢ چیرۆکم بڵاوکردوونەتەوە لەوانە ـ نیو بیتاقە، کورە هات ـ کە کورە هات باسی بۆردومانی فڕۆکەیەک دەکات، کوڕێک و کچێک دڵداری دەکەن، کچەکە دەڵێ تەیارە هات، کوڕەش ئەوەندە شپرزەیە وا دەزانێ دەڵێ: دایکم هات ـ ئەمەش کەش و هەوایەکی کۆمیدیانەیە لەکاتی بۆردوماندا ـ، زەربەی بە هێزی چیرۆکەکە لەوەدایە کە تەیارە خۆی کەش و هەوای تراژیدییە، بەڵام من کەش و هەوایەکی کۆمیدیم دروست کردووە، بۆ نموونە چیرۆکی «داهۆڵ» /الفزاعة ـ کردوومەتە عەرەبی و لە ڕۆژنامەی ـ الجمهورية ـ ی عێراقیدا بڵاوم کردۆتەوە، بەمەرجێ چیرۆکنووسی گەورەی کورد ـ ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل ـ دەیووت : من تەمەننا دەکەم لە ڕۆژنامەی ـ الجمهورية ـ ی عێراقیدا چیرۆکێکم بۆ بڵاوبێتەوە، ناردیشی کەچی هەر بۆیان بڵاونەکردەوە، دەیووت تەمەننام دەکرد لە پۆستەی خوێنەرانیشدا بڵاوببێتەوە.. من ناردم لە لاپەڕەی ڕۆشنبیری دا بڵاویان کردەوە، زۆرم پێ خۆش بوو..

وابزانم تا ئێستە کەم چیرۆکنووسی کورد لە سەرچاوەیەکی وەک ڕۆژنامەی ـ جمهورية ـ ی عێراقیدا چیرۆکی بڵاوبووبێتەوە، چیرۆکەکانم لە ئاستێکدایە دەتوانم بڵێم شانازییان پێوە دەکەم..

وەک خۆتان دەڵێن بابەتی منداڵانیش دەنووسم، حەزدەکەم بابەتەکانم بەراورد بکەن لەگەڵ بابەتی کەسانی تردا، ئەوسا دەزانن کە لە چ ئاستێکدایە چ وەک ناوەڕۆک و چ وەک و فۆرمیش خزمەتی منداڵی کورد بکات..

**«ئای لەم بەفرەی باریوە»**
**«دار بە ڕوو توندو تۆڵە**
**ڕەگی لە ناخی خۆڵە».**

وا بزانم ئەم دوو قەسیدەیەم ڕۆژێ لە ڕۆژان لەسەر زاری هەمنوو منداڵانی کوردا وتراوەتەوە، ئەم دیاردەی فرەچەشن شت نووسینە دیاردەیەکی تازە نییە، لە جیهاندا شتی وا زۆرە، تاغور چیرۆکیشی نووسیووەو شانۆیی و شیعریشی نوسیووەو حەزی لە مۆسیقاش بووە.. بیکاسۆ وا دەزانم بە سیناریۆو ڕەسمیشەوە خەریک بووەو ئارەزووی شیعریشی هەبووە، سلڤادۆر دالیش سیناریۆی هەیە، بۆ نموونە ماوتسی تونگ ـ سەرکردەیەکی سیاسییەو شیعریشی نووسیووە، ـهۆشی منە ـ هەروەها، ئەمەش غەریب نییە، بێجگە لە مانە من لەبواری وەرگێڕانیشدا

سەدان دەقم لە عەرەبییەوە کردووە بە کوردی و بەپێچەوانەشەوە، هەروەها هەمو ی ڕۆژنامەنووسیشم هەیەو دەتوانم بڵێم لەبواری ڕۆژنامەنوسیدا خۆم ڕۆژنامەنووسیشم.

**ڕامان: لەوتەیەکدا شێرکۆ بێکەس وتویەتی: لەتیف هەڵمەت ـ شاعیرێکی خۆڕسکە، واتا وەک درەختێ پەل و پۆ دەهاوێ و بژاری شیعرەکان ناکات.. مەبەستی ئەوەیە پەل و پۆکان لقی زیادەی لێ ناقرتێنێ، لەم دووایییەشدا لە دیانەیەکی تەلەفزیۆنیدا وتی: لەتیف هەڵمەت جاران کانییەک بوو هەڵدەقوڵا ـ بە مانای لە ڕابوردوودا ـ وەک ئەوەی ئێستە ئەو گڕوتینەی جارانت نەمابێت..؟!**

**لەتیف هەڵمەت:** ڕەنگە ئەم قسەیە بەسەر شێرکۆ بێکەس ـ خۆیدا بسەپێت، چونکە شێرکۆ بێکەس لە هۆنراوەی ـ **داڵ** ـ ەوە هەر ئەو هۆنراوەیە سفرە تا ئێستە شێرکۆ بێکەس قەسیدەیەکی گەورەی نەنووسیووە، لە هۆنراوەی داڵەوە گەڕاوەتەوە بۆ دوواوە، مانای گەلێ دواکەوتووە چ لە فۆرم و چ لە ناوەڕۆکیشدا دەتوانم بڵێم کەژاوەی گریان و تریفەی هەڵبەستی لە هۆنراوەی داڵی بەهێزترە، چونکە ـ **دەربەندی پەپولەکەشی** ـ هەر کەش و هەوای هەمان کەژاوەی گریان و تریفەی هەڵبەستە بە لێکدراوی و کاریگەری قەسیدەی ـ **کۆچیشی** ـ هەر بە سەرەوەیە ئنجا هاتووە دۆبلاژو مۆنتاژو گەمەیەکی تیا کردووەو قەسیدەیەکی درێژی لێ پێک هێناوە، بەدەیان مەلاحیمی شیعری بەهەموو زمانەکان هەیە ڕەنگە کەس هەر نەیخوێنێتەوە، جاری واهەیە دوو دێرە شیعر لە مەلحەمەیەکی شیعری دوورو **درێژ مەزنترە، من شێرکۆ بێکەس لەبەهای شیعری تەجرید ناکەم هەر بۆ نموونە ـ ئاوێنە بچکۆلەکان** ـ دیوانێکی زۆر گەورەیە لە ئاستی شیعری کوردیدا، هەروەها کۆمەڵە هۆنراوەی ـ **کازیوە** ـ گەورەن لەسەر نەخشەی شیعری کوردیدا، بەهایەکی گەورەیان هەیە لەسەر نەخشەی شیعری نوێ دا هەیە ئەم دوو دیوانەی لە دواییدا ناوم هێنان جێی دیاری خۆیان هەیە و شێرکۆش وەک و هەموو شاعیرێکی تر چووەتە دواوەو دێتە پێشەوەو دچێتەوە دواوەو لەو شیعرەدا سەردەکەوێ و لە میاندا پاش دەکەوێ، بەڵام وەڵڵاهیی هۆنراوەی ـ **داڵ** ـ شیعری شاعیرێکی دەرەجە هەشتایە نەک هەشت، هەر کەسێ ئەلف بای شیعر بزانێ دەتوانێ ئەو شیعرە بنووسێت، هەروەها گەلێ هۆنراوەی تر کە لەم دواییەدا شێرکۆ بێکەس لە ـ وڵات ـ دا بلاوی کردەوە، ئەمانە شیعرنین، ئەمانە گەڕانەوەیە بۆ ئسلوبی پەنجاکان چ ئسلوبی کامەران موکری یا دیلان و پێشتریش.

**ڕامان: لێرەدا پرسیاێک دێتە پێشەوە، بەڕێزت لە چاوپێکەوتنێکدا گوتوتە: کە پرچی ئەو کچە ڕەشماڵی گەرمیان و کێستانمە، لەوێوە شۆڕشی دەنگی خۆت بەرپا کردووە، ئایا لێرەدا غەدرێ لە بەرهەمەکانی پێشووت وەک ـ خواو شارە بچکۆلەکەمان ـ ناکەیت؟!**

**لەتیف هەڵمەت:** بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارەت، من باسی شیعری بەرگریت بۆ دەکەم، وا دەزانم یان تۆفیق زیادە یان جەبران سالمە ـ دەڵێ: ئەگەر وڵاتەکەت کەوتە مەترسییەوە هەموو شەهادات و بەهای هونەری بۆ ئاودەستخانە

**«للمــراحــيض»**، من وا نالێم بەڵکو دەڵێم ئەو ماوەیەی کە ـ خواو شارە بچکۆلانەکە ـ م تیا نووسی، ماوەیەکی زۆر دیاربوو لە مێژووی شیعری کوردیدا .. لە ـ خواو شارە بچکۆلانەکەمانەوە ـ تا المدن الحدیدیە ـ یەک ڕێچکەی شیعریم گرتووە، بۆچی من لە پرچی ئەو کچەدا هەمان ڕێچکەی پێشووترم نەگرتووە، ئەی لە وشەی جوان و گوڵە گوڵ کە دیوانێکی زیاتر لە دوو سەد لاپەڕەیە بۆچی ڕێچکەی خواو شارە بچکۆلانەکەم نەگرتووە؟! ئەی بۆچی ـ قەسیدەی ـ گۆرانی پاشــە ڕۆژ ـ یان ـ **بەیاننامەی شاعیرە شێتەکە** ـ تەجاوزی خواو شارە بچکۆلەکەشمان نییە، هەروەها لە قەسیدەی **«ساڵنامەی سەدەی بیستەم»** کە لە دوو شوێندا بڵاوم کردۆتەوە چ لە ژمارەیەکی نووسەری کورد و چ لە دیوانی **«ئەم ڕووبارە وشک ناکات»**.. ئەو دوو قەسیدەیە گەورەن و غەدریان لێ کراوە لەسەرو بەری هەموو ڕەخنەی کوردیدا ـ قەسیدەیەکی تریشم هەیە ـ کۆمیدیای خەوە قورسەکان ـ هەروەها وەک لەبیرمە بێ ساڵی ٩٩٥ دیوانە شیعرێکم بەناونیشانی گورگەکانی لەتیف هەڵمەت بڵاوکردۆتەوە، لەوێدا هەموو بەرهەمەکانی تا ٩٩٣هەرچیم نووسیوە خستومنەتە ئەو دیوانەوە، من لە ساڵی ٩٩٣وە تا ساڵی ٢٠٠٠ ... هیچ بڵاوناکەمەوە.

**ڕامان: ئەی «المدن الحدیدیە» چییە؟**

**لەتیف هەڵمەت:** ئەوە بە عەرەبییە .. دێمەوە سەر ـ **کۆمیدیای خەوە قورسەکان** ـ کە پێنج لاپەڕەی دیوانی شیعری ناو دووتوێی ـ **گورگەکانە** ـ برادەرێکم بەناوی ـ **محێدین مەحموود** ـ وەریگێڕایە سەر زمانی عەرەبی و لە ڕۆژنامەی عێراقی عەرەبیدا بڵاوبۆوە، هەروەها برادەرێکی عەرەب کە یەکێکە لە پێشکەوتوخوازەکان لەبواری چیرۆکداو بەرپرسیاری لاپەڕەی ڕۆشنبیری ڕۆژنامەی ـ الجمهوریة ـ یە نایناسم و نامناسێت، کەچی لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر قەسیدەکەم نووسیوە، کورتەی لێکۆڵینەوەکەی یەک دێڕی دەڵێم کە ئەو دەڵێ: ئەمە تەجاوزی شیعری عێراقییە و بەکورتیش دەڵێ ـ یجب ان ننحني امام کلمات هذة القصیدة ـ من شانازی بەرای ئەو برادەرەوە دەکەم، ئەم ڕایە بەرپەرچدانەوەی هەموو ئەو ناحەزانەمە کە قسەو قسەڵۆک بە شیعرەکانمەوە دەکەن.

**ڕامان: بێگومان تۆ لە هەموو بەرهەمەکانی خۆت ڕازی نیت و هەمووشیان لە ئاستێکدا نین، ئایا کە شیعرێک دەنووسیت چەند جارێک پیایدا دەچیتەوە یان بڕوات بە پێداچوونەوە نییە؟**

**لەتیف هەڵمەت:** باوەڕت بێت شیعرم هەیە دەجار پیادەچمەوەو دووای ئەوەش بە دڵم نییە و دەیدڕم.. ئەو برادەرەی دەڵێ ـ لەتیف هەڵمەت ـ بەشیعری خۆیدا ناچێتەوە ڕێنماییم بۆیان ئەوەیە بەشیعری خۆیاندا بچنەوە .. کوڕە وەڵاهی من بە شیعری خۆما دەچمەوە بەڵام ئەوان ناچنەوە.. قەسیدەشم بۆ هاتووە، ڕەنگە دەستکاری زۆر کەمم کردبێت لە هەڵچوونێکی کاتییەوە بۆم هاتووەو بەکەمی دەستکاریم کردبێت.. بە هۆنراوەیەکی سەرکەوتووشی دەزانم..

**رامان: گومانی تیادانییه ـ زۆر له گەنجەکان کاریگەری شیعری تۆیان پێوەیە، بەڵام بەگشتی دەڵێن تۆ له بەرامبەر گەنجەکان دڵت رەقەو ددانی خێریان پیانانێی؟!**

**لەتیف هەڵمەت:** من بەم چاوە کزەی خۆمەوە، هەندێ جار بە چاویلکەش ئەگەر خەتەکە وردبێت بۆم ناخوێندرێنەوە، دەتوانم بڵێم لە ساڵێکدا ١٠ ـ ١٥ کۆمەڵە هۆنراوەی گەنجەکان بەدەستنوسی دەخوێنمەوە، بە دڵی خۆشەوە بۆیان هێناوم و بەدڵی خۆشەوە تێبینی خۆم لەسەریان نووسیوەو گەلێ جاریش پێیان خۆشە..

**رامان: تا چەند لەو گەنجانە رازیت؟**

**لەتیف هەڵمەت:** گەلێ گەنج هەن لە شیعریان رازیم، تەنها لەو گەنجانە دووردەکەومەوە کەلاسایی خۆم دەکەنەوەو دەیانەوێ شتە کۆنەکانی خۆم بەناوی تازە بەمن بفرۆشنەوە.. جارێکیان گەنجێک پێی وتم: تۆ شیعری ئەدۆنیست خوێندۆتەوە.. کاکە گیان من لە ساڵی ٩٦٩ دا شیعری ئەدۆنیسم خوێندۆتەوە، هەرچی روادی شیعری نوێی عەرەبییە بێجگە لە دادائی و سوریالی و **«اربعاء الرماد»** ی ـ ئەلیوت و **«ارض اليباب»**ەکەی و (دوامة في سروالي) مایکۆفسکی و شیعرەکانی بۆدلێر و مالارمیە، ئەمانەم لەشەستەکاندا خوێندۆتەوە، ئەمەکەی رەوایە گەنجێکی تەمەن هەژدە ساڵ پێم بڵێ ـ تۆ شیعری ـ **ازهار الشر** ـــ ی بۆدلێرت خوێندۆتەوە، ئەوانەم لە شەستەکاندا خوێندۆتەوە، ئەم برایە لەوانەیە عەرەبییەکەشی باش نەبێت و بەسەرو گوێلاک شکاوییەوە پێی کاریگەر بێت، ئەوبێ ئەوە بە من بفرۆشێتەوە!؟

**رامان: لە شیعردا باسی قۆناغەکان، دەکرێت، خۆ قۆناغ پەنیر نییە تۆ بێی قاشی بکەیت مانای قۆناغەکان بەستراوون بەیەکەوە، ئەی بەلای تۆوە گرێ دراون یان لێک پچڕاوون..؟!**

**لەتیف هەڵمەت:** زۆر ئاساییە لەناو قۆناغێکدا یەکێکی تر دروست دەبێت، بۆ نموونە دەنگی گرووپی کفری هەر لە خواو شارە بچکۆلەکەمان تا دوا دوای دیوانەکانم کە بە فۆتۆکۆپی بەناوی ـ **گورکەکانی لەتیف هەڵمەت** ـ چاپم کردووە .. دەنگێکی تایبەتن بەخۆمەوە و دەیان کەسیش پێیان وتووم، یەکێ لەو شاعیرانەش کە زۆر ناسراون راوبۆچوونی وایە کە قوبادی جەلی زادەیە لە بەرامبەر پێی وتم کە هەریەکێ لەم گەنجانە گەر بڵێن کاریگەری لەتیف هەڵمەتم پێوە نییە راست ناکات، کارتێکردن قەیدی نییە، من خۆم لەژێر کارتێکەری بەدر شاکر سەیاب و ئەدۆنیس و خەلیل حاوی و ئیلیۆت و بۆدلێر و دەیان شاعیری ترم، پۆل ڤالێری دەڵێ ـ شێر بریتییە لەو مەرو بەرخانەی دەیخوات، نووسەریش بریتییە لەو بەرهەمانەی کە بەچاوو مێشک لووشی دەدا ـ من بۆیە دەخوێنمەوە تا سوود وەربگرم، ئەلیۆتیش دەڵێت: شاعیری گەورە ئەو شاعیرەیە کە دەنگە رەسەنەکانی پێش خۆی لە شیعرەکانیا رەنگ و دەنگ بداتەوە..

**رامان: تۆ هەموو شاعیرەکان وەک یەک سەیر دەکەیت؟**

**لەتیف هەڵمەت:** نا.. دووای گرووپی کفری گرووپی تەلیعییەکان هاتەکایەوە،

برادەرانی هەولێریش هەر لە **ئەحمەدی مەلا و ئەنوەر مەسیفی و عەباس عەبدوللا یوسف و هەروەها محەمەد عومەر عوسمان** دنیایەکی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ نموونە ژەنەڕاڵی پاییزی محەمەد عومەر عوسمان قەسیدەیەکە دەتوانی بڵێی نموونەو هاوتای نییە، بەلاّم ئەمەیش مانای ئەوە نییە بلّێی لەو قەسیدەیە گەورەتر نییە، ئێستە خواو شارە بچکۆلەکەمان ـ دەستپێشکەری تیایە بەلاّم ئێستە هاوتای بۆ پەیدا بووە، ژەنەڕاڵی پاییزەکەی محەمەد عومەریش لە زروفێکی تردا نووسراوە هەروەها ـ زەرتکی ـ ئەحمەدی مەلا کۆمەڵێ هۆنراوەی زۆر سەرکەوتووە، بەلاّم دەتوانم بلّێم زەرتک ـ دەنگی منی تیایە ـ رەنگە ئەحمەدی مەلا ئێستە تەجاوزی ئەو دەنگەمی کردبێت، بەلاّم من نالّێم سەرکەوتووە یان سەرنەکەوتووە لەوتەجاوزەدا .. دەیلێمەوە گرووپی کفری رێچکەی شکاند گەلێ کەسیش شایەدی بۆمان دەدەن، بۆ نموونە حوسێن عارف لە وتارێکیدا بە عەرەبی نوسیویەتی لە گۆڤاری ـ اقلام ـ دا بلاّوی کردەوە هێمایەک دەدا، بەلاّم ناوی ئێمە ناهێنێت، وەک ئەوەی دەستی خستبێتە سەر بەرهەمەکانی ئێمە بۆ دەستنیشان کردنیان.. جگە لەوەش دەنگی تر هەن و هیچ بەشیعری کوردی نابەخشن، چونکە دەنگەکان لاسایی شیعری ئەوروپی دەکەنەوە، گەورو گیپاڵی شیعری ـ **البرکات ـ والیوت ـ و ئەدۆنیس** و شیعری نوێی ئەورووپا و تا شیعرەکانی سوهراب و ئەحمەدی شامیلۆش دەردێنن و دێن وەک خۆی بۆ سەر نەخشەی شیعری کوردی دەیگوازنەوە، ئەمە مردوو دزینەو دەق نووسین نییە، لە وتارێکیشدا لە رۆژنامەی برایەتی دا ئاماژەم بەوە کرد ـ مردوو دزین یان نوێکاری ـ، لەمەدا نوێخوازی جیاوازە لەوەی تۆ دەقێکی شیعری زمانێکی تر بهێنێت و نەقڵی سەر زمانی کوردی بکەیت، بۆ نموونە لە ژەنەڕاڵی پاییزدا ئەو دەقە مردووە بەدی ناکەیت..

**رامان: کەلەپوور چۆن لە گروپی شیعری کفری دا رەنگی داوەتەوە؟**

**لەتیف هەڵمەت:** هەموو ئەو دیوانانەی کە خوالێخۆشبوان ـ گیو موکریانی حوزنی موکریانی لە چاپخانەی خۆیان بە چاپیان گەیاندبوو ـ دیوانەکانی نالی .. صافی .. وەفایی .. دلّدار .. مەلا محەمەدی کۆیی.. هەتا فڕی فڕی قەل فڕی و دیوانی حاجی قادری کۆیی .. هتد .. ئەمانەمان دەخوێندەوەو رەفزیشمان دەکردن.. رەفزی ئێمە بەدیراسەوە بوو کە دەبوو تەجاوزیان بکەین، لە راستیشدا توانیمان تەجاوزی ئەو بارودۆخە بکەین من لە خواو شارە بچکۆلەکەماندا دەڵێم ـ لقی هەتاو ـ کە تەعبیرەو لە سەرانسەری شیعری کوردی پێش مندا نییە، کە دەڵێم (رستەی کەفاوی) تەجاوری هەرچی تەعبیری پێش خۆمە کردوومە، بەلاّم ئێمە چاومان بەخۆماندا خشاندەوە، بۆ نموونە قەسیدەی ـ ئامۆزاگیان ـ بە شێوەی فۆلکلۆر دامرشتۆتەوە ، هەروەها لە خۆزگەی شەوانی بارانا ـ ئەوەش قەسیدەیەکە کەش و هەوای فۆلکلۆری تیایە.. مامەڵەم لەگەڵ دارو بەردو شوانکارەو دلّداری لەگەڵ باران و شتی وادا کردووەو سوودم لە فۆلکلۆر بینیووە هەروەها رەمزی دینیشم بەکارهێناوەو وەک ـ تناص ـ بۆی چووم یان وەک رەمزو ئەفسانە بەکارم هێناوە، یەکەم جار کە قەسیدەی درێژ نووسراوە پێش من کەسی تر نەینووسیەوە

قەسیدەکانم دەتوانرێ بکرێن بەشانۆیەک، گۆرانی پاشە ڕۆژ درێژترین قەسیدەی کوردییە کە تا نەوەدەکان کەس نەینووسیووە لە پەنجا لاپەڕەی قەوارە گەورەدا بلاوم کردۆتەوە..

**ڕامان: ڕات چییە بەرامبەر خەلاتە جیهانیەکان کە بۆ شیعر دادەنرێن؟!**

**لەتیف هەڵمەت:** تەنانەت بڕوام بە خەلاتی نۆبلیش نییە، چونکە دەستی ماسیۆنیەت و زانیۆنیەت و ئیمپریالیزمی جیهانی بە سەردەوەیە، بۆ نموونە نەجیب مەحفوز تا ڕێکەوتننامەی کامب دیڤید مۆرنەکراو نەجیب تەئیدی نەکرد خەلاتەکەی وەرنەگرت، ئەدۆنیس ئێستە هەڵبژێردراوە بۆ وەرگرتنی ئەو خەلاتە کاتێ لە چەمکە نەتەوەییەکانی خۆی پەشیمان بۆتەوەو باسی برایەتی عەرەب و زایۆنیزمی دەکات ئەوسا خراوەتە بازنەی هەڵبژاردنەوە، بەمانای ئەدۆنیس پشتگیری چارەیەکی پینەو پەڕۆیانە دەکا بۆ کێشەی عەرەب لە فەلەستین، هەر لەسەر ئەم بیروبۆچونانەشی بوو کە لە ئۆردوگایەکی ئوردندا بەر تەماتەی پیس دران، لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم ئەدۆنیس گەورەترین شاعیری عەرەبە و شایەنی خەلاتی نۆبلە، ڕەنگە ئەدۆنیس لە ئەلیوت و ئەحمەدی شاملۆش گەورەتر بێت..

خەلات پێوەندی بە بەهرەوە نییە، ئێستە هەمەنگوای لەسەر پیرەمێردی زەریا خەلاتی نۆبلی وەرگرتووە، نازانم ئەو ڕووداوە کە بە قوولی تێ هەڵنەچووە کەچی خەلاتی نۆبلی وەرگرتووە..

پالەوانی ڕۆمانەکەی ـ **مستەفا سەعید** ـ م قەد لەیاد ناچێتەوە، نازانم بۆ ئەو خەلاتە بەو نەدراوە.. کەواتە نارێکی هەیە لەو بەخشینەدا.. منیش قەد چاوەڕێی خەلاتێک ناکەم.. خەلاتی من خوێنەری میللەتەکەمە کە بمخوێنێتەوە، خەلاتی من ئەوەیە باشترین بەرهەمی شیعری کوردی بنووسم و تەحەددای شیعری جیهانی پێ بکەم.. لەبەر ئەوە چاوەڕوانی خەلاتی نۆبل ناکەم، شانازیش بەوەوە دەکەم ئەوەندەی بە کوردی و عەرەبی و فارسی و ئینگلیزی و سویدی و تورکی و هۆڵەندی لەسەر من نووسراوە، ڕەنگە لەسەر هیچ شاعیرێکی تر نەنوسرابێ،..

**ڕامان: هەندێ کەس لە ڕەخنەگرتنا وەزیفەی سیاسەت و ئەدەب تێکەڵاو دەکەن. بۆ نموونە شاعیرێک تاوانبار دەکەن بە ڕەشبینی کە زیاتر ئەمە زمانی سیاسەتە یان داوای چارەسەر لە شاعیرێک دەکەن تۆچی دەڵێی؟!**

**لەتیف هەڵمەت:** شاعیر دکتۆر نییە نەخۆش بپشکنێ و دەرمانی بۆ بنوسێ، شیعر خۆی لە خۆیدا بابەتیکی زاتییە، هەر شاعیرێ نەتوانێ زاتی خۆی بدۆزێتەرە، ناتوانێ لە گەردوونیشدا خۆی بدۆزێتەوە، هەموو دۆزینەوە گەورەکانی شیعر لە دۆزینەوەی زاتەوە دەست پێ دەکات..

فەرموودەیەکی پێغەمبەر هەیە ـ دروودی خوای لەسەر بێ ـ لە دووای شەڕی بەدر دەفەرموێ: لە غەزای بچووکەوە بۆ غەزای گەورە ڕۆژوو گرتنەکەمانە بێگومان ڕۆژو و شتێکی زاتییە، منیش دەڵێم غەزای گەورە ئەوە نییە ئێمە بتوانین باسێ لەسەر دێیەکی سووتاو یان دارستانێکی سووتاو بنووسین . غەزای گەورەی شیعر ئەوەیە دەروونی خۆمان بدۆزینەوەو لەوێوە پەیژە بەرز بکەینەوە بۆ کەلێنەکانی تری

گەردوون..

**رامان: لەم بارودۆخەدا وەک شاعیر چ موعاناتێکتان هەیە؟!**

**لەتیف هەڵمەت:** وڵاتی ئێمە لبنان نییە، ئەفغانستان نییە، ئەوان دەوڵەتن ئەگەر شەڕیشیان تیا بێ رەنگە شتێکی ئاسایی بێت، بەڵام دەڵێم لەگەڵ ئەم بارودۆخە نالەبارەشدا، شیعرو چیرۆک و هونەری کوردی زیندوون، گەلێ دەقی ئەفغانی دەخوێنمەوە یان هی ئەفریقایی تەنانەت دەقی سیداد سەنبور ـ شاعیرێکی گەورەی ئەفریقیایە، کە شیعرەکانی دەخوێنمەوە لەچاو شیعری کوردیدا زۆر بچووک دێتە پێش چاووم ، کورد ئەگەرچی تا ئێستە ژێر پێ بووە، ئەگەرچی لەهەر چوارلاوە زەبرو زەنگی لێکراوە، شیعری کوردی لەم کوردستانەدا کە بەزۆر یان بە یاسایەکی پووچەڵ لکێنراوە بە عێراقەوە لە ئاستی شیعری عەرەبی عێراقی کەمتر نییە، لە شیعری دەوروبەریش باشترە، ئەگەرچی کاریگەری دەوروبەری هەیە، بەڵام بازی گەورەی داوەو لە دەوروبەریش گەورەترە، زۆر ئاساییە شیعری میللەتێکی تر بخوێین لە هی ئەو میللەتە گەورەتر بنووسین، شتی ورد دەخوێین لە زەمەنێکی دیاریکراودا لەشمان گەورە دەبێت، دەبێ هەمەجۆر بخوێین بە بەرهەمی وڵاتانی دەوروبەرەوە، سەرچاوەکانمان لە دەرەوەیەو لە دەرەوە دەخوێنەوە، بەڵام توانیومانە گەلێ شت بنووسین لەوانەی دەرەوە بەهێزتر بن.

**رامان: دووا وتەت**

**لەتیف هەڵمەت:** شت رەنگە زۆربن، بەڵام ئەوە دەڵێم نووسەر.. هونەرمەند.. شاعیر.. نابێ لایەنگری هیچ لایەک بێ، چونکە کە چووە لای هەر لایەنێک و شیعاراتی ئەو لایەنەی کرد بە هێماو ناوەڕۆک بۆ شیعرەکانی ئەوا لە ئێستەوە دەڵێم ئەو شاعیرە یان ئەو هونەرمەندە هەر هیچی پێ نامێنێ، تەنها خزمەتی شیعرە ئایدیاکانی ئەو لایەنە دەکات، هەر بۆ نموونە بمانەوێ ئەدەبێکی مارکسی بنووسین، یا گەر بیانەوێ ـ یا عمال العالم اتحدو ـ کە شیعارێکە بخەینە ناو شیعرەوە ـ وەک وەقانیع کە دەڵی «ئەی پاڵەو کرێکار یەکگرن» ئەگەر بێی ئەم شیعاراتانە بکەیت بە شیعر لەنگییە، بەڵام یەکێکی وەک و رەسووڵ هەمزاتۆف لە وڵاتێکی مارکسیدا ژیاوەو بیروباوەڕی مارکسیانەشی هەبووە، بەڵام داغستانی منی نووسیوە، ئەو هەشتینە جوان جوانانەی نووسیوە، یان جەنگیز ئیتماتۆف «عودە الغرانیق» و «الکلب الابلق»ی نووسیوە کە ئەمانە تا هەتایە دەقی گەلێک نەمرن و هیچ کاریگەری ئەو ئایدیایەیان بە سەرەوە نییە، من خۆم پاراستووە لەو جۆرە شیعرانەو شانازیش بەوەوە دەکەم دەقەکانم تارمایی هیچ ئایدیایەکی پێوە نییە.

**سازدانی گفتوگۆ:**

**محەمەد عومەر عوسمان**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:**

# ئەو بڕوانامەی وەردەگیرێن زۆربەیان مەرجی ڕەسەنایەتی و زانستیان تێیدا نییە

*خامەیەکی بە بڕشت و ژیانێکی پڕ لە بەخشش*

*مامۆستا زوبێر بیلال لەو مامۆستایانە نییە و نەبووە، کە دوای ئەوەی- بە هەر جۆرێک بێ!- بڕوانامەیەک جا چ (بەکالۆریوس- ماجستێر- دکتۆرا) بێ بخەنە تەنکەی باخەڵیانەوە، یا لە نێو ماڵیاندا لە چوارچێوەیەکی زیوین و ڕازاوەی بگرن و بەسەر دیوارا شۆڕی بکەنەوەو ئیتر نە دەنگ و سەنگ و ڕەنگ و نە بەخشش و داهێنان ماندووبوون و خزمەتکردنی نەتەوە، نا بەڵکو خەوخۆراک و رابواردن و پاڵدانەوەو (حەقم چییە!) دەبێ بە دروشمی ڕۆژانەو بگرە شەوانەشیان..!*

*ئەم مامۆستا خاکەڕاو بەڕێزە، گوڵی تەمەنی لاویەتی خۆی لە نێو کتێب و نووسین و بەرهەمی بەپێزدا- تا ڕۆژی ئەمڕۆشی لەگەڵدابێ- هەر بەردەوامەو وەک کوردێکی نیشتمانپەروەریش، لە ڕادەبەدەر هەست بە لێپرسینەوەی مێژوویی دەکات.. هەر ئەم خامە بە بڕشت و هەر ئەو ژیانە تێروتەسەلەش وای لێکردین، میوانی ئەمجارەی (ڕامان) و ئێوەی خوێنەرانی ئازیزیش، ئەم نووسەرە باڵادەستە بێ.. بۆ ئەمەیش (٣٥) پرسیاری جیاجیامان خستە بەر دەستی، کە لە ئەنجاما ئەم وتووێژەی لێ ڕسکا..!*

**ڕامان: ئایا هیچ قوتابخانەیەکی مێژوویی کوردی هەیە؟ ئەگەر نییە، بۆ؟!**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** نەبوون و هەژاری ئێمەی کورد بۆ دیکۆمەنت و تۆماری کۆنی مێژوویی، چ لە بواری شیعردابێ یا پەخشان، دەورێکی سلبیانەی لەسەر زمان و مێژووی کوردی نواندووە، کەچی لەلای دراوسێی وەک فارسەکاندا، گەلێ تۆماری مێژوویی و کتێبی مێژوویی بە زمانەکەیان و لە چاخی ناوەڕاستا دەبینین، وەک (شانامە) و (تأريخ ملوك الفرس)ی محەمەدی کوڕی جەهەمی بەرمەکی و (تأريخ ملوك ساسان)ی بەهرامی کوڕی مەردان شاو (سير الملوك)ی بەهرامی ئیسفەهانی.

(شانامە)کەی شاعیر تووسی (فیردەوسی) کە لە ساڵی (٩٩٠ز) دا نووسراوەتەوە، داستانێکی نەمرەو لە نێو سیستەمی شیعردا هەموو یادگارە

مەحموود زامدار- زبێر بیلال - ئازاد عەبدولواحید

ئەفسانەیی و مێژوویییەکانی فارسەکانی تێدایە.. ئا ئەم بەرهەمانە بنەمای قوتابخانەیەکی مێژوویی بۆ فارس بنیاد ناوە.

کتێبی (شەرەفنامە)ی شەرەفخانی بەدلیسی کە لە ساڵی (١٦٠٣ز)دا مردووەو بە زمانی فارسیشە نەک کوردی، (٦٠٠) ساڵ دوای (شانامە) نووسراوەتەوە(١٥٩٧-١٥٩٩ز) لە بارەی دەوڵەت و میرنشینە کوردییەکانی چاخی ناوەڕاست و تا کۆتایی سەدەی شانزەهەمی زایین نووسراوەتەوە و باسی ژیاننامەی شاو سوڵتان و میرو دەسەڵاتدارە سەربەخۆو ناسەربەخۆکان دەکا. بە راستی ئەم کتێبە چاکترین ژێدەرێکە بۆ مێژووی ئەو سەروبەندانە.. هەر هەموو ئەو مێژوونووسانەی کە دوای (شەرەفخان) هاتوون وەک (کاتب چەلەبی و ئەولیا چەلەبی) و کەسانی دیکەش سوودیان لەو ژێدەرە وەرگرتووە، ئەم کتێبە کۆن و نوێیە بە نرخ و گشتگرە، تا رۆژی ئەمڕۆمان لەبارەی بابەتەکانییەوە، چ لە رووی ئەو زانیارییە مشەیەو چ لە بارەی تێکڕایی باسوخواسەکان، شتێکی وا نەنووسراوەتەوە. بۆیە شەرەفخان لەم کتێبە مێژووییەی کە دەربارەی کوردە، تاکە سوارو رابەری ئەم مەیدانەیە.. هەر ئەو شەرەفنامەیەش لە لایەن (مەلا مەحموودی بایەزیدییەوە ساڵی ١٨٠٨ز) وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردییەوە، لە پاشانیش هەر ئەو مەلا مەحموودە ویستویەتی لاسایی شەرەفخان بکاتەوەو رێگەی ئەویش بگرێتەبەر، ئەوەبوو لە ساڵی (١٨٥٧-١٨٥٨ز)دا کتێبێکی خۆی لە ژێر سەردێڕی (تأریخ کردستان الجدید) لە (١٠٠٠) لاپەڕە نووسیوە، دەشکرێ ئەم دوو کتێبە بەسەرەتایەکی چاکی قوتابخانەی مێژوویی کورد دابنێیت. لە دوای نزیکەی دوو سەدەیش (محەمەد ئەمین زەکی) هاتووە و کتێبێکی بە ناوی (تأریخی کوردو کوردستان) بە شێوەیەکی زانستانە نووسیوەو پشتیشی بە گەلێ ژێدەری جیاجیای ئیسلامی و هەروا لێکۆڵینەوەی رۆژهەڵاتناسەکان بەستووە.. لە پاڵ ئەمەشدا کتێبخانەی مێژوویی کوردی زۆر خاکەڕایەو دیکۆمەنتی مێژوویی و بە زمانی کوردی زۆر زۆر کەمی تێدایە.. واتە: تا رۆژی ئەمڕۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی کورد هەروا لاواز بووە و تا ئێستەش کێڵگەیەکەو نەکێلراوە و

پێداویستیەکی زۆری بە هەوڵ و کۆششی پسپۆران هەیە، بەڵام وەک دیارە ئەم مەسەلەیە گەلێ کۆسپ و تەگەرەی لە بەردەمدایە، چ خۆیی و چ مەوزووعی، بەڵام ناشێ ئەرکی پڕ لەبەری ئەم تاکە کەسانەش لەم کێڵگەیەدا فەرامۆش بکرێ وەک هەوڵەکانی (علاءالدین سەجادی) رەحمەتی و مامۆستا مەلا جەمیلی رۆژبەیانی و دکتۆر کەمال مەزهەر..! لەم بوارەشدا دکتۆر مەزهەر یەکێکە لە رابەرانی لێتۆژینەوەی مێژوویی هاوچەرخی کوردەوە، نووسینەکانیشی

## ئەوەی مێژوونووسی کورد نەینووسیوە مێژووی کورد نانوێنێ

خاسیەت و ئەدگاری رەسەنایەتی و مەوزووعیەتی تێدایە، کە ئەمەیان:

دوو مەرجی سەرەکن لە نووسینەوەی ئەکادیمیانەی مێژوودا. هەروا دەکرێ ئاماژە بۆ ئەو نووسینانەش بکەین کە گەشتوەرو رۆژهەڵاتناسەکان لە بارەی مێژووی کوردو کوردستان و ئەدەبی نەتەوەی کوردییان نووسیوە، بەڵام بە داخەوە کارەکانیان پەرش و بڵاوەو هەموو ئەو نووسینانەشیان لە لێکۆڵینەوەی ئەزموونی تایبەتی میللەتەکانی خۆی هەڵێنجاوە، یا بۆ مەبەستێکی سیاسی دیاریکراو دایانناون.. لە هەردوو حاڵەتیشدا، ئەو لێکۆڵینەوانەیان مێژوونووسانی کورد نەیانووسیوەتەوە، بەڵکو بۆ کورد نووسراوەو کورد نەینووسیوەتەوە، بۆیە -بەرای من- ئەو نووسینانە مێژووی کورد نانوێنن و کوردیش ناتوانێ رەگو ماکی خۆی تیایاندا بدۆزیتەوە و ناشتوانن بۆ حەقیقەت و بوون و شوێنی کورد لەم جیهانە جەنجاڵەدا رێنمایی بکەن... مەسەلەی گەڕانەوەش بۆ رەگوماکی مێژوویی، مانای وایە: سەرلەنوێ و بەتێڕوانینێکی نوێوە ئەو رابردووە بخوێنرێتەوە و مێژوونووسیش ببێتە شایەدی چاخەکەی خۆی، چونکە ئەمیش پاژێکە لەو چاخە، ئا ئەمە تاکە رێگایەکە بۆ گەیشتن بە «روحی چاخ» و بە سروشت و بە لێکوڵینەوەی ئەو روح و سروشتە، وەک ئامرازێک بۆ تێگەیشتنی رابردووەکە خۆی، زۆر بە کورتیش دەڵێم: ئێمە هیچ قوتابخانەیەکی مێژوویی کوردیمان تا ئێستە کە ئێستەیە نیە، کە دەبێ هەبێ، بەڵام پێداویستیەکی زۆر و توانایەکی زۆر تریشی بە شێوازی زانستی و بە توانستی ماددی و بەهەناسە درێژی و بەدڵسۆزی هەیە.. بەواتایەکی تر: بارودۆخی زاتی و مەوزووعیانە، هێشتا کۆسپ و بەربەستن، لەرێی سەرهەڵدانی قوتابخانەیەکی کوردی لە مێژوودا..!!

**رامان: مامۆستا زوبێر چۆن مێژووی نەتەوەی کورد، لە قۆناغە جیاجیاکانیدا دابەش دەکا، ئەی ئەو دابەشکردنە لە پای چی؟!**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** دەکرێ مێژووی کوردو کوردستان بەسەر چەند قۆناغێک دابەش بکرێ:

١- قۆناغی چاخەکانی بەر لە مێژوو، کە ئەمەیش بەسەر چاخەکانی بەردینی کۆن و ناوەڕاست و هاوچەرخ دابەش دەکرێ.

٢- چاخەکانی مێژوویی: ئەمیش لەو ماوەیە دەستپێدەکا کە مرۆڤ، چ لەسەر قوروهەری یا لەسەر کەڤرو بەخەتی مسماری رووداوەکانی رۆژانەی خۆی لە سنووری (٣٥٠٠) ساڵەی پێش زایین و بەزمانە کۆنەکان تۆمارکردووە، دەشکرێ بە مێژووی هۆزەکانی زاگرۆس وەک (لوولوو. گوتی. کاسی. هوری) بچینەوە و کورد بەرەچەڵەکی ئەوان دابنێین، سەرباری ئەو هۆزانەی کە زۆر زۆر لە کوردەوە نزیکن وەک: (نایری، مەنایی، میدی، کاردۆخی) دیارە چاخەکانی مێژوویش بریتییە لە:

١- چاخی دێرین: کە بریتییە لە مێژووی دەوڵەتی میدیاو دارمانی ئەو دەوڵەتە لە ساڵی (٥٥٠)ی پ.ز. هەروا قۆناغەکانی داگیرکردنی کوردستان لەلایەن بێگانەکانەوە وەک سەردەمی (ئەخمینی)و (یۆنانی)و (پەرتی) و(ساسان)یەوە. ئەم چاخە دێرینەش لە ساڵی (٤٧٦ز) دا کۆتایی دێ، یا بە لە دایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) لە ساڵی (٥٧١ز) لەم قۆناغانەدا، ئەم کوردستانە گەلێ رووداوی گرنگی بەخۆیەوە دیوە.

٢- چاخەکانی ناوەڕاست: ئەمەش لە ساڵی (٥٧١) زایینەوە دەسپێدەکا تا روخانی قوستەنتنە نیە لە ساڵی (١٤٥٣)زدا. یا بە دۆزینەوەی ئەمەریکا لە ساڵی (١٤٩٢) زدا. لەم چاخەنەشدا گەلێ حکوومەت و میرنشینی کورد لە کوردستان دامەزراوە وەک (حکوومەتی هەزبانی و شەدادی و حەسنەوەی و مەڕوانی و عەنتازی و لوڕی و ئەیووبی).

٣- چاخەکانی هاوچەرخ: ئەمەش لە سنووری (١٥٠٠ز) دا، یا دوای ئەو سەری هەڵداوە وگەلێ میرنشینی وەکو: (سۆرانی. بابانی. بادینانی. بۆتانی) هاتۆتەکایەوە. مێژووی نوێی کوردستانیش، گەلێ راپەڕینی بە خۆیەوە گرتووەو ویستویەتی خۆی لە بن دەستی دەوڵەتی عوسمانلی راپسکێنێ و سەربەخۆیی کورد جاڕبدا، وەک راپەڕینی محەمەد پاشای رواندزی و ئەورەحمان پاشای بابان و بەدرخان پاشاو یەزدان شێرو شێخ عوبەیدوڵلای شەمزینی.. لەسەرەتای ئەم سەدەیەش راپەڕینەکەی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی. هەروا دەکرێ رووداوە مێژووییەکانی دوای کودەتای تورکی لە ساڵی (١٩٠٨)و دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، بە مێژوویەکی هاوچەرخ حسێبی بۆ بکرێ. هەردوای ئەو کودەتا تورکییەش گەلێ راپەڕینی خێڵەساتی میللی و شۆڕشی دەرسیم و شۆڕشی هەمەوەندو دیاربەکرو بەردەوامبوونی شۆڕشی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی دەسنیشان بکرێ... جێگەی رامانیشە دەبێ بڵێین: دابەشکردنی مێژوو بۆ سەر چەند قۆناغێک، وەک: دێرین و ناوەڕاست و هاوچەرخ، بۆیەکەمجار لە چاخی راپەڕینی ئەوروپاییەوە سەری هەڵدا.

**رامان: گەلێ رێبازی جیاجیا لە نووسینەوەی مێژووی کورددا بەرچاو دەکەوێ، لەوانەش:**

**أ- لاساییکەرەوەی کاوێژکەرەوەو مل پێوەنانە یا نوێشکێکی بێ تام و بێ تەفسیرکردن و بێ لێتوژینەوەیە!؟**

**ب- یا وەرگرتنێکی کوێرانەو یەکانسەرە لە نووسینی ڕۆژهەڵاتناسەکان و کوردناسەکان، جاچ ئەونووسینانە چەواشەکەربن، یا زانستیانە!؟**
**ج- یا مەوزوعیانەو ڕێبازێکی ئەکادیمیانەی زانستیانەیە..!؟**
**ڕای مامۆستا، لەم بوارانەدا چییە و لە بەرچی؟**
**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** وەک ئاماژەتان بۆ ئەو هەموو ڕێبازو شێوازانە کرد لە نووسینەوەی مێژوودا بە گشتی و مێژووی کورد بە تایبەتی، بەڵام ناکرێ هەروا بە خێرایی شوێن پێی ئەو هەموو ڕێبازە جیاجیایانە هەڵگرین، بە تایبەتی لەلای مێژوونووسانی کۆن و هاوچەرخی کورد. شێوازی

نوێی ئێستە لەو نووسینەوەیەدا، بەندە بەشەنوکەو کردنی ڕووداوەکان و بە بەندیواری هۆکارەکان بە دەرەنجامەکانەوە، هەروا ئاوێزانی ڕووداوەکان بە یەکتریەوە، لەگەڵ ئەوەش مێژوونووسی هاوچەرخ لە کاتی نووسینەوەی قۆناغێک لە مێژووەکەی خۆی، بۆی نالوێ تێڕوانینێکی سەربەخۆو مەوزووعیانە بۆ خۆی دروست بکا، بەڵام بۆی دەلوێ ئەو مێژووە بکاتە ئاوێنەیەکی باڵانوما، کە تێیدا بیروبۆچوون و هزروهەستی کۆمەڵانی خەڵک بەرامبەر بە ڕووداوەکانی چاخەکەی خۆیان و پێوەندیە جۆربەجۆرەکان بنوێنێ، مێژوونووسیش تەنیا (گرۆندیک)ێک نیە بۆ تۆمارکردنی ئەو ڕووداوانە، نا بەڵکو شایەدی ئەو چاخەیە، هەروەک لە پێشدا ئاماژەمان بۆ کرد... سەبارەت بەلاساییکردنەوەو کاوێژکردنەوەش (واتە: ئیزافەکردنی شتێکی تازە) یا نویشکێکی بێ لێتۆژینەوە، یا وەرگرتنێکی کوێرانە لە ڕۆژهەڵاتناسە لایەندارەکان، ئەوا هەر هەموویان مەبەست ناپێکن و ئاکارێکی ڕاستەقینەو ڕاشکاو بۆ مێژووی کوردو کوردستان نادەن بە دەستەوە.. ئەزموونی نەتەوەش ئەزموونێکی زیندووە و لەیەک دابڕ ناکرێ، ناشکرێ بەشێکی یا قۆناغێکی لێوەرگرێ و لە قۆناغەکانی تر لادەی، یا لایەنێکی وەدەربخەی و لایەنەکەی تری بشاریتەوە، چونکە ئەو ئەزموونە یەک تاکە پرۆسەیەکی بەردەوام و یەکانگیرە، لە هەموو قۆناغەکانیدا، هۆکارەکان پێوەندییان بە دەرەنجامەکانەوە هەیە..!!
**ڕامان: ئایا مێژوو پرۆسەیەکە بۆ هوشیارکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵک؟ یا ئەو پرۆسەیە، مەبەستی تەیارکردنی مرۆڤە، تا لە ئێستەیەکی پەرەسەندووی سەر بە پاشەرۆژێکی پرشنگدار بژی؟ یا پرۆسە خۆی لە خۆیدا چەکێکی کاریگەرە، تا ئەو مرۆڤە خۆی لەبەر پەرژەنگ و کارەساتەکانی ڕۆژگاردا ڕاگرێ؟**
**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** ئەوەی من بیزانم، مێژوو، ڕابردووی گۆڕانی بەردەوامی مرۆڤە، ئەمڕۆش کوڕی دوێنێیە و سەریش بۆ دوارۆژ دەکێشێ. بۆیە مێژوو مەبەستی تەیارکردنی کۆمەڵانی خەڵکە تا لەو ڕابردووە بگەن و سروشەی پەندو

عـيـبرەتی لێـوەرگرن و ئەوەشیـان لەبەر چاوبێ کە ڕۆژی ئەمرۆیان بەردەوامبـوونی ڕابردوویانەو ئاماژەش بۆ پاشە ڕۆژیان دەکا.. بۆ مێژووی کوردیش، وەدەرخستنی دەوری مێژووی کورد یەکجار گرنگە، تاکەسایەتی سەرپەڕی خۆیان بە دەرخەن.. با ئەوەش هەڵنەبوێرین کە: ئێـمـە ناتوانین پێـوانەی ڕابردوو لەسـەر ئەمـڕۆمـان فـەرزبکەین و بە پێـچـەوانەشـەوە، چونکە ناکـرێ بە پێـوانەی ئەمـڕۆ حوکم لەسـەر ڕووداوەکـانی ڕابردوو بدەین.. وتراوە: (مـێـژوو خـۆی دووبارە دەکـاتەوە!) بەڵام ئەمـەیان زۆر تەواو نـییـە، هەر چەندەش ئەنجـام و هۆکـارەکـانیش لە یەک بچن، چونکە ئەو هۆکارانەو ئەنجامەکانیان، بەندی قۆناغێکی دیاریکراون و نیشانەی پاشـەڕۆژانەشـیـان یا ئەنجـامـەکـانیـان، هەر بە تەواوی لەیەک جیاوازن. ژیانی مرۆڤیش بەردەوام لـە پـەرەسـەندن و پێشکەوتن دایەو ناکرێ ڕەورەوەی ئەو ژیانە بۆ پاشەوە وەرچەرخێ!

## ئێمە هیچ قوتابخانەیەکی مێژوویی کوردمان نییە

**ڕامـان: لێکۆڵینەوە کـورتبڕەکـانی نێـو گـۆڤـارو ڕۆژنامـەکـان لەلای جەنابت چی دەگەیەنێ؟!**

**زوبێر بیلال ئیسماعـیل:** شتێکی سەیرو سەمەرە نیە، گەر هات و لێکۆڵینەوەی مێژوویی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوبکرێتەوە، لە سەر لەبەری ئەورووپاشدا ئەم دیاردەیە هەر هەیە، بەڵام خـەوشی (ڕۆژنامـە) لەوەدایە کـە تەمـەنەکـەی (یەک ڕۆژە).بۆیە کـە (گـۆڤـار) پێی دەکرێ زانیـاری و لێـتـوێژینەوەکـان زیاتر بپارێزێ.. ئەمەو گەر لێکۆڵینەوەی زانستیـانە، لە گۆڤارەکانیش بڵاو بکرێتـەوە، بێگومانم ئامانجی خۆی دەپێکێ، بەڵام لێکۆڵینەوەی کورتبڕو خێرا، ناگاتە ئەو ئامانجە... دیارە کە هەندێ کەسیش ڕوودەکەنە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان و لێتوێژینەوەکانیان تیایدا بڵاو دەکەنەوە، هۆیەکەی دەگەڕێتەوە سەر نرخی گرانی کاغەزو چاپ و نەک بڵاو نەکردنەوە لە کتێبێکی سەربەخۆدا وەک دەزانی!!

**ڕامـان: هەندێ لەو (ئوتروحانەی!!) کە لە لایەن هەندێ لە قـوتابیـانی کـۆلێـژی ئەدەبیـات- بەشی مێـژوو- لە بارەی مـێژووی کـوردەوەو لەم ساڵانەی دواییدا خرانە بەردەست، لەلای ئێوە چۆن دەسنیشان دەکرێ؟**

**زوبێر بیلال ئیسمـاعـیل:** لەم سـاڵانەی ڕابردوودا، کـەوتمە شـوێن پێی گـەلێ لەو بڕوانامانەی کە (ماجستێر)ی پێوەر دەگیرێ لە کۆلێژی ئەدەبیاتدا، هەروا لەگەڵێ کـۆڕی مـوناقـەشـەش دا ئامـادەبووم، بەڵام مـخـابـن و زۆر بەداخـەوە: زۆربەی ئەو بڕوانامانەی کە پێشکەشکران، مەرجی (ڕەسەنایەتی و زانستیان) تێدا نەبوو، کە ئەمـەش دوو مەرجی سـەرەکیین لەهەر لێکۆڵینەوەیەکی کارامەو ڕەسەندا...! واتە: ئەو بڕوانامـانە هیچ (ئیـزافـە) یەکی تازەیان بۆ مـێـژووی کـورد یا کـوردسـتـان تێـدانیـە.. ئەوەی زۆر سـەرنجـیشی ڕاکـێـشـام لەو بڕوانامـانەدا: لاوازیی ئاسـتی زمـانەوانی بـوو، هەروا لاوازیی ئاراسـتـەکـردنی (سـەرپەرشـتـیـارانی) سـەر ئەو

بڕواناماییانەبوو، جگە لە لاوازیی موناقەشەی پڕ لە ئینسافی زانستیانەش لە کاتی موناقەشەکردنی ئەو بڕوانامانە.. دەرەنجامەکەش لە لامدا واکەوتەوە: ئەو قوتابییانەی کە ئەو جۆرە بڕوانامانە دەنووسنەوە، لەلای زۆربەی زۆرینەیاندا (هەستی مێژوویی) و هەروا ئارەزووی گەرم و قووڵیان بۆ شوێن پێ هەڵگرتنی مێژوو زۆر کزو لاوازە و یا هەر نییەو ئەوەی نووسیویانەتەوەش پاژێک نییە لە ژیانی فیکریی خۆیان..! کەچی دەبینین ئەو بڕوانامانەی کە لە زانستگەکانی ئەورووپا یا لە میسردا، لەلایەن قوتابییانی کوردو غەیری کورد لە بارەی مێژووی کوردو کوردستان دەنووسرێنەوە، هەموو خاسیەتی بڕوانامەی سەرکەوتووی تێدایە.. زۆر بە کورتیش دەڵێم: ئەو (ئوتروحانە)ی کە لە کۆلێژی ئەدەبیاتدا پێشکەشدەکرێن، هەردوو ئاستی زمانەوانی و زانستییان- زۆربەیان- زۆر لەڕو لاوازە..!

## ناکرێ بە پێوانەی ئەمڕۆ بڕیار لەسەر ڕووداوەکانی دوێنێ بدەین

**ڕامان: (قصة الحضارة)ی لیتۆژەری گەورە (وڵ دیۆرانت) چۆنی هەڵدەسەنگێنن؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** ئەم کتێبە باسێکی درێژ، یا ئینسکلۆپیدیایەکی مێژووییە، لە هەندێ ڕووەوە لە کتێبێک دەچێ وەک (باسێک یا لێکۆڵینەوەیەک لە مێژوو) کە هی (ئەرنۆڵد تۆینبی)یە.. ئەم کتێبە باسی هەموو ئەو شارستانیە مرۆییانە دەکا کە هەموو گەلانی سەر ڕووی زەمین بەشدارییان تێدا کردوە، هەر گەلێکیش بە پێی ئاستی شارستانی خۆی.. بەڵام هەندێ لەو شارستانیانە ڕەسەنایەتیەکی سەربەڕیان هەیە، وەک شارستانیەتی (سۆمەری- فیرعەونی- چینی) دەشکرێ هەندێ لە شارستانیەتەکانی ئەمەریکا، یا هەر چوار جیهانی نوێی وەک: (مایانی. باکۆتی. مەکسیکی. ئەندیانی) بە شارستانیەتی ڕەسەن لە قەڵەم بدرێن.. ئەمەو (٢٦-٢٧) لقە شارستانیەتی دیکەی وەک: (هیندی- سندی- هیندۆکی- حیسی- مینەوی (شارستانیەتی دورگەی گریت) و هەروا سریانی- هیلینی- یۆنانی- بابیلی- ئیرانی- عەرەبی- کریستیانی ڕۆژاوایی و ئەرسۆزکی... تاد) بەلق یا وەرگیراو حسێبیان بۆ بکرێ..!!

**ڕامان: ئایا ئێوە لەگەڵ تەفسیرکردنی مەتریالی مێژوودان؟!**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** تەفسیرکردنی مەتریالی مێژوو، مەتریالی مێژووخۆیەتی.. بلیخانۆف لە کتێبەکەیدا (فەلسەفەی مێژوو) دا ئاماژە بۆ بڕگەیەکی (مارکس) دەکا کە لە پێشەکی «ڕەخنەیەک لە ئابووری سیاسی»دا هاتووەو لەوێشەوە پێیهەڵدەگرێ و دەڵێ: «هەموو لێکۆڵینەوەکانم گەیشتنە ئەم ئەنجامە»: «ناکرێ پێوەندیە حقووقیەکان و جۆری دەوڵەت، نەبەخودی خۆی و نەبە پەرەسەندنی گشتیی کە بەندە بە فیکری مرۆڤەوە، تەفسیر بکرێ، بەڵکو ڕەگوماکەکەی خۆی لە مەرجەکانی ژیانی مەتریالییەوە هەڵدەهێنجێ، کە (هیگڵ)

له ژێر سەرناوی (کۆمەڵی شارستانی)دا وەک هەموو زاناکانی ئینگلیزو فەرەنسایی لەسەدەی هەژدەهەمدا بۆی دەچوون، بۆی دەچێ..! بەم پێیەش باری ئابووری هەرگەلێک، سنوور بۆ بارە کۆمەلایەتیەکەی دادەنێ، ئەمیش بە دەوری خۆی باری سیاسی و ئاینیی ئەو گەلە دەسنیشان دەکا... تاد دیارە باری ئابوورییش، هۆکاری سەرەکییە، بۆ سەرجەم پەرەسەندنی کۆمەلایەتی، بەمەش هەر بزاڤێکی مێژوویی، خۆی لە خۆیدا ئەو ململانێیەیە کە مرۆڤ لە پێناوی بوونی خۆی لەگەڵ سروشتدا دەیکا. هەندێکیش ئەم چەمکەیان بە (مەتریالی مێژوویی) لە قەڵەم داوە کە تیوریەکی گشتیە بۆ شێوازەکانی بەرهەمهێنان، ئابووری سیاسییش، زانستێکی تایبەتە و بەندە بەو قانوونە مەوزووعیانەی کە بەرزەفتی پێوەندیەکانی بەرهەمهێنان دەکا لە نێوان کۆمەلانی خەلکا.. مەسەلەی (زانستی مێژووش) ئەو پێوەندییە ئالۆگۆڕ کراوانەیە کە لە نێوان چینەکان دا هەیە.. هەرچی چۆنێ بێ، تەفسیری مەتریالی بۆ مێژوو، یەکێکە لە تەفسیرە هەرە گرنگەکانی مێژوو، یا باری سەرنجێکی ترە لە نێوان هەموو ئەو بارە سەرنجە بێ شومارانەدا.. بەلام باری سەرنجێکی سەرپەڕە..!

**رامان: ئایا بەیازو دەسنووسە ئەدەبی و ئاینییەکان و هەروا چامەو بەڵگەنامەو دیکۆمەنت و شاهید عەیان و حیکایەتخوان و خەبەر دەرەکان، جێگەی متمانەی مێژوونووسە؟ بۆ؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** ئەو زانیاریانەی کە لەو ژێدەرانەی باسی دەکەن، بەراشکاوی ژینگەی نووسەران و رۆشنبیریی و بایەخدانیان سەراوەڵە دەکاتەوە.. بە شێوەیەکی گشتییش (هەستی مێژوویی) لەلای فەقێیانی زانستە ئاینییەکان لاوازو کزبووە.. ئەمەش چونکە: بابەتەکانیان هەر تەنیا زمانەوانی و فیقهی و عەقایدی بووە..، بەدەگمەنیش هەن کە: بایەخیان بەرووداوەکان دابێ یا تۆماریان کردبێ، بە تایبەتیش لەم سەدە دواییانەدا.. کەچی بە پێچەوانەوە: مێژوونووسە کۆنەکانی موسلمانیەتی بایەخیان بەم لایەنەداوە، بۆ نموونە: (ئیبن خەلکان) هەم زانابووە وهەم قازی، نا بەڵکو سەرۆکی قازییەکانیش بووە، لە هەمان کاتیشا مێژوونووس بووە. هەر ئەم دیاردەیەش لە سەرهەموو مێژوونووسە موسلمانەکانی کە باسیشتان کرد، گەلێ کەرەستەی خاوو گەلێ ئاماژەی مێژوویی وای تێدایە، کە: مێژوونووس دەتوانێ کەڵکی لێوەربگرێ..!

**رامان: دابونەریتی گەندەڵی کۆمەلایەتی، بەردەوام ئافرەت لە پەراوێزی پەرەسەندنی سیاسی و گۆڕانکارییەکانی کۆمەلایەتی و مێژوویی دادەنێ، بەڕای ئێوە ئەمە زیان بە تێکڕای مێژووی نەتەوەکەمان ناگەیەنێ؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** بێگومان ئافرەت نیوەی کۆمەڵە، ژیانی مرۆڤایەتیش بەبێ ئافرەت بنیاد نانرێ.. جا نازانم چۆن دەکرێ بزووتنەوەی مێژوو و پەرەسەندنی بەبێ بوونی ئافرەت، یا کەمکردنی دەوری ئافرەت سەردەگرێ؟ لاتەرازکردنی ئافرەت لە جوولانەوەی مێژوو، زۆر سلبیانە کار دەکاتە سەر پەرەسەندنی و پێشکەوتنی کۆمەڵ- لە هەموو بوارێکدا- بێبەشکردنی ئافرەت لە خوێندن و

خوێندەواری، بێبەشکردنی نیوەی ئەو کۆمەڵەیە لە فێربوون و خوێندەواری.. بۆیە کە ئافرەت شوێنی ئاسایی خۆی لە هەموو دەرەتانەکانی ژیان و کارکردنی و بنیادنان و پەرەپێدانا هەیەو زۆر دیاریشە...!!

**رامان: باشە ئەی باسوخواسی هەردوو ئینسکلۆپیدیای ئیسلامی و بەریتانی لە بارەی مێژووی کوردەوە؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** تیمێکی گەورەی زانایانی رۆژاواو رۆژهەلاتناسەکان، بەسەر گەرمیەوە خەریکی لێکۆڵینەوەی شارستانیەتی ئیسلامەتی بوون «ئاین- زمان- ئەدەب- فەلسەفە- تەشریع» زۆربەی باسەکانیشیان چ لە نێو کتێب و چ لە گۆڤارە تایبەتیەکاندا بلاو کردۆتەوە.

لە پاشا و هەر لە بەرایی ئەم سەدەیەشەوە ویستیان نوبشکی باسو لێکۆڵینەوەکانیان لە کتێبێکا کۆبکەنەوەو ئەوەبوو (دائرة المعارف الاسلامیة) یان بە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسایی و ئەڵمانی هێنایەکایەوە.. ئەم ئینسکلۆپیدیایە، بەری ئەرکی کەڵە رۆژهەلاتناسەکانە، کە: هەر

## مێژوونووس دەبێ قەناعەتی بەوە هەبێ کە دەینووسێ

یەکێک لەوانە، لە بارەی پسپۆری خۆیەوە شتێکی نووسیوە.. بەڵام ئەو باسانەیان تەنیا لایەنێکی شارستانیەتی مرۆڤایەتی گرتۆتەوە، ئەویش کە: (کەلەپووری ئیسلام)ە.. واش نیە سوودی ئەم ئینسکلۆپیدیایە هەر بە لایەنی رووناکبیرییەوە بەندبێ، بەڵکو کەڵکێکی زۆری بۆ بووژاندنەوەی شارستانیەتی ئیسلامەوە هەیە، جگە لە پێکهێنانی رای گشتیی موسڵمانەتی و پشتیوانی کردن لەدابونەریت و ئایدیالە باڵاکان بە شێوەیەکی قووڵ و تێکرایی و زانستیانە، جگە لە شێوازی و زمانیش کە هەموو کەس تێیدەگا.. لە ساڵی (١٩٣٣) شدا لە میسر ئەو ئینسکلۆپیدیایە وەرگێردرایە سەر زمانی عەرەبی، بەڵام هێشتا کارەکە هەر ماوەو تەواو نەبووە.. هەر ئەم ئینسکلۆپیدیایەش بووە مایەی ئەوەی کە محەمەد ئەمین زەکی رەحمەتی بڵێ: ئەم سەرچاوەیە بووە هۆی ئەوەی کە مینۆرسکی لە بارەی کوردەوە نووسیوبەتی، کتێبێکی وەک (خولاسەی تأریخی کوردو کوردستان)ی لێ بڕسکێ. ئەمەو گەلێ ئینسکلۆپیدیای لەم بابەتەش هەیە وەک:

ئینسکلۆپیدیای بەریتانی و رووسی و ئەمەریکایی، کە لەنێویاندا گەلێ زانیاری پوخت هەیە دەربارەی کوردو ولاتەکەی..!

**رامان: وەک دەزانن، مێژووی ئێمە، دوچاری گەلێ دەستێوەردان و سەر لێشێواندن ولادان و دەسیسە و چەواشە کردنێکی قووڵ هاتووە، لەرێی هەندێ لەو خامە شوڤێنییە بەدنیهادانەوە، بەرای ئێوە چ چارەسەرێک هەیە بۆ رزگارکردنی ئەو مێژووە لەم کارە هەرە نامرۆڤایەتییە؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** گەلێ بۆچوونی مێژوویی وا هەیە، کە گەلێ مێژوونووسی بێگانە و هەروا دە ردراوسێ، لە لێکۆڵینەوەی ئەزموونی میللەتەکەی خۆیان هەڵیانهێنجاوە، یا بۆ مەبەستێکی سیاسی و دیاریکراو نووسیویانەتەوە.. لەهەر دوو حاڵەتدا، ئەو نووسینانە کورد نەینووسیوون و بە هیچ شێوەیەکیش رەنگی کورد نارێژن و ناشبن بەو ژێدەرانەی کە کورد رەگوماکی خۆی تێدا بدۆزێتەوە یا ناسنامەی کورد بناسێنێ، نەخوازەڵلا لەم جیهانە پڕ لە گۆڕانکاری و جمینەدا..!!

**رامان: ئەی رای جەنابت لە بارەی بەرنامەکانی قوتابخانەیی و زانسگەیی، دەربارەی مێژووی کورد؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** بەرنامەکانی ناوەندی و دواناوەندی، چەندین بابەتی کورت و کورتبڕی لە بارەی مێژووی کوردەوە دوای رێککەوتنامەی (۱۱) ئاداری ساڵی ۱۹۷۰ هاتە ناو.. کەچی لەناکاویکا ئەویش نەما.. لە پاش ساڵی ۱۹۹۱- یش، گەلێ بابەتی مێژوویی کوردو جوغرافیای کوردستان خرانە نێو بەرنامەی قوتابخانەکانەوە، بەلام بەداخەوە، کەس پشتی بە پسپۆڕانی ئەم بوارەنەبەست، بۆیە زۆربەیان چ لە رووی زمان و چ لە رووی زانیارییەوە کزو لاوازبوون..!! سەبارەت بە بەرنامەی زانستگەیش، کتێبێک دانراوە بە ناوی (مێژووی کۆنی کورد) و لە کۆلێژی ئەدەبیات دا دەخوێندرێ، کە بەراستی کتێبێکی باشە، ناشزانم جگە لەم کتێبە چ کتێبی تر هەبێ، لە قۆناغە جیاجیاکانی ئەو کۆلێژەدا بخوێندرێ وەک: مێژووی کورد لە چاخەکانی ناوەڕاست و هاوچەرخدا!؟

**رامان: ئەدگارو خاسیەتی مێژوو نووسی لێتۆژەرەوە چییەوچۆنە؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** دەبێ مێژوونووس زۆر بە چاکی و بە قووڵی لە بابەتی نووسینەکەی خۆی بگات، لێکۆڵینەوەکانیشی رەسەن و زانستیانەبێ، بە ئەمانەت و دەسپاکییەوەش لە رووداوە مێژووییەکان بدوێ و خۆی لە دەمارگرژی و چەواشەکردن و سەرلێشێواندن و زێدەڕۆیی دوور راگرێ، هیچ راستییەک نە شارێتەوەو قەناعەتێکی تەواویشی بەوەی هەبێ کە دەینووسێ..!!

**رامان: وەک دیارە، هەندێ لە مێژوونووسان، پتر بایەخیان بەلایەنی سیاسیی و سەربازیی داوەو ئەوەندە بەلای کۆمەڵ و بزووتنەوەو چالاکییە رووناکبیری و شارستانییەکاندا نەچوون، ئایا مێژوو بەمجۆرە شرۆڤە دەکرێ؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** لە چاخەکانی ناوەڕاستا، زۆربەی زۆری مێژوونووسە موسڵمانەکان، بایەخیان بەلایەنی سیاسی و سەربازی و هەروا بە ژیاننامەی پادشاو میرەکان داوەو لایەنی تری شارستانی و ژیانی رۆژانەی خەڵکیان وەلاناوە.. من لەگەڵ تۆدام کە ئێستە ئەم بۆچوون و نووسینە پەسەند نییەو پەسەندیش ناکرێ..!!

**رامان: بەشێکی زۆری مێژوونووسان، بایەخیان بە میرو دەسەڵاتدار داوەو کۆمەڵانی خەڵکیان خستۆتە لاوە، ئەمەیان چۆن دەبینی؟ ئەی دەوری ئەو کۆمەڵە**

**خەڵكیانە لە ڕووداوەكانی مێژوودا؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** بێگومان لە پرۆسەی بنیادنانی كۆمەڵ و پێشكەوتنیدا بە جۆرێ كە لەگەڵ ڕوحی ئەم چەرخە بگونجێ و لەتەك پێداویستییە پڕ لە گۆڕانكارییەكانی مرۆڤیش هەڵبكا، دەبێ دەوری كۆمەڵانی خەڵك لەو پرۆسە هەرەگرنگەدا لەبەر چاو بگیرێ.. لە چاخی ناوەڕاستی ئەورووپادا، گەلێ لە مێژوونووسانی ئەوێ، نكووڵیان لەو دەورە دەكردو بایەخیان پێنەدەدا. ئەوان لەو باوەڕەدابوون كە:

«من منی و ئەز ئەزی تاكەكەس لە پشت ڕووداوەكان خۆیی لە مەلاس ناوە..!»

**ڕامان: هەندێ تاكەكەسی (قارەمان) لە قۆناغی ناسك و تەنگەبەری مێژووماندا، دەورێكی یەكجار گەورەیان دیوە، لە وەرچەرخاندنی ئەو ڕووداوانە بۆ بەرژەوەندی نەتەوەكەمان، ڕای جەنابت بەرامبەر بە (قارەمان)ی مێژوویی چییە و چۆن؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** ژمارەیەك لە مێژوونووسانی ئەورووپای چاخی ناوەڕاست لە (دەوری تاكەكەسی لێزان- سەركردەو كەسایەتی ناوداری مێژوویی) یان لە ڕەوتی ڕووداوەكان كۆڵیوەتەوە.. بەڵام هەرچی لە بارەی دەوری (قارەمان لە مێژوود)دا بوترێ یا نەوترێ، ئەوا ئێمە ناتوانین نكووڵی لە دەوری سەركردە ناودارو خاوەن فەلسەفەو تیوری و ڕێنماییە ئاینییەكان و زاناو پیاوە ناودارەكانی كۆمەڵایەتی و سەركردە گەورەكانی سەربازی و شۆڕشە میللییەكان و یاسا دانەرە مەزنەكان و ڕزگاركەرانی كۆیلەو سیاسییە دیارو پزیشكە باڵا دەستەكان بكەین، چ لە ژیانی كۆمەڵگەكەی خۆیان و چ لەوەرچەرخاندنی ڕەوتی مێژوویی گەل و نا بەڵكو ڕەوتی سەرجەمی دونیاش.. بەچەشنێك تا بە (لینین)یش دەگا، هەر چەندە دەوری بزاڤی (ناردوییەكان)ی ڕەفز دەكرد كە لە ڕووسیاداو لە چارەگەی دوایی سەدەی نۆزدەهەم لە كایە دابوون، بەڵام ئەوەی سەلماند كە: (گەل خوڵقێنەری مێژووە) بەڵام (سەركردەی گەل)یش دەوری دیاری خۆی لەم پرۆسەیەدا هەیە، چ لە تێگەیشتنی قانوونە مەوزووعیەكانی كۆمەڵ و چ لە تێگەیشتنی بەرژەوەندییەكانی ئەو كۆمەڵە...!!

**ڕامان: ئایا دەبێ مێژوونووس كێشەو هەڵوێستی ڕۆژانەی لەبەرچاو ڕاگرێ، كاتێ كە دێ و ڕاڤەی مێژووی دێرینەمان بۆ دەكا؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** بووژاندنەوەی كەلەپووری كۆن، واتە: ڕۆشنایی خستنە لەسەر لاپەڕە نادیارەكانی مێژووی سیاسی و ڕووناكبیری و كۆمەڵایەتی دێرینە... بایەخدانیش بەشكۆمەندی و بە ئەزموونەكانی ڕابردوو، لەگەڵ هەستی (نەتەوایەتی و نیشتمانی)دا هەماهەنگە... بەڵام كێشەكانی ئەمڕۆ بەندنییە بە لێكۆڵینەوەی مێژووی كۆنەوە، بەڵكو سروشە وەرگرتنە لە ئەزموون و ڕووداوەكانی ئەو ڕابردووە، بەجۆرێ كە ڕێنماییمان بكا بۆ چارەسەركردنی كێشەكانی ئەمڕۆ.. دەشبێ مەسەلەی جیاوازی شوێن و كات و ژینگەش لەبەر چاوبگیرێ، چونكە مرۆڤی ئێستە، بەرهەمی ژینگەیەكی سروشتی و كۆمەڵایەتی خۆبەتی... هیچ

جۆرە هاوتەریبیەکیش لە نێوان ڕووداوەکانی ئێستە و ڕووداوەکانی رابردوودا نییە.. هەر چەندەش ناکرێ بەبێ لێکۆڵینەوەی رابردوو لە ئێستە بکۆڵێت وە..!!

**ڕامان: ئایا شۆڕشە پەیدەرپەیەکانی نەتەوەی کورد، بە ئەمانەتێکی ئەکادیمی و مەوزووعیانە شرۆڤەکراوە؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** من پێم وایە، ئەو بڕوانامانەی کە لە زانستگەکانی ئەوروپادا لەلایەن قوتابیانی کوردو غەیری کوردیش ئامادەکراون، هەر هەموویان بەندن بە شێوازی بەرنامەی زانستی و مەوزووعیەوە، لە بارەی شۆڕشەکانی کوردو هەموو ئەو بارودۆخە ناوخۆیی و هەرێمی و نێو دەوڵەتیانەی کە دەوری لەو شۆڕشانەدا دیوە.. لەوانەش: بەرژەوەندییە ئاڵۆزو یەکنەگرتووانەی دەوڵەتەکان و دەرەنجامی هەڵوێستە جیا جیاکانیان.. ئەو یادداشتنامانەی کە کەسانی سیاسی و سەربازی و گەشتەوەرو کارمەندە بێگانەکان لە بارەی شۆڕشە هاوچەرخەکانی کوردەوە تۆماریان کردوە، هەر چەندەش بێلایەن نین، بەڵام لە سوود وەرگرتن بە دەرنیین..!!

**ڕامان: بەرای ئێوە، راڤە جۆراوجۆرەکانی مێژوویی، شتێکی ببڕای ببڕە، یا نیسبی؟ چۆن؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** (ئیبن خەلدوون) بەیەک وشە پێناسەی مێژوو دەکاو دەڵێ: «مێژوو، هەواڵە، هەواڵیش قابیلی راستی و درۆیە».. بۆیە ناکرێ مێژوونووس لەبەرژەوەندی و لە سۆزوگۆدازی خۆی ببڕای ببڕ دابڕێن، هەر بۆیەشە هەموو ئەو شرۆڤانەی بۆ مێژوو کراوە، (بڕای بڕ)بن، بەڵکو شتێکی نیسبین و قابیلی لێکۆڵینەوەو موناقەشەن و لەوانەشە وەختەکی بن. چونکە هەر شرۆڤەیەک چارەسەری لایەنێکی ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵ دەکا، چ لەلایەنی ماددییەوە بێ چ ل لایەنی رووحی و ئاوەزەوە.. بێگومان سروشت و ماددە و ئاوەزو مرۆڤیش دەوری خۆیان لە ژمارەیەک لە تەوەرەکانی ئەو شرۆڤە کردنەدا هەیە..!

**ڕامان: کەمی کۆڕو کۆبوونەوەی مێژوویی، لە بارەی مێژووی نەتەوەکەمانەوە، چۆنی بۆ دەڕواننی؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** سازدانی کۆڕو کۆبوونەوەی مێژوویی بە تاکە کەسێک یا بە تاکە لێتوژەرێک ناکرێ، بەڵکو ئەمەکاری دەزگا رۆشنبیریی رەسمی و نارەسمیەکانە.. وەک: زانستگەو رێکخراوە ئەدەبی و فیکریەکان.. سەرباری ئەمەش ئەو جۆرە کۆڕانە پێداویستیان بە پسپۆری لێهاتوو و بەکات و شوێنی گونجاو هەیە.. دووریش نییە، هەندێ لە لێتوژەرەکان هەر لەبەر ئەم هۆیەوە بەشداری لەو کۆڕو کۆبوونەوانە ناکەن..!!

**ڕامان: فەیلەسووفێکی مێژوو هەیە و کەتەگۆریایەکی هەیە و دەڵێ: (مێژوو، هەر هەمووی مێژوویەکی هاوچەرخە!) ئێوە چۆنی لێ تێدەگەن؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** لەوانەیە مەبەستی لەم کەتەگۆریایە چەند شتێ بێ:

١- یا ئەوەتا مێژوو، هاوچەرخی سەردەمی خۆیەتی، واتە: بەندە بە ماوەیەکی دیاریکراوەوە

٢- یا ئەوەتا نکوولّی لەوەدەکا کە: مێژوو، رابردووی پڕلەجمانی مرۆڤ بێ
٣- یا ئەوەتا بڕوای بە مێژووی پێشوو نییە و هەر هەموو مێژووش بە ساختەکاری تێدەگا
٤-یا ئەوەتا دەبێ مرۆڤ بۆ ئێستەی خۆی بژی و پەرەی پێ بدا

**رامان: ئەو مەرجانەی کە دەبێ مێژوونووس پشتی پێ ببەستێ لە نووسینەوەیەکی ئاکادیمیانەی مەوزووعی مێژوودا چین؟ و لەبەرچی؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** رووداوە مێژووییەکان ناکرێ لە بارودۆخی دەوروبەر جیابکرێتەوە جا چ لایەنی ئابووری بێ یا سیاسی یا کۆمەلایەتی یا جوغرافی، چونکە شێوازی زانستیانە لە تۆمارکردندا بەندە بە لێکدانەوەی رووداوەکان و شەنوکەوکردنیان و زانینی هۆو ئەنجامەکانیان، لە پاشا، شەکەندانی ئەو رووداوانە بە یەکتری و بەباری ناوخۆیی و هەرێمی و نێودەولّەتییەوە، ئینجا نووسینەوەی لەبەر رۆشنایی باری بۆچوون و سەرنجێکی هاوچەرخانەدا، ناشبێ مێژوونووس لە دەرەوە سەیری مێژوو بکا، بەلّکو دەبێ شۆڕبێتەوە نێو رووداوەکان..!

**رامان: نەخشەکێشانی شار لە کوردستاندا چۆنی دەبینن؟ ئایا لەم بارەیەوە ئێمە مێژوویەکی رەسەنمان هەیە؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** شاری نیمچە دەولّەتەکان، یا شار لە قۆناغی نیمچە دەولّەتەکاندا لەم عیراقەدا، شوورەبەندبوو، بەلّام سەرگۆنی ئەکەدی ئەو شوورانەی کەم کردەوە، بە مەبەستی ئەوەی نەوەک لەنێو ئەو شارانەدا شۆڕش بەرپابێ و خەلّکیش خۆیان بەو شوورانە بپارێزن.. ئەوەی زانراوە شاری میدییەکان هەموو شوورە بەندبوون و قەلاوقونگرەیان هەبووە تا خۆیانی تێدا بپارێزن، هەروەک چۆن (تەورات) ئاماژەی بۆ شاری (ئەکباتان- هەمەدانی ئێستە)و شوورە بەرزەکانی کردووە. لە پاش بلّاوبوونەوەی ئاینی موسلّمانەتیش، شارەکان بەچەشنێ بنیادنران کە بنە (خانەی میرنشین)ی و مزگەوتەکانیش لە یەکتر نزیک بن، مزگەوتیش بوو بە چەند کۆلانچەیەک و هەر کولانەش چەند خێلّەساتێکی تێدا نیشتەجێ بوون..
لە سەروبەندی عەبباسی و ئەتابەکیش لەم هەولێرە، ئەوا قەلاکەی بوو بە شارێکی تەواوی شوورەبەند، کە تێیدا خانەی میرنشینی و مزگەوت و قوتابخانە و بازاڕهەبوو.. لە پاشا موزەفەرەددین (٥٨٦- ٦٣٠ کۆچی) شارێکی لە بنار قەلادا دورستکردو شوورەبەندیشی کرد.. هەر هەموو شارەکانی چاخەکانی ناوەڕاست، تا بە شارە شاخاویەکانیش دەگا، هەمووی شوورەبەندبوون ئەمیش لە پێناوی خۆپاراستن.. لە پاش ناوەڕاستی ئەم سەدەیەش، بایەخێکی تەواو بە نەخشەسازی شار درا، بە تایبەتی لە دەولّەتە پێشکەوتوو پەرەسەندووەکاندا، نەخاسمە لە پاش جەنگی دووەمی جیهانگیری، ئەمیش لە ئەنجامی ئەو خاپوورکردنەوەی کە بە سەر ئەو شارانەدا هات، چ جای خوشگوزەرانی ئابووری و زیادبوونی دانیشتووان و پەرەسەندنی تەکنیکی بیناسازی..!

**رامان: هونەری مۆسیقا، لایەنێکی هەرە مەزنی تێکڕای شارستانیەتی مرۆڤایەتییە، ئەمەیان چۆن؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** مۆسیقا زۆر کۆنە.. دوو قیسارەی زێرین لە گڵکۆکانی بنەچەی ئووری یەکەمی، سەردەمی ئەلندی بنەچەکانی دووەمدا، واتە: (٢٦٠٠- ٢٥٠٠) پ.ز دۆزراوەتەوە.. مۆسیقاش هەمیشە هەر لەو سەردەمانەوە لە جەژنە میللی و شاهانەییەکاندا بەکارهاتووە، هەروا دەورێکی گرنگی لە سرووتەکاندا گێڕاوە، هەروەک چۆن لە تەورات- سفر سموئیل (ئەصحاح ١٠-٥)دا هاتووە.. ناوی گەلێ ئامرازی مۆسیقاییش، چ وەک: لێدان یا فووپیاکردن و یا ژێدار هاتووە. بەردەوامیش (کاهین)ێک لەپەرستگەدا هەبووەو دەهۆڵی ئەنگیوەو روحە بەدەکانی پێ راوناوە.. لە گڵکۆکانی ئووریشدا لاشەی هەندێ ئافرەت دۆزرایەوە کە هەندێکیان ئامرازی ژێداری مۆسیقاییان لە کاتی ناشتنی شادا هەڵگرتووە.. چونکە لە کاتی ناشتنا جۆرە مۆسیقایەکیان ژەنیوە، بەمەش دەوری کاریگەری مۆسیقا لە بنیادنانی شارستانیەتا، زۆر زەق و دیارە..!

**رامان: ئایا ئێوە لەگەڵ ئەو لادان و تۆمەتانەن، کە دراوەتە پاڵ پرەنسیپ و بزاڤی خوڕەمییەوە؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** کاتێ کە لەسەردەمی مەئموون بابەکی خوڕەمی لە ئازربایجان سەری هەڵداو حەشاماتێکی زۆر دەوروەیان لێدا وبوو بە مەترسییەکیش لەسەر دەوڵەتی عەبباسی و نەشیان توانی هەروا بە ئاسانی ئەو راپەڕینە لەناو ببەن.. بەڵام لە ئەنجاما (ئەفشین) کە سەرکردەیەکی ناوداری (موعتەسەمی خەلیفە)بوو، لە پایزی (٨٣٧ز)دا و دوای مقاوەمەتی (٢٠) ساڵ توانی دەسەڵاتی بابەک لەناو بباو بابەکیش لە بەغدا لە سێدارە بکێشرێ..! رەگوماکی ئەم بزووتنەوەیە، لە ئەنجامی ئەو خەرج و باجە بارگرانەبوو کە شانی جوتیارانی شکاندبوو، سەرباری ئەو دەساوێژە کۆمەلایەتی و سیاسیانەی کە لە کۆتایی سەدەی هەشتەم و سەرەتای سەدەی نۆیەم سەری هەڵدابوو، ئەمیش لەسەر بنەمای دەرکردنی زەوی وزار لە دەست کەمایەسیەکان و دابەشکردنی بەسەر جوتیاراندا، دیارە کە زەویش رزگارکرا جوتیاریش رزگار دەکرێ و سنوورێکیش بۆ چەوساندنەوە دادەنرێ.. ئەمەو هەر ئەو بزاڤە داوای رزگاربوونی ئافرەتیشی دەکرد..!

بۆیە جۆرەها تۆمەتی درایە پاڵ لەوانەش: گوایە: پیاوانی ئەو بزاڤە هەموویان دزوجەردە و رێگرو خاپوورکارن، تا رای گشتی لە دژیدا بوروژێنن.. لە ئەنجاما توانیان ئەو بزاڤە کۆمۆنیستییە لەناوببەن و بابەکیش بکوژن، بەڵام بزاڤەکە خۆی لە نێو جووڵانەوەی (ئیسماعیلی)دا هەر بەردەوام بوو، کە زۆر لەوانەوە، لەرووی عەقیدەوە نزیک بوون، ئەم بزاڤە زۆر بە توندی جیهانی ئەوسای ئیسلامەتی هەژاند.. ئەو تۆمەتانەی ،کە دراشنە پاڵ بزاڤەکە زێدە رۆییەکی زۆری تێدایە، بە تایبەتی کە تۆمەتی زەردەشتی و مەزدەکی درایە پاڵ.. کوردیش بە شێوەیەکی گشتی لەو بزاڤەدا بەشداربووە، هەروەک چۆن مێژوونووسەکان ئاماژەی بۆ دەکەن..!

**رامان: زۆربەی زۆرینەی ئەنترۆپۆلۆژیا، لەو باوەڕەدان کە: لێتوژینەوەکانیان، بەشداریی لە پەرەپێدانی تێگەیشتنی رەفتارو هەڵسوکەوتی مرۆڤ و**

**مێژوویەکەیدا هەیە؟ئێوە چۆنی لێکدەدەنەوە؟**
**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** وەک دەزانین، مێژوو- هەر بۆ نموونە- خۆی بە تۆمارکردنی هەموو فاکتەرەکانی ژیانی مرۆڤانە خەریک ناکا، نا بەڵکو لایەنێکی فاکتەرە کۆمەلایەتیەکانی، کۆمەڵە بەراییەکان بەلاوە دەنێ، ئەوەی کە ئەنتروپۆلۆجیا پشتی پێدەبەستێ. ئەنترۆپۆلۆجیاش بەندە بە لێتۆژینەوەی ژیانی مرۆڤانەوە، هەروەک چۆن دیاردەکانی بواری شێوازی زانستی ئەنترۆپۆلۆجی لە لێتۆژینەوەی دیاردە کۆمەلایەتییەکانی، کۆمەڵە بەراییەکانە..!

**رامان: ئاشتی و جەنگ و پێشکەوتنی مرۆڤایەتی، چۆنی سەیردەکەن؟!**
**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** گەر جەنگ بەردەوامبوونی سیاسەت بێ، بەلام شتێکی خاپوورکەرە. چونکە مرۆڤایەتی مرۆڤ و دەوری دیاریشی لە پێشکەوتن دا تەنیا لە سەردەمی ئاشتیدا خۆی لە زاخ دەداو دەبریسکێ. جەنگیش شێرپەنجەیەکە و هەڕەشە لە شارستانیەتی مرۆڤایەتی دەکا.. هەر لە جەنگیش دا هەموو بەها و بنەما ئەخلاقییەکان رۆدەچن.. کەچی لە ئاشتی دا ئەو بەهاو بنەمایانە بەردەوام دەبن و کۆمەلانی خەڵکیش بەختەوەر..!

**رامان: چلچرای مێژوونووسی راستەقینەو پێوانەی بابەتیانە چۆن هەڵدەسەنگێنی؟**
**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** دەبێ چلچرای دەستی مێژوونووس راستگۆیی و ئەمانەت بێ لە تۆمارکردنی رووداوەکاندا، هەروا دەبێ خۆی لە چەواشەکردن و سەر لێشێواندن و هەلفریواندن دوور راگرێ و ناشبێ توندڕەووزیادە رۆیی بکا، چ لە ستایش کردن و چ لە زەمکردنا، دەشبێ رووداوەکان چۆنن، ئە ئەوا بەڕاستی هەڵیانبخا، چونکە لە رووداوەکانی مێژوودا گەلێ دەرس و پەند و عیبرەت هەیە..!

**رامان: ئایا ئێوە لەگەڵ ئەو کەتەگۆریانەن کە دەڵێ: دەبێ و پێویستە جارێکی تر مێژووی کوردی تۆمار بکرێتەوە چونکە ئەمە مەسەلەیەکی حەتمییە؟!**
**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** گەر مەبەستت دووبارە نووسینەوەی مێژووی کوردبێ، ئەوا من دەڵێم هێشتا مێژووی کورد بە تەواوی نەنووسراوەتەوەو کەلێنێکی گەورەش لەم بوارەدا هەیە.. بەلام گەر مەبەستت ئەوەبێ کە کورد، سروشان لە رابردووی خۆی وەرگرێ بە تایبەتی رابردووی شکۆمەندانە کە لەگەڵ هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانیدا هاوشانن، ئەمەیان شتێکی دیکەیەو پێداویستیەکی زۆری بە دیاردەی زاتی و مەوزووعیەوە هەیە..!

**رامان: ئایا ئێوە لەگەڵ مامۆستا مەسعوود محەمەددان لە کتێبەکەی (وجهة نظر في التفسير البشري للتأريخ)؟**
**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** تا ئێستە دەیەها تەفسیر و شرۆڤە بۆ مێژوو هەیە، هەر لە ئەفسانە و کۆنفۆشیوسەوە بگرە تا دەگەیتە ئیبن خەلدوون و میکاڤیلیی و سان سیمۆن (١٧٦٤-١٧٩٧ز)، هەروا هیگڵ و کارل مارکس و چەمکی مەتریالی

مێژوویی لای بیلخانۆف.. وەک دیاریشە، ئەو شرۆڤەیەی کە مامۆستا (مەسعوود محەمەد) هێناویەتی، بەرپەرچێکە بۆ بلیخانۆف و مەتریالیەتی مێژوو، زیاتریش دەوری مرۆڤ لە پێشکەوتن و پەرەسەندنی زانستیی مرۆڤایەتیدا بە دەردەخا و دووپاتی بارودۆخی مرۆڤانەش دەکا، لە لێکدانەوەی حاڵەتەکانی مرۆڤ..!

**رامان: ئەی بۆ مێژووت کردە سەرمەشقی پسپۆرییەکەت؟!**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** من لە دەرچووانی بەشی ئەدەبیاتم، لە قۆناغی دواناوەندیەوەش گزوڤت و حەزێکی زۆرم لە مێژوو کردووە.. کە لە بەشی شوێنەوارو شارستانی کۆلێژی ئەدەبیاتی بەغداش وەرگیرام، ئەوا مێژوو بوو بە بەشێک لە ژیانی پیشەیی و رۆشنبیریبیم، هەر بۆیەشە رووم کردە مێژووی کۆن و ناوەڕاست و نوێوە، بە تایبەتیش ئەوەی پێ ەندی بە مێژووی کوردو کوردستانەوە هەبێ، چونکە زەویەکی بەیارە و کەم کەس کێلاویەتی دیارە تۆمارکردنی مێژووی کوردو کوردستانیش پێویستی بە دەیەهای ەک من هەیە...!

**رامان: ئەی ئەم لاربوونەوەو مەیلەت بەرا بەر بە نووسینەوەی مێژووی هەولێرو کەڵەپیاوانی؟ ئەی بۆ زیاتر پشتت بەو سەر چاوە تۆمار کراوانە بەستووەو بەس؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** بەڕاستی بە ێکی نووسینەکانم هەر لە سەرەتاوە بەندبوو، بە مێژووی هەولێرەوە، بەڵام لە ه مان کاتا، مێژووی گەلێ لە هۆزەکانی زاگرۆسیشم تۆمارکردن.. ئەمەو لاربوونیـ ـم بۆ نووسینەوەی مێژووی هەولێر و کەڵەپیاوانی هەولێر و هەروا شوێنەوارەکانی هەولێر، لەبەر ئەوەیە چونکە ئەم شارە زۆر دێرینە و تەمەنەکەی خۆی لە قەرەی (٩) هەزار ساڵ دەدا و هەمیشە نیشتەجێ بووە.. سەرەڕای ئەوەش هەولێر شارێکی ەرە کۆنی کوردستانەو گەلێ قۆناغی جیاجیاشی دیوە.. لەم ساڵانەی دواییشدا ووم کردۆتە تۆمارکردنی ئەو بابەتانەی کە بەندن بە مێژووی کوردو کوردستانە ە وەک: (مێژووی زمانی کوردی) و مێژووی هۆزەکۆنەکانی زاگرۆس و مێژوو هاوچەرخی کوردو مێژووی کورد لە رووسیای قەڕاڵ و یەکێتی سۆڤیەتی جارا و مێژووی لوڕولوڕستان و میرنشینی هەزبانی..!

پشت بەستنیشم بە ژێدەرە تۆمارکراوە ان، ئەمەیان دەگەڕێتەوە سەرکەمی دۆزینەوەی شوێنەوارەکانی کوردستان.سە رەت بە مێژووی نزیکیش، ئەوا پشت بەستنم بە یادگاری بابە عەمرە تەمەندرێژە ان، کارێکە هەم سلبیاتی هەیەو هەم ئیجابیاتی خۆی، چونکە ئەو یادگارانەو ەو حیکایەتخوانیانە، بە شێوەیەکی تێکڕایی زۆر وردەکارانە نین. هیچ شتـ کش لە مێژوودا وەک (نووسین) و (تۆمارکردن) کاریگەر نییە، دەمێکیشە وتـ بانە:

(هەر شتێ کە بە قەڵەم نەنووسرێ بزر دە ێ) هەر بۆیەش نووسین و تۆمارکردن، یادگەی هەمیشە زیندووی مرۆڤن..!

**رامان: ئەی ئەم کەڵە پیاوانە لەلای تۆدا ـی دەگەێن، بەدلیسی..؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** مێژووی ـوردستان قەرزاری ئەم کەڵەپیاوەیە (شەرەفنامە)ش هێشتا نرخ و گەرم و گوڕی خۆی نەدۆڕاندوە..!

**رامان: ئەرنۆڵد توینبی؟!**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** (١٨٨٩-١٩٧٥) ئەم کەڵە مێژوونووسە بە تایبەتی لە کتێبە ناوبانگەکەیدا (بحث فی التاریخ) کە لە (١٢) بەش پێکهاتووە و (٢٧) ساڵێش پێوەی خەریک بووە، هەموو مرۆڤایەتی قەرزاریەتی، چونکە بەڕای ئەو (مرۆڤ)و دەوروبەر ناتوانن شارستانیەت بە تەنیا دروست بکەن، بەڵکو پەرەسەندنی مرۆڤایەتی لە گۆڕان و بەرەنگاربوونەوە سەرهەڵدەدا، نەک دەستەپاچەیی و ملکەچکردن بۆ دیاردە قورسەکانی سروشتی و کۆمەڵایەتی. سەرباری ئەمەش بڕیاری گۆڕان و بەرەنگاربوون دەخاتە بەردەستی (سەردەستە) نەک کۆمەڵانی خەڵک، کە ئەمەش زۆر ڕەخنەی لێگیراوە... بەهەر حاڵ ئەم مێژوونووسە مەزنە دژی جەنگ بوو، لایەنگری بزاڤی ڕزگاری بە خشانەی گەلانیش بوو..!

**رامان: ئەمین زەکی بەگ؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** یەکە مێژوونووسێکە کە کتێبێکی زانستی تێکڕایی لە بارەی مێژووی کوردو کوردستان و بە زمانی کوردییەوە نووسیبێ.. هێشتاش ئەو کتێبە ژێدەرێکی بە نرخە بۆ گەلێ لە لێتوێژەرەکان..!

**رامان: حوزنی موکریانی؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** زۆر باش لە مێژووی کورد گەیشتبوو، بەرهەمەکانیشی هەمووی بە زمانی کوردین، لە هەمان کاتا هەم کەڵەمێژوونووسێکە و هەم ڕابەرێکە لە بواری ڕۆژنامەنووسی و چاپەمەنی کوردیدا..!

**رامان دکتۆر کەمال مەزهەر؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** ڕووناکبیرێکی ناوداری کوردە، زۆر زانایانە خەریکی پسپۆریەتی خۆیەتی و زۆریش لەگەڵ خۆی ڕاستگۆیە و زۆریش دڵسۆزی کارەکەی، شێوازەکەی زانایانەیە و لەسەر مێژووی کوردو کوردستانیش بەردەوامە.. پایەی زانستیەکەی لەلایەن هەموانەوە دیارو ڕوونە..!

**رامان: دکتۆر جەمال ڕەشید؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** لە نزیکەوە نایناسم، بەڵام لە نووسینەکانی شارەزای بووم.. چونکە دکتۆر یەکێ لە زمانە سلاڤیەکان دەزانێ، بۆیە دەرفەتی بۆ خولقاوە تا سوود لە ژێدەرە ڕۆژاواییەکان وەرگرێ و ئەوەی یۆنانی و ڕۆمانییەکان لە بارەی کوردەوە تۆماریان کردووە بنووسێتەوە.. بەڵام چونکە زۆر گەلەکەی خۆی خۆش دەوێ، جارناجار زێدەڕۆیی لە بۆچوونی مێژوویدا دەکا، بە تایبەتیش لە مێژووی کۆنی کورد..!

**رامان: منذر الموصلی؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** هەندێ شت لەکەسایەتی ئەم کابرایە هەیە کە بە هیچ جۆری نایکا بە (مێژوونووس) بەڵام لە بەرهەمەکانی دا هەندێ شت هەیە سوودی لێوەردەگیرێ..!

**رامان: ڕەشید الفیل؟**

**زوبێر بیلال:** ئیسماعیل بەرەحمەتبێ، زۆر ناحەزی کوردبوو، نەشیدەتوانی ددان بەبوونی کورددا بنێ، بەڵام وەک گەلێکی موسڵمان ناوی کورد دەبا..!

**رامان: عزیز الحاج؟**

**زوبێر بیلال ئیسماعیل:** مێژوونووس نییە و نووسەرە.. بایەخی کتێبەکەشی (القضیة الکوردیة فی العشرینات) ئەوەدایە کە گەلێ دیکۆمەنتی تێدایە و بڵاونەکراوەتەوە لە بارەی کوردەوە بە تایبەتی لە نێوان ساڵانی (١٩٢٠-١٩٢١ز).. بەهەر حاڵ ئەم کابرایەش زیاتر تانەوتەشەر لەسەر کوردەکان دەداو بە سادەو ساویلکەش لە قەڵەمیان دەدا.. بەڵام بە هیچ جۆری ئامۆژگاریەکانی، گوماندارن و بێلایەن نین..!

**بەخششی بەردەوام**

**لە نێوان ساڵانی ١٩٧١-١٩٨٩ مامۆستا زوبێر هەولێری (٥) کتێبی مێژوویی بەچاپگەیاندووە...(٨) دەسنووسیشی ئامادەی چاپن، سەرباری ئەم لیستەیەی کە لە ژیانی پڕ لە بەخششی دا بە زمانی عەرەبی بڵاوکردۆتەوە، بۆیە وامان بەراست زانی ئەو گۆڤارو رۆژنامانەی کە ئەو لە ژیانیدا بەرهەمی تێدا بڵاوکردۆتەوە. یەکەیەکە ئاماژەیان بۆ بکەین، کە هەر هەموویان لە بارەی مێژووی کوردو هەولێرن، تا هەرکە و هەر لێتوێژەرێک بەوێ سوودی لێوەرگرێ، ئەوە هەر بەو زمانە و بەو سەرچاوانەوە رێکترو پوختترن... نیاز خوازیشین بەرهەمی قووڵ و بەپێزتری بەدوادابێ.**

**١- جریدة التآخي - (٨) لێکۆڵینەوە**

**٢- مجلة شمس کوردستان (٧) لێکۆڵینەوە**

**٣- مجلة هەولێر- (٤) لێکۆڵینەوە**

**٤- مجلة رۆشنبیری نوێ (٥) لێکۆڵینەوە**

**٥- جریدة العراق (٣) لێکۆڵینەوە**

**٦- مجلة الثقافة (١٠) لێکۆڵینەوە**

**٧- مجلة الحکم الذاتي (١٨) لێکۆڵینەوە**

**٨- مجلة کاروان (١٨) لێکۆڵینەوە**

**٩- مجلة التراث الشعبي (٢) لێکۆڵینەوە**

**١٠- مجلة المجمع العلمي الکوردي ( ) لێکۆڵینەوە**

**١١- مجلة الرسالة الاسلامیة (١) لێکۆڵینەوە**

**١٢- مجلة الاجیال (١) لێکۆڵینەوە**

**١٣- مجلة تەندروستی و کۆمەڵ (١) لێکۆڵینەوە**

**١٤- جریدة برایەتی (٥٩) لێکۆڵینەوە**

١٥- جريدة خەبات (٩) لێکۆڵینەوە
١٦- جريدة الاتحاد (١١) لێکۆڵینەوە
١٧- مجلة الاتحاد الدولی (١) لێکۆڵینەوە
١٨- لە کتێبی (اربیل في ظلال بیان اذار واربیل بین الماضي والحاضر) (٢) لێکۆڵینەوە
جگە لە چەندین وتارو لێکۆڵینەوەی تر لە نێو ئەم گۆڤارو ئەو رۆژنامەیەدا، چونکە ئەوەی باسمان کرد مشتێک بوو لە خەروارێک..!

تابلۆیەک
* ساڵی ١٩٣٨ لە قەڵای هەولێر لەدایک بووە.
* ساڵی ١٩٥١ خوێندنی سەرەتایی لە هەولێر تەواو کردووە.
* ساڵی ١٩٥٦ چووەتە کۆلێژی ئەدەبیات (بەشی شوێنەوار)و دوای چوار ساڵ بەکالۆریۆسی لە شوێنەوارو مێژووی کۆن وەرگرتووە.
* لە ژیانی مامۆستایەتی خۆیدا، گەلێ ناوچەو قوتابخانەی جیاجیای دیوە و دوای (٢٥) ساڵ خزمەت و لە ١٩٨٥/١٢/٣١ خۆی خانەنشین کردووە.

سازکردنی گفتوگۆ:
ئازاد عەبدواحید - مەحموود زامدار

### عەبدوڵڵا ئاگرین:

# ڕۆشنبیر ئەگەر گوێی لێ نەگیرا، بێدەنگ بێ باشترە

***بەڕێز عەبدوڵڵا ئاگرین لەناو بزووتنەوەی ڕۆشنبیری کوردی سالآنی حەفتا بە دوواوە بەهۆی کۆمەڵە چیرۆکەکانییەوە ناسراوە، لەو ساوە پەیتا پەیتا چیرۆک و وتاری ئەدەبی بڵاوکردووەتەوە. لەناو کێشمەکێش و زۆرانە ئەدەبییەکان و بەتایبەتی لە چالاکییەکانی یەکێتی نووسەرانی کورد ئاگەدارە، لە دیمانەیەکدا لەگەڵ گۆڤاری (ڕامان) سەبارەت بە بارودۆخی ئەمڕۆی ئەدەبی و ڕۆشنبیری و زۆر بواری قسە لەگەڵی دووایین.***

**ڕامان: وەک دەزانین تەمەنێکی زۆرت لەکاری ئەدەبی و ڕۆشنبیریدا بردۆتە سەر، بەڵام ماوەیەکە بێدەنگی، لەو بوارەدا دەکرێ بزانین هۆیەکەی چییە؟!**

**عەبدوڵڵا ئاگرین:** لە پێشەوە دەستخۆشانەی دەرچوونی گۆڤاری ڕامانی ئەدەبیتان لێدەکەم، کە دەزگای ڕاگەیاندنی ـ گوڵان ـ بڵاوی دەکاتەوە، بەڕاستی ئەو کارە، یەکێکە لەو پێداویستیانەی ئێستەی بزاڤی ئازادیخوازی گەلی کوردمان و بزاڤە ڕۆشنبیرییەکەی پێویستی پێیەتی پێم وایە بەلای کەمەوە پڕکردنەوەی کەلێنێکی ئەدەبی ڕۆشنبیرییە، سەبارەت بە بێدەنگیم لە بواری ڕۆشەنبیری و ئەدەبی و ئەوانەی دوورن لە بوارەکانی سیاسەتەوە، بێدەنگی گەلێ جار خۆی لە خۆیدا هەڵوێستە، من لە ڕۆژانی ١٩٩٣/٩/١ وە ڕاستەوخۆ لە نووسیندا بەشداری بزاڤی ڕووناکبیری و ئەدەبی و سیاسیم نەکردووە، دیارە ئەمە بەشی ڕاگەیاندنیش دەگرێتەوە، چ ڕۆژنامەو گۆڤار چ کتێب بێت، دیارە ئەمەش بەشێوەیەکی زۆر توندو تۆڵ و ڕاستەوخۆ پەیوەستە بەو زەمینەیەی تیایدا دەژیم مەسەلەی ڕاهاتن، هۆگربوون و زیاتر شارەزابوون، مەسەلەی زیاتر ساغ کردنەوەو خۆ ڕاهێنان لەگەڵ وەزعی نوێی من، پاشان ڕووبەرووی چیایەکی سەخت بوومەوە، ئەویش چیایەکە هەرگیز چاوەڕێم نەدەکرد، ئەویش ئەو شەڕە خۆکوژییەیە کە بەسەر میللەتەکەماندا سەپاوە، من بەش بە حاڵی خۆم بەردەوام بەسات و ئان، بەچاوترووکاندن لەگەڵ لێدانی ترپەی دڵدا، لەگەڵ ژیانی پڕ لە ژان و بەسوێی میللەتەکەمدا ژیاوم، گینگڵی پێوە دەخۆم و ئەو ئازارە لە دەروونمدا پەنگی خواردۆتەوە، وەک گڕکانێک زیاتر کاری کردۆتە سەر هەست و هۆش و بیرم، لێکم داوەتەوە، چۆن بۆی بچم، چی بڵێم، هەرچەندێک بیرم لێ کردۆتەوەو لێی هاتوومەتە پێش سەیرم کردووە سەری کۆڵانەکانم لێ گیراوە، دەزوولەکانم لێ قرتاوە، پردەکان هەمووی ڕووخاون،

واهەسەت دەکەم مرۆڤی رۆشەنبیر، مرۆڤی ئەدیب، مرۆڤی سیاسیی دڵسۆز وەک مۆمێک بۆ خێرو خۆشی و ئازادی و کامەرانی و سەربەستی میللەتەکەی دەژی، ئەگەر هەست بەوە نەکات لە هاتنە پێشەوەیدا خزمەتێ دەکات پێم وایە بێدەنگی باشترە، بەڵام ئەم دیدەنییەم مانای ئەوە نییە لە بواری ئەدەبی و رووناکبیری و سیاسیدا دابڕابێتم، بەڵکو پێداچوونەوەیەکی هەمیشەییم بووە، بڕواتان هەبێت خۆم بە خۆم ناتوانم بڵێم لەو ژیانە ئەدەبی و رووناکبیری و سیاسییەدا دابڕاوم، هەرچەندە ئێستە سیاسەت و رووناکبیری تێکەڵ بوون، چونکە هەموو سەرچاوەکان خزمەتی یەک دەریا دەکەن، ئەویش دەریای شارستانیەت و ئایندەی ئەو میللەتەیە، گەرلێکی بدەینەوە هەموومان خزمەتی ئەو دەریایە دەکەین کە پێی دەڵێین دەریای مرۆڤایەتی و ئەو راستە رێیەش کە هەموومان دەچینەوە سەری خزمەت بە مرۆڤایەتی دەکات. بێدەنگ بوونم ئەوە بووە کەمن شتم نەنووسیوەو بڵاونەکردۆتەوە، شتی خۆم هەیە کە گوزارشت لە ژان و ئازارو موعاناتی خۆم دەکات، پێم وایە هاوبەشی ئازاری میللەتەکەم لەم قۆناغەدا دەکەم و بەراستی بۆ ئایندەی میللەتەکەم دەسووتێم، هەر عاشقی وشەم و هەر لەگەڵ وشەدام، چونکە وشە بەلای منەوە، گەورەترین بوویەکی زیندووە، بۆ نموونە کاتێک لە کۆلیژی ئاداب بووم پاڵێورا بووم بۆ مەنصەبێکی وەزاری لە حکومەتی هەرێمدا، هەر ئەنجوومەنی زانکۆ پێیان وتم، ئەو کورسییەی لەسەری دادەنیشتم کورسی رۆشنبیری، کورسی ئەدەبی و خۆپێگەیاندن پێچکەکەی ناگۆڕمەوە بە کورسی هەموو وەزیرو وەزارەتێک.

**رامان: بەپێی ئەوەی باست کرد، وەک نووسین دانەبڕاویت، بەڵام وەک بڵاوکردنەوە بێدەنگیت، مادەم بەدووا داچوونی بەردەوامی کاری رۆشنبیریت هەیە، دەکرێت بزانین بزاڤی ئەمڕۆی رۆشنبیری کوردستان لە تێڕوانینی جەنابتانەوە لە چ ئاستێکدایە؟!**

**عەبدوڵڵا ئاگرین:** بەشبەحاڵی خۆم بۆچوونێکم بەرامبەر رووناکبیران و ئەدیبان و بزاڤەکەیشی هەیە، هەست ئەکەم پڕە لە شێواوی و ئاڵۆزی و لە ناهەقی کردن بەرامبەر بە وشە، ئەدی، وشەی رەسەن و ئەدیبی رەسەن، ئێستە من لە دوورەوە لەوانەیە باشتر بتوانم حوکم بدەم، ماوەیەکە ئەوانە لە راستە رێگەکاندا کار دەکەن من لە دوورەوە تەعقیب و سەیریان دەکەم، هەست دەکەم بزووتنەوەی ئەدەبی و رووناکبیری ئەمڕۆمان بە قۆناغ و پلەیەکی سەختتدا دەڕوات، کە ئێستە بەسەر کەسایەتی رۆشنبیرو ئەدیبەکانماندا رەنگی داوەتەوە، ئەگەر غەدر نەکەم و وبڵێم هەموو ئەدیبان و رووناکبیران بوون بە پاشکۆو سێبەری لایەنە سیاسییەکان و ئەحزابەکان و بوون بە تووتی و قەوانی ئەوان لێ دەدەنەوە، کەم ئەدیب هەیە لەوانەی ریزی خۆیان و کەسایەتی خۆیان پاراستووە، بەنموونە ئەدیبمان هەیە کە لە سەردەمی رێژیمی فاشستی بەعسدا نەک هەر هاریکاری و کۆمەکی دەزگا رۆشنبیرییەکانی ئەوسای سەردەمی بەعسی وەرنەدەگرت، بەڵکو تەنانەت بە نووسینی خۆی هاوبەشی هیچ جۆرە چالاکییەکی نەدەکرد، تەنیا ئەو نووسینە نەبێ

کەخۆی دەیویست و بێ سانسۆر بڵاوبکرێتەوە، بەڵام ئێستە هەسەت دەکەم، لەبەر دەرگەکاندا دەست پان دەکاتەوە، بەڕای من هەم ئیشەکەیان سووک کردووەو هەم رابووردوی خۆشیان تەڵخ کردووە، هەم رەنگیشی داوەتەوە لەسەر سەرجەم ئەدیب و رووناکبیراندا، دیارە ئەمە دەگۆڕێت، کەمن دەڵێم زیاتر لە کوردستانی باشووردایە، ئەگەر بچینە سەر بەشەکانی تری کوردستان ئەوە حەتمەن لەوانەیە تێڕوانینی تر هەبێت.

**رامان: مامۆستا باسی ئەوەت کرد کە لەسەردەمی رژێمدا هەندێ نوسەرو ئەدیب ئامادە نەبوون بەشداری چالاکییە ئەدەبییەکانیش بکەن، بەڵام ئێستە فێری دەست پانکردنەوە بوون لە حزبەکان، پێت وانییە ئەو گوناحە بۆ وەزعێکی سیاسیی بگەرێتەوە نەک بۆ ئەدیبەکان؟!**

**عەبدوڵڵا ئاگرین:** وەڵڵاهی من پێم وانییە بگەڕێتەوە، چونکە ئەدیبی رەسەن و سەربەست لەبرسا مردنی خۆی بەلاوە زۆر پیرۆزترە لەوەی بەژیانێکی پڕ لە رەفاهەت بژی، بەڵام بەدەست پانکردنەوەو چاوشۆڕ کردن، چونکە بڕوا ناکەم لە کوردستاندا کەس لە برسا مردبێت، گەر حاڵەتی واش ببی ئێمە زۆر لە زووەوە ئەوەمان بیستووە، خەڵک دەرگەی لەسەر ماڵ و منالی داخستووە ئاوی خستۆتە سەر ئاگر بۆ ئەوەی بڵێن چێشتی لێ ناوە، ئنجا منالەکانی مردوون و هاتوون جەنازەکەیان دەرهێناوە، یەعنی پێم وایە ئەبێ ئەدیب وەک ئیحتیجاجێک هەستێ قوربانی بۆ بدات، کە وشە یاخود هەستی پیرۆزی زۆر لەوە مەزنترە بەو ژیانە بژی و ژن و

## زۆر ئەدیبمان هەیە لەژێر منارەی هەڵوویستدا بازرگانی دەکەن

منالەکانی بە رەفاهیەت و وەک و خەڵکی تر بژین، وەک ئەوانەی کە بەکسبی حەرام یان بەشێوەیەکی نادروست ژیانی خۆیان بەسەر دەبەن، لەگەڵ ئەوەشدا من ئەوە دەڵێم کە بارودۆخە ئابوورییەکە ژیانەکەی زۆر سەخت و گران و تەنگژەی دروست کردووەو بەشیکیشی دەگەڕێتەوە بۆ حزبەکان و لایەنە سیاسییەکان، دەکرا نەهێڵێم ئەو ئەدیبە دەست پان بکاتەوە، با وەک سەردەمی کۆن با لە قۆناغەکانی مێژوودا زۆر ئەوانەمان بینیوە، کە دەستڕۆیشتووە، یان دەوڵەمەندێکی ئەهلییە، زانیویەتی ئەدیبێ پێویستیی بە یاریدەیە بۆ ئەوەی سووک و ریسوا نەبێت چووە لە پەناوەشتی داوەتێ، دەکرا ئەم ئەحزابە دەست رۆیشتووانە بێ ئەوەی ئەوان داوایان لی کردبا، خۆیان هەستیان بی کردبا، ئێستە من بەش بەحاڵی خۆم ئەزانم لە کوردستانەکان کام ئەدیب پێویستی بە یارمەتییە، کام ئەدیب بمرێ لە برسان نەفسیەتی هێندە بەرزە داوای دە فلس ناکات، داوای کیلۆیەک ئارد ناکات، ئەدیبی تریش هەیە کە وەڵڵاهی هەشیەتی و کەچی هەر ئەپارێتەوەو دەلالێتەوە، دەشێت ئەو لایەنانەی دەست رۆیشتوون تەقدیری ئەو خەڵکە بکەن و نەیانخەنە

ئەو مەزەللەیەوە، هەموو مانگێ هاریکارییەکی موحتەرەم وەک هەموو ئەو ملیۆنان دینارانەی دەڕوا بە فیڕۆو یان ئەدرێ بە فیشەک و ئەنرێ بەسەر سنگی یەکترەوەو، یان دەکرێ بە ئاگرو بەئاسماندا بڵاودەکرێتەوە، کەمێک لەو پارەیە بدرێ بە ئەدیبێک و لە ماڵی خۆی وەک خانەنشینێک دانیشێت و بی ئەوەی لای کەسیش بیڵێ و بێ ئەوەی کەسیش داوای هەڵوویست و پشتگیری لێ بکات، بابڕوا بۆ خۆی لە ماڵەوە دانیشتێت خەریکی بەرهەم و کاری ئەدەبی خۆی بێت..

**ڕامان: بەو شێوە دەکرێ چەند پڕۆژەیەک دابمەزرێت و ئەدیبەکان دوور لە مەسەلەی حزبایەتی کاری تێدا بکەن، تا پێویستیەکانی خۆیانی پێ دابین بکەن، لەو دەسپێشخەرییانە ئێستە گۆڤاری ڕامان کە گۆڤارێکی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی دوور لە هەموو مەسەلەیەکی سیاسییە، بەروونیش داوا لە نووسەرانی هەموو چین و توێژێک دەکات، بەبێ جوداوازی نووسینی خۆیانی تێدا بڵاوبکەونەوەو لە هەمان کاتدا پاداشتی خۆشیان بەرامبەر بە نووسینەکە وەردەگرن، پڕۆژەی ڕامان دەکرێ پڕۆژەیەک بێت لەو بابەتانەی کە هاریکاری نووسەرانیش بکات و هەنگاوێکی ڕۆشنبیریش بێت؟!**

**عەبدوڵڵا ئاگرین:** لەو بارەیەوە چارەسەر زۆرە یەکێک لەو چارەسەرانە بۆ ئەوەی نەفسیەتی ئەدیب نەشێوێ، بۆ ئەوەی سەری بڵندو بەرزبێت و دەنگی نێر بێ و خاوەنی وشەی خۆی بێ، بۆ ئەوەی ئیجبار نەبێ لەژێر پاڵەپەستۆی بی دەرامەتی و برسێتی و تینوێتییدا، یان رووت و قووتی ماڵ و منداڵیدا پەنا بەرێت بۆ هەندێ کار کە دەبێتە مایەی سووک کردنی، دەکرێ حکوومەتی هەرێم بەهەردوو فراکسیۆنەوە یان ئەو دوو حزبە لە هەردوو بەشەکەیەوە پرۆژە دابنێت، بۆ نموونە چاپخانەیەک دابنێن و با کادیرەکانی خۆیان نەبێت و کەسانێکی ئەدیب دانێن نەک پارەیان بەنێ و لەماڵەوە دابنیشن و، حەقی ئەوە مانگی ٥٠٠ دینار یان دوو هەزار دیناری بدەنێ و پێی بڵێن منەتیان بەسەردا بکەن موقابیلی ئەوەی شەش سەعات کارمان بۆ بکەیت، یان لە ڕۆژنامەکاندا مەرج نییە ئیلاوبیلان نووسەری ئەدیب نووسەری سیاسیی بێت، دەتوانی پێی بڵێی تۆ وەرە سەبارەت بە مێژوو بنووسە، یا لە بارەی بزووتنەوەی ئەدەبی لە ئەفریقیا، تۆ عەرضی لایەنێکی ڕۆشنبیری بکە، دەکرێت وایان لی بکەن تووشی زەلیل بوونیان نەکەن، ئەگەرچی ئەدیبی نەفس نزم زۆرە، ئەدیب هەیە لەژێر ڕەشماڵی وشەی پیرۆزی کوردیدا، لەژێر منارەی هەڵوویستدا دێت بازرگانی دەکات. بەناوی ئەدەبیشەوە دێتە پێشێ و بەهەرزان دینار دەسکەوتی دەبێت بەو بیانووەی یارمەتی فەقیرو فوقەرا دەدات، بەڵام ئەمانە ئەدیبی چڵێسن و شەرمە لە ئەدەب و لەوشەش نزیک ببنەوە، چونکە چاویان لە گیرفانی خۆیانە، چاویان لەوەیە چۆن ئیستغلالی لایەنی لاواز بکەن، هەندێ ڕۆشنبیرو ئەدیب لەژێر سایەی کەسێکدا، یان لایەنێکدا بەزمانی لووس پارە وەردەگرێت کە گوایە خزمەتی براقی ڕۆشنبیری و رووناکبیری کوردی دەکات، بەڵام لە هەمان کاتدا زۆر نادروستانە چاڵ بۆ ئەو لایەنە هەڵدەکەنێت، سووکایەتی دەخاتە پاڵ ئەو لایەنەو بێ شەرمانەش دەچێت دەست پان دەکاتەوە، ئیتر چەم بێ

چەقەڵ نابێت، بەڵام چارەو ڕێگە زۆرن بۆ ئەوەی ئەدیب سووک و ڕیسواو زەلیل بن..

**ڕامان: بەسیفەتی ئەوەی ئەندامێکی یەکێتی نووسەرانی کوردی هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە، دەکرێت پێناسەیەکی ئەو یەکێتیەمان بۆ بکەیت کە لە چ ئاستێکدایە..؟!**

**عەبدوڵلا ئاگرین:** یەکێتی نووسەرانی کورد سەربە هەموو چین و توێژو لایەنە سیاسیەکانن ئەدیب خۆی بەخۆی دروست کردووە، مانای حزبێک ناتوانێت کۆلێژی دروست کردنی ئەدیبان بێ، لەبەر ئەوە ناتوانین تەواو دەستی بەسەردا بگرین و بڵێین ئەمە سەر بە فلان لایەنەو ئەو لایەنە دروستی کردووە، لەوانەیە کابرایەک زۆر دەوڵەمەند بێت بەواتای تەقەدومیەکان دەرەبەگ و ئاغا بێت، کەچی شاعیرێکی زۆرباشیش بێت، ئەدیب و ڕووناکبیری زۆرچاک بێت، مێژوونووسی زۆرچاک بێت یان لاوێک لە چینێکی زەحمەتکێشەو شاعیرو ئەدیبێکی چاکە، بەگشتیی لە چوارچێوەی ئەو هەیکەلەی کە یەکێتی نووسەرانی کوردی تیا کۆبوونەتەوە، یان ئەو ڕەشماڵە یان ئەو قووبەیەی کۆیکردونەتەوە دەتوانم بڵێم ئێستەی بە ناخۆشترین یان بەزەبوونترین قۆناغی نووسەراندا تێدەپەڕێت، ئەمە جگە لەوەی کۆمەڵێ ئاژاوەو ئاڵۆزی و بەربەرەکانێ و ناحەقی و نامەشروعی و خۆهەڵواسین بەم لاوبەولادا تەنیا لە پێناوی ئەوەی شتێکیان دەست کەوێت، قسەکانیشم قەد شامیل نییە، ئێستە هەست دەکەم ئەگەر بەراوردی بکەینەوە لەگەڵ سەردەمی پێش ڕاپەڕین، یان دووای ڕێککەوتننامەی (١١)ی ئازار جیاوازییەکە زۆر زۆرە، ئەدیب ڕێزێکی زۆری هەبوو یەکێتی نووسەران ئیحترامێکی زۆری هەبوو، ئەدیب لە دووای ئەوەی شۆڕشی ئەیلوول، لە دووای ئەو پیلانە سەرسەختە ناهەموارەی نێوان داگیرکەران و کۆنەپەرستەکانی عێراق و ئێران و بە دەلالی هاواری بۆمدیان و جەزائیر رووی دا، جگە لەوەی نەخشەکێشی گەورەی دژمن بە میللەتەکەمانە، لەو کاتەدا ئەدیب تەنیا لایەنێ یان کۆمەڵێک بوون کە لەسەر شانۆی بەرگریکردن لە دژی زوڵم و داگیرکەری بەعەس و هەموو دژمنەکانی کورد بوون.

ئەدیب هۆیەک بوو بۆ یەکگرتنەوەی باڵەکانی کورد، ئێستە بەداخەوە ئەدیب و قەڵەم بووە بەبەشێک لەو سوتەمەنییەو گڕی ئاگری دووبەرەکێ و شەڕەکە خۆش دەکەن جگە لەوەی ئەم ڕۆڵە ناهەموارە دەبینێ وەک باسیشم کرد بەراستی ئەدیب خەریکە ئێستە سووک دەبێت و بە بیانووی بێ کاران و هەژارانەوە گیرفانی خۆیان پڕ دەکەن، تەنانەت کار گەیشتۆتە سەر ئەوەی لە تەلەفزیۆن و ڕادیۆکاندا لە شاری سلێمانی بڵێن ئەدیبێک ئەمەی کردووە.

**ڕامان: مامۆستا ماوەیەک لەمەوبەر سەردانی کوردستانی ئێرانت کرد دەکرێت پێمان بڵێی لە بوارە ڕۆشنبیرییەکاندا لەوێ چیت دەست کەوت؟!**

**عەبدوڵلا ئاگرین:** بەراستی من بۆ چارەسەرو تیمار کردنی خۆم چووم، بەڵام ئەوەم بە هەلێکی باش زانی کە بیقۆزمەوە بۆ بەسەر کردنەوەی ئەو برا خاوەن قەڵەمانەی

که له کوردستانی ئێراندا دەژین، ئەو گەشتەی دەستم پێ کرد، لەناو شارەکانی ڕەزائیە، ورمێ، مەهاباد، بۆکان، سەقز، بانە، کوردستان، کرمانشان، کە هەریەکەیان شەوو ڕۆژێکی تێدا مامەوە، کۆمەڵێ ئەدیب و ڕۆشنبیرم بینی کە هێواش هێواش بۆ بزاڤی روناکبیری و ئەدەبی کوردی دەسووتان، ئەمانە بەحەق خۆیان بە خەمخۆری کێشەی میللەتەکەی خۆیان دەزانن، من هەستم کرد بزووتنەوەیەکی زۆر لەسەرخۆ و بەشێنەیی و بە شێوەیەکی زۆر سروشتی لەدایک بووەو خەریکی نەش و نوماو گەورە بوونە، بەرسکاوی قۆناغێکە زۆر ئاسایی سەری هەڵداوە، بێ پێشبڕکێی ناهەموار، بێ هاندان لەلایەن ئەم حزب یان ئەو حزب، کۆمەڵی ئەدیب و رووناکبیرو گەنجی لێهاتوو هیوایەکی زۆر گەورەیان لێ دەکرێت، ئەمانە تەنیاو تەنیا خۆیان بۆ ژیانی ڕۆشنبیری و ئەدەبی دوور لە حزب و سیاسەتە وشکەکە تەرخان کردووە، ئەوەی منی دڵخۆش کردووە بەنیسبەت ئەو بزاڤەوە ململانێی حزبایەتی تیکەڵیان نەبووە، مانای کەسیان سەودای حزبێ نین، کە هەر کەسەو بەلای حزبەکەی خۆیدا بەحەق یان بە ناحەق رابیکێشێت، ئەمە کارێکی گەورەو سەرکەوتوو و بە هێزە بۆ ئەوەی ئەو کۆمەڵە لاوە یەک بگرن.

هیچیان چاوەڕێی پاداشت نین و پیش یەکتر بکەون، هەموویان ئەو خولیایە لە سەریاندایە، لە بواری ئەدەبی و ڕۆشنبیریدا زیاتر خزمەتی میللەتی کورد بکەن، من هەست دەکەم پێوەندییەکی ڕۆحییان لە نێواندا هەیە، ئەمانە دەیانەوێت لە داهاتوودا کارێکی گەورەی ئەدەبی پێشکەش بە میللەتەکەیان بکەن، کە ئێمە لێرە خەریکە کایەو مایەی سیاسیی و ئەدەبی و ڕۆشنبیری و هەموو شتێکمان لەدەست دەدەین، ئەوان هێواش لەو بارەیەوە.. بونیادی تەلاری داهاتووی خۆیان دەکەن.

**ڕامان: مادەم بزووتنەوەیەکی وەها هەبێت، حەقەن دەبێت چەند دەزگایەکی ڕۆشنبیرییان بنیاد نابێت و ڕەنگە بلاوکراوەو شتیان هەبێت دەکرێت ئاماژەیەک بەوە بدەیت؟!**

**عەبدوڵلا ئاگرین:** سەبارەت بەوەی خۆیان دەزگایان دروست کردبێت، ئەو ئەدیب و ڕۆشنبیرانەی بینیمن و لەگەڵیان دانیشتم ئاڵوگۆڕی ئازارەکانمان کردو باسمان لە ژانی میللەتەکەمان کرد، لە دەرگەو پەنجەرەو دنیایەکی نوێوە هاتینە ناو مەسەلەکانەوە، هەستم کرد ئەوانە دووبەشن بێوەندییەکی ڕۆحی نوێ لە نێوانیاندا هەیە، ئەدیبێ یان وەزیرێکی کرمانشان لەگەڵ نەغەدەدا پێوەندی هەیە، بەڵام پردی بێوەندی تەنیا وشەو ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردییە، لە نێوان خۆیاندا پێتاکیان کۆمەکییەو پرۆژەیان لەبەردەوامدایە دەستە جەمعی خۆیان هەیە، ئەوان ناتوانن خۆیان دەزگایەک دروست بکەن، لە کوردستانی باشوور تا ئێستە نەیانتوانیووە دەزگای گەورەیان هەبێت، لەوێ ئەدیبێک خۆی دەسووتێت و هێواش هێواش لەگەڵ موشکیلەی خۆیدا دەژی، بەڵام لە ئێراندا لە سەردەمی ئینقیلابی کۆماری ئیسلامی ئێراندا دەزگایەک هەیە بەناوی ـ ئینتشارات سەلاحەدین ـ ئەمە کۆمەڵێکیان کۆکردۆتەوە، مەڵبەندەکەی شاری ئورمیەیە یان ڕەزائیەیە، ئەمانە طابیعی ڕەسمی

دەوڵەتییان پێوەیە، بەڵام کاری ئەدەبی و رۆشنبیری دەکەن، گۆڤارێ بەناوی ـ سروە ـ دەردەکەن، بەڕای من وەک دەستە جەمعی ئەدیبان و وەک و دەزگایەکیش هەست دەکەی دەنگی ئەذیبە رەسەنەکان لەناو ئەو گۆڤاری سروەیەدا هەن، هەروەها دەسگیرۆیی هەندێ ئەدیب و رۆشنبیر دەکات، چونکە رەسمییە، یان هەندێ جار کتێب چاپ دەکەن وەک دیوانی مەحوی کە لەوێ چاپی نوێ دەرچووە و نووسراوە لە بڵاوکراوەکانی دەزگای سەلاحەدین یان سروە، وەک چۆن لێرەش کاتی خۆی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی هەبوو دەزگایەکە وەک ئەو مۆرکی رەسمی دەوڵەتی هەیە، بەڵام خزمەت بە ئەدیبان دەکات.. ئەدیبم بینیوە لە شاری ـ بانە ـ کاربەدەستێ بووە، بەڵام لەسەر هەندێ هۆی تایبەت لەسەر فەرمان و وەزیفە نەماوە، ئێستە کاسبی دەکات و خەریکی سەوزە فرۆشییە، خەریکی فرۆشتنی کەل و پەلی ناوماڵە، لە چیشتخانەیەکەدا کار دەکات، بەڵام دووایی کاری رۆژانەو مسۆگەرکردنی پارەیەکی باش بۆ ژیانی پڕ نەوازشانە، شەوێ دادەنیشێ شت دەخوێنێتەوە، تا سەعات چواری بەیانی، ئەمە یەکێکە لەو کارە دڵخۆشکەرانە، هەست دەکەم هەندی ئەدیب لەوێ بە بەراوورد لەگەڵ چیرۆکنوسەکانی باشووری کوردستاندا کامیان زۆر لە پێشەوەیە بە بەرواوورد لەگەڵ ئەواندا پێشی ئەمانەی لای خۆمانە، چەندان بەرهەمی ئەدەبییان هەیە، هەم وەک چیرۆک و هەم وەک شیعر، ئەمانە بڵاو دەکەنەوە، لەو گەشتەدا کە بە شارەکانی کوردستاندا کردم چیرۆکنوسێ ناوی عەتای نەهاییە ئەمە دوو کۆمەڵە چیرۆکی هەیە، یەکێکیان بەناوی ـ تەنگانە ـ، ئەوی تر بەناوی ـ زریکە ـ، تەنگانە دووای زریکە دەرچووە.

کۆڕی بۆ گێڕدراوە، لەو کۆڕو کۆبوونەوە ئەدەبییانەدا تەنها باسی ئەدەب کراوە نەک سیاسەت، لە هەموو کۆڕەکاندا باسی تەنگانەی ـ عەتای نەهائی ـ کراوە، خەڵک دووای ئەوە لەسەر حیسابی خۆی یان بە کۆمەڵ کتێب چاپ دەکەن، فەرهەنگی مەعنوی ئەمە فەرهەنگیکی زۆر گەورەیە، یەکێکە لە عالیمەکانی ئێرانی کە دەریکردووە، کە سەرمایەیەکی فەرهەنگی زۆر گەورەیە، زانیاری و زانستی زۆری تیایدایەو لەهەموو رووەکانی ئەدەبی و مێژوویی و کلتوورییەوە دەریاچەیەکە، بەراستی ئنسکلوپیدیایەکی ئێرانیە، لەوانەیە شەش هەزار لاپەڕە بێ هەر دوو سەد لاپەڕەی داویانەتە دەست کۆمەڵە گەنجێک لە مەهاباد، هەرکەس بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێت کە وەریگێڕێتە سەر کوردی، مەسەلە لە (دیواندەرە) یان لە (بانە) بە کۆمەڵێ ئەدیب دەڵێن ئەم دووسەد لاپەڕەیە لە ماوەی مانگێدا وەرگێرنە سەر زمانی کوردی، ئەو زاراوانەی کە لە شاری مەهابادە جیاوازە لەوانەی لە سنەو بانەو شوێنەکانی تردا هەیە، پاش ئەوەی وریدەگێڕنە سەر زمانی کوردی بەو شێوەیەی خەڵکی مەهاباد قسەی پێ دەکەن وەک دەڤەر یان زاراوە، دووایی ئەم دوو سەد لاپەڕە تەواو بووەی (مەهاباد)دەدەنە دەست ئەوانەی (سنە) ...

بزانە چەند وشەی وەک لای ئەوانیش بەکار دەهێنرێ، ئەگەر وشەیەکی تر هەبێت جگە لەو وشەیەی ئەوان دایانناوە ئەمانیش بنووسن، بەمە سیفەتیکی زۆر گەوردی

کولتوری کوردی دەکرێت، ئەوسا ئەوەی دەیخوێنێتەوە دەزانێ بۆ نموونە (تەننانە) لە مەهاباد تا نەغەدە چی پێ دەڵێن، لەوانەیە تەنگژە بێت یا لە شوێنێ تر پێی دەڵێن ـ ئاڵۆزی ـ ئەوسا دەڵێن کورد ئەوە بەو وشەیە دەڵێ، لە هەموو شارەکانی کوردستاندا، بەڕای من ئەگەر ئەم پرۆژەیە سەربگرێت ئەمە کارێکی زۆر گەورەیە..

**رامان: بەپێی ئەو دانیشتنانەت لەگەڵ ئەدیبانی ئەوێدا سەروبەندیان لەگەڵ ئەدیبانی فارس یان بێگانەدا چۆنە؟!**

**عەبدوڵلا ئاگرین:** رووناکبیری هەموو شارەکانی کوردستانی ئێران بێ ئاگا نیین لە بزووتنەوەی روناکبیری کوردستانی باشوورو هەم دەرەوەی کوردستان، ئەو گۆڤارو رۆژنامەو کتێبانەی لە ئەوروپا دەردەچن پێیان دەگات و دەستاو دەست دەیگێڕن، یەکێک لەو گلەییانەی ئەوان هەیانبوو ئەو بەرهەمە ئەدەبی و سیاسیانەیە کە لە کوردستانی باشوور دەردەچن و کەناڵێک نییە پێیان بگەیەنێت، ئەوان زۆر بە پەرۆشەوە لە چاوەڕوانی ئەوەدا بوون کە گۆڤاری گولان لە کاتی خۆیدا پێیان بگات، هەروەها برایەتی و خەبات و گولانی عەرەبی و ئەم ـ رامانە ـ من لەوێ بووم ژمارە (١)ی گەیشتبوو، ئەوان بە پەرۆش بوون هەموو ئەو بەرهەمانەی ئێرەیان پێ بگات، بەرهەمەکانی ئەوانیش بگەنە ئێرە، بەش بەحاڵی خۆم هەستم کرد ئەوان وێڵن بەدووای ئەو بەرهەمانە، هیچ نەبێ بۆ ئەوەی لە فیکری یەکتری تێبگەن، ئەوان موتابەعەی بەردەوامیان هەیە لەسەر ئەو جووڵانەوەیەی بواری وەرگێڕان لە ئێراندا هەیە، چونکە هەر بەرهەمێ لە جیهاندا دەربچێت ناڵێم رۆژی یەکەم، بەڵام لەوانەیە هەفتەی یەکەم یان لە مانگی یەکەمدا بۆ سەر زمانی فارسی وەردەگێڕدرێن و لەبەر ئەوە ئەوان ئاگەداری بزووتنەوەی رۆشنبیری کوردستانی ئێمەن، هەرچەندە کەمیش بێ، بەڵام لەهی دەرەوە زیاتر ئاگەدارن.

هەستم دەکرد سەرچاوەکانی خۆیان، ئەوانەی دەیکەن بە کانگای هەڵێنجانی رۆشنبیری و ئەدەبی و فەرهەنگی لە هی ئێمە زیاترە، ئەوان زیاتر پێوەندییان بە کەناڵەکانی دنیاوە هەیە، بەپێی ئەو بەرهەمانەی ئەوان هەیانە دابڕاونین لە شارستانیەتی دەرەوەی خۆیان، بە پێچەوانەی ئێمەوە، لای ئێمە گۆڤارو رۆژنامە لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر گەر بە دەست یەکێکەوە بێت وەک قومبولەو تی ئێن تی حیسابی بۆ دەکرێت و لەوانەیە دووچاری گرتن و ئەشکەنجەدانی بکات، ئەو پارچە زەوییە کەمەی ناوی ئازادیمان لە سەر داناوە خەریکە کولتوورو رۆشنبیری خۆمان تێیدا بۆ دوو شێوەو دووبەش دادەبڕێن و لێکی دەترازێنین..

**رامان: تۆ بڵێیی ئەوان بەو بزاڤە رۆشنبیرییەیان تۆڵەی بزاڤی سیاسییان کردبێتەوە..؟!**

**عەبدوڵلا ئاگرین:** من خەریکە وا دەڵێم، کە بەو شوێنانەدا تێ دەپەڕیم دەمووت خوایە لێیان تێک نەدەیت، لە مەسەلە ئەدەبییەکەداو مانای وەزعی ئێمەیان لێ بەسەر نەیێ، لە سایەی حکوومەتی هەرێم خەڵکێک لێرەوە نەتوانێت بچێتە سەلاحەدین کە ماوەی چارەکە سەعاتێکە، یان بچێتە هەولێر، مانای لەوێ بەدرێژایی وڵاتەکەدا دەڕۆیت و کاری رووناکبیری و ئەدەبی خۆت دەکەیت، لەوێ

بزاڤەکە زۆر بە هێزەو ئومێدم پێیانە، یەکێک لەوانە برای چیرۆکنوس عەتای نەهایی تا ئێستە دوو کۆمەڵە چیرۆکی بە چاپ گەیاندووە یان ـ مێژووی مۆسیقای کوردی ـ کە برای خۆشەویستم کاک محەمەد حەمە باقی تەئلیفی کردووە، ئەوەی بیخوێنێتەوەو سەرنجی خۆی بداتێ، بۆی دەردەکەوێ لە شوێنێکی وەک ئێراندا کتێبێکی وەها چاپ بکرێ، کە مێژووی شارستانیەتی کوردە لە زۆر رووەوە، لەلای ئێمە ئەو ئەدیب و رۆشنبیرانەی خۆیان بە شەڕە قسەو شەڕە جوێن و سوتووی ئاگری شەڕی برا کوژی و میللەت کوژی و ئایندە کوژی کورد خەریک دەکرد، با خۆیان بە تەئلیفی کتێبی وەهاوە خەریک بکردایە، ئنجا تەماشای ئەو هەوڵە جوامێرانەیەی کاک محەمەد حەمە باقی و ئەو هەوڵانەی لای نووسەرانی ئێمە کە تیجارەت بە ئەدەب و رۆشنبیرییەوە دەکەن، چەند جوداوازن لە یەکتر، لە کاتیکدا ئەو بەژیانێکی کوڵە مەرگ و کەم دەرامەتی دەژی، بەڵام سەر بەرزی و سەرفرازی خۆی لە دەست نەداوە.. بزاڤە رۆشنبیرییەکە لەودیو بواری سێ گرتۆتەوە:

١ـ تەئلیفاتی چیرۆک و نوسین ٢ ـ شیعر ٣ ـ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی.. ئنجا وەرگێڕانیش سیمایەکی دڵخۆشکەری لەوێ هەیە یەکێک لەو کتێبانەی لەم دواییەدا بۆ سەر زمانی کوردی وەرگێڕدراوە، کتێبێکە بە ناوی ـ ئەفسەرانی خوراسان ـ ئەمە باسی ئەبو حەسەن تەفرەشیانە کە لە سەردەمی ئەوسای شا، کۆمۆنیست بووەو هەولێکی داوە سەری نەگرتووە، پاشان کە کۆماری ئەزەربایجان و مەهاباد دامەزرا ئەوان ناردیانە ئێرەو لەگەڵ بارزانی دا کاری کردووە، مەبەست لەوەیە ئەوان خەریکی ئەو بەرهەمانەن کە وەربگێڕنە سەر زمانی کوردی، یان وەرگێڕراوەکان ـ صۆفیایەکی کارۆخی ـ وەرگێڕەکەی سەیید محەمەد صەمەدییە.. دەیان کتێبی وەها هەیە وەریان گێڕاونەتە سەر زمانی کوردی، تەئلیفیش لایەنی دووەمە.. وەرگێڕانیش دوو لایەنە:

یەکەمیان لە فارسییەوە بۆ کوردی، لایەنی دووەمی لە زمانە پێگانەکان کراوون بە فارسی و دیسانەوە وەردەگێردرێنە سەر زمانی کوردی، ئەو دەزگایانەش کە هەن بۆ ئەوەی گورو تەوژم بدەن بە بزووتنەوەکە دێن ئەو کتێبە بە نرخانەی لێرە دەرچوون وەک خۆی دەقەکەی چاپ دەکەنەوە، لەوانە دیوانەکانی نالی و مەحوی بەش بە حاڵی خۆم من پێم وتن نەهێڵن کەسیان جسمی غەریبتان تێکەڵ بێت کە دایبشکێننەوە بەلای لایەنێکدا، ئەوانەی لەوێن حزبایەتییان تێ نەکەوتووە، ئەگەر ئەوان بتوانن سیمای خۆیان بپارێزن ئەوە خزمەتی باشی ئەدەبی میللەتەکەیان دەکەن، من بەش بەحاڵی خۆم هەر ئەوەم بۆیان دەوێت، چونکە بەو شێوە دەتوانن کەڵک بە میللەت بگەیەنن، ئەگەر لەپاڵ حزبەکاندا ئەدەب و سیاسەتیش بکەن لە هەردوو لادەشێوێ..

**رامان: دوواجار حەز دەکەین گەر پێشنیازت هەبێ بۆ گۆڤاری رامان پێمانی بڵێین؟**

**عەبدوڵلا ئاگرین:** بەنیسبەت رامانەوە جارێ ژمارە (٢)یم نەخوێندۆتەوە، بەڵام هەست دەکەم بەپێی رێچکەی ژمارە (١)ی گۆڤاری ـ رامان ـ ئەمە ئەو رێچکەیەیە

کە ڕۆشنبیرو ئەدیبەکانی کوردستانی ئێران لەسەری دەڕۆن، نەهێڵن مەسەلەی حزبایەتی و شەخصی تێ بکەوێت زۆر بە تۆخی خۆی تەرخان بکات بۆ مەسەلەی ئەدەب و روناکبیری بەبێ جیاوازی فیکر و بیکاتە سەکۆیەکی ئازاد، چونکە من هەست ناکەم ئێستە ئازادیمان هەبێت، منێک کە نەتوانم بچمە هەولێر، ئەدیبانی هەولێر نەتوانن بێن بۆ دهۆک هەر بەرهەمێکی ئەدەبی بە پەساپۆرتیش بڕ نەکات بۆ دەڤەرێکی تر باشە ئەمە چ ئازادییەکە، با ئەم گۆڤارە ببێ بە سەکۆیەکی ئازاد، وایدابنێین کە چوارچێوەی باخچەیەکە، تەلارێکە بەرزدەبێتەوە هەموو دنیا تەماشای دەکات، پەخشی دەنگی ئازاد کراوە بەبی جیاوازی بیرو بڕواو ئینتمای حزبایەتی و سیاسەت، داواش لە هەموو ئەدیبێکی رەسەن دەکەم هاریکاری گۆڤاری رامان بکات و دەنگی خۆی لەوێوە بە جیهان بگەیەنێت، هیوام وایە لەناو خەڵکدا گزنگی خۆرو ئەزموونێکی نوێ بێت، هیوادارم کەسایەتی رۆشنبیری و ئەدەبی خۆی نەدۆڕێنێت..

**عەبدولڕەحمان کاکل ئامادەی کردووە**

**نەجیبە ئەحمەد:**

# زۆربەی کاری ئەدەبی و خوێندنەوەم لە موبەق ئەنجام دەدەم

*نەجیبە ئەحمەد وەک قەڵەمێکی بوێری ئافرەتانی کورد لەهەشتایەکانەوە دەرکەوتووەو توانیویەتی هەست و موعانات و ئەندێشەی ئافرەت بەرجەستە بکات. ماوەیەکە لە بەرهەمەکانی بێئاگا بووین، بەپێویست زانرا ئەم دیمانەیەی لەگەڵدا ساز بدرێ.*

**رامان: لە چەند ساڵی رابوردوودا وەک ئافرەتێکی کورد هەوڵتان داوەو دڵ ودیدەمان بە چەند چاپکراوێکتان رۆشن بووەتەوە «خاکی دایک - رۆمان- ساڵی ۹۸۶ - بەرگی یەکەم /۹۹۲ - بەرگی دووەم» «راسان - کورتە چیرۆک ۹۹۳ - ۹۹۵» «بەهارە گریان - کۆمەڵە شیعر» واتە بەرێزتان لە سێ مەیدانی ئەدەبیدا کاری بەجێ و شیاوتان بەسەرکەوتوویی ئەنجام داوە، ئایا نووسەرێکی کورد پێویستە لە چەند مەیدانێکی جیاوازدا کاربکات و خۆی بنوێنێ، یان یەکێ لەمەیدانەکان هەڵبژێرێ..؟!**

**نەجیبە ئەحمەد:** کاری هونەریی بەگشتیی جۆرێکە لە دەربڕینی هەست و دروست کردنەوەو دارشتنەوەی ژیان، رەوتی ژیانیش هەر لەیەک جێگەدا وبەدەوری خۆیدا ناخولێتەوە، بەڵکو ئەم رەوتە هەمیشە لە گۆڕان و پەرەپێداندایە، بۆیە ئەم رووداو و گۆڕانکارییانەی رۆژانە روودەدەن بۆ من هەریەکەیان قاڵبێک، کراسێک پڕ بەبەری دەبێت، هەندێ مەسەلە کە لەدایک دەبێت لە پەنجەرەی شیعرێکەوە چاوشارکێ لەگەڵ رۆح و هەستمان دەکات، رووداوی وایش دێتە پێشەوە کەهەر لەدنیای چیرۆکدا دەتوانم مامەڵەی لەتەکدا بکەم، هەریەکە لەم بابەتە هونەرییانەش هەلومەرجی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام لەهەموو بابەتەکاندا (جدییەت و هەستکردن بە مەسئولییەت) لەبەرامبەر بچووکترین زەرەی ئەو بابەتە بڕیار لەسەر زۆرشت دەدات، پێشم وایە ئەو سۆراغ کردنەی هونەرمەند، ئەو هەوڵەی دەیدات بۆ دۆزینەوەی خۆی وجێ پەنجەی لە ناو کۆمەڵدا پەلکێش دەکات بەرەو چاودێری و لە بەرچاوگرتنی بناغەو کۆڵەکەکانی ئەو بابەتە..

بۆمن شیعر دەرگایەکە بۆ سەربەهەشتێکی بێ برانەوە دەکرێتەوە، من لەم بەهەشتەدا بێباکانە دێم و دەچم، لە هەندێ جێدا دەوەستم، دەگریم، پێدەکەنم، لە هەندێ جێدا لەگەڵ مەوجودێکی ناو بەهەشتە دەردەدڵ دەکەم، شیعر نیوەکەی ترمە

کە لەگەڵیدا هەست بە ئازادی دەکەم و رازەکانمی پێ دەسپێرم، بەڵام لەناو ئەو بەهەشتە بێ برانەوەیەو لەئاسۆی ئەو ئازادییەشمدا سنوورو مەرزی تایبەتی هەیە کە دەبێ بیانپارێزم، چیرۆکیش بۆ من ئاوێنەیەکە ژیان بە هەموو جوانی و دزێوییەکانییەوە خۆی تێدا دەنوێنێ، وەرگێرانیش هەوڵێکی ترە بۆ دەوڵەمەند کردنی فەرهەنگ و ئەدەبی میللەت، کەواتە هونەرو ئەدەب لە چوارچێوەی ژیان ناترازێ و لە قاڵبی ژیاندایەو لێکتر جودا ناکرێنەوە، ئەدیب و هونەرمەند کە دەست بۆکاری ئەدەبی دەبەن بەر لەهەموو شتێک بۆ خۆیان دەگەرێن، بۆ ئەو بەشەی خۆیان کە هەمیشە هەست دەکەن لێیان ون بووە، ئیتر جاری وا هەیە خۆیان و جێ پەنجەکەیان لە بابەتێکدا دەدۆزێتەوە، جاری واش هەیە ئەو هەوڵ و تەقەللایەی لە تاقە قاڵبێکدا جێی نابێتەوە و رۆحی ئەم رازی ناکات، بۆیە دەست بۆ بابەتی تر دەبات، کاری هونەریش بۆ خۆی جۆرێکە لە سەنگەرگرتن لەبەرامبەر هێزی مەرگ و فەنابوون، هەوڵێکە هونەرمەند دەیدات لە پێناوی مانەوەدا ئیتر ئەو هەوڵە لەرۆچنەی سەنگەرێکەوە بێت، یان چەند سەنگەرێکی جۆراوجۆر، گرنگ ئەوەیە لە هەموو سەنگەرەکاندا کەرەسەو تفاق و هێزی مەعنەوی بە ئەندازەی پێویست پێ بێ..

**رامان: وەک ئافرەتێکی ئەدیبی کورد گیروگرفتی خوشکانی ئەدیب و هونەرمەندی کورد لە رۆژگاری ئەورۆدا چۆن دەبینن و چ رێگەیەک بۆ شکاندنی هەموو ئەو سنوورانەی کۆمەڵ و سروشت لەبەردەم ئافرەتی کورد دایان دەنێ پێشنیار دەکەن..**

## بۆ من شیعر دەرگایەکە بۆ سەر بەهەشتێکی بێ برانەوە دەکرێتەوە

**نەجیبە ئەحمەد:** تا ئێستە زۆر جار ئەم پرسیارە ئاراستەی من و ئافرەتانی تر کراون، من پێم وایە ئەو گیروگرفتانەی دێنە رێی ئافرەتی ئەدیبی کورد پێوەندییان بە دوو شتەوە هەیە یەکەمیان ریشەییەو پێوەندی بە بناغەی کۆمەڵەوە هەیە بەگشتی و باری فەرهەنگی بەتایبەتی، بەو پێوانەیەش کە کۆمەڵگەی کوردەواری بەشێکە لە کۆمەڵگەی بەشەری و ئەو گیروگرفتانەی لە کۆمەڵگەی گەورەی بەشەریدا بە هۆی باری ئابووری و فەرهەنگییەوە سەرهەڵدەدەن کوردی لێ بێبەش نییە، بگرە لە چاو میللەتانی تردا بەشەکەی یەکجار زۆریشە دەردەسەرییەکانی ئافرەتی نووسەر لە کۆمەڵە بچووکەکەیەوە کەماڵەو بەشێکە لە کۆمەڵە گەورەکە دەست پێدەکات.. ئەو کۆت و زنجیرانەی لە گەردن و پێماندان و هەستیان پێ دەکەین لای میللەتانی تریش بوون، ئەمانە تەکانی فەرهەنگی و گۆرینی دیدی کۆمەڵیان دەوێ، ئافرەتی کورد کە سالان لەو دیو پەنجەرەوە دنیای نیشان دەدرا، ئێستە رەوتی کۆمەڵ وا پێویست دەکات خۆی هەنگاو بنێ و لە مەیدانەکەدا دەست بخاتە سەر دەردەکان و

بۆ دەرمانیان بگەڕێ، هەر ئەم باسە دەمباتەوە سەر خاڵی دووەم، یانی ڕەگی دووەمی گیروگرفتەکان کە خودی ئافرەت خۆیەتی، دیدی ئافرەت لەبەرامبەر ڕووداوەکانی ڕۆژدا، چۆنێتی بسەلماندنی بوون و وجودێتی، من پێم وایە کاری ئەدەبی و هونەری بۆ هەر مرۆڤێک ئافرەت بێت، یان پیاو بەرلە هەموو شتێک عەشقە، عەشقیش هەڵبژاردنی ڕێگەی پڕ سەختی و خەتورەتە، عاشق فەرشی بۆ ڕاناخرێت، ڕێگەکەی چقڵ و دڕکەو لەسەریەتی بیکاتە گوڵزار، خۆڕاگری و حەوسەڵەی ئەو ئافرەتە، شوێن کەوتنی ئەو ئاگرە سوورە، ئەو بوون و وجوودە دەسەلمێنێ، ئافرەتێک کەشان دەداتە بەرکاری هونەری چاوەڕوان نەبێ هەر لە یەکەم ڕۆژەوە کۆمەڵ بیخەنە سەردەست و بارەقەڵای بۆ بکەن، نەخێر، بەڵکو لەو ڕۆژەوە کۆمەڵێ گیروگرفتی کۆمەڵایەتی لە عەیبەو حەیاچوونە دەست پێ دەکات تا دەگاتە سەر دەیان جۆر بەرهەڵستی و ڕێگە گرتن، بۆیە دەبێ ئەو کۆرپەی عەشقە بە خوێنی دڵ و ئاوی چاو پەروەردە بکات و ڕۆح و گیانی بۆ بکا بە سوپەرو لە نێزەو نەشتەر بیپارێزێ،

## کاری هونەری جۆرێکە لەسەنگەرگرتن بەرانبەر هێزی مەرگ و فەنابوون

دەبێ بەر لەهەموو شتێک بیسەلمێنێ کە شوێن کەوتنی ئەو ئاگرە سوورە حەزو هەوەسێکی کاتی نییە، ئەمە تەقەللایەکە بۆ خەملاندن و ئاوێتە بوونی ڕۆحی مرۆڤێک لەگەڵ دەردو فرمێسکەکانی کۆمەڵەکەیدا..

**ڕامان: چ هۆیەک بووەتە هۆی کەم کاری، یاخود بایەخ نەدان بە هونەرو ئەدەب لای ئافرەتی کورد..؟!**

**نەجیبە ئەحمەد:** ئەم پرسیارە تێهەڵکێشە لەگەڵ پرسیاری پێشوودا، ئەو گیرو گرفتانەی دێنە ڕێی ئافرەتی نووسەر و هونەرمەند هەر ئەوانەشە کە دەبنە هۆی کەم کاریان، ئەگەر چاوێ بە مێژووی ئەدەبدا بگێڕین تێدەگەین کە ئافرەتمان بوون تەکانیان دابێ بۆ تێکەڵاو بوون لەگەڵ کاروانە ئەدەبیەکەدا، بەڵام یان نەیانتوانیوە تاسەر لەگەڵ ڕەوتی کاروانەکەدا بن و لەنیوەی ڕێگەدا بەجێ ماون، یان هەر نیوە چڵ بووە و پاشان دەستیان لێ بەرداوە، بە حوکمی ژیانی ئافرەت و سەرقاڵ بوون بە پەروەردەکردنی منداڵ و بەڕێوەبردنیماڵەوە کڵپەی ئەو بەهرەیەی لای هەندێکیان کوژاندۆتەوە و نەیهێشتووە بخەملێ، یان بووەتە هۆی کەم کاری.هەروەها ئەو هەلەی بۆ پیاو دەرەخسێت بۆ چوونە ناو کۆڕو مەجلیس و خوێندنەوەی بەردەوام و ئاگاداربوون لەرەوتی ئەدەبی گەلانی دنیاو ناسینی پێگەی ئەدەبی گەلەکەی خۆی بۆ ئافرەت نارەخسێت بۆیە دەبینین ئافرەت تەنگ دەست ترە لە داهێنان وئەفراندندا، هی واش بووە هێشتە سەرەتای هەنگاوی بووە ڕێگەیان لێ بەستووەو نەیاهێشتووە بەردەوام بێ، لەلایەکی تریشەوە ئەو کەم حەوسەڵەیی و خۆڕانەگرییەی ئافرەت بووەتە هۆی ئەوەی کە بەهرە و توانا هونەرییەکەی بکا بە

قوربانی ماڵداری و ژیانی تایبەتی ناو خێزان، چونکە ناچار کراوەو خراوەتە سەر دوڕیانی هەڵبژاردنی مەرگ و ژیان، ئافرەتیش بە حوکمی ئەوەی مەوجودێکی حەساسە و لە خۆبوردنی زۆرە بەنابەدڵی و ناچارییەوە قوربانی داوە بەخۆی و بە ئەدەبەکەی، ئەگینا هۆی کەم بایەخی بە بەرهەمی ئافرەتان هی ئەوەنییە کە ئافرەت لە توانایدا نییە باری ئەدەب هەڵبگرێ، بەڵکو کەشانی داوەتە بەر کارە ئەدەبییەکە، یان کە بارودۆخێکی لەباری بۆ رەخساوە کاری ئەدەبی و هونەری جوان و لەبەرچاوی ئەنجام داوە، چونکە تواناو قودرەتی عەقلی و رۆحی ئافرەت لە هی پیاو کەمتر نییە..

**رامان: بەشێوەیەکی گشتی لاتان وایە ئافرەتانی کورد لەچەند لاوە بەش خوراون؟**

**نەجیبە ئەحمەد:** لەگەلێ لاوە، بەڵام بناغەی هەموویان لایەنی مرۆڤایەتییە، مانای هەر کاتێ کۆمەڵگە بەوە گەیشت کە ئافرەت مرۆڤە، مرۆڤێکی تەواوەو مافە مرۆڤایەتییەکانی لەبەرچاوگیراو پارێزرا، ئیتر بەش خوارو نییە و دەتوانێت هەر نەخشەو بەرنامەیەکی بۆ ئایندە پێ چاک بێ دایڕێژێ و قاڵبی ژیانی خۆیشی هەڵبژێرێ...

**رامان: ئەو خوشکانەی لەم چەند ساڵەی دواییدا لەمەیدانی ئەدەبی و هونەریدا خۆیان نواندووە، ئایا ئامانجێکی ستراتیژی بووە، یان گیروگرفتی رۆژانەیە؟!**

**نەجیبە ئەحمەد:** هونەرو ئەدەب کەرەسەیەکن دنیای دەرەوەی دەروونی هونەرمەند ئاوێتەی ناوەوەی دەکات..

بوونی مرۆڤێک دەیسەلمێنێ لە فەزاو سروشتی رووداوەکاندا و ژیان بەگشتی هەر ئەو کەرەسەیە لە خۆوە وەک قارچک هەڵناتۆقێ وپشتیشی خاڵی نییە، ئەو هەوڵەی هونەرمەند دەیدات بۆ سەلماندنی بوون و وجودی خۆی چاوکراوەیی و ئاگاداربوونی دەوێ، ئاگاداربوون لەرووداوەکانی ژیان و بناغەکانی ئەو رووداوانە، واتە هۆکانی پاشان بیرورا دەربرین و دید لە بەرامبەریاندا مرۆڤ، مرۆڤی هونەرمەند تەنیا بۆ حەزێک و خۆشییەک نازی، بەڵکو بۆ ژیان بەجوانی و دزێوییەکانییەوە دەژی، کەواتە دەبێ هەستی بەرپرسی وای لێبکات بیر بکاتەوەو رادەربڕێ و هەروا راگوزاریانە بەلای رووداوەکاندا نەگوزەرێ، لەبەردەمیاندا ساتمە بکات، بەرای من ئەوەی ئێوە پێی دەڵێن گیروگرفتی رۆژانە هەر ئەوانە سەرچاوەی ئامانجە ستراتیژییەکانە، خودی ئامانجەکە کەم کردنەوە، یان نەهێشتنی گرفتەکانی رۆژە، بەڵام لێرەدا جۆری مامەڵەت کردن و چۆنییەتی بەکارهێنانی ئەو دەردو مەینەتییانەیە لە قاڵبێکی ستراتیژیدا، ئێمە رۆژانە سەرمان بەدەیان جۆر داخ ودەردا دەتەقێ، ئافرەتی هونەرمەند سیما و هۆی ئەوداخ و کەسەرانە لەمس دەکات و کار لە رۆح و وێژدانی دەکات، ئینجا دەیەوێت لە دیدو هەستی خۆیەوە ئەو دەردانە بگەیەنێ بەدەوروبەرەکەی و چارەسەری بناغەیی و ستراتیژی بۆ بدۆزێتەوە.

**رامان: لەکام ژووری ماڵەوە دەخوێننەوەو دەنووسن؟**

**نەجیبە ئەحمەد:** وایێ دەچێ هۆگریم لەگەڵ کاسەوکەوچکدا زۆر بێ و لە فەزای

ئەواندا ئاسوودەبم، بۆیە زۆربەی کاری ئەدەبی و خوێندنەوەم لە موبەق ئەنجام دەدەم..

**رامان: منداڵەکانتان وەک بزانم هەموو ساڵێک لە قوتابخانەدا بەیەکەم دەردەچن ئایا پێ راگەیشتنی منالەکانتان (وانەو پەروەردەکردنیان) چەندی لەسەر شانی تۆیە و چەندێ لەسەر شانی کاکە (محەمەدی حەمە باقی)یە؟!**

**نەجیبە ئەحمەد:** کاکە حەمە لەو مەسەلانەدا کەم حەوسەڵەیە، یان بۆی دەلوێ لەو ئەرکە بێبەش بێ، نەک هەر ئەوەش، بەڵکو خۆشی بەقەد ئەوان ئەرکی هەیە بۆمن..

**رامان: بەرهەمەکانت خۆش دەوێ یان منالەکانت..؟**

**نەجیبە ئەحمەد:** جیاوازییان نییە، بەلام جۆری خۆشەویستییەکانیان جیاوازن..

**رامان: لە کوردستانی ئەم دیودا ترووسکەیەکی پڕ هیواو جووڵانەوەیەکی هەست کردن بە بەرپرسی و بەرەو خۆ دۆزینەوە بەدی دەکەن لە نێو ئافرەتاندا؟**

**نەجیبە ئەحمەد:** بارودۆخی خوێندەواری و فەرهەنگی کوردی لێرە زۆر جیاوازن لەگەڵ لای خۆمان، لێرە ئەوەی بەهرە لە خۆیدا شک دەبات دەبێ ماوەیەکی زۆر بەفێر بوونی زمانی کوردییەوە خەریک بێت، چونکە جگە لە حەزو عەشقی خۆی دەرەتانێکی تر نییە پەنای بۆ بەرێ، بۆیە شوێن حەزی فێربوونی زمانەکە دەکەوێ و تا سەردەمێکی باش بەمەوە خەریک دەبێ، ئنجا

## ئێمە پشتمان خاڵی نییە، ئیتر بۆ پەنا ببەینە بەر کوڵەکەی ماڵی بێگانان

دەبێ ماوەیەکیش خەریکی خوێندنەوەی بابەتی کوردی بێت، بۆ ئەمەش کتێبخانەیەکی هێندە دەوڵەمەندی لەبەردەستدا نییە تا سەلیقە و بەهرەکەی پەروەردە بکات، بۆیە ئەوەی لێرە دەست دەداتە قەڵەم و بە کوردی دەنووسێت و بەهرەی ئەدەبی پەروەردە دەکات زۆر سەختی و کوێرەوەری دێتە رێی و زۆر جێی رێزو شانازییە، لەگەڵ ئەوەشدا هەست دەکەم لەناو گەنجەکانی ئێرەدا خەریکە ترووسکە دەبینرێت، ئەگەر چی ترووسکەکان کەمن، بەتایبەت لەناو ئافرەتاندا، ئەو ترووسکە گەشەش لە هەمووان زیاتر لای «ژیلا -ی» جوانەمەرگ دەبینرا، ژیلاخانم زۆر بە گەرم و بەشەوقێکی سەیرەوە شانی دابووە بەر کاری ئەدەبی و باکی نەبوو لەوەی لە پێناوی شیعردا چی بەسەر دێت، کۆمەڵێ ئافرەتی لەدەوری خۆی کۆکردبووەوە و فێری خوێندن و نووسینی کوردی دەکردن، مەبەستی بوو وەک دەنگێکی ئافرەتانەی رەسەن لەناو کاروانەکەدا بێت، زۆر چاک سەر رێ کەوتبوو، تازەش دوای گەشەی ئەوین خەریک بوو لە خۆی و لە پەیامەکەی بگات، لەگەرمەی تەقەللای ئەدەبیدا بوو بۆ خۆدۆزینەوە کە بوو بە قوربانی شیعر و ئەدەب، بۆیە لەدەست دانی (ژیلا خانم) لە دەست دانی کۆڵەکەیەکی دیارو گەورەیە لەناو تەقەللای ئافرەتاندا و بەرای من وا زووش قەرەبوو نابێتەوە، جێ پەنجەی

(ژیلا خانم) بەسەر ڕۆح و بەرهەمی زۆر لەو کچانەوە دیارە کەبەکاری هونەرییەوە خەریکن، لە هەمووان دیارتر لای « فاتمە حوسێن پەناهی»کە خۆی بە قوتابییەکی نزیکی ژیلا خانم دەزانێت، لە مەیدانی چیرۆکیشدا ترووسکەیەک لای (کافیەی جوانرودی) دەبینم ئەگەر چی زۆر کەم کارە، لەمەیدانەکانی تریشدا بەتایبەتی لە وێنە کێشاندا جموجوولێک لە نێو ئافرەتاندا دەبینم، هەر ئەو جموجوولە هەولێکە بۆ خۆدۆزینەوەو ناساندنی پێگەی ئافرەت لەناو کۆمەڵدا، لەناو ئەو دەستە ئافرەتانەشدا ترووسکە گەشەکان لای « لالەی یەزدان جو، ستارەی حوسێن، فەریبای عەباسی» دەبینم..

**رامان: وەک بزانم ژمارەیەکی زۆر لەو خوشکانەی ئەم دیو سەردانی بەڕێزتان دەکەن، یان پێوەندی و نامە گۆڕینەوەتان لەگەڵ دەکەن، ئایا ئەم پێوەندییانە چۆنن؟!**

**نەجیبە ئەحمەد:** بەر لەهەموو شتێک ئێمە لە کۆمەڵگەیەکداین کە پێوەندی کۆمەڵایەتی تێدا لێک نەترازاوە، ئەمە لەلایەک و لەلایەکی ترەوە ئەو بزووتنەوە ئەدەبییەی لێرەدەستی پێکردووە وبناغەکەی شەوقی فێر بوونی زمانی کوردی و خزمەت کردنی فەرهەنگ و ئەدەبە، بووەتە هۆی ئەم بەربلاوییەی لە پێوەندییەکانی ئێمەدا دەبینن، هەموو ئەو خوشکانەی سەرم دەدەن یان بەنامە بەسەرم دەکەنەوە، سەر لەوشەی کوردی و شیعری کوردی دەدەن، ئەمانە شەوقی فێر بوون و خزمەت کردنی زمان و ئەدەبەکە وایان لێدەکات بەسەرم بکەنەوە، من حەددی مامۆستایەتیم لە خزمەت هیچ کام لەم خوشکانەدا نییە، بەڵام بە حوکمی ئەوەی بەر لەوانەوە دەست بەکار بووم بیروڕاگۆڕینەوەمان هەیە وەبەیەکەوە تەگبیریش دەکەین، جێی شانازییە بۆ من کە لەو سەری کامیاران و کرماشان و تارانەوە نامەی خوشکێکم بۆ دێت و داوام لێدەکات هەڵەی ئیملاو داڕشتنەوەی رستەکانی بۆ بنووسمەوە، جاری وا هەیە هەر لەسەرنامەکەی بۆی چاک دەکەمەوە یان هەر نامەکەی خۆی بۆ دەنووسمەوەو بۆی ڕەوانە دەکەمەوە، چەندان جار ئەم کارە دووپات دەکەینەوە تاتەواو فێری کوردی نووسین دەبێ، ئنجا وردە وردە خوێندنەوەی جۆراوجۆری کوردی دەست پێدەکات، تا لە پڕێکدا شیعرێک یان چیرۆکێک یان وەرگێڕانێکم بۆ دەنێرێ، ئەمە جۆری پێوەندی منە لەگەڵ ئەو خانمانەدا کە خۆشم لەزەتی لێ دەبینم و هەست بە ئاسوودەیی دەکەم ئەگەر توانیبێتم خزمەتێکیان پێبکەم.

**رامان: چۆنە تا ئێستە لە سەقز گیرساونەتەوە؟!**

**نەجیبە ئەحمەد:** وەڵامی ئەم پرسیارەتان بەشێکە لەوەڵامی پرسیارەکەی سەرەوە، کەواتە هەست کردن بەمەسئوولیەت لەبەرامبەر پەیامی ئەدەب و خزمەتی زمان و پەرەپێدانی لەم بەشەی تری کوردستاندا و خۆشەویستیمان بۆ کاری ئەدەبی بووەتە مایەی گیرسانەوەمان لەم شارە کوردییەدا، ئەگینا وەک دەیان و سەدان هاوڕێمان بۆمان هەڵکەوتووە بچینە هەندەران و خەریکی خۆشگوزەرانی و رێک وپێک کردنی ژیانی تایبەتیمان بین، بەڵام ئەمەمان هەڵبژارد چونکە ئاسوودەیی ویژدان و پیرۆزی پەیامەکەمان لەمەدا دەبینین..

**رامان: وەک بزانم کۆمەڵێک شیعر و چیرۆکی نوێتان هەیە ئەمانەی چاپ نەکراون لەگەڵ چاپ کراوەکانتان چۆن هەڵدەسەنگێن؟!**

**نەجیبە ئەحمەد:** ئەگەر چی هەڵسەنگاندن کاری من نییە، بەتایبەتی بۆ کاری خۆم بەڵام دەڵێم بێگومان دەبێ جیاوازییان ببێ، چونکە شیعر و نووسراوێک کە لە رۆژانێکی جیاوازترو لەفەزاو دەوربەرێکی ترو بەدیدو روانینی هەرزەکارێک و بەکۆمەڵێ وشەوە کە بۆ ئەو رۆژو فەزایە و بۆ ئەو دیدو تەمەنە بەکاربرێ، دەبێ جیاوازی ببێ لەگەڵ ئەو شیعر و نووسراوانەی لە سرووشت و فەزای ئەم رۆژانەدا دەنووسرێن کە کۆمەڵێ خەم و مەینەتی نوێ بابەت حاکمی رۆژن، دیدی ئافرەتێکی لە چل بەرەوژووریش بە هەمان ئەو وشانەی سەردەمی هەرزەکارێتی دەرنابڕرێن، بۆیە لە بەرگێکی تردا خۆیان دەنوێنن..

**رامان: لەبەشەکانی تری کوردستان و لەدەرەوەدا زۆر دەنگی تری ئافرەتانی کورد هەن، ئێوە چۆنیان دەبینن و چۆنیان دەبیستن؟!**

**نەجیبە ئەحمەد:** بەڵێ لەبەشەکانی تری کوردستان و لە هەندەرانیشەوە جار جارەدەنگی ئافرەتم دێتە گوێ، بەڵام ئەو چەند دەنگە لەرادەی حەزو ویستی دڵی من کەمترن، کەدەبوایە و ئەوە جێی داخە لە کوردستانی عێراق و لە هەندەران کە بارودۆخی خوێندن و بواری خزمەت کردنی فەرهەنگ و ئەدەب لەبارترە جێ پەنجەی ئافرەتان دیارتر بوایە ومەیدانەکە هەر پێنج شەشێکی تێدا نەبوایە، ئەم کزی و کەم كارییەش هەر لە شیعردا نییە، بەڵکو لە مەیدانەکانی تریشدا هەر وایە، تا ئێستە جگە لە کەژاڵ ئەحمەد و مەهاباد خانم بە کۆمەڵە چیرۆکێکیش بەسەریان کردوومەتەوە و هیچی ترم لەلایەن کەسی ترەوە نەدیوە، بەر لەمانیش ساڵی ١٩٨٩ - شەونم عەبدولعەزیز - دیوانی «کات بەرەو بیست و پێنج دەچێت..»ی چاپ کرد، لێرەش هەوڵە ساواکەی ژیلا- ی جوانەمەرگ «گەشەی ئەوین»دەبینم ئەم چەند رەنگە کەلە پەنجەی دەست تێناپەڕن ناتوانن ئەوخانە چۆڵەی کتێبخانەی کوردی پڕ بکەنەوە کەتایبەتە بە ئافرەتان، من داوای زۆر و بۆری ناکەم بەڵام دەڵێم خواستی من لەوە زیاترە و دەبوایە ئێمە کاری زۆر ترو گەورەترمان بوایە، بەتایبەت کە کەرەسەی دەیان بابەتی هونەریمان لەبەردەستدایە، ئەو چەند تەقەللایەی ئەو خوشکانە بۆ من جێی دڵخۆشییە، بەڵام تینوێتیم نەشکاوەو چاوەڕوانیم کۆتایی نەهاتووە، لەم خوشکانەم چاوەڕوانی هەنگاوی گەورەتر دەکەم، دیوانی (دایکانەی) کەژاڵ ئەحمەد- سەرەتای کارێتی، هەڵچوون و داچوونی دەروونی کچێکی کەم تەمەنی کەم تەجروبەی نیشان دام، شاخ کێلگەی گەنمەشامی -یە- دیوانە شیعرێکی مەهاباد قەرەداغییە، پێم جوان بوو، لایەنی جوانی و دیدو ئیحساسی جوانی تێدا بوو، هەوڵی داوە دەنگێکی تایبەت و دیاربێ، بەڵام لە هەندێ جێدا زمانەکەی رازیی نەدەکرد، واش پێ دەچێ بۆ کاری ئەدەبی ئازاو پرکاربێت، شیعرەکانی «نەزەند بەگی خانی لە کۆمەڵەیەکی بچکۆلەی ئێسک سوکدا بوو بەناوی (دوێنێی سبەینێ) لەزۆر جێدا وردەکاری جوان و بۆچوونی شاعیرانەی هەیە، لە توێی هەندێ زامی بچکۆلەوە زامە گەورەکانمان نیشان

دەدات، شەونم - یش دەبوایە کاری زۆرتر و هەنگاوی گەورەتری بنایە، بەڵام شەونم بۆ کاری ئەدەبی کەمتەرخەمەو لە چاوی خەمەکانیدا هەنگاوەکانی کورتن، تەقەڵلاکەی (ژیلا)ی جوانەمەرگیش بۆ ئەم بەشەی کوردستان باش بوو، ئەگەر چی سەرەتای کاری بوو.

**رامان: لەو ماوەیەی دواییدا زۆربەی ئەو نووسین و لێکۆڵینەوەو کتێبانەی لەسەر شاعیری ناوداری ئێرانی خانمی فەروغی فەروغزاد نووسراون بە وردی و بە پەرۆشەوە دەخوێنینەوە، جێی پرسیارە بڵێین ئێوە فرووغ چۆن دەبینن و تەقەڵلای فرووغ و ئافرەتانی کورد چۆن سەیر دەکەن، تۆ پێت وانییە ژیلای جوانە مەرگی خۆمان لە فرووغ نزیک بووبێ و زۆر شتیان وەک یەک بێ؟!**

**نەجیبە ئەحمەد:** رۆژانێکە لەگەڵ خانمی شیعری فارسی (فرووغ)-ی فەروغزاد و دنیاکەیدا دەژیم و هۆگری بووم، هەر رۆژەی لەگەڵ سووچێکی نوێی دنیاکەیدا ئاشنا و تێکەڵ دەبم ، حەز دەکەم قەڵەمەکەم دەروازەیەکی گەورەبێت و بکرێتەوەو جوانکارییەکانی فرووغ پیشان بدات، کەباس لەرەوتی ئەمڕۆی شیعری فارسی دەکرێت واتە (سەبکی نیمایی)فرووغ لە ریزی پێشەوەدایە، فرووغ ئەو ئافرەتە پڕکارە بوو کە لە تەمەنێکی کورتدا بوو بە خاوەنی ئەزموونێکی ئەدەبی قووڵ وگەورە، کەسێک نەبووە هەروا راگوزاری بروانێتە شیعر و ئەدەب و حەز بکات ببێ بە خاوەنی چەند دیوانێک و ناوێک، فرووغ لە تەمەنی (٣٢)ساڵیدا چاوی لە دنیا پۆشی و پێنج دیوانە شیعری بۆ بەجێ هێشتین، سێ کتێبی (ئەسیر و دیوارو عصیان) ئەزموونە سەرەتاییەکانی بوون و شتێکی نوێیان نەخستەسەر خەرمانی شیعری فارسی، بەڵام دوو دیوانی - تولد دیگر- و- أیمان بیاوریم بە أغاز فصل سرد- تا ئێستەش هەڵلایەکی ئەدەبین و تالێیان قووڵ بینەوە دەریایە و لێی هەڵدەهێنجێ و کۆتایی نایەت، فرووغ ئەگەر چی وەک دەرس وەزن و عەروزی نەخوێندبوو، بەڵام زۆر شارەزایانە دەستی بۆ وەزنی شیعری فارسی بردووەو چەند وەزنێکی تێکەڵ کردووە، لەولاشەوە کەسێک بووە هەستی کردووە کە شیعری فارسی بۆ ئەم رۆژانە کەموکورییەکی تێدایە ئەویش کەمی وشەیە- یانی کۆمەڵێ وشەهەن کە هەر ئەوان لە شیعردا دووپات دەبنەوە بۆیە زۆر ئازایانە گەلێ وشەی سادە و جوانی رۆژانەی هێنایە ناو شیعرەوە، چونکە بەوە گەیشتبوو کە رۆژگارەکە ئەوەندە گۆڕاوە داوای دەربڕینی نوێ دەکات، لەچاوپێکەوتنێکدا کە لێیان پرسی: وشەی تەقینەوە (أنفجار) شاعیری نییە و تۆ بەکارت هێناوە.. وتی جاچیبکەم کە شاعیری نییە، من رۆژانە چاو دەکەمەوە هەموو شتەکانی دەوروبەرم لە تەقینەوەدان، من دەیهێنمە ناو شیعرەوە، بابێ بە وشەیەکی شاعیری،... هەڵبەت ئەم کارەی فرووغ سەبارەت بەبەکارهێنانی وشە هەوڵی تاکە کەسی نەبووە، بەڵکو لەو رۆژگارەدا -سوهرابی سوبەهریش - ئەوەی کردووە، ئەم جۆرە تەقەڵلایانەش هەروا سەرپێی و لە خۆوە ناکرێ.

فرووغ و سوهراب بەدەستی بەتاڵو پشتی خاڵییەوە نەهاتوون، شیعرو ئەدەبی سەردەم و رۆژگاری بەر خۆیان نەخستۆتە لاوەو بە خوێنەریان نەوتووە ئیتر ئەمانە

کۆن بوون و باویان نەماوە بەڵکو لە ئەدەبیاتی پێشینەی دەوڵەمەندی خۆیان بەهرەمەندو بە خەبەربوون لەوێوە جۆگەو جوێباریان هەڵبەستووە، بۆ ئەو کیشوەرە نوێیەی کە بە دیدو ئیحساسی ئەمرۆ دایان مەزراندووە، بەشێوەیەک کەشایستەو لایەقی بارودۆخی ئەمرۆبێ، فرووغ لەحافیزی سەعدی و جەلالەدینی رۆمی بێ خەبەر نەبووە، لەداستانی کۆنینەو ئەفسانە، لە فۆلکلۆر .. لێرەدا حەزدەکەم ئیجازەم بدەی چرپەیەک لەگەڵ تێکرای شاعیرە گەنجەکاندا بکەم، حەز دەکەم بڵێم مەسئوولیەتی ئێمە ئەوەنییە بەناوی تازەگەریەوە بابەت لە دوای بابەت بخەینەبەر دەستی خوێنەرو لە جیاتی ئەوەی ئاسوودەیی بەرۆح ببەخشین و ئاسۆی بیر فراوانتر بکەین، لە پێشینەی خۆی ئاگاداری بکەین و تووشی سەرئێشەی بکەین، چەواشەی بکەین، بەداخەوە هەندێ جار بەناوی شیعرەوە بابەتێکی چەند لاپەڕەیی دەبینم، وشەکان دانە دانە کوردین، کە دەچنە پاڵ یەک نەدەبنە رستەو نەوێنەی شیعری، نازانم دەیانەوێ، بڵێن چی..؟! یان ئاگایان لەوەنییە کە ئەوان لەبەرامبەر تەنانەت وشەیەکیشدا بەرپرسن، چۆنییەتی بەکارهێنانی وشەو پاراستنی زمان پێویستە، کە ئێمە خاوەنی ئەدەبێکی دێرینەی (فۆلکلۆر) و (بەیت)ین، پشتمان خاڵی نییە ئیتر بۆچی دەبێ لە خۆمانی تێک بدەین و پەنا بۆ بەر کۆڵەکەی ماڵەبێگانان بەرین و لەم ماوەیەدا کتێبێکم خوێندەوە بەناوی (نگاهی بەفروغ) نووسینی (دکتر سیروس شمیسا) لەم کتێبەدا شمیسا ئەوەندە وردەکاری لەگەڵ شیعرەکانی (فرووغ)دا کردووە شاعیر وا لێدەکات نەوێرێ لە خۆوە و بێهوودە نەک وشە تەنانەت پیتێکیش بەکاربهێنێ، لەشیعری(ایمان بیاوریم به اغاز فصل سرد) کەبریتییە لە (٣٥٦)دێڕ سەرتاپای شیعرەکە شوێن پێی حەرفی (س)ی هەڵگرتووە و دەلالەتی ئەم حەرفەی لە هەر دێڕێکدا شیکردۆتەوە. کەواتە شاعیردەبێ بەترس وسڵ و ئاگادارییەوە مامەڵە لەگەڵ وشەو رستەو زمان بکات و زمان لەناوەرۆک و کۆڵەکەکانی تری شیعر کەمتر نەبینێ، دێمەوە سەر فرووغ و دەڵێم گەورەیی فرووغ هەر لەوەدا نەبووە کە توانیویەتی چەند کۆمەڵە شیعرێکمان بۆ بەجێ بهێڵێ بەڵکو ئەو بیروڕاو بۆچوونانەی سەبارەت بە سەبک و وێنەی شیعری و زمان وباقی کۆڵەکەو پێویستییەکانی پەروەردەو پەرەپێدانی شیعر ئەوەندە تۆکمەوقاییم و بەهێزبوون کە تائێستەش ئەو بۆچوونانە لەبەرچاو دەگیرێن پشتیان پێ دەبەسترێ جگە لە شیعر فرووغ لە دەرهێنانی چەند فیلمێکدا کاری کردووە لەوانە «(این خانه سیاه است)واتە (ئەم ماڵەرەشە)» ئەگەر بەراورد لە نێوان فرووغ و ئافرەتانی کورددا بکەین، دەبینین ئەزموونی ئەدەبی ئێمە لە چاو ئەزمونەکەی فرووغ دا ئەو قووڵییەی نییە..

نزیکییەکیش لە نێوان ژیانی تایبەتی ژیلای جوانەمەرگ و (فرووغ)دا بەدی دەکرێ، نزیکییەکە لەوێوە هاتووە کە هەردووکیان ئاوو هەوای ولاتێک کۆی کردوونەتەوەو خەم و دەردەسەرییەکانیان وێک دەچێت، بەتایبەت کە هەردووکیان لە تەمەنێکی زۆر مناڵدا«فرووغ بە شانزە ساڵی وژیلا بە پانزە ساڵی » بوون بەهاوسەری کەسانێکی نزیک بەبنەماڵەکانیان، بەلام بەویستی خۆیان و زۆر زوو

لێک جیابوونەتەوە، بەرهەمی ئەو چەند ساڵە کەمەی ژیانی هاوسەرێتییان هەر یەکەو منداڵێک بووە(فرووغ- کامیار و/- ژیلا - بەهارە)، ئەم تێکشکانە هاوبەشەو ئیحساس لێکبڕانی دایک و فرزندێک هەمیشە پاڵی بە ژیلا خانمەوە ناوە کە هاودەمی هەمیشەیی شیعرەکانی فرووغ بێت و وێردی سەر زمانی بن، هەر ئەو ئیحساس نزیکییە وای لە ژیلا خانم کردبوو کە زۆر جار هەستبکات تەمەنی وەک تەمەنی فرووغ کەم دەبێت، کە هەرواش بوو هەردووکیان لەتەمەنی (٣٢)ساڵیدا و بەکارەساتی ئۆتۆمبێل چاویان لێک نا..

هەروا ئەو شەیدایی و سەرکێشی و سووتانەی لای ژیلا خانم دەمدی و وای لێدەکرد بێباکانە سڵ لە ئاوو ئاگر نەکاتەوەو لە پێناوی عەشقە پاکەکەیدا عەشقی شیعر ببێ بە سووتەمەنی ناو کۆمەڵ و کوورەی شیعر، هەر هەمان سەرکێشی و بێباکی و سووتانەکە لە ژیانی شیعری و تایبەتی - فرووغ -دا دەبینرێ...

**رامان: چەند ساڵ ئەندامی یەکێتی نووسەران بوون، چۆن بوو؟!**

**نەجیبە ئەحمەد:** لە کۆتایی ساڵی ١٩٨١ ەوە تا ساڵی ١٩٩١ وەک ئەندامێک لە یەکێتی نووسەران بووم، لەماوەی ئەو (١٠)ساڵەدا کە (٧)ساڵی لە شاخ و (٣)ساڵیش لە ئاوارەیی بوو، گۆڤاری نووسەری کوردستان، زمانحاڵی ئەم یەکێتیە بوو ئەم گۆڤارە کە ناو بەناو دەردەچوو، هەر لە یەکەم ژمارەیەوە هەوڵی داوە ئۆرگانێکی راستەقینەی نووسەران بێت، سەربەخۆو ئازاد، پاشکۆی هیچ دەستە و تاقمێک نەبێت و سەر بە هیچ لایەنێک نەبێت، هەرواش بوو، توانی لەو چەند ساڵەدا رەوتی خۆی بپارێزێ، منیش وەک ئافرەتێکی نووسەر ئەو شانازییەم پێ برا کە لەو یەکێتیەدا کاربکەم و لە بازاڕی سیاسەت و کاری سیاسی دووربم..

**سازدانی گفتوگۆ:**
**بەدرەدین ساڵح**

**مەحمود زامدار:**

# لە حوجرەوە بەرەو ماركسيزم و وجودييەت بەڵام دوور لە سياسەت و شۆڕشگێڕی

***مەحموود زامدار نووسەرێكی ناسراوە لەكوردستاندا، دەتوانين بڵێين لە ماستی هەولێر ناسراوترە. لەژيانی رۆژنامەنووسيی خۆيدا (٩٥٧)چاوپێكەوتنی لەگەڵ نووسەران و هونەرمەندان سازكردووە، لەم تەمەنەيدا كاتی ئەوەی هاتووە چاوپێكەوتنی لەگەڵ خۆيدا بكرێ، بۆيە لە دانيشتنێكی سێ قۆڵيدا( سەرۆ قادر و ئازاد عەبدولواحيد و ئەنوەر مەسيفی) لە گفتوگۆيەكی خێرادا بە گيرمان هێنا، تا ئەگەر بەخێراييش بێ چەمكێكی ژيان و كارو ئەركەكانی بەدەربخات.***
***دانيشتن لەگەڵ(زامدار) تامێكی تايبەتی خۆی هەيە، بەتايبەتيش ئەگەر دانيشتنەكە شەوانە بێ وبكرێتەوە، ئەوە خۆی واتەنی(٧٢)سەعات قسە بكات لێی تێر نابێ، هيواداريين بەم دانيشتنە لايەنێكی ئەم مرۆڤە ماندووەمان دركاندبێ.***

**رامان: زامدار لە خانەوادەيەكی ئەدەبدۆستدا پەروەردە بووەو لە كەشوهەوايەكی ئاينی و ئەدەبيدا هەڵكەوتووە، حەز دەكەين بزانين كاريگەری ئەو خانەوادەو كەشوهەوايە لەسەر هەڵكەوتنی ئەدەبيت چەندو چۆنە؟**
**زامدار:** لە باوكمەوە بە حەوت پشت هەر مەلاو مەلازادە بووين، هەر حەوت مامم دەستی نووسين و ئەدەبياتيان هەبووەو زۆربەشيان دەنگيان خۆشبووە، سەرباری باوكم، جگەلەمەيش دايكيشم هەر مەلابوو، پتر لە (٥٠) كيژە هەولێری لەلای دايكم خوێندوويانە و ئيجازەی مەلايەتيان وەرگرتووە، ئەم يادەم زۆر بە ئاستەم لە ياد ماوە.. باوكم خۆی لە خۆيدا ديوانێكی گەورەی ئەدەبياتی كوردی و فارسی و عەرەبی بوو، لە حەزرەتی (نالی)و (وەفايی)و (ئەدەب)و (مەلای گەورە)دا زۆر شارەزا بوو، ديوەخانەكەی خۆی لە مزگەوتی گەورەی ناوبازێردا هەميشە جمەی ئەهات و شوێنی پيلە و موناقەشەی جياجيای ئاينی و ئەدەبی

مەحموود زامدار، سەرۆ قادر، ئازاد عەبدولواحید، ئەنوەر مەسیفی

بوو.. من هەر لە منالییەوە خرامە بەر خوێندنی حوجرە، چ لەودیوەخانەیەو چ لە حوجرەدا وردە وردە چەشەم کرایەوە، عەرەبیەکەی ئەمڕۆم گەر تۆزە هێزێکی تێدابێ هی ئەو سەردەمەیە.. بیرم دێ دوای ئەوەی باوکم (٧) جار قورئانی پێ خەتم کردم، ئینجا تەفسیرەکانی بۆ شەرح دەکردم.. زۆر حەزی دەکرد ببم بە (مەلا) بۆیە (٣) هەزار حەدیسی پێ لەبەر کردم، هەر حەدیسەیشی بە (عانە) یەک، رۆژی واهەبوو (٣-٥) حەدیسم لەبەر دەکرد و بەرامبەریشی ئەوەندە پارەیەم وەردەگرت و کەباب و لەوزینەو گەنمەشامیم پێ دەکڕی.. ئەمەیان تا (١١-١٢) سالّی تەمەنم بوو.. لە پشووی هاویناندا دەیناردمە لای مامەکانم لە دێهات تا وەک خۆی وتەنی زمانم بپژێ، ئەمەو جگە لەوەی کە مەلا مەسعوودی برام، گەلێ رۆژنامەو بەیاننامەو کتێبی ئاشکراو نهێنی دەهێنایە مالّەوە و لەگەلّ برادەرە سیاسیەکانیدا کۆبوونەوەیان دەکرد، منیش دەرفەتم وەدەس دەخست و ئەو چاپەمەنیانەم دەخوێندەوە..! هەر لەو کاتانەشدا بوو خرامە بەر خوێندنی قوتابخانە، کە ئەمیش رێگەیەکی تری چاوکرانەوەو هاتنە نێو دنیای ئەدەبیم بوو، بە تایبەتیش تەنیا لە قوتابخانەکەی ئێمەدا (قوتابخانەی یەکەمی هەولێر) لە پۆلی (١-٤) دەرسی کوردی تێدا ئەخوێندراو بەڕێوەبەرەکەشی مامۆستای رەوانشاو عزالدین فەیزی بوو، کە زۆر بایەخی بە سروودو خوێندنی کوردی دەدا، مامۆستا زایەری هەناریش قوتابیانی فێری سروودی نەتەوایەتی دەکردو شیعری پیرەمێرد و بێکەس ودلّدارو مەلای گەورەی پێ ئەزبەر دەکردین، ئەمەیان جۆرە کەشوهەوایەکی منالّی و مێرد منالّیم بوو، هێشتا تەمەنم خۆی لە قەرەی (١٥) سالّی نەدابوو، تووشی کەشوهەوایەکی ترهاتم، کاتێ چەشەم بۆ (موتالا)ی کتێبی جۆربەجۆری سیاسی و ئەدەبی کرایەوە، بە تایبەتی مارکسیزم، کە زۆر بە توندی کاری تێکردم و چەشنە یاخیبوونێکی لە لادروستکردم، هەر لە ناو ئەو یاخیبوونەشدا خۆم لە نێو ئاژاوەیەکی قوولّی فیکریدا دۆزیەوەو حەجمانم لێبڕا، هەر لەو سەروبەندانەی

هەرزەکاریمدا، تەیاراتی وجوودی و بەتایبەتیش سارتەری زۆر کاری تێکردم و هەر بە تەواوی دنیاکە لەلامدا گۆڕاو کەوتمە نێو نیگەرانیی فیکرییەوە، زۆر نهێنی ئەو ساتانە هەیە کە ناتوانم لێرەدا بیدرکێنم، بەڵام هەرگیز ئەوەم لە بیر ناچێ کە بەخراپی زمانیان لێدابووم لەلای باوکم، ئەویش دەمەو عەسرانێک لە نێو حەوشەدا هەموو کتێبە نائاینییەکانی کەڵەکە کردبوو، نەوتیشی پێداکردبوو، گڕیشی تێبەردابوو، بە خاکەنازەکەی دەستیشی ئەمدیو ئەو دیوی پێدەکرد، تا باشتر بقرچێن..! ئا لەو ئاژاوە فیکریەدا، چوومە نێو ریزی پارتییەوەو هەر لەو ناوەندەیش فێری یەکەم رازی کوردایەتی بووم و لە پەنهانی خۆیشمدا خۆم بەنەتەوە پەرستێکی وجوودی پێشکەوتنخواز دەهاتە بەرچاو...!

**رامان: مەبەست لەو نیگەرانی فیکرییە چییە؟**

**زامدار:** مەبەستم تێکشکانی کەشوهەوای کۆنم ورووکردنم بۆ نێو کەشوهەوایەکی نوێ بوو.

**رامان: وەچەی تۆ کامانە بوون؟**

**زامدار:** لەوانە عەبدوڵڵا پەشێوو مستەفا پەژارو سەلاح ماندوو سەعید خەتاب و ئەحمەد رەشوانی و موحسین جوامێر و لەپاشا سەرسام و پەرۆش و خامۆش و کرمانج ورەنجبەر و باجەلان و هێرش و خەمناک و چەندانی تر بوون... ئا لەوساتانەشدا دیاردەیەکی زەق لە ناو شاردا هەبوو، کە لەوانەیە تا ئێستە بە قووڵی باسی لێنەکرابێ، ئەویش دوو تەیاری دیاربوو، تەیارێکی کوردی نووسین بەرامبەر بە تەیارێکی عەرەبی نووسین کەلەبرادەران (سەیفەددین ئسماعیل و عەبدوڵڵا حەداد و فەرهاد شەریف و یەحیا ئدریس سەواف) و چەندانی تر پێکهاتبوو، هەردوو تەیارەکە لە ململانێیەکی دۆستانەی ئەدەبیدا بوو، پارتی ئێمە و مانانی پاڵپێوەدەنا تا رووبەڕووی ئەو تەیارە ببینەوە، ئەوەبوو هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆرشی مەزنی ئەیلوول، وردە وردە ئەو تەیارە عەرەبییە کزوکزتربوو، تەیارە کوردیەکەش بە تەواوی پەرەی سەند، بەڵام لە کەشوهەوایەکی پتر لە (٨)ساڵی قاتوقڕی بڵاوکردنەوە.. نابێ ئەوەش فەرامۆش بکرێ کە بوونی چاپخانەی کوردستان و گۆڤاری (هەتاو) و مامۆستای نەمر گیوی موکریانی دەورێکی زۆری بەسەر هەموومانداا هەبوو، گیوی نەمر خۆی کتێبی کوردی بە سەرماندا دادەبەشی، زۆرجارانیش خۆمان کتێبمان لێدەدزی، لە پاشا کە دزیەکەمان بۆ دەدرکاند- من خۆم یەکێ بووم لەو کتێب دزانە- دەیبەخشین و بەبزەیەکەوە دەیفەرموو: (قەینا مادامەکی کوردی فێر ئەبن، لێتان زویر نابم...!)

هەر لەو ماوەیەشدا و بۆ ماوەی چوار ساڵ لەو چاپخانەیەداو لە رێگەی مەلا مەسعوودی برامەوە، بەردەستی مامەگیوم دەکرد و هەر لەوێشدا بۆ یەکەم جار چاوم

**ئەوانەی دڵڕەقانە دژایەتی وەچەی نوێیان دەکرد ئێستە پەشیمان بوونەتەوە**

به جیهانی چاپخانەو چاپەمەنی و رۆژنامەوانی رۆشنتربوو، زیارتریش چێژم لەو جیهانە سەرسیمە و بەرفراوانە وەردەگرت...!

مەحموود زامدار بە منداڵی

**رامان: باشە، ئەی کەشوهەوای رۆشنبیری لە هەولێر لە پەنجاو شەستەکاندا چۆن دەبینی؟**

**زامدار:** لە ژمارە (١٤) گۆڤاری (بەیان )ی ساڵی ١٩٧٤ دا بە دورو درێژی لەم باسەو لە ژێر ناوی (بزووتنەوەی رۆشنبیریی لە شاری هەولێر)دا کۆڵیوەتەوە و هەر هەموو ئەوانەی بەشداریان لەو بزاڤەدا کردبێ، ناونووسم کردوون.. بەم دواییەش بیستم کە ئەو لێکۆڵینەوەیەم لە شاری کرمانشا کراوە بە نامیلکەیەک، بەڵام بەداخەوە نەمدیوە.. ئەبێ ئەوەش هەڵنەبوێردرێ کە یەکەم قوتابخانەی بە کوردی خوێندن لە هەولێر کرابێتەوە، لە ساڵی (١٩٢٦) دا بووە، کە بەراستی دیاردەیەکی وەرچەخان و گۆڕرانە لە بزاڤی رووناکبیریی کوردیدا، جگە لەمەیش بزووتنەوەی سەرانسەری رۆشنبیریی لەم شارەدا، بەندیواریەکی توندوتۆڵی لەگەڵ زمانی تورکی و فارسی و عەرەبیدا هەبووە، ئەوەی کە کوردیشە تەنیا چەند دەنگ و ناوێکە و بێ شوێنەوارە و بەس، لە پاڵ ئەوەش لە دەشتی پانوبەرینی هەولێردا چەند مەلایەکی شاعیر هەبوون، بەڵام کاریان نەدەکردە سەر بزووتنەوە کزوچەسپاوەکەی جارانی شار... بەواتایەکی تر ناوەوەی شار زیاتر مۆرکی عوسمانلی هەبوو، دەرەوەیشی مۆرکێکی کەلەپووری نەتەوایەتی و میللی کوردی.. بەش بە حاڵی خۆم ویستم تەنیا لە سەدەی نۆزدەیەمدا بە دوای چەند دەقێکی کوردی بگەڕێم، بەڵام جگە لە یەکدوو دەقی شێوەزاری هەورامی نەبێ کە لە رێی تەریقەتی نەقشبەندی گەیشتۆتە هەولێر، هیچی وام چنگ نەکەوت... بێگومان سیاسەتی تورکاندنی ئەم شارە بۆ ماوەی (٤٠٠) ساڵ کارێکی گەورەی لە ژیانی رۆشنبیریی دا گیرابوو، بۆیە کوردی نووسین و خوێندن، تا سەرەتای ساڵانی سیی زۆر زۆر کزبوو، یا هەر نەبوو، جارێکیان باوکی رەحمەتیم نوکتەیەکی بۆ گێڕامەوە و وتی: لە سییەکان پیرەمێردی شاعیر، دانەیەکی لە رۆژنامەی (ژیان)ی بۆ مەلا ئەفەندی ناردبوو، ئێمەش بە سوختەو فەقێوە، دەورمان لەو رۆژنامەیە دابوو یەکێ بە (ژیانون) و یەکێ بە (ژیانین)و یەکێکی تر بە (ژیانەن) ئیعرابی دەکرد..! جا حاڵ بەوجۆرە بووە، بەڵام وەک دیارە لەگەڵ سەرهەڵدانی گۆڤاری (زاری کرمانجی) لە رەواندوزو لە پاشا گۆڤاری (رووناکی) لە هەولێر و ئەمەو جگە لە گەیشتنی هەندێ چاپەمەنی کوردی لە سلێمانییەوە بۆ هەولێر بە تەواوی کەشوهەواکەی گۆڕی، بە چەشنێکی وا شاعیرێکی وەک (کانی) قۆریاتی تورکی بە کوردی دەهۆنییەوە و بڵاو دەکردەوە.. ئەمەو نزیکیی شاری کۆیە لەم شارە، کە پتر لە سەدەونیوێک هەر لە (شێخ مستەفای قوتبی شامەوە بگرە تاحاجی ئەمرو قاسیدو مەلابەکری

حەوێزی و حاجی مەلا عبداوللای جەلیزادە و ئەختەرو کەیفی و فیکری و خادیم، تا دەگاتە سەر عەونی و تایەرو رۆستەم حەوێزی و دلدار و دلزارو شارەزاوە.. تاد) دەورێکی یەکجار دیاری رۆشنبیریی لەم شارەدا بینیوە.. زۆربەی ئەو دەستەیەی کە لە سییەکاندا سەریان هەلدا، بەشێکیان خەریکی ئەدەبیات و رۆشنبیریی گشتی بوون و بەشی هەرەزۆریشی خەریکی سیاسەت بوون، بەلام ئەفسووس زۆر بە یاشی نەیانتوانیوە

- لەبەر گەلێ هۆی کۆمەلایەتی و شارستانی!- سیماوئەدگارە سروشتییەکانی جوولانەوەی رۆشنبیریی کوردی لەم شارەدا گەلالە بکەن و بیخەنە پێرەوکەو گەشەی پێبدەن، چونکە زۆربەیان زەمینەیەکی پوختیان لە بارەی ژیان و واقیعی کۆمەلایەتی نەبووە، بۆیە بەرهەمەکانیان گیانی دینامیکیان تێدا نییە.. بەلام هەر بەرابەرو هەر بە پێشەنگ پەنجەنوما دەکرێن.. ئەمەیان واوهەر لە پاش شەڕی یەکەمی جیهانگیریش و هاتنە کایەی راپەرینەکانی نیشتمانی و تا دەگاتە پەنجەکان، دەرگاو دەروازەی ئەدەبیات و هونەرو فیکرو زانستی رۆژاوا و میللەتانی دەردراو سێ و بلۆکی سۆشیالیزم، لە سەر گازەرەی پشت لەبەردەم ئەم وەچەیەدا کرایەوە، دیارە دەوری دیاری رۆژنامەو گۆڤارەکانی (گەلاوێژ)و (دەنگی گیێتی تازە)و (ژین) و (ئازادی) بە تەواوی خۆی لەم قۆناغەدا نواندووە، کە لە سالی (١٩٥٠-١٩٥٣)یش رۆژنامەی (هەولێر- اربیل) بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بلاوکرایەوە، ئەمیش بە هەولی نەمرێکی وەک عزەددین فەیزی و دەستەیەک لە رۆشنبیرو مامۆستا دلسۆزەکانی ئەو ئانوساتە، ئەمیش دەورێکی دیاری لەم کارەدا هەبوو، لەوانەیش (گیوی موکریانی- مارف خەزنەدار- عەلی چوکل- خەلیل خۆشناو- حوسێن رەشوانی- ئیحسان مستەفا- عەونی یوسف- وریا ئەمین رەواندزی- ئیبراهیم هوشیار- لەتیف بەرزنجی- پیربال مەحموود- بێبەش -جەلال خەیلانی- بێخەو- بورهان جاهد- رەشاد موفتی- عومەر ساقی- عبدولوەهاب حەسەن- جەمال خەزنەدار- عەلی فەتاح دزەیی- مەلا شەریف- ئیسماعیل رەسول- ئەنور دلسۆز- زیوەر خەتاب- بیلال عەزیز- ئەنور تاهیر- بەشیر چیچۆ- محەمەد مولودی مەم...تاد)

جگە لە بەشداربوونی رۆشنبیرانی دەرەوەی شار لە جموجولی رۆشنبیری دا وەک (گۆران- فوئاد عیزەت- محەمەد عەلی کوردی- زەکی هەناری- جەمیل رۆژبەیانی- شاکر فەتاح- ناهیدە شێخ سەلام- ئەنوەر مائی- ئبراهیم بالدار- فەرەج شارەزووری- عیصمەت کەتانی- ئەحمەد شوکری..تاد)

ئەمەیان زۆر زۆر بە کورتی..!

**رامان: ئەی دەوری هەرە دیاری مامەگیو لەو بزاڤەدا؟**

**زامدار:** یەکجار گەورەبوو، بە تایبەتی دوای داخرانی رۆژنامەی هەولێر، گۆڤاری (هەتاو) لە سالی ١٩٥٤دا دەورێکی (وەک وتم) گەلێ مەزنی لەم بوارەدا بینی، تاوای لێهات (هەتاو) بووە سەنتەری رۆشنبیرانی هەولێر و کوردیش... جێی رامانە کە ئاماژە بۆ ئەو تاکتیکەی مامۆستا گیوی نەمر بکەم کە لە گۆڤارەکەیدا بە

کاری دەهێنا، ئەویش هەڵخستنی گۆشەی (مەتەڵ) بوو کە دەیویست لەو کەلێنەوە گەنجانی شار بەرەو کوردی نووسین رابکێشێ، بەراستیش توانی ئامانجەکەی بپێکێ و دەیان و بگرە سەدان کەسی لە دەوری گۆڤارەکەو کوردی نووسیدا کۆ کردەوە..!

## بەشی کوردی کۆلیژی ئەدەبیاتیان ناو نابوو بەشی هەی بەڵلارو دەهۆڵ و زورنا

**رامان: ئەی چ پێوەندیەکی رۆشنبیری و ئەدەبی لە نێوان نووسەرانی کۆیەو سلێمانی و هەولێر و شوێنەکانی تردا هەبوو، کەس باجی سیاسیی لەو قۆناغەدا داوە؟**

**زامدار:** وەک لەو ناوانەی ئاماژەم بۆ کردن، دیارە ئەو پێوەندییە هەبووە، بەڵام وەک ئەمرۆ توندوو لەبەر چاونەبووە، بەڵکو کز بووە، تەنیا سالۆنێکی ئەدەبیش لەناو چاپخانەکەی کوردستان بوو، هەندێ دیوەخانیش هەبوو، نووسەران و رۆشنبیران لەوێ یەکیان دەگرتەوە، وەک دیوەخانەکەی (موفتی زادە)...! لە بارەی باجی سیاسییەوەیش گەلێ لەو رۆشنبیرانەی ئەو سەردەمە، گیران و راونران و چەند کەسێکیشیان لێ ئیعدام کرا...!

**رامان: تۆ کۆلێژی ئەدەبیاتت تەواو کردووە، ئایا ئەوکۆلێژە تا چ رادەیەک سوود مەندبوو لەم بوارەدا؟**

**زامدار:** من بۆ خۆم چوار ساڵ لەو کۆلێژە ژیام بەڵام تەنیا (٤٠) رۆژ دەوامی رەسمیم تێدا کردووە، ئەمەیان جار جار مامۆستای رەوانشاد عەلائەددین سەجادی وەک (نوکتە) دەیگێڕایەوە.. بەراستیش ئەو قوتابیانەی دەهاتنە ئەوێ، گەر خۆیان لە بەراییەوە شتیان پێ نەبوایە، نەدەبوون بەشت و بەنووسەر، بەڵکو مامۆستایەکی رەقو تەقیان لێ دروست دەبوو... من بەش بە حاڵی خۆم - زیاتریش لە دەرەوەی کۆلێژ!- جگە لە دکتۆر مارف و دکتور عزەددین، هیچی وای تێدا فێر نەبووم، هەر چەندەیش دوو ساڵ لە بەغدا بووم بە مامۆستا، بەڵام لە ئەنجاما رەنجام و بەیەکجارەکی بەجێم هێشت..! هەر بۆ نوکتە و بەس: ساڵێکیان ئەو بەشە کوردییە نزیکەی (٩٠٠) قوتابی وەرگرت، هەر ئەوساڵەش ناوی لێنرا بەشی **(هەی بەڵلار)** یا بەشی **(دەهۆڵ و زورنا)** یا بەشی **(تاعوون)** چونکە بەراستی بووە جێی هەڵپەرکێ و ئاهەنگ گێران نەک خوێندن و زانست.. ئەو ساڵە، ئەوساڵەبوو کە کاک مەسعوود بارزانی لەگەڵ هەندێ بەرپرسانی حکوومەت هاتنە کۆلێژەکەمان و ئاهەنگێکی قەشەنگمان بۆ سازدا.. ئەمە حاڵی لایەنێکی بەشە کوردییەکە بوو، بەڵام خۆ لە قاعیدە بە دەریشی تێدابوو، بە تایبەتی ئەو دەستە قوتابییەی کە خۆیان عاشقی وشەی کوردی بوون..!

**رامان: وەک دیارە پێشکەوتنی شارێک و رۆشنبیریەکەی بە خەڵک و بەهەڵسوکەوت و بە قسەو رەفتاری ئەو خەڵکەوە دەردەکەوێ، وەک لە قسەکانت**

مەحموود زامدار بە مێرد منداڵی

**دیارە تۆ لە هەولێر ئاستێکی بەرزی رۆشنبیری تێدا نابینی، تا ئێستەش کە پایتەختی کوردستانە.. تۆ وتت کاریگەری کەڵچەری عوسمانلی بە سەر هەولێرەوە دیاربوو، دوای ئەوەی رژێمەکانی عێراقیش ئەو بایەخەیان پێنەدا، باشە چەندی ئەو هۆکارانە پێوەندی بەلاوازی بزووتنەوەی کوردایەتییەوە هەیە، یا چەند کارتێکەر بووە بۆ هۆشمەندی سیاسیی لە هەولێردا؟**

**زامدار:** بەراستی نەشونمای هوشیاری سیاسیی لەم شارەدا، لەسەرەتاو ناوەڕاستی سییەکاندا دەستی پێکردووە، ئەویش رەنگی خۆی لە هۆشمەندی رۆشنبیری گشتیدا داوەتەوە.. منیش ئاماژەم بۆ ساڵانی زوو کرد نەک ئێستە..!

**رامان: کەواتە مەسەلەکە هەر کەڵچەری عوسمنی نەبووەو بەس؟**

**زامدار:** جگە لەو کەڵچەرەش، هەولێر کەوتۆتە نێوەندێکی کشتوکاڵییەوە، دیارە ئەمیش جۆرە بۆ چوون و رەفتارو هەڵسوکەوتێکی دیکە دروست دەکا، بە تایبەتیش لەسی و چل و پەنجاکاندا، کە ئەوساتانە هەولێر زۆر زۆر بچووک بوو، لە گەرەکێکی ئێستەی خۆی بچووکتر بوو.. هەر بۆیە تائێستەش زۆربەی زۆری وشەو دەستەواژەی ناو شار پاشماوەکەی ماوەو هەر رەنگی ئەو عەقڵییەتە کشتسازیبە دەداتەوە!؟

**رامان: تۆ مرۆڤی هەولێری بە مرۆڤی قەڵا یا بە مرۆڤی دەشتەکی دەزانی؟**

**زامدار:** جاران قەڵاتی بوو، ئێستە دەشتە- بەمانا فراوانەکەی - بە تایبەتیش دوای کۆچڕەوی جوتیاران بۆ نێو شار دەستی پێکرد، یا بەزاری هەولێریان (کرمانج!) هەر بە جارێ کەشوهەوای ناو شار گۆڕراو وردە وردە ئەو کەڵچەرە کۆنەی عوسمانلی و قەڵا پاشەکشەی کردو پێچراو جۆرە کەشێکی تر هاتە گۆڕێ..!

**رامان: بە هاتنی (کرمانج) بۆ ناو شار، مانای لە ناوچوونی ئەو شارستانییەتە بوو کە لە قەڵادا هەبوو، واتە: بوونی کورد لە هەولێر پەرەی سەندو ئەو رۆشنبیرییە لاوازەشی لەگەڵ خۆی هێنا؟**

**زامدار:** بەڵێ- وەک وتم- بە هاتنی جوتیاری کرمانج بۆ ناو شار (٧٠٪) ی کەشەکەی گۆڕی و بەسەر ژیارە تەقلیدیەکەی جاران زاڵ بوو بەڵام پێرەوکەکەی کز و لاوازبوو.

**رامان: باسی لایەنێکی منالی خۆت کرد، قسەیەک هەیە دەڵێ: منالیی پیربوونی نووسەرە، تۆ ئێستە شتێکت هەیە دەربارەی فەلسەفەی ئایین؟**

**زامدار:** وەک ئاماژەم بۆ کرد، کەتووشی گێژاوە فیکریەکە هاتم، خۆم لە نێو ریزی کوردایەتیدا دۆزیەوە و لە زۆرشتی منالیم دابڕام و لە پاشانیش بەرەو کێشەکانی (تصوف) ێکی هاوچەرخانە کشامەوە..!

**رامان: واتە نەتتوانی بە تەواوی لە ئایدیۆلۆژیای خانەوادەییت بپچڕێیت؟**
**زامــــدار:** بەڵێ.. تا رادەیەک ئەو ئایدیۆلۆژیایە پاشەکشەی پێدەکردم، بەڵام هۆشمەندی رۆشنبیریم لە قۆناغی هەرزەکاریدا بەرەو پێشەوە هەنگاوی دەنا، بە تایبەتی کە شۆڕبوومە نێو ناخی تەیاراتی گەورەی فیکری و فەلسەفییەوە، هەنگاو دوای هەنگاو لەو کەشوهەوا کۆنە فیکریە دور دەکەوتمەوە، وەک هەر لە سەرەتاوەش ئاماژەم بۆ کرد..!
**رامان: تۆ چۆن باسی پاکبوونەوە دەکەیت، هەر وەک چۆن دانتی باسی لێکردوە؟**
**زامــدار:** بەڕای گەلێ زانای دانتی ناس، ئەو بەهەشتەکەی لە ئاسمانەوە هێنایە سەر زەوی، مامەڵەیەکی رۆحیانەی لەگەڵ بوون و ژیان و مەرگ و مرۆڤ و بەها ئەخلاقییەکان دەکرد، لە ئەنجامیشا دەقەکەی بوو بە دەقێکی سۆفیزمانە.. پاکبوونەوەیش دیارە لە خودی مرۆڤ خۆیەوە دەس پێدەکا..!
**رامان: ئێمە پێمان وایە تۆ مرۆڤێکی (إنتقائي)یت لە فیکردا، تا بتوانی سوود لە هەموو رێرەوە فیکرییەکان وەرگریت، بۆ تەفسیرکردنی هەموو دیاردەکان کە لە خودی مرۆڤ و گەردوون دا هەیە.. ئەمەیان چۆن؟**
**زامدار:** ئا بەڵێ من لە فیکردا (إنتقائي)م، بەڵام بەچەشنێ کە نکوڵی لە هیچ بیرو بۆچوون و فەلسەفەو ئایدیۆلۆژیاو تێڕوانینێکی ئینسانی نەکات.. هەر بەو (إنتقائیەتەش) توانیومە خزمەتی ناخی خۆمی پێبکەم و بەدوای پاکبوونەوە بگەڕێم، بۆیە زۆرجار بە پچڕپچڕ دێمە بەرچاوان.. بەڵام من بڕوام بە جۆرە (وحدة الوجود)ێک هەیە لە هەموو بوارەکانی ژیان و مێژوو مرۆڤ و گەردوون دا، هەر ئەم (إنتقائیەت)ەش بەرەو (موسوعیەتی) پەلکێش کردم..!
**رامان: وەک وتت: سەرەتا بەرەو مارکسیزم چوویت و زۆر شتی لەلاتا دروست کردو رووخاند، لەو قۆناغەی تۆدا، بە عادەت فیکری مارکسی ئەدیبی بەرەو یاخیبوونی سیاسیش دەبرد، بەڵام وەک دیارە محمود زامدار بە ئەدیبی شۆڕشگێڕ نەناسراوە، بەڵکو وەک ئەدیبێکی ناسراو بەناوبانگەو لە بوارە جیاجیاکانی رۆشنبیری دا کاری کردووە، هۆی چییە مارکسیەت تۆی بەرەو حیزبایەتی و پراکتیک نەبرد، لە کاتێکا ئەو مارکسیەتە بوو بە تەکانێک بۆ زۆر لە ئەدیبان، هەتا رۆڵیان لە گۆڕانکاری سیاسەتدا هەبێ، ئەی تۆ بۆ لە نێو گروهە سیاسیەکاندا نەگیرسایتەوە؟**
**زامـدار:** من لە سەرەتاوە وتم: مارکسییەت بەشێکی گەورەی یاخیبوونم بوو، لە پاڵ سارتەریەت لە واقیعی تاڵی رۆژانە!
**رامان: مانای ئەزموونەکانی فەلسەفەی مارکسییت وەرگرت؟**
**زامدار:** بەڵێ وایە... لە بیریشمە لە (زێدەبایی) نەدەگەیشتم، ناچار رووم کردە مەلا شەریفی هەولێری کە بە مەلا عەرووس بە ناوبانگە، ئەوسا ئەو بەئاسانی و بە زمانێکی سادەو بە چەند دانیشتنێک ئەو مەسەلە قورسەی بۆ شیتەڵ دەکردم.. هەر لەم بوارەشدا من زۆر زۆر بەندیواری لێکدانە قووڵەکانی (ئەنگلز) بووم،

چونکە زیاتر لە جیهانی رۆمانتیکیانەی من و لە جیهانی شیعر و جوانی و خەیاڵی وردو واقیعبینانەی فانتازیایی من نزیک بوو، بەواتایەکی تر - ئەگەر بکرێ-

ئەو ساتانە من (ئەنگلزی) بووم، نەک مارکسی!

بۆ چوونە نێو گرووهی سیاسیش، ئەوە وەک ئاماژەم بۆ کرد، من خۆم لە نێو ریزەکانی پارتیەکی پێشکەوتوودا دۆزیەوە، نەک حزبێکی مارکسی، چونکە زیاتر لەگەڵ بۆچوونەکانی پارتی دا دەگونجام و بنەما پیرۆزەکانی کوردایەتیش زۆر زۆر کاریان تێکردبووم..!

**رامان: باواز لە سیاسەت بێنین، مادامەکی ئەو کاتە خەریکی خولقاندنی ناخی خۆت و بە جیهانی بۆ چوونی خۆت بوویت، ئایا هەولت داوە بە نووسین گوزارشت لەو قۆناغە فیکرییە بکەیتەوە؟**

**سەرەتای کوردی خویندنەوەمان بە کتێب دزین دەستی پێکرد لە قۆناغی یەکەمدا تووشی گێژاوی فیکری بووم دوایی خۆم لە ریزی کوردایەتیدا دۆزییەوە**

**زامدار:** بەڵێ: دوور لە سیاسەتی حزبایەتی و بە نووسین، ئەو قۆناغەم لە تابلۆکانی (دەردە کورد)دا رەنگی داوەتەوە، کە چاوەڕێم بۆمی لە چاپ بدەن، لەوێدا ئامانجی هەرەبنەڕەتیم، جگە لە رەنگرێژتنی ئەوسای باری کۆمەلایەتی و ژیاری و سیاسی و سێکسی و ئەخلاقی و رۆشنبیری نێو شارەکەم، بنەماکانی فیکری کوردایەتیشم هەر لەوێ رەنگی داوەتەوە..!!

**رامان: وەرگێرانەکانت دوورن لە مارکسییەتەوەو نزیکن لە میتۆلۆژیا، بەتایبەتیش لە حەفتاکاندا، ئایا ئەو نووسینانە گوزارشت لە خودی خۆت دەکا؟**

**زامدار:** وەک ئێوەو خۆیشم ئاماژەم بۆ کرد، من (إنتقائي)م.. حەزیش دەکەم ئەوە بلێم:

کە من وەک شاعیر دەستم بە ژیانی ئەدەبی خۆم کرد، بەلام لەبەر ئەوەی (شیعر) لەلامدا (مەسئولیەتێکی گەورەی ئەفراندنێکی زۆر گەورەبوو) زۆریشی لێدەترسام و نەشمدەتوانی خۆم لە قەرەی ئەو ئەفراندە گەورەیە بدەم کە بەقوولی لە بنەماکانی گەیشتبووم، بۆیە وازم لێ هێنا، دوای ئەوەی دیوانێکی (٤٠٠) لاپەڕەییم نووسیەوە چاکیشم کرد وام کرد، چونکە گەر شیعر ئەو ساتە و ئێستەش- ئەفراندنە مەزنەکەی لێدەرکەی- ئەوەبێ کە هەیە، ئەوا من خۆم لە (٩٨٪)ی ئەو شاعیرانە بە شاعیر تر دەزانم.. هەر ئەمەش وای لێکردم گەلێ شاکاری گەورەی

جیهانی لە نێو دنیای سەراسیمەو بەر هەرای شیعردا وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی، بە تایبەتیش ئەوانەی کە کار لە ڕەوتی نوێخوازی شیعری کوردی دەکەن و بنەما شاعیریەکەی خۆمیش لەم ڕێگەیەدا بخەمەکار.. وا دیارە جەنابیشت ئاگاداری ئەوە نیت کە لە ساڵی (١٩٧٢)دا هەر بە ناوی (مارکسی شاعیر و دڵدار)ەوە لە ڕۆژنامەی هاوکاری دا لێکۆڵینەوەیەک لەگەڵ چەند هەڵبژاردەیەک لە شیعرەکانی مارکس بڵاو بکەمەوە، ئەمەو جگە لەمەش بە (١٤) ئەڵقە کتێبی (مارکسیزم و زانستی زمان)ی ستالینم هەر لە ڕۆژنامەی هاوکاری دا ولە ساڵی (١٩٧١)دا بڵاو کردەوە، جگە لە بڵاوکردنەوەی شیعرەکانی لێرمەنتۆف و مایاکۆڤسکی و چەندین شاعیری چەپڕەوی سەر بەبلۆکی ئەوسای سۆشیالیزم..! ئینجا خوێندنەوەی نوێ و سەروسۆراغی بەردەوام و وەرگێڕانی بەردەوامیشم لە شاکارەکانی شیعری ڕۆژاوایی و سەرتاسەری هەر پێنج کیشوەرەکە..!

**ڕامان: بەپێی قۆناغەکانی ژیانت، تۆ لە ژیانی نووسینت دا، نیگەرانیت لێ دیارە و هەتا ئێستە بەرقەرار نەبوویت و پسپۆڕیت لە بوارێکی دیاریکراودا نییە، بەڵکو لە هەموو کێڵگەکانی ئەبستیمدا کار دەکەیت، هۆی ئەمەو ئەم پەرشوبڵاویەت چییەو لە چییەوە سەری هەڵداوە؟**

**زامدار:** من بەوە ناڵێم پەرشوبڵاوی، بەڵکو بە لێکدانەوەیەکی ئینسکلۆپیدیایی دادەنێم .. من هەر لە بەرایی هەرزەکاریمەوە، کەوازم لە دنیای مەزن و سامداری شیعر هێنا، لەو باوەڕەدا بووم کە زەمینەی ڕۆشنبیری و ئەدەبی و فیکری و سامانی نەتەوایەتی کوردی، خاکێکی نەکێڵراوە و بە هەوەسی خۆت دەتوانی بیکێڵی و کاری تێدا بکەیت و چۆنیش دەستی بۆ درێژ کەیت شتت دێتە دەست، بۆیە مەبەستی من و دوای ماندووبوونێکی زۆر بە ڕۆشنبیرکردنی خۆم، لە هەموو کێڵگەو بوارەکانی ئەبستیمدا دەستبەکار بووم لایشم وایە خزمەتێکی زۆر بچووکی ئەو لایەنانەم کردووەو تۆمارەکانیش هەروا ڕادەگەیەنن..!

**ڕامان: ئەی کاتێ ئاوڕت لە فۆلکلۆر دایەوە، ئایا ئەمەیان سەلماندنی نیازپاکی خۆت نییە بەرامبەر بەم سامانە، چونکە لە کاتێکا هەندێ لایەنی ڕوانگە ڕەفزی فۆلکلۆریان دەکرد، کەچی تۆ خەریکی ئەم لایەنە بوویت، ئایا ئەمە هەڵوێستێکی کولتووری نەبوو بۆ تۆ؟**

**زامدار:** بەڵێ، هەڵوەستەیەک بوو، چونکە دەمزانی جموجووڵی (تەعریب و تەغریب) کردنی مرۆڤی کورد لە وڵات و کەڵچەرو لە سامانی فیکری نەتەوایەتی خۆی گوناهێکی گەورەیە، من خۆم پاڵپشتی بزاڤی (ڕوانگە) بووم ولە پشت پەردەوە بەرگریم لێدەکردو بە ئانقەستیش شاکاری جیهانیم بڵاو دەکردەوە تا زیاتر ئەو (ڕوانگە)یە پێداگرێ و ڕەگازۆتر بێ، بەڵام لەگەڵ هەندێ لەو بۆچوونانە نەبووم کە «فۆلکلۆرو کلاسیکی زیندوو وسامانی پڕ لە زیندەگی نەتەوایەتی تور بدرێتە دەریاوە..!» هەر لەو ساتە پڕ لە تەوژمەشدا و تەنیا لەیەک مانگدا (ساڵی ١٩٧٤) دوکتێبی لەیەک دوورو نزیک لەیەکم (وێرانەخاک)ی ئیلیوت و (بۆنی هەڵاڵان دێ)ی فۆلکلۆرم گەیاندە چاپ، هاوکێشەکەش لە لامدا لە نێوان گرێدانی

هەردوو جەمسەری (رەسەنایەتی و هاوچەرخیتی) بوو، رەسەنایەتییەکە لە کوردەواری و هاوچەرخیەتەکەیش لە رۆژاوا لە جیهانی راچەنیودا، بڕوایشم بە بۆ چوونی تاکلایتانە نەبوو..!

**رامان: یانی مەبەستت ئەوەبوو لە نێو هەموو کێڵگە مەعریفیەکاندا، بە تایبەتی ئەوانەی دەستیان لێنەدراوە بەسەر بکەیتەوە، بەڵام من زۆر جار گوێم لێت بووە کە ئیدانەی خۆت کردوە، چونکە رۆژنامەنووسی زۆر زۆر لەوزەو تواناکانتی کوشتووە، ئەمەیان چۆن؟**

**زامدار:** بەڵێ وایە... بەراستی من خۆم زیاتر لە رۆماننووسیدا دەدۆزیەوە، بەڵام لەبەر بژێوی ژیان کە دووچاری جیهانی بەربڵاوی رۆژنامەنووسی بووم، ئەو هەموو هێزو هەرەنگ و توانایەی لە لادا خنکاندم، بەڵام بەوەرگێرانی چەندین شاکاری جیهانی لە بواری (شانۆیی)دا ئەو تۆڵەیەشم سەندەوە...!

مەحموود زامدار بە لاوی

**رامان: تۆ خۆت زیاتر لە کامیان، لە رۆژنامەنووسی یا لە ئەدەبیاتی دا دەدۆزیەوە؟**

**زامدار:** بێگومان لە ئەدەبیاتیدا، ئەوەی ژیانی منی لە نێو رۆژنامەنووسیدا خوێندبێتەوە، ئەزانێ هیچ کاتێ رۆحی ئەدەبیم بە رۆحی رۆژنامەنووسی نەگۆڕیوەتەوە.. من نزیکەی (٩٥٧) دیدارو چاوپێکەوتنی جیاجیای رۆژنامەنووسیم لەگەڵ سەرجەم وەچەکانی خۆم و دوای خۆیشم ئەنجام داوە، بەڵام زمانم هەر زمانی ئەدەب بوو، نەک رۆژنامەنووسیی، لێشنەگەڕاوم زمانی رۆژنامەنووسیی وشکم بکاتەوە..!

**رامان: چونکە زمانێکی ئیستیهلاکییە**

**زامدار:** ئیستیهلاکی یەو زۆریش راستەوخۆو زەق ورەق و تەقە..!

**رامان: تۆ لە هەشتاکان لەگەڵ کۆمەڵێ دەنگ زۆر ماندوو بوویت، بە تایبەتی لە هەولێرو لە بواری شیعردا، بەڵام زیاتر بەقسەو بەرگری کردن بوو، نەک بەنووسین، بە تایبەتی ئەو جووڵانەوە شیعریەی کە لە هەولێر سەری هەڵدابوو، هۆی چی بوو، بە کوێ گەیشت، چۆن بوو؟**

**زامدار:** سەبارەت بە سەرهەڵدانی ئەو بزاڤە، من تەنیا و بەس جارم بۆ ئەداو مزگێنیم دەبەخشی و بەرگریم لێدەکرد و دەق و راوبۆچوون و تێڕوانینەکانیم بڵاودەکردەوە، مەبەستم خوڵقاندنی پەرژینێکی قایم بوو لە دەوری (داهێنەرەکان) تا دەستی لێنەوەشێن.. ئەو وەچەیە خۆی خۆی خوڵقاندبوو، بە تایبەتی دوای پاشەکشەکردنی (روانگە).. من کە هاتم و بەناو (پێشڕەوایەتی ـ طلیعیەت)

ناوزەدم کرد، مەبەستێکی دوورو نزیکی ئەدەبی ونوێخوازی و شڵەقاندنی گۆمەکەو واقیعەکە بوو... ئەو بزاڤە لەشاری هەولێر چەقی بەستبوو، دەشبوایە جارِدانێکی چاکی بۆ بکرێ، دەبوایە دەنگی **(هاشم سەراج و جەلال بەرزنجی و دلشاد عەبدوللا و ئەنوەر مەسیفی و محەمەدی باوەکر)** و وەچەی دووای ئەوانیش بگاتە سەر شانۆی رۆشنبیری کوردی، لەم جارِدان و بگرەو بەردەو بەرگرییەدا تووشی گەلێ دڵێشەو سەرێشە هاتین.. بۆ بەرگری کردنیش، لێکۆڵینەوەیەکی دورودرێژی (٧٠) لاپەڕەییم بۆ رۆژنامەی (هاوکاری) نووسی، کەچی دوو سانسۆری دڵڕەق و بەرچاوتەنگ (٣٦) لاپەڕەیان لێ قرتاندبوو، ئەوەبوو لێکۆڵینەوە بەرگرییەکە زۆر بەنابووتی و بەکۆڵێ هەڵەی چاپی دەستی ئەنقەستەوە بڵاوکرایەوە.. ئێستاکێ پڕۆژەی هەر ئەو لێکۆڵینەوەیە رۆژ دوای رۆژ لەلام قەبەتر و درەوشاوەتر دەبێ، چونکە بزاڤەکە سەری گرت و زۆر لەوانەش دژایەتیان دەکرد هەڵگەڕانەوەو گەلێ دەقی نایابیش تا ئێستە لەژێر تەئسیری هەر ئەو بزاڤەدا دەنووسرێتەوە..!

**رامان: لەبەرایی باسی قەلاو کۆچڕەوی جوتیاران بۆ ناو شارکرا، ئایا ئەو بزاڤەی هەشتاکانی شار چۆن هەڵدەسەنگێنێ، دووبارە بوونەوەی کۆنە رۆشنبیریەکەیە، یا ئەزموونێکی ترە؟**

**زامدار:** دیارە شوێنکات دەورێکی دیاری لە مەسەلەی بەرەو پێشەوە چوونی ژیان و داهێناندا هەیە.. بۆیە بێگومان کەشوهەوای هەشتاکان، بەتەواوی لەگەڵ چل و پەنجاو شەست و حەفتاکان جیاوازی هەیە، هەر چەندیش تاڵەمووی نێوانیان هەر ماوە.. لەو ساتانەدا جۆرە دابرِانێک دروست ببوو، بەڵام رەسەنایەتییە زیندووەکە ـ نەک مردووەکە! ـ کاری خۆی هەردەکرد.. لەو قۆناغەدا کۆمەڵە لاوێکی خوێنگەرم و خوێندەوارو ماندووی رێگای ئەبستم و شەیدای داهێنانی راستەقینەو شاکار سەریان هەڵدابوو، زیاتریش بەرێبازو فیکرو بەخششە مەزنەکانی رۆژاواوە بەند بوون و ئەوەندە متووی کلاسیکیە کوردیەکە نەبوون، بەڵام لێشی نامۆ نەبوون، رەگەمای ئەو بزاڤە دەگەڕایەوە سەر تاقە ئەزموونێکی بێکەسی (عەباس عەبدوللا)ی شاعیری سەرەتای حەفتاکان، کە بارودۆخێکی وای بۆ هەڵنەکەوت تابرەو بە ئەزموونەکەی بدات.. جگە لەمەش تەیاری (ئەدۆنیسیەت) و (بەرەکاتیەت) و (ڤالیریەت) زیاتر خۆی دەنواند و کۆنە ئەزموونی (روانگە) و (سەیاب و بەیاتی و سەعدی) لە دابرِاندا بوون جگە لە دابرِانی جیهانی (گۆران)ی مامۆستا.. ئەوان بە (رۆیا) یەکی ترو بە خەوبینین و بە خوێندنەویەکی تازەتر لە شیعرو لە شاعیر و لە داهێنان و ئەفراندن ئەدوان و دەقیان دەنووسی و زیاتریش بەرەو شیعری (پاکتاو ـ خالص) هەنگاویان هەڵدەهێنا..!

**رامان: واتە: ئەو ماوەیەی کە شیعر زۆر شڕ کرابوو، ببووە خۆهەڵکێشان و مینبەریەت؟**

**زامدار:** بەڵێ، زۆریش

**رامان: ئەی بۆ ئەو بزاڤە لە شارەکانی تر دروست نەبوو، تەنیا لە هەولێر چەقی**

بەستبوو؟

**زامــدار:** لە ئەنجامی سەرهەڵدانی ـ وەک وتم ـ دەستە لاوێکی عاشقە شیعرو جوانی و هەروا ماندووی ڕێگەی درێژخایەنی فیکرو بواره جۆراو جۆرەکانی فیکر بــوو.. بـەڵام دەنــگـی وەک **(محـمەد عومەر عـوسـمـان و بەختـیار عـەلی و جـەمـال غـەمبـار)** و **چەندانی تر لە سلێـمـانی و هەروا (رەمـەزان عـیسـاو مـوئەیەد تەیب و هروری) لە دهـۆک و (ئازاد ئەحـمـەد) لە کـەرکـووک** هەر هەمــوویان یەک خــەمی داهێنان کــۆی دەکــردنەوەو (قــاســمی مــشــتــرک) لە نێــوانیــان دا نوێخــوازیەکی ڕاستەقینە بوو، هەروا لە هەولێریشدا لە دەرەوەی بزاڤەکە دەنگی بەهێز هەبوو وەک (کەریم دەشتی) و چەندانی تر، بزاڤەکە گەلێ شاعیری ڕەسمیی بێ ئۆقرە کردبوو، وایان دەزانی بەرە ڕەسمینیەکە لەژێر پێیان رادەکێشرێ و ڕووناکیەکەیان لەسەر لادەچێ، بۆیە زۆر بە توندڕەوی بەرەنگاری دەبوونەوە..! بەهەرحاڵ ئەو بزاڤە دەنگ و ڕەنگ و ســەنگی خــۆی هەبوو، نـاشکرێ هەروا بەرق و کــینە، یا بە ئاســانی راستوچەپێکی بەسەرا بهێنرێ..!

**رامــان: بـەڵام لە هەولێــرو بەدرێژایی ئەو مــاوەیەی باست کــرد، وەرچەرخـانێکی گەورە لە ئارادا نییە کە خۆی لەقەرەی شاکارێکی جیهانی بدات؟**

**زامــدار:** بزاڤەکە ـ وەک وتم ـ ئەزموونێکی بەتەوژم بوو، توانیشی دەقی گەورە بخـوڵقێنێ، لام وایە گـەر تەرجەمـەی چەند زمـانێکی زیندووی جیـهـانـی بکرێن، ڕووی ئەوەیان دەبێ بڵێین: ئێمەی کوردیش هەین..!

**رامــان: ئەی فـشــاری فــیکری و نـەبوونی ســامــانێکی زیندووی کــلاسـیـک لەم شارەدا، نەبووە مایەی ئەوەی کە بزاڤێکی گەورەی ڕۆشنبیری لە هەولێر، بەتایبەتی لە سییەکانەوە دانەگیرسێ؟**

**زامــدار:** بێگومـان وایە.. لوتکەی بەرزی شیـعـر هەر لە سەدەی نۆزدەهەمەوە لە سلێـمـانی سـەری هەڵدابوو، کە سێ کوچـکەکـەی بابان لـوتکە هەرە بەرزەکـەیەتی، بەڵام لە هەولێردا ئەو کەلەپوورە کلاسیـکییە ـ وەک ئاماژەم بۆکرد ـ تەنیا چەند وردە شاعیرێک و چەند کۆڵکە مەلایەک لەناودا بوون، جگە لە سامانی دەگمەنی تاکـو تەرای (نالی ـ مەحـوی ـ وەفـایی ـ حـەریق ـ ئەختـەر ـ شـێخ ڕەزا ـ مـەلای گــەورە) و چەنـدانـی تر، ســامــانێکی ئەوتۆی زیندوو لە گــۆڕی دانەبوو، بۆیە جـووڵانەوەی شیعری و جووڵانەوەی فـیکریش، جگە لەباری ناهەمـواری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی لەناو شارە بچکۆڵەکە، بە تەواوی خۆی نەدەنواند..!

**رامان: پێمان وایە (مەولوود نامە) جێگەی شیعری گرتبووەوە؟**

**زامـدار:** وەک وتم: نووزەیەکی شیـعر هەبوو، بەڵام کەڵچەرە تەقلیدیەکە زاڵ بوو، نەک هەر مەولوودنامە، بەڵکو نامیلکە پەڕپووتەکانی محەمەدەمین عەسری کەلە چاپخانەی شارەوانی کەرکووک و هەروا نامیلکە فۆلکلۆر ئامێزەکانی چاپخانەی کـوردسـتـانیش لە هەولێـردا، زۆر باو بوون و زیـاتریش بۆ شـەو رابواردن و کـوردی فێربوون، بوون نەک بۆ مەبەستێکی داهێنەرانەو نوێخوازانە ئەخوێنرانەوە..!

**رامــان: هەر لە ســەرەتای حـەفـتــاکـانەوە، کـە گــەرمــەی ڕوانگەبوو، دەســتـەیەک**

**بەتوندی کەلەپووریان ڕەفز دەکرد، ئا لەو ساتانەدا مێزی زامدار مێزی موناقەشات و حیواری گەرم و بەجۆش بوو، لەسەر دوا ڕوداوەکانی نێو جیهانی ئەدەب و فیکرو هونەرو ڕۆشنبیری و ڕاگرتنی هەردوو سەنگی تەرازووی (ڕەسەنایەتی و هاوچەرخیتی)... کە ڕووشت کردە هەولێر، جاری سەرهەڵدانی بزاڤێکی نوێخوازانەی (طلیعیەت)تدا.. ئەوەبوو زۆر زڕە بوختان و درۆی شاخدار هاتە سەر ڕێگەتان، ئێستە ئەو چاوسوور کردن و مراندن و هەڕەشە و گوڕە شانە نەماون.. جگە لەوەو لە کاتێکا لەسەر خوانی تۆ گەلێ کەسی وەفادار دەیانووت: لەسەر ئەو خوانەدا فێری یاخیبوون و گەلێ شتی تازە فێربوون و لەوێوە ناسنامەی هونەری و ڕۆشنبیری خۆیان دەدۆزیەوەو تۆش بە دونیای ئێزگەو ڕۆژنامەو گۆڤارانت دەناساندن و شەڕت لەسەر دەکردن و هەرات دەنایەوە.. باشە ئێستەو بەتایبەتی دوای ڕاپەڕین بۆ وا بێدەنگی و بۆ وا گۆشە گیر و داینەمۆکەی جاری جارانت تەوەرەی خێرا نییە، هۆیەکەی چییە؟**

**زامدار:** براگیان: ئەمە جگە لە (استعراز) کردنی ژیانی من، پرسیارێک نەبوو بەڵکو (٢٠) پرسیار بوو لەیەک پرسیاردا کۆکراوەتەوە.. بەهەر حاڵ! تەمەن فەرمانی خۆی هەیە، هەروا نەداری و دەسکورتی و بژیوی ڕۆژانەی خۆم و منداڵەکانم، بۆیە بەکورتی زۆر بە کورتی دەڵێم: ڕێککەوتنامەی (١١) ئاداری ساڵی ١٩٧٠، بوو بەمایەی هەڵخستنی کەشوهەوایەکی یەکجار بەرفرەوانی ڕۆشنبیری و هونەری و فیکری لەسەر ئاستی گۆڕەپانی کوردیدا، ئەو داکشانە ئاداریبیە" موژدەی (ڕوانگە) و نوێخوازی لەگەڵ خۆی پەلکێش کرد، تەنانەت لە بیرمە لە (٥) ساڵەی ئەو ڕوانگەیە، وتارێکم لە حەفتەنامەی (ڕۆشنبیری نوێ) دایە عەرەبی و بەناوی (الیوم یدخل روانگە ربیعە الخامس) نەک (خریفە) بڵاوکردەوە، کەبووە مایەی مقۆمقۆیەکی گەورەی ئێرەو ئەوێ، هەر لەو ساتانەشدا، سەدان دیدارو چاوپێکەوتنم لەگەڵ ئەوانەی کەبە داهێنەری پاشەڕۆژم دەهاتنە بەرچاو سازاندو دەیان و بگرە سەدان وتارو شیعرو چیرۆک و شانۆی جیهانیم بڵاودەکردەوە، شەوانیش ئەو سەرمێزەی باسی دەکەی نووسەران و هونەرمەندانی هەموو لایەکی کوردستانی لەسەر کۆدەبوەوەو دەبووە مایەی هەڵخستنی دەیەها تەوەرەی داهێنان لەبوارە جیاجیاکاندا.. کە هاتمەوە هەولێریش ئەو دیاردەیە بۆ چەند ساڵێ هەروا ڕۆیی.. بەڵام دوای ڕاپەڕین کە بە بێدەنگ و گۆشەگیر لە قەڵەم ئەدرێم، ئەوە وەک گوتم: ئەو زەمانە زەمانێک بوو، ئەم زەمانەش زەمانێک... من دوای ڕاپەڕین، وەک زۆربەی زۆری نووسەرانی تر، کەوتمەدوای هەوڵی بژیوی ڕۆژانە، بە ئاماژەیەکی کاک مەسعوودو کاک فلک الدین کاکەییەوەش، کەوتمە نێو ڕیزەکانی ڕاگەیاندنی پارتی، ئێزگەو تەلەفزیۆن و (خەبات)ی عەرەبی و سەمینار سازدان.. برسیەتی و نان پەیدا کردنی ڕۆژانەی منداڵانم و دابینکردنی (مەی) شەوانەش لە پەلوپۆی خستم، بەڵام بڕوابکەن گەر ئەم بارەم بۆ ڕاستبکرایەوە، من هەر مەحموود زامدارەکەی جاری جارانم و هێشتا داینەمۆکەم لە کارنەکەوتووە...!

**ڕامان: مەحموود زامدار لەڕووی سیاسیەوە واناسراوە کە پیاوێکی دەستەومۆیە،**

**بەڵام لەرووی فیکرییەوە یاخییە و سەرکەش.. باشە دوای راپەڕین ئەو دەستەمۆ بوونە چەند تەئسیری هەبووە تا نەوێرێ زیاتر بجووڵێ؟**

**زامدار:** جا بۆ دەستەمۆ..! وەک دیارە راپەڕین و بنەماکانی راپەڕین زۆر پیرۆزن و هیچ پێوەندییان بەم هەموو ئاشووب و فیتنەو هەراو ژاوەژاوو ئاژاوەیە نییەو بەندیشە بە ئازادکردنی مرۆڤی کوردی لە هەموو کۆت و پێوەندو زنجیرێک.. بەڵام دیارە ئەو فشارە سیاسییە ناهەموارەی کە هاتە پێش و ئەو هەموو ململانێ حزبایەتییە بەرتەسک و گورچکبڕە لە گۆڕەپانەکە دورست بوو، نەک مەحموود زامدار و بەس، بەڵکوخەونی پاکی هەر هەموو مەحموود زامدارەکانی تریشی تێک وپەکان دا.. هەر هەوو ئەدیب و هونەرمەندو رووناکبیری کورد، دووچاری مۆتەکەیەکی سامناک هاتن و لەبەردەم خۆیشیانەوە دەیانپرسی و ئێستەش کە ئێستەیە دەپرسن: (بۆ خۆم شێواو بۆ راپەڕین و بنەما پیرۆزەکانی وا شێوێندران!؟).. بەڵێ: شاڵاوی بێ رەحمانەی شەڕی پشت شکێنی براکوژی خۆکوژی، بووە مایەی ئەم هەموو رقەستووری و ناتەبایی بێ مەعنایە، ئەم هەموو نیگەرانی و دڵە راوکێیە ناڕەوایە، بووە هۆی ئەوەیش کە شەپازللەیەکی کوشندەش لە سەرجەم بزاڤی رۆشنبیری و ئەدەبی کوردی بسرەوێنێ..!

بەڵێ: دوای راپەڕین توێژی زیندووی رۆشنبیران و هونەرمەندان و ئەدیبان و رۆژنامە نووسان بەسەر حزبییەکاندا ـ بە ناچاری یا بەخۆشی خۆیان ـ دابەشبوون، بەمەیش خۆیشیان دابەش دابەشکرد و لەیەک دابڕان، تاوای لێهات گەر یەکێک ویستی بە خواست و ئارەزووی خۆی و بۆنان پەیدا کردنێک، لە شوێنێ کارێ بدۆزێتەوە ئەوا (١٠) لایەنی تر بێن بە چاوسوور کەرەوەو بە ناحەزو لێوی لێ هەڵقورتێنن و دەهۆو داوی بۆ دابنێن و مەچەکی بادەن و نانی ببڕن و خەونە پاکەکانی زیندە بەچاڵ بکەن.. دەمن ناڵێم، ئێوە چۆنی بۆ دەچن..؟ جاگەر ئەمە حاڵ بێ، دەبێ بابایەکی وەک من دەستەمۆبم، پرسیارەو بەس!؟ هەر بۆیەشە من بەش بەحاڵی خۆم هەر لە ساڵی (١٩٥٨)وە بگرە تا ئەمڕۆ ببڕای ببڕ لە ساحەی سیاسی چ عێراقی و چ کوردستانی دڵنیا نەبوونم و هەر نیگەران و دوودڵم.. بۆیە خۆم بە هیچ کۆت و بەندێکەوە نەبەستاوە، زیاتر خواست و ئارەزووم بۆچی چووبێ ئەوەم کردووە، هەمیشە ویستوومە وەک یاخیبوویەکی سەر زەمینەی واقیع ـ لەرووی رۆشنبیریەوە نەک سیاسی ـ خۆم هەڵخەم، ئەمەش هەڵبژاردەی خۆمە و مرۆڤیش لە هەڵبژاردنیدا ئازادو سەربەستە..!!

**رامان: بێ ئیلتیزامی زامدار لە ژیاندا هۆیەکەی چییە؟**

**زامدار:** من (بێ ئیلتیزام) نیم، بەڵام (ملزم)یش نیم، بەشێکی هۆی بێباکی و سەرەڕۆیشم دەگەڕێتەوە بۆ رۆژانی ساواییم ـ چونکە من وەک تارماییەک نەبێ ـ دایکم نەدیوە، لە پاش مەرگی ئەویش بەمەمکی پوورەکانم پەروەردە بووم، ئەمەش جۆرە نامۆییەکی لەلادا خوڵقاندم، جگە لەوەش هەراو تاوانەکانی (زڕدایک) مم لەبەرچاوەو زۆریش کاری کردە سەرباری دەروونیم و پاژێکی غوربەت و بێباکی و تێکشکان ودڵسافیشم هەر بۆ ئەو رۆژانە دەگەڕێتەوە..!

**رامان: بەشێکی تری ژیانت کۆمیدیا ئامێزو موفارەقاتی سەیر سەیرە، حەزت لە قسەی قۆشمەو خۆشە، لە ئەدەبی گاڵتەجاڕی دا دەسباڵایت، (کەرنامە) کەت باشترین بەڵگەیە، ئەمەیان چۆن؟**

**زامدار:** لە بارەی ئەدەبی گاڵتەجاڕیەوە، وتەیەکی بەنرخی شارلی شاپلنم دێتەوە یاد کە دەڵێ: (گاڵتەجاڕی رووی دووەمی ژیانە) یا (کە من پێدەکەنم، بزانە ئەو پێکەنینەم جۆرێکە لە هەنسک و گریان).. بەندبوونی من بەو ئەدەبەوە، بۆ تراجیکو میدیایی ژیانی خۆم و بنەماڵە و میللەتەکەم دەگەڕێتەوە، جگە لەوەیش موتاڵاکردنی بەردەوامم لە نێو ئەدەبی گاڵتەجاڕی جیهانی و رۆژاوایی دا وەک: (وایلد و برنادشۆ و شاپلن و بریڤێر) و هەروا ئەدەبیاتی گاڵتەجاری میسری و رۆژهەلات و ئینجا شێخ رەزای تاڵەبانی و مام هەژاری موکریانی و مەلا مەسعوودی بێبەشی برام و گەپجاڕەکانی نێو هەرحەوت بەرگەکەی (رشتەی مرواری) بەشێکن لەو بەندبوونەم، ئەمەو پەیامی هونەرو ئەدەبی گاڵتەجاڕی ـ لەلای مندا ـ پەیامێکی یەکجار گەورەترە لە ئەدەبی (جدیات) چونکە ئەم ئەدەبە، ئەدەبێکی هێرشبەرو بەرەنگار بوونەوەو زاتکردن و جورئەتە، ئەدەبێکی ئامانجداریشەو مەبەستیشی گۆڕینی واقیعە تاڵەکەیەو لە گۆڕنانی چەمکە مردووەکان و زەرکەفتکردنی بەها بەرزەکانەو بەرگریشە لە مرۆڤ و لەخەونە پاکەکانی مرۆڤ و لەدوا رۆژی پڕشنگداری مرۆڤ .. خامەیەکی بەتین و گوڕ و دڵێکی مرۆڤانەی پۆلایین و بەرچاو رۆشنیە..!! لە (کەرنامە)کەشمدا ویستوومە ئەوە بکەم، بەڵام ئەوەی مایەی پێکەنینە من لەو نامەیەمدا، تەنیا باسی هەموو شتێکم کردبێ، تەنیا باسی (کەر)م نەکردووە، کەچی خەڵکانی وا هەیە وا ئەزانن من باسی (کەر) دەکەم.. لەبێ خەبەرانیش کەشکەک سەڵەوات..!!

**رامان: لە ناوەندی ئەدەبیدا زۆرجار وەکو کۆمیدیایەک باس لە شەڕە زاتیەکانی تۆ دەکرێ، ئایا ئەو شەڕانە جێگری ئەو پەیامەیە کە هەتە، یا رەنگدانەوەی سەردەمی منداڵیتە، یا جێگری ئەو خەون وخەیاڵە شاعیرانەیەتەو نەتتوانیوە دایانبڕێژیتەوە؟**

**زامدار:** هەر هەموویانن.. بەڵام من شەڕکەر نیم و لە ناخی ناخەوەش حەزم لەشەڕ نییە.. بەڵام ئەوانەی تۆ ئاماژەی بۆ دەکەی پێوەندی بە پێکهاتەی دەروونی خۆمەوە هەیە، زیاتریش حەزم لە گاڵتەجارییە.. زۆریش بەو جددیاتە سەیری ژیان ناکەم، ژیانیشم بەجۆرێ لە بێهودەیی و گاڵتەجاڕی وەرگرتووە، بۆیە ئاوا، بە تایبەتی لەسەرمەستیمدا ئاوا رەنگ دەداتەوە..!!

**رامان: ئایە لاربوونت بۆ ئەدەبی منالان، مانای بێزاربوونت نییە لە جیهانی گەورەکان؟**

**زامدار:** بەڵێ.. زۆر جوان بۆی رۆیشتی، بەڵام یەکەم: بژاردنی کاتی منالی پڕ لە ئازارو وەیشومەمە، دووەمیش: بێزار بوونمە لە ئەدەبی رواڵەتبازو ساختەسازی هەندێ بەناو (گەورەکان!)..!!

**رامان: لە هەرزەکاریت شیعرت دەنووسی، دیوانێکی زلیشت هەبوو، ئایا پێت**

**خۆش بوو چاپ نەکرا؟**
**زامــدار:** زۆر چاک بوو کەچاپ نەکرا، چونکە ئێستە تووشی شێرپەنجەو پەتای شیعر دەبووم، وەک ئامـاژەشم بۆ کرد، من شیـعر بە (مـەسئوولیـەتێکی یەکجار گەورەی داهێنان و ئەفرین دەزانم!) لە بیریشت نەچێ (٢٠ ـ ٣٠) شیعرم کراون بە گـۆرانی، خـۆیشم (١٠ ـ ١٥) ئاوازی نـاسکم بۆ شیـعـره.لیـریکەکـانی خـۆم دامناون و لەکات و بۆنە تایبەتییەکاندا دەیانلێمەوە..!
**رامان: هەست دەکرێ جۆرێک لە رۆحی شیعریەت لە نووسینەکانت دا هەیە؟ ئەی بۆ دەسبەرداری شیعر نابیت؟**
**زامـدار:** من دەسبەردارم، بەڵام ئەو روحە شیعرییە دەسبەردارم نابێ.. لە ماوەی دورو درێژی ژیانی ئەدەبیمدا، هەمیشـەو دزەم بەو رۆحە شیـعریە کردووە و لەناو نووسینەکانمدا رەنگی داوەتەوەو لێشنەگەڕاوم بفەوتێ و بەردەوامیش پەرەم پێداوە، بەڵام زیاتر ئەو روحە لە (دەردە کورد)ەکەمدا رەنگی رشتووە..!
**رامـان: باشە، لەگەڵ ئەوەی لە حەفتاو هەشتاکاندا هانی دەیان شاعیـرت دەدا، ئایە هیچ شاعیریەتی خۆت لەناو شیعری ئەواندا دەدۆزیەوە؟**
**زامـدار:** من ناوی کەس نـاهێنم.. بەڵام ئەو کەسانەی دەزانن، روحی شاعـیریەتی من و ئەو تەوەرە شیعریانەی شەوەهای شەو باسم کردوون چۆن لەلای ئەواندا بوون بە شیعرێکی جوان.. مەسەلەکەش لەلامدا زۆر ئاساییەو دڵیشم لەکەس نەڕەنجاوە، لەیەک دوو کەس نەبێ، کـە زۆر بەزەقی هەوڵێکی کۆنی منیـان لرفاند. بێ ئەوەی ئاماژەیەکیش بۆ هەوڵەکەی (٢٦) ساڵ لەمەوبەرم بکەن. ئەمەش هەر ئاسـاییەو ناوەندی رۆشنبیریمان وا هەڵکەوتووە!؟
**رامــان: تۆ هەست دەکـەیت کـە جـۆری ژیان و رووگـەی شـێـوازو نووسـینت، کاریگەری بۆسەر وەچەیێ هەبێ، یاوەک قـوتابخانەیەکت لێهاتبێت، گەروایە تا چ رادەیەک پێت خۆشە؟**
**زامـدار:** من مەحموود زامدارم و بەس..لەوانەیە من شێوازێکی تایبەتی خۆم لە نووسینا هەبێ، کە ئەمەش رەوایەو حەقی خۆمە.. بەڵام ببڕای ببڕ من قوتابخانە نیم و رۆژێ لە رۆژانیش دەنگم بۆ ئەوە هەڵنەبڕیوە کـەمن وام و وام.. من تەنیـا خزمـەتی ویژدان و خـامـەم و وەچەکـانم کـردووە ـ ئەگـەر کـردبێ! ـ کـە ئەمـەش ئەرکێکی سەرشانی رۆشنبیری و نەتەوایەتیم بووە.. من هەر خزمەتکاری وشەی گەوارا بووم و هەرواش دەمێنمـەوە.. بەڵام کـە دەبینم هەندێ لە قـوتابیـانی خـۆم پێگەییـون و پایەو پلەی ئەدەبی و هونەری و رۆژنامـەگـەرییـان هەیەو ئەفـرینیـان بەهێـزە، زۆر شـادمـان و خـۆشـحـاڵ دەبم، لام وایە کـەس نـیـیـە حـەسـوودی بەم شادمانیەم بێنێ..!!
**رامــان: تۆ بەردەوام نەک هـەر روانگەســازی بزاڤی رۆشنبـیــری بوویت، بەڵکو پاڵپشتی ئەو بزاڤەش بـوویت، ئایە ئێستە جووڵانەوەی رۆشنبیری ناو هەولێر چۆن هەڵدەسەنگێنی؟**
**زامـدار:** من لە ژیانی ئەدەبی و رۆشنبیری و رۆژنامەگەری خۆمدا (٩٥٧) کۆڕی

جیاجیاو لە بواری جیاجیادا، بۆ خۆم و خەڵکانی تر سازداوە، لە زۆربەی هەرە زۆری ڤیستیڤاڵ و سیمینارو کۆڕە ئەدەبی و هونەری و رۆشنبیریەکانیشدا بەشداریم کردوە، بەمەش توانیومە، زۆر لە نزیکەوە لە دەردو بارودۆخی جووڵانەوەی رۆشنبیری و رۆشنبیران بگەم، ئەمەش هەر ئەرکێکی سەرشان بووەو چیتر.. سەبارەت بە شاری هەولێریش، من لەو باوەڕەدام کەشارێکی موژدەدەرە و بزاڤێکی مەزنی رۆشنبیریی گشتیی لەم شارەدا لە جۆش و خرۆشدایە، بەڵام بەهۆی ئەم بارەنالەبارەی شەڕی براکوژی خۆکوژییەوە، ئەو بزاڤە مەزنە ئازارێکی کوشندەی بەرکەوتووە، نەک هەر لەم شارە، بەڵکو لە سەرانسەری کوردستانی وێرانەخاکدا..!

**رامان: لە بوارەکانی راگەیاندندا بەشداریت زۆرن. هەروا بەرهەمی چاپکراوو چاپ نەکراویشت هەن، دەکرێ پاژێکی لێ باس بکەی؟**

**زامدار:** لە سەرەتای حەفتاکانەوە تا ساڵی ١٩٨٤ بەرنامەی جیاجیای ئەدەبی و ئەدەبی منالان وگەنجانم لە ئێزگەی کوردی بەغدا ئامادەو پێشکەش کردوە، لەوانە (لە ئەدەبی گەلانەوە) کە سێ ساڵ و نیوی خایاند، هەروا بەرنامەی (گۆڤاری ئەدەبی منالان) کە دوو ساڵ و نیوی خایاند، هەروا بەرنامەی (لەگەڵ شاعیرە لاوەکان) کە پتر لەشەش ساڵی خایاند.. لە بواری تەلەفزیۆنیشدا لەگەڵ هاوسەرەکەم لە TV کەرکووک (١٤٤) ئەڵقە لە گۆڤاری منالانم بۆ ماوەی دووساڵ ئامادەو ئەویش پێشکەشی کردوون.. لە دوای راپەڕینیش لە ئێزگەی دەنگی کوردستان بۆ ماوەی سێ مانگ گۆڤاری ئەدەبی منالانم نووسیوەو بەرنامەیەکی ئێزگەو تەلەفزیۆنیشم بەناوی (أنسام جبلية) بۆ ماوەی ساڵ و نیوێک ئامادەکردووەو کاک بەهزاد چەلەبی پێشکەشی کردوون، هەروا (٣٢) ئەڵقەش لەبەرنامەی (کەلەپووری زیندووی بارزانی نەمر) م لەKTV دا ئامادەکردووەو کاک تەحسین دۆڵەمەڕی پێشکەشی کردوون. (١٤٦) ئەڵقەی هەمان بەرنامەش، چ بەدەنگی خۆم و چ بە دەنگی کاک بەهزاد و کاک سەباح بەیتوڵڵا لە ئێزگەی دەنگی کوردستان ئامادەو پێشکەش کردوون.. لەبواری چاپەمەنیشدا (١١) کتێب و نامیلکەیی جۆراو جۆرم لە چاپدراون و ئێستاش (١٨) دەسنووسی ترم پاکنووس کردوون و ئامادەی چاپن..لەوانەیە هەر بەم زووانە (دەردە کورد)ەکەشم رووناکی ببینێ..!

**رامان: ئەوەی زۆر بڕوات پێ هەیە؟**

**زامدار:** وەفاداری

**رامان: ئەوەی زۆر رقت لێیە؟**

**زامدار:** من مانای رق نازانم، بەڵام گەر رقێکم هەبێ، ئەوا رقم لە بێوەفاییە

**رامان: چیتر؟**

**زامدار:** بۆ ئەم دانیشتنە سوپاستان دەکەم، بەڵام من بەدانیشتنێکی تێرو تەسەلی نازانم.. خۆزیا دانیشتنێکی (٧٢) سەعاتیتان دەڕەخساند، بەمەرجێک

به (شەو) بوایەنەک بە رۆژ... تا دەیەها تەوەری ترمان باس بکردایە.
**رامان: چیتر**
**زامدار:** هیچ..!

## سازکردنی گفتوگۆ:

**سەرۆ قادر، ئازاد عەبدولواحید، ئەنوەر مەسیفی**

## سەلام عەبدوڵڵا:

# لە هەندەران بیانییەکان لە شانۆو مۆزەخانە دەپرسن کوردیش لە دوکانی برنج فرۆشتن..

سەلام عەبدوڵڵا نووسەرێکی شاری سلێمانییە و لە ساڵی ١٩٤٨ لە دایک بووە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی هەر لەوێ تەواو کردووە. لەساڵی ١٩٧٤ بووە بە پ.م لە هێزی ئازادی و لە کۆتایی ١٩٧٤ چۆتە ئەڵمانیا بۆ خوێندن.
دوای نسکۆ گەڕاوەتەوە سلێمانی و دەستی بە خەباتی نهێنی کردووە. ساڵی ١٩٧٧ لەلایەن ڕژێمی عێراقییەوە گیراوەو حوکمی ئیعدامی دەرچووە، کە پاشان لەگەڵ دوانزە خەباتکاری تردا لە بەندیخانەی «هیئە خاصە»ی کەرکوک رایکردووەو پاشان بووە بە پ.م. لە ساڵی (١٩٧٩)ەوە لە وڵاتی سوید دەژی. لە سوید لە زانستگای ئۆپسالا بەشی ئێرانناسی تەواو کردووە لە ساڵی ١٩٩٢ گەڕاوەتەوە کوردستان و بووە بەیاریدەدەری پارێزگاری سلێمانی. لە بەرهەمە چاپکراوەکانی ١ـ مەدالیای سەرۆک ــ چیرۆک ٢ ـ ڕۆژانی بێکاری خاطرات ٣ ـ بەهەشتی پەنا بەران شانۆنامە.
٤ـ میرئاخوڕ شانۆنامە ٥ـ زیندانی گەڤەڕ داستان ٦ـ هیستیریای کۆچ لێکۆڵینەوەی ـ فەرهەنگی سویدی ـ کوردی ٨ ـ چەندین نووسینی تری لە گۆڤارەکانی دەرەوی وڵات وەک (پەیڤ) و (خەرمانە) دا بڵاوکردۆتەوە. لە نێوان ساڵانی ١٩٨٩ـ ١٩٩٠ ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی (سەردەمی نوێ) بووە کە لە سوید دەردەچوو، کۆمەڵێ نووسینی تری لە گۆڤاری (هەڵوێست) ئۆرگانی ئاڵای شۆڕشدا بڵاوکردۆتەوە، لە سەردانێکیدا بۆ بارەگای گۆڤاری (رامان) ئەم دیمانەیەمان لەگەڵیدا سازکرد.

* رامان: لە هەشتایەکانەوە ئەدیب و نووسەرو ڕۆشنبیرانی کورد روویان لە دەرەوەی وڵات کردووە، لە ماوەی ئەم (١٥) ساڵەدا لە دوولاوە چالاکیان کەم بووە. یەکیان ئەوەیە بەرهەمەکانی خۆیان بەرەو لاوازی دەچێ و هەندێکیشیان هەر بەجارێ وازیان هێناوەو تەنیا ژیانی خۆیان دەبەنە سەر، ئەوی دیکەشیان لە هەندەران نابن بە هۆکارێک بۆ ئەوەی بنکەی بڵاوکردنەوەی کوردی لە بواری ڕۆشنبیریی و ڕاگەیاندن دروست ببێت. ڕۆشنبیرانی عەرەب و فارس و ئەوانی

***دەوریەری خۆمان دەبینین کە لەناوەوە ڕێگەیان لێ دەگیرێ، لە دەرەوە جموجوولی خۆیان پەرەپێ دەدەن، مەڵبەندی لێکۆڵینەوە دادەمەزرێنن و کار لە رای گشتی ئەورووپی و وڵاتەکەی خۆشیان دەکەن. هۆی چییە رۆشنبیری کورد لە دەرەوە تووشی ئەم دابڕانە دەبێ؟ هەم لە واقیعی خۆی و هەم لەبەرهەم هێنانی؟***

*** سەلام عەبدوڵلا:** راستییەکەی لە حەفتاکانیشەوە کورد لە دەرەوە هەبوون، بەڵام زۆربەشیان کوردی تورکیا بوون، هەندێکیشیان نووسەر بوون و ناسراویش بوون، بەڵام کوردی عێراق و ئێران زیاتر دوای دەستپێکردنی جەنگی عێراق - ئێران روویان لە دەرەوە کرد.

من خۆم کە چوومە سوید لەوێ کابرایەکی سویدی رۆژێک پرسیاریکی زۆر ماقووڵی لێکردم وتی: ئێوە هەمووتان کە قسەتان لەگەڵ دەکەین دەڵێن یەکێ لە هۆی پەنابەریمان ئەوەیە سەربەستی رۆژنامەنووسیمان نییە، باشە لێرە کە رۆژنامە ئازادەو دەتوانن بە هەوەسی خۆتان شت بووسن بۆ نایبنووسن؟!

گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە ئەوانەی لە دەرەوە هەریەکەو ئینتیمایەکی سیاسی هەیە، هەروەک چۆن لە ناوەوە ناتوانن هاریکاریی لەگەڵ یەکتردا بکەن، لەدەرەوەش هەمان شت. بۆ نموونە دەرکردنی گۆڤارێکی ئەدەبی پێویستی بە کۆبوونەوەی کۆمەڵێک نووسەر هەیە دەبێ کۆمەڵێ نووسەر لەرووی سیاسی و فیکرییەوە بگونجێن و سەر بەیەک رێبازی سیاسی بن ئەمەش زۆر زەحمەتە.

## هەندێ فیدراسیۆنی کورد لە دەرەوەدا بە ملیۆنانیان دێتە دەست، ناشتوانن گۆڤارێک چاپ بکەن

کە ئەو مەسەلەیەم بۆ باس کرد ئەویش پرسیارێکی دیکەی کرد و وتی ناتوانن لانی کەم رۆژنامەیەک دەربکەن تەنیا هەواڵ بڵاوبکاتەوە، تا بزانن رۆژنامەیەک هەیەو بەزمانی خۆتان لە دنیادا هەواڵ بڵاودەکاتەوە. هەروەک رۆژنامەیەک هەیەو بە زمانی فارسی و تورکی و عەرەبی لە هەندەران دەردەچن. یان رۆژنامەیەک بەناوی پەناهەندان هەیەو بەهەموو زمانەکان بەرهەم بڵاودەکاتەوە کوردی نەبێ، ئایا ناتوانن لەوێش بەشداری بکەن؟. بە راستی لە ئاست ئەو پرسیارە بێ وەڵام بووم!

کە دەچیتە کۆمەڵگەی نوێ تا شارەزای ژیان و کەلتوورەکەی دەبیت و لەرووی نەفسییەوە تۆزێ پشوو دەدەی و مێشکت دەکەوێتەوە گەر چەندساڵێکی دەوێ، کە دەکەوێتەوە کاریش، دێیتەوە سەر ئەوەی ئایا ئاستی رۆشنبیری خۆی لە چیدا بووە؟ نووسەری کوردیش بەشێکە لە کۆمەڵگەی کوردەواری، ئاستی شارستانیی و پێشکەوتنی هەربەندە بە ئاستی میللەتەکەی خۆی، رەنگە یەکێ لە هۆیەکانیش هەر ئەوەبێ کە تا ئێستە ئەو ئامادەبوونە دروست نەبووبێ.

ئەو نووسەرانەی کە لەولاتانی عەرەبی و ئەوانی تر دێن بۆ ئەوان ئاسانترە، چونکە ئەوان لەولاتی خۆیان ئەزموونێکی دیکەیان هەیە، ئەوەش پێوەندیی بە قەوارەی سیاسییەوە هەیە کە زیاتر هاوکاریبیان بووە. لەبەر ئەوە ئێمە نەمانتوانی ئەوە بکەین، بۆیە زۆربەی نووسەران هەر بە تاک تاک بۆخۆیان شت دەنووسن و بلاودەکەنەوە، یان هەندێ گۆڤار دەرچوون وەک (پەیڤ) و (هەلوێست) و (خەرمانە) دیسان ئەوانیش لەو ئاستەدانە بوون بۆیە زۆربەیان ئێستە دەرناچن و وەستان. ئەوانە هەموویان زیاتر پێوەندییان بەبارودۆخی ناوەخۆوە هەیە. ئەگەر بارودۆخی ناوەوە چاک بێ رەنگە ئەویش چاک بێ.

*** رامان: سەبارەت بەو ئەزموونانەی باست کردن، چەند گۆڤارێک دەرچوون و وەستان ئەوە وەک ئەمەیە ئەم وەچەیەی رۆشنبیری کورد کە لە کۆتایی حەفتاکانەوە، بە تایبەتی لە هەشتایەکاندا لە ئەوروپا نیشتەجێبوون لە زۆربەی ولاتانی ئەوروپا نیستقراری کرد، ئێستەش لە دوای راپەرینەوە ژمارەیەکی زۆر رێگەی دەرەوە دەگرنەبەر، وەک بلێی پرۆسەیەکیان دەست پێکردووە. لەبێ ئەزموونییەوە ئیش بۆ ئەزموونی ژیان بکەن، وا لە قسەکەت گەیشتم کەوا رۆژگارێک دێت چەند مەلبەندێک دروست بکەن، هەروەک چەند مەرکەزێک هەیە، کە ئاماژەی بۆ بەرهەمەکانیان کرد. وەک مەلبەندی رۆشنبیری لە لەندەن و ئەنیستیتیوی کورد لە پاریس، کە حکومەت پشتیوانی لێدەکات، لەگەل فدراسیونی کۆمەلە کوردستانییەکان، بەلام هیچیان نەیانتوانیووە ببنە بنکەی گەورەو دەفتەری گەورە بۆ لێکۆلینەوەو بلاوکردنەوەی بەرهەمە ئەدەبییەکان بلاوکردنەوەی ئیشی راگەیاندن لەدەرەوە، وەک ئەوەی رۆشنبیرانی عەرەب لەدەرەوە دەیکەن.**

**راستە ئەگەر کورد قەوارەیەکی هەبووایە زیاتر هاوکاریی نووسەرەکانی خۆی لەدەرەوە دەکرد، بەلام ئەو هەول و تەقەللایەی لە دەرەوە بە پەراگەندە دەدرێ، ئایا ئەوە نزمی ئاستی رۆشنبیری کوردە لە دەرەوە کە ناتوانن تەجاوزی ئینتیمای سیاسیی حزبی بکەن، بۆ ئەوەی مەلبەندی راگەیاندن و ئەدەبیی گەورە کۆببنەوە گۆڤارێک یا رۆژنامەیەک دەربکەن ئەگەر لێرە بەحوکمی ئەو واقیعەی هەیە گۆڤار و رۆژنامە ناتوانن لەیەک مەلبەند بلاوببنەوە، خۆ لە ئەوروپا زەمینە ماددییەکە هەیە، وەک ئەو کابرا سویدییە بە تۆی گوتووە. من لەوەدا تێدەگەم کە ئاستێکی کەمێک نزم بۆ رۆشنبیری کورد لە دەرەوە هەبێ، کە پێویستیت بەوەبێ وردە پێبگات و بابلێین لە مێشکدا گەورە بێ، شتی وا هەیە؟**

## لە کەمپەکانی سوید کە ئەمریکاییەک یان یۆنانییەک دەهات هەوالی مۆزەخانەیان دەپرسی، کوردهەوالی دوکانی برنج فرۆشتن دەپرسێ

* **سەلام عەبدوڵلا:** راستییەکەی تا ئێستە سیاسەت بەسەر نووسەراندا زاڵە، بۆ نموونە شێرکۆ بێکەس لەسەر ئاستی کوردستان شاعیرێکی ناسراوە. تا لە دەرەوەش، بەڵام لە هەموو بۆنەیەکدا ئینتیمای خۆی ناشارێتەوە، ئەگەرچی دەڵێ من حزبی نیم، بەڵام هەموو هەڵسوکەوتێکی لایەنگیرییەکی کوێرانەی لایەنێکەو لایەنێکی دیکە سەرزەنشت دەکات، ئەمەش وا دەکات بواری هاوکاریی نەمێنێتەوە.

ئەمە یەکێکە لەو هۆیانەی رێگرە، راستە زەمینەی ماددی لەبارە، بەڵام ئەم مەسەلانەی باسم کردن، رێگری ئەو شوێنانەن کە ناوی بردن راستە توانیویانە بوارێک برەخسێنن، تا گۆڤارێکی کوردی دەربکەن هەندێ لە سیاسەت دووربێ، بەڵام ئەوانیش رۆشنبیری راستەقینە نین زیاتر بازرگانین و بازرگانی بە مەسەلەکەوە دەکەن.

ئەگەر سەیری دەستەی نووسەرانی ئەو گۆڤارە بکەین کە لە سوید دەردەچێ (بەربانگ) ئەوانەی هاوکارییان دەکرد هیچیان نووسەر نەبوون کە کەسێک نووسەر بێ چ کارێکی باش دەکات!! چ کاریگەرییەکی دەبێ!! بەداخەوە دەڵێم ئەوانەی کاریان تێدا دەکرد زیاتر مەرامی ماددییان هەبوو، لە کۆبوونەوەیەکی ئەم دواییەی فیدراسیۆن من بەشداریم کرد، مەسەلەی پارەخواردن و پارە کۆکردنەوە ئەوەندە زەقە پیاو شەرم دەکا باسی ئەو فیدراسیۆنە بکات. بە ملیۆنانیان دێتە دەست سەرەڕای ئەوەش دزی لێ دەکەن، کەچی ناتوانن گۆڤارێکی رۆشنبیریی دەربکەن میللەت سوودی لێ وەربگرێ.

لەلایەکی دیکەوە نووسەری کورد خۆی توانای ئەوە نییە شت بڵاوبکاتەوە، چونکە بەڕاستی میللەتی ئێمە میللەتیکی نەخوێندەوارە، بۆ نموونە من ماوەیەک خەریکی وەرگێڕان بووم لە یەکێ لە کەمپەکانی پەنابەران، کەکابرایەکی ئەمەریکی دەهات دوای ئەوەی شارەزا دەبوو پرسیاری دەکرد ئەرێ مۆزەخانە لە کوێیە؟ یۆنانییەک ئێرانییەک دەهات هەمان شتییان دەگوت، کەچی کە کوردێک دەهات دەیپرسی دوکانی برنج لە کوێیە؟ ئیتر سەیری ئەم جیاوازییە بکە!

جا کە نووسەرێک بییەوێ لەسەر حیسابی خۆی کتێبێک بڵاوبکاتەوە، ئەوە ٩٩٪ زەرەری لێ دەکات، چونکە خوێنەری نییەو بۆی نافرۆشرێت.

سویدییەکانیش هەستیان بەوەکردووە دەبینن هەمووماڵە کوردێک کتێبخانەیەکی گرانبەهای هەیەهەموو شتێکی تێدایە تەنیا کتێب نەبێ!!

لە سوید دەزگایەک هەیە بەناوی دەزگای یارمەتیدانی نووسەران، کەنووسەران بەرهەمی خۆیان پێشکێش دەکەن ئەو نووسینانەی بۆ بڵاوکردنەوە بشێت ئەم دەزگایە لەسەر حیسابی خۆی چاپیان دەکات، هەرچەندە بەداخەوە دەڵێم لەوێش دیسانەوە کەسانێک هەن دەستیان بەسەریدا گرتووەو رێگەنادەن هەموو نووسینێک بڵاوبکرێتەوە، ئەمەش وای لە دەوڵەت کردووە وردە وردە ئەم یارمەتییەش کەم بکاتەوە.

* **رامان: هەر لە کۆنەوە لە کوردستان نووسەران نەیانتوانیوە بە نووسینی خۆیان**

**بژین، بۆیە بووە بەنەریت ئێستەش نووسەر کە باسی پارەی لەگەڵدا دەکەی وەک ئەوەیە سووکایەتی پێ بکەی، هەموو پیشەیەک مرۆ دەتوانێ پێی بژی تەنیا نووسین نەبێ، لە کاتێکدا نووسین هەمووژیانی نووسەر داگیر دەکات و رێگەی نادا هیچ کارێکی دیکە بکات. لەدەرەوەش دیارە ئەم بابەتە هەیە، لەبەر ئەوەی خوێنەری کورد لەوێ کەمە، چەندێکیش پێوەندی بەو تەنگژەیەوە هەیە کە لە هاریکاری خودی رۆشنبیراندا هەیە؟**

* **سەلام عەبدوڵلا:** ئێمە لەدەرەوە نووسەری موحتەریف کە،نووسین وەک پیشە وەردەگرێ تا ئێستە نیمانە، ئەگەر شێرکۆی لێ دەربکەی، کە چەند جارێک پارمەتی وەرگرتووە تابتوانێ پێی بژی یا بەرهەمی پێ بلاو بکاتەوە. لە دەرەوە نووسەرێکمان نییە لە رێگەی نووسینەکانییەوە بژی، چونکە میللەتەکەمان ئەو میللەتە نییە، ئەوەندە بایەخ بە نووسین و رۆشنبیری بدات کتێب بکرێ، بۆیە نووسین کارێکی لاوەکییە بۆ نووسەرانی کورد. بۆ میللەتانی دیکە بە پێچەوانەیە نووسەریان هەیە ـ موحتەریف ـ کە کتێبێک بلاو دەکاتەوە ئەوەندە قازانج دەکات لەسەر ئەو قازانجە دەژی. لای ئێمە زۆر گرینگ بوو شاعیرێک دیوانێکی هەبێ لەوێ شاعیر هەیە (٣٠) دیوانی هەیە، یان لای ئێمە زۆر گرینگ بوو رۆماننوسێک رۆمانێکی هەبێ کەچی لەوێ (ئۆگۆست ستریند بێرگ) (٧٥) رۆمانی هەیە.

* **رامان: بەنیسبەت ناساندنی ئەدەبی کوردی لە دەرەوە تۆ باسی واقیعێکی کەمێ نا ئاساییت کرد، سەرباری ئەوەش کارکراوە ئەدەبی کوردی بۆ زمانانی تر وەربگێڕدرێ، کەچی ئەدەبی بێگانە کەمتر بۆ کوردی وەرگێڕدراوە.**

* **سەلام عەبدوڵلا:** ئەوە زۆر کەم هەستی پێ دەکرێ، دەتوانم بلێم لە چەند هەولێکی تاکە کەسێکەوە شیعرێکی شێرکۆ یا حەمە سەعید وەرگێڕ درابێ، یان هەندێ لە شیعرەکانی گۆران وەرگێڕدرا بن. ئەوە بە نسبەت سوید بۆ ولاتی تریش هەر هەمان شتە. بۆیە ناتوانرێ بوترێ ئەدەبی کوردی بەوشێوەیە وەرگێڕدراوە کە رۆشنبیرانی ئەو ولاتانە بتوانن لێکۆینەوەی لەسەر بنووسن. وەرگێڕانیش کارێکی ئاسان نییەو هەرکەسێ زمان بزانێ مەرج نییە ببێتە وەرگێڕ.

بێجگە لەمن و کاک حەمە سەعید وابزانم نووسەرێکی ئێرانی هەیە، ئەویش نووسینی لەو بابەتەی هەیە، بەلام ئەو زیاتر بەکتێب بلاوی دەکاتەوە، بەگشتی کوردەکانی ئێران لەو بوارە زیاتر پێشکەوتوون، دیارە ئەویش رەنگدانەوەی ئەدەبی ئێرانە کە فرەوانترە لەو ئەدەبەی ئێمە لە کوردستانی عێراق پێی ئاشنا بووین، یان لەو زەمانی کە تەنیا زمانی عەرەبیمان دەزانی.

من لەبیرمە لە سالانی حەفتاکاندا نووسەرێک، کەناوی (سالم الجسر) بوو، زۆر ناودار بوو زۆر کاری تێدەکردم، دەتوانم بلێم لە بابەتی عەزیز نەسین بوو، ئێمە هەروەک لە ئێرانیش ژیاوین هەموو نووسینەکانی عەزیز نەسینمان بە فارسی دەست دەکەوت، دیارە کوردەکانی ئێران لەزمانی فارسی زالن، ئەوان بۆیان ئاسانتر بوو کە بەو ئەدەبە ئاشنابن.

### ئەنوەر محەمەد تاهیر:

# چ قارەمانێت چیروکێت من د خەیالی و فانتازی نینن

*چیروک نڤێس (أنور محمد طاهر) خودان سەر بورەکا درێژو قەنجە دواریێ کورتە چیروکێ دا ودهێتە هژمارتن ژ رەوشە نبیرێت بەرز ل دەڤەرا بەهدینا، گوڤارا (رامان) بفەر زانی ئەڤرو سەیدایێ ئەنوەر مێهڤان بکەت دا ژ نێزیک بزانیت کا هزرو بیرێت وی چنە دەربارەی چیروکا کورت و بارێ رەوشەنبیری ب گشتی:*

**رامان: بهزرا تە ئەدەب ب شێوەکێ گشتی و جیروکا کورت و رومان ب تایبەت هەر وەزیفا جاران دبینین و هەر گرنگیا خو مایە، نەمازە پشتی [فیدیو و سەتەلایت و کو مپیوتر] ژیانا رۆژانە داگیر کری و کارەکێ مەزن لسەر کری؟؟!.**

**ئەنوەر محەمەد تاهیر:** ئەز دبینم ئەدەب ب هەمی رەنگا چێ دبیت هندە سستی بخوڤە دبینیت ئەو ژی ژبەر پەیدا بوونا [فیدیو سەتەلایت... تاد] ئۆ ب دێتنا من ل چەند تۆخمێت ئەدەبی وەک «هوزان» بەلێ بەرو ڤاژی نسبەت چیرۆک رومان کەتیە وەرار دانێ دا چونکی سینماو تلفزیون گەلەک مڤای ژێ وەرد کرێت.

بەلکو ئەڤە لسەرانسەری جیهانێ هەیە، نسبەت مە مللەتێ کورد، دبینم هۆزانێ ئەو رولێ کارێگەری جارا نەمایە.

ژبۆ پالدانا هۆشیاریا نەتەوەی، لدویڤ هزرا من ئەز دبینم چیرۆک شانو و رومان،بەیافەک بەر فرەهـ هەیە کۆ رولێ خۆ ببینن.

نەمازە ئەڤرو مشە بوونا تلفزیونا لسەرانسەری کوردستانێ و ئەو فورسەتا هاتیەدان بۆ بلاڤکرنا کتێباو مشەبوونا چابخاناو نەمانا سەنسورێت رەوشەنبیری و دێ رومانێ چیروکێ وشانویێ رولەکێ باش هەبیت. نەمازە پشتی نەمانا قەیرانا ئابوری لسەر کوردستانا رزگار کری و جێ بەجێ کرنا بریارا(٩٨٦) کۆ هەتا نهو مللەتێ مە گرنگیا وی نزانن بەلێ پشت ب خودێ ئەم پر ئۆمێدەوارین کۆ دێ پاشە رۆژکا گەش مە هەبیت.

هەکە سیاستمدارێت مە ژی هندەک ب وژدان بن و ئۆ خۆ پەرستنا خۆ وحزبیەتا بێ تام کێم بکەن دا ئەڤ مللەتە پشێت نانەکێ ب تەنای بخوت.

**رامان: ئەو بەرهەمێ تە بـ درێژاهیا ڤان سالێت چوی نڤیسی ئایا نهو توژ وی بەرهەمی یێ رازی و پێ قانعێ؟**

**ئەنوەر محەحمەد تاهیر:** نەبیتە نهێنیەک ئەز ئاشکرا بکەم، ئەز بەرو ڤاژی هەمی نڤێسەرامە کۆهەمی دبێژن ئەم سەح دکەینە بەرهەم و کتیبێت خۆ وەک زاروکێت خۆ وەک نالی دبێژیت:

شیعرەکانم کە جگەر گۆشەی منن دەربەدەرن
دلی «نالی» چ رەقە غەمی فرزەندی نییە
کۆ بەرهەمێ وان جهەک تایبەتی ددلی واندا هەیە، بەلێ ئەز قەت نەهوسا مە. ئەز چ بەرهەمێ خۆ رازینیم، تشتێ ئەڤرو بلاڤ دبیت سوبەهـ من دڤێت حاشایێ لێبکەم!!
سەدو ئێک چەوتی وکێماسییێت وی دهێنە پێش چاڤێت من. ئەز چاڤێ رەخنەگەرییێ سەح دکەمە بەرهەمێ خۆ هەتا من نەڤێت ئەڤرو وان کتێبێت من بلاڤکری بخوینمەڤە هەمی کێماسیت تێدا بەرچاڤ دکەم هەر ژ رێزا ئێکێ ئەز نە رازیمە ئەڤجا چەوا ئەز ژبەرهەمێ بەری بیست سالا من بلاڤکری.
هەکە ئەز سەرو ژنوی چیروکەکا خۆ بنڤێسم دڤێت خۆ ژ رێزا ئێکێ بگۆهورم هەتا یادویماهکێ. تشتەکێ دی من دڤێت بێژم کۆ ئەز ژ بەرهەمێ خۆ نە رازیمە من دڤێت هەمی گاڤا یاغی بوونێ لسەر بکەم.
بەلێ قارەمانێت وان چیروکا هەر دەم لپێش چاڤێت من وەک بالندێ «قەنقەس» دسوژن ساخ دبنە ڤە، ئەوان هەمبێز دکەم جاران ژ دل و هزرێت خۆ دەر بەدەر دکەم

## هندی مروڤایەتی د پێشکەفتنێ دا بیت.. دێ خاندگەهێت ئەدەبی هەر هەبن

جاران ژی ل خەوا شەڤان مێڤان دکەم را دەموسم هەتا تێر بۆ دمکە کری وخیرک دچم، بێ هۆش دبم دەمێ دنڤێسم. دگەل قەلەقێ من ب چەپلە لێدان دبێژن ئەم هاتین.

**رامان: ئایا رەخنێ مافی تە دایە تە؟**

**ئەنوەر محەحمەد تاهیر:** باوەر ناکەم رەخنێ مافێ کەسکێ دابیت هەتا یێ من بەلێ هەر دیسان ئەم هیڤدارین کۆ رەخنا مە دێ پێش کەڤیت پشتی ئەو بەرو بیاڤێت من گوتین باش بن هەتا نوکە ئەم هو درەخنێ دگەهین کۆ دیار کرنا کێماسیایە نزانین کۆ کارەکێ ئەفراندنێ یە ژ جۆرێت دی کێمتر نینە.

**رامان: ئایا کورتە چیروکێ شیایە هەمی هزرو بۆچون و دیتنێت تە بیت سیاسی و رەوشەنبیری «إحتواء» بکەت؟**

**ئەنوەر محەمەد تاهیر:** نەخێر کورتە چیرۆک نەشیایە هەمی هزرو بۆچۆنێت. بخو ڤە بکریت (أحتوا) بکەت چونکی هەکە شیابا دڤیا من مرنا خۆ ئیعلان کربا!!
یان دێ خو دووبارە کەم ئەو ژی مرنە بەلی ب رەنگەکێ دی. کارەسات و گۆهارتنێت مللەتی کورد تێدا بۆرین زەحمەتە هەکە هەمی چیرۆک رومان بشێن ڤان بخوڤە بکرن ئۆ زەحمەتر ئەوە ژی کۆبشێن پشت گۆهـ بهاڤێژن ڤەڤکێشکرنا (بلانس) کرنا ڤێ ترازیێ دەم پێ دڤێت ئۆ روژگار دێ حوکمێ خۆ لسەر دەت.

**رامان: تۆ چەوا چیروکا کورت دنڤێسی.. قوناغ قوناغ یان ئێکسەرو ئۆ دەمێ ژ نڤیسینا چیروکێ بدویماهی دهێی چ هەست لجەم تە پەیدا دبیت؟**

**ئەنوەر محەمەد تاهیر:** بەرسڤا ڤێ پسیارێ یادرێژە بەلێ ب کورتی دێ دەم.
چیرۆک لدە ست پێکێ وەک بیروک لدەڤ من پەیدا دبیت بەلێ لهزرا خۆ هەر دهینم و دبەم، ئاڤا دکەم خراب دکەم سەرو ژنوی ئاڤا دکەمە ڤە، گەلەک سەرو بن

وەک گــوللکێ لمن هندا دبیت ئەو تەڤن دبیتــە رویس.
بەلێ ئەز دەست ژێ بەر نادەم دکەڤمە دویڤ هەتا قــارەمــانێ خــۆ نــێـجـیـر بــکەم، دگـــەل من دژیت چند رۆژا هەتا ب هەیڤــا بەرە بەرە ئـاڤــــاهـیێ چیــروکێ هەر لـهــزرا من دمینیت، ئەڤ چیرۆکە دمەهیت زەحمەتا من ئەوە دەمێ ئەز دەست ب رێزا ئێکێ بکەم، بەرە بەرە دنڤیێسم رەش دکەم سپی دکەم ئۆ قارەمانێ چیروکێ دگەل من دهێت و دچیت لسەر خوارنێ ل رێ چۆنێ هەر دگەل من دمینیت، هندا جارا ئەز خۆ لێ زیز دکەم دەست ژ نڤێسینێ بەر دەم دهێلمە هەلاویستی، هەجکو سەد هێز من پالدەن کۆ ئەز جارەکادی بنڤیێسمەڤەو وەک مرۆڤەکێ پەشێمان ل یارا خۆ دزڤریت و سەد هێجەتوکا ڤەدگێریت هەتا لێ ئاش دبیت.
هەتا سالا (١٩٨٤)ێ دەمێ من چیروکا «رافە شێر» نڤێسی ئۆ قارەمان تووشی وی چارە نڤێسی بووی.
شەڤەکا زفستان بوو ئەز بتنێ ل ژوورا خۆ هاتمە دەرێ، باژێر یێ کپ بوو، کوتەکا زۆر دارو داگــیــر کــەرا یێ بێ دەنگ کری روند کێت من دهاتنە خارێ هەجکو عەز یزەکێ بەر دلێ مــری ئەو شــەف بوو [ یالداو دەیجور]لمن وەک نالی گۆتی خەو لمن ڤەرە ڤەی.
نزانم ئەز زەحــمــەت و مــاندی بوونێ ب چیــروکێ ڤــە دبینم، نزانم ژکــێـم شـــارەزای و نە مەلەڤانیا منە یا خۆ هەر هۆسا هۆنەرەکێ ب زەحمەتە.

## ئەڤێت ل سەر دەمێ رژێمێ گوتار دنڤیسین ب کریتکرنا هندەک سەرکردا . . . ئەڤرویێ ستایشا وان دکەن!!

**رامان: قارەمانێت چیروکێت تە واقعێ ژیانا رۆژانە یا خەلکێ مە لسەر تە (فەرض)، دکەت یان خەیالا تە یا ئەدەبی یە؟**

**ئەنوەر محەمەد تاهیر:** بەلێ قارەمانێت چیروکێت من هەر رۆژ دکەڤنە بەرامبەر من و تەو ل هەمی کۆلان و جەهدا تۆ دبینی ل هەمی باژێرێت کوردستانێ، ناکەڤنە بەر چ قەدغەکرنا ناوجەگەری و حزبایەتی، جونکی لناڤ جەرکێ ڤی خەلکی دا دژین بەس ئەڤە ڤێ چەندێ ناگەهینێت کۆ ئەز ب رەنگێ فوتوگرافی دهینمە ناڤ جیهانا چیروکێ، جونکی چیرۆک وەک هۆنەر دڤێت ل فانتازیا «مێشکێ» چیرۆک نڤێسی دا هندە بمینیت دا بێتە هەڤیر کرن و ترش کرن ئەڤجا بەرە بەرە بێتە ناڤ هۆنەرێ چیروکێ دا.
مەیدانا قارەمانێت چیروکێت من هەمی کوردستانا بێ تۆخیبە.

چ ژ قارەمانێت چیروکێت من مرۆڤێت خەیالی و ژ جیهانا فانتازی نینن، ئەز دشێم جەردکێ بکەم کا قارەمانێ هەر چیروکەکا من کییە؟
بەس کەس نەشێت ڤێ چەندێ دیار کەت، تنێ جارەکێ ل ئێکەتیا نڤیسەرا من چیروکا (ئەو زەلامێ شەر نەکری و کەتیە داڤێ) خاندنی، گەلەکا گۆت مە زانی قارەمانێ وێ کییە، ئەو ژی چونکی دگەل وان بوو ئۆ ماوەیەکێ نێزیک بوو ئەو رویدانێت چیروکێ لسەر وان برادەرێت ئامادە بۆرین.

# مللەتێ مە نەخوشیا ژ بیرکرنێ هەیە

**راماان: دیتنا بۆ خاندنگەهێت ئەدەبی [البنیویە- الحداثە، الوجودیە، الریالزمیە- السریالیە] چییە؟ ئۆ ئایا وەک جاران سەنگا خۆ ل جیهانا ئەدەبی دا مایە؟**

**ئەنوەر محەمەد تاهیر:** ئەلبەت هندی مروڤایەتی ل پێشکەفتنێ دا بیت دێ هەر خاندگەهێت ئەدەبی پەیدا بن ئەڤەژی نیشانا سەربەستیا هزرو بیرانە دبینین ل دەستپێکا ڤی چەرخی هەتا نهو ئەڤ خاندنگەهە هەر ل فرنسا پەیدا دبن و گەشێ دەکەن ئەو ژی وەک (سارتری)گۆتی فرنسا جهێ هەر هزرمەندەکێ مشەخت بوویە ژ وەلاتێ خۆ، ئۆ داخاز ژ سەروکێ فەرەنسی یێ سەر وی دەمی «دیگول»ی کر کۆ قەت ئەڤ دەرگەهە ل کەسێ نەهێتە گرتن ئەڤجا ئەڤ هەمی خاندنگەهێت تە گوتین هەتا پیت هۆنەری ژی وەک (تكعیبیەو تجریدی) ل وێرێ پەیدا بوون.
ئەلبەت ئەڤە هەمی ڤەرێژا هزرا مرۆڤایەتیێ یە، نابیت مرۆڤ پشت گوهـ ب هاڤێژیت هەر چنە بیت شارەزایەکێ ژێ پەیدا بکەن کتێبت وان بخوینین بەلێ ڤەگۆهاستن ب رەنگەکێ «میکانیکی و پراکتیکێ» لسەر بەرهەمێ مەیێ ئەدەبی مەقسەدا خۆ ناهینیت ئۆ دێ کەچ کەت بەلێ لدویف پسیارا تە کۆ سەنگا خۆ دێ هەر مینیت جونکی ئەو خاندنگەهە قوناغێت هزرا مرۆڤایەتی تێدا بوری - دیار دکەت.

**رامان: رەئیا تە چی یە بەرامبەر خەلاتێت جیهانی؟**

**ئەنوەر مەحەمەد تاهیر:** خەلاتێت ئەدەبی بێت جیهانێ کارەکێ باشە جونکی بهایەکی دەدتە هزرا قەلەمێت نڤیسەرا بەلێ پروپاکندا چەب رەوا هۆسا دهزرا مەدا چەسپاندەبوو کۆ خەلات نەمازە (نوبل) مەبەست بوو کۆ خەلاتەکێ ئمپریالی یە دەنە هندەکا ئەوین وان دڤێت ئۆ ژ بەر ئەگەرێت سیاسی، [نەجیب مەحفوزی] وەرگرت جونکی چۆنا ساداتی بوو ئیسرائیلێ پیروز کر بوو.
بەلێ پشتی من رومانا [أولاد حارتنا- زاروکێت ناخێ مە] خاندنی من زانی شاکارەکا نڤیسی و حەقێ وی پێ دایێ.

**رامان: ئایا تەشیایە دنڤێسینیت خودا پێ راستکو بی دگەل خۆ دگەل جەماوەری ئۆ تە مجامەلا مەسئولا نەکریە هنگێ و نهو؟**

**ئەنوەر محەمەد تاهیر:** پسیارەکا پر بهایە دڤیا هەر نڤێسەرک دەمێ ژ بەرهەمێ خو خەلاس دبیت ئەڤی پسیارێ ژ خو بکەت؟

ئەز نزانم بەلێ وەک ئەم کورد دبێژین دێ هەر مروڤ [موحتاجێ] بیجەکا ئاخێ دبیت ئەڤجا دڤێت بێ راستگو بیت.
ئەز هەر ل روینشتن و سمینارا دبێژم نڤێسەر بێ بەر پسیارە ژ نڤێسینا خۆ.
جونکی نڤێسین وەک «قاقانیا رەش» لسەر دمینیت جونکی ب سەدان دانە ژ وێ رۆژنامە یا گۆڤارێ تێنە چابکرن ئەڤجا (رم دتیرکادا ناهێنە ڤەشارتن) ئەڤێت ل سەر دەمێ رژێمی گۆتار دنڤێسین بب کریتکرنا هندە سەر کردا ئەڤرو ستایشا وان دکەن، ئەو ژی سەرهندێ دژین کۆ ملەتێ مە نەخۆشیا ژبیر کرنێ هەیە.
جارەکێ ل گۆنگرێ نڤێسەرا ل سالاێت هەشتێ ل هەولێر من گۆت بلا (مزایدێ) لسەر ئێک نەکەین جونکی هەر ئێک ژ مە ملەڤەک هەیە لدەڤ ملەتی.
ئەز دەستێ خۆ دانمە سەر دلێ خۆ سەری خۆ بلند دکمە ئاسمانی و دبێژم خودێ هەکە ئەز یێ راستگۆ نەبم تو لمن بکری.
**رامان: پەیوەندیێت تە دگەل نڤێسەراو رەوشەنبیرا چەوا نن؟**
**ئەنوەر محەمەد تاهیر:** ئەز دبێژم نڤێسەرو رەوشەنبیر دشێن بەرسڤا تە بدەن بەلێ

# ئەز ژ چ بەرهەمێت خو یێ رازی نینم، ئومن نەڤێت ئەو کتیبێت من بەلاڤکری بخینمەڤە!!

ئەز دبێژم پەیوەندێت من باشن دگەل هەمیا.
**رامان: پشتی سەر هلدانێ تۆ گۆتارێت سیاسی دنڤیسی جار ب رەنگەکێ کومیدی وەک ئەڤا ل زار دەڤێ «حەجی ئەحموی» جار ژی گۆتارو ڤەکۆلینیت سیاسی. تەدڤێت ببیە نڤێسەرەکێ سیاسی ژی؟**
**ئەنوەر محەمەد تاهیر:** نەخێر من نەڤێت ببمە نڤێسەرکێ سیاسی بەلێ ئەڤرو سیاسەت بوویە شاسوارێ مەیدانێ و بوویە نان و ئاڤ و غەم رەڤینا دەر دێت مە دیارە مەیدانا چیروکێ ماڤێ- راستەخو- نادەت ئەڤجا ئەز دبینم حەجی ئەحموو گۆتارێت سیاسی من قورتال دکەت ژ ڤێ ئاریشێ، جونکی گۆتارێ سیاسی زێدە تر سەربەستی و تێدا هەیە.
هیڤی دکەم ئەڤ دەرگەهـ لپێشی هەمیا ڤەبیت چ چاڤ ل کەسێ نەهێنە سوور کرن وزالگە هـ و چ رێکـا ل گۆڤارو رۆژنامێت کوردی نەکرن.
شوینا دان و ستاندێت مە تۆپ ئار پیجیا بن بلا ببنە بەر پەرێت روژناماو سالونێت رەوشەنبیری و کوچکا پەرلەمانی ئەم ژی بەرو شارستەنیەت بچین و جونکی رۆژا شکەفت و چیاگرتن و رەبیئا چو بلا بەس بیت.
**رامان: تە چ پروژێ ئەدەبی بۆ داهاتەکا نێزیک هەیە.؟**
**ئەنوەر محەمەد تاهیر:** من رۆمانەک هەیە بناڤێ (پیرە فات و چارە نڤێسێ

کوریت وێ) پشکەک ژێ ل گوڤارا پەیڤ ژمارە (دو). بلا ڤکریە ئو هندەک گوتار لسەر رەخنێ؟
**رامان: بهزرا تە وەخت نەهاتیە هەلبژارتنێت نوی بو ئیکەتیا نڤیسەرا بهێنە کرن؟**

**ئەنوەر محەمەد تاهیر:** وەک تشتەکی قانونی و نورمەل دڤێت هەلبژارتن هەر سالەکێ ئان دوو سالا هاتبانە کرن بەلێ ئەو کاو دانێت سیاسی پێت تەعل و پشتی پارچە کرنا کوردستانا رزگار کری ئەڤ هەلبژارتنەو کونگرەکێ سەرا نسەری بو تشتەکێ زەحمەت هەتا ئەڤرو ما.

## ترس ئەوە ئەڤرو هەر کونگرەکێ نڤیسەرا بهێتە بەستن.. دێ نڤیسەرا کەتە دوو پشک!!

ئەز دبێژم پشتی :گیانێ حزبایەتی دژوارتر لێ هاتی ترس ئەوە ئەڤرو هەر گونگرەک ببیت نڤیسەرا کەتە دو پشک ئو بینە رووی پێ بەرو ڤژی بێ هەر دوو حزبا هەر چەندە ئەڤە فهێتیە بو نڤیسەرا ئەفجا دبێژین نەعلەت ل دوو بەرەکییێ.
**رامان: نها هندەک گەنج هەنە یێ بزاڤێ دکەن کو بخو ئیکەتیا نڤیسەران دابمەزرینن ژ بلی ئەڤا هەی.. تە چ هزرو پەیڤ هەنە بو ڤێ چەندێ؟**
**ئەنوەر محەمەد تاهیرا:** ئەز دبێژم ئەڤ قانونا پەرلەمانێ کوردستانێ دەرئێخستی لسەر دروست کرنا کومەل و ئیکەتیا ماڤێ دایە هەر کروپەکێ ژ دەه کەساو بن ئیکەتیەکا پیشەی یا کومەلەکێ دانن پشتی ئارمانج پەیرەوێت خوپێشکێش دکەن، کەس نەشێت رێکێ لێ بکریت.
بەلێ (عیبرەت) نەدانانا کومەل و ئیکەتیایە جونکی وەک دبێژن (بە ئیشە نە بەریشە).
ئەز دبێژم ئیکەتیەکا سەرانسەری و حزبی کو پی کرنا [ استنتاخ ] سیستەمێ سوفیەتا جارانە ئەفجا روژگارا وێ نەما هەر ئیکە تیەک هەبیت دڤێت پیشەی بیت ئەڤرو ئەو ئەندامێت وان ئیکەتیاو کومەل و سەندیکایا دبێژن کا سەر کردیت ڤان ناڤبریا بو مە چ پێشکێش کریە مانا مە ل رێزا ئیکەتیا یان نەمان ژبەر چییە؟
ئەز دگەل وەێ رەئییێ مە چەند ئیکەتی بو ئێک پیشە هەبن بەلێ نە لسەر بناغەکێ حزبی بەلکو پیشەی و بەس.
یاشیا ل مەیدانێ جهێ خو بکەن و یان نەشیا بەردەوامیێ ب کار خو بکەت بخێر، بجیت جونکی متاتیی باش پێ خراب دەردکەت ئەڤە ژێ قانونا سروشتی و خودێ یە.

**ئەنوەر محمد طاهر**
**- ل روژا (٥) تیرمەها سالا ١٩٤٩ ژ دایک بویە.**
**-کولیجا ئاداب- زانکویا بەغدا- پشکا کوردی ل سالا ١٩٧٣- ١٩٧٤ بدیماهی ئینایە.**
**- سێ کتیب چاپکرینە.**
**- سێ کتیب ژبو چاپێ د ئامادەنە.**
**لەسەر پێشنیاری رامان وەسفی حەسەن ئامادەی کردووە**

**دڵشاد عومەر کاکی**

# قۆناغی ڕوانگە هیچی لەسەر من بەجێ نەهێشت

***دڵشادی عومەر کاکی شاعیرێکی وەچەی نوێیەو لەناو شاعیرە لاوەکاندا شاعیرێکی بزێوەو بەرهەمەکانی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاوکردۆتەوە. ئەم شاعیرە لە هەڵبجە لە دایک بووە، هەڵەبجەش بەوە ناوبانگی هەیە ئەو سەردەمە وەک باخچەیەکی شاعیران وابوو، کە تیایدا زۆربەی شاعیرانی وەک گۆران و فایەق بێکەس و ئەحمەد موختار بەگی جافی تیا هەڵکەوتووە، دەوروبەری هەڵەبجەش لە شاعیرانی کلاسیکی وەک مەولەوی و نالی و چەندان شاعیری تر دەوری ئەو شارەیان داوە، خەڵکی هەڵەبجەش وەک خۆشەویستیان بۆ ئەدەب ئەو شارەیان وا لێ کردووە کە هەردەم بە پەرۆشی شیعر بن.***

**ڕامان: چۆن خۆتان لەناو دنیای شیعردا دۆزییەوە؟**

**دڵشاد عومەر کاکی:** من وەک منداڵێکی ئەو سەردەمەو لەو شارەدا شیعرم خۆش دەویست، کە چاوم هەڵهێنا لە کتێبخانەیەکدا خۆم بینییەوە هەمووی شیعرو ئەدەبیات بوو، بەو پێیە تەکوینی ڕۆحی و شعووری من لە شیعرەوە نزیک بوو، شیعرم هەڵبژارد و بوو بە هاوڕێیەکی هەمیشەییم و زیاتر خەون و خەیاڵەکانم تیایدا قاڵ بوون، توانیم ئەو زمانی بیرو دەربڕینانەشم لەڕێی شیعرەوە ببینمەوەو لەڕێی جوانی و بەرفراوانی و سیحری شیعرەوە خۆم بخوێنمەوە، لە ساڵانی ١٩٧٥ - ١٩٧٦ چەند پارچە شیعرێکی خۆمم خستە ڕوو، ئەو کاتە سەرەتای دەسپێکردنی ژیانی ئەدەبیم بوو، پێشتریش خوێندنەوەی شیعر یەکێک بوو لەو ئومێدانەی من کە خۆ ئامادەبکەم بۆ شیعرو لە دنیای ڕۆشنبیری و لە باخچەیەکی جواندا خۆم پەروەردە بکەم،، هەرچەندە کە ئاوڕیش دەدەمەوە لە سەردەمی منداڵی و لاوێتی نەمتوانی تەعبیرێکی ئەوتۆ لەشیعر بکەم تا ساڵانی (٧٨ - ٧٩) خۆم

سەرقاڵی ئەدەبیاتی جۆر بە جۆر کرد، بە تایبەت ئەدەبی بێگانە ئەوەندەی لە تەجروبەی ئەدەبی عەرەبییەوە نزیک بووم و خەریکی لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکانیان بووم، کەمێکیش لەرێی زمانی فارسییەوە هەستم ئاشنایەتی لەگەڵ ئەدەبیاتی فارسیدا پەیدا کرد، پاشان بەهۆی ئەودەرفەتەی بڵاوکردنەوەی ئەوسا چەند گۆڤارێکی کوردی هەبوون، هەرچەندە هیوام کەم بوو کە مرۆڤ سەربەستانە بتوانێ هەموو خەون و خەیاڵەکان و هەموو بیروباوەڕو ئەندێشەکانی لەو لاپەڕانەی سەردەمی رژێمدا دەرببڕێت، بەڵام بوونی ئەو گۆڤارانە، هەر خۆیان لە خۆیاندا مەنفەزو دەروازەیەک بوون، تا ئێمە بتوانین تاقیکردنەوە شیعرییەکانی خۆمان ببینینەوەو هەندێ لە رەخنەگران و نووسەران وتوێژی لەسەر بکەن، لە ساڵانی ١٩٧٨ - ١٩٧٩ بەولاوە چەند پارچە شیعرێکم بڵاوکردەوە کە تارادەیەک دروست بونێک لەناو شیعرەکانی خۆما دەبینمەوەو، لە ساڵەکانی ١٩٨٠بەولاوە دوایی لە کۆڕەکاندا شیعرم بڵاودەکردەوە، سەرقاڵی لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی شیعری بووم و ئاشنایەتیم لەگەڵ ئەو رەخنەگرە زیرەک و بەسەلیقانەدا دەبەست تاکو بتوانم لە دنیای شیعردا شتێک بۆ خۆم پەیدا بکەم..

**رامان: کاک دڵشاد بەپێی قسەی خۆتان لە ٩٧٨ - ٩٧٩ چەند شیعرێکتان بڵاوکردۆتەوە، کەواتە کەوتوونەتە دوای ئەو کۆمەڵە شاعیرەی کە خۆیان بەنوێخواز دەزانن و ئەو کۆمەڵە شاعیرەی کە روانگەیان دەرکرد، ئێوەبە چەند ساڵێک کەوتوونەتە دوای روانگە چۆن تایبەتمەندێتی جیلی خۆتان لەوان جیادەکەنەوە؟.**

**دڵشاد عومەر کاکی:** بەپێی ئەو سەرنجەی خۆم بۆ روانگە، مەسەلەی روانگە لە ئەدەبیاتی هەموو جیهاندا بەشێوەی جیاوازو دوور لە روانگە، لەناو هەر گەل و میللەتێکدا دیاردەیەکی جیاجیای لەم جۆرە قوتابخانە شیعرییەی هەبووە، ئەو نووسەرانەشی لە سەردەمی روانگەدا ئەو شیعرانەیان دەنووسی، ئەو دیاردەیان بڵاوکردەوە، من پێم وایە ئەو دیاردەیە بە تەواوەتی پێنەگەیبوو، واتا نەهاتبووە سەرپێ هەندێ کەس روانگە بەتەمومژ باس دەکەن و هەریەکەش بۆ چوونی جیاوازی هەیە لەسەر روانگە، منیش پێم وایە ئەدەبی روانگە نەیتوانی لەقۆناغێکدا تەکانی خۆی هەبێ و وەرچار خانێک لەگەڵ شیعری پێشووی خۆیدا دروست بکات، واتە روانگە هیچی تازەی نەبوو بۆ پێشووی خۆی، زۆر شاعیرانی چاک ئەگەر چی زۆرجار بەشێوەیەکی زۆر نوێخوازیش نەیاننووسی بێت، بەڵام دانە دانە لەپێش روانگەدا شاعیرانی نوێخواز هەبوون، هەر بۆ خۆشیان لە شاعیرانی روانگە هەندێ شیعریان لەسەردەمی پێش خۆیان نووسیوە کە زۆر شیعرێکی باڵانوماترو جوانتر بووە لە سەردەمی روانگە، ئیتر من پێم وایە ئەو سەردەمەی کە روانگە هەبوو وەک خوێنەرێک من شیعرەکانیانم دەخوێندەوە، هیچ تام و لەزەت و خۆشی بۆ سەر بیری من نەبوو، ئێستەش بەهەر چاوێک سەیری دەکەم و لەهەر لایەک و لەهەر گۆشەیەکەوە بۆی دەڕوانم پێم وایە ئەدەبێکی هەڵچوو بوو، خزمەتێکی بەو جیلە نەکرد کە لەو کاتەدا ئەو جیلەی تریش کە ئێستە بزێو ترن، زیاتر خەرقی ماناو زمانی شیعریان کردووەو زیاتر لە وێنەی شیعری نزیک

دەبنەوە، ئەمانە نەیانتوانیوە روانگە بکەنە مەرجەعێک و بەفەرهەنگێک بۆ ئەزموونی نوێی خۆیان.. بۆیە هەرگیز روانگە نەیتوانیوە جیاوازییەک لە نێوان ئەوسای خۆی و زابوردووی ئەدەبدا بکات، خۆی بۆشاییەک هەبوو، بەڵام ئەوەش هەروەک خۆی مایەوە، ئەوانەی دوای روانگەش هەرچەندە هەندێ لە رەوش و خەوش و تۆزو گەردی روانگەیان پێوە دیار بوو جار بەجار نەدەما، کەچی جاری تر سەری هەڵدایەوەو بە جوڵەیەک و بەشێوازێکی تر، بەڵام ئەو جیلەی ئێمە کە چەندەها شاعیر بەو بیرکردنەوەو دیدو وێنە شیعریانەی خۆیانەوە دەیاننووسی و توانییان وەرچەرخانێک لەگەڵ روانگەدا دروست بکەن، هاوشانیش بن بەهەموو ئەو بنەمایانەی کە لە ئەدەبی کوردی تا ئێستە هاتووە. بەڵام بەشێوەیەکی نوێترو جیاوازترو بە مانایەکی قووڵتر رەسەنایەتی شیعریشیان لە دەست نەدا..

**رامان: لەتیف هەڵمەت یەکێکە لە شاعیرانی کۆمەڵەی روانگە، لەو ماوەیەدا لەگفتوگۆیەکیدا لە گۆڤاری رامان باسی ئەوە دەکات کە کاریگەریتی شیعری ئەوان و جەماعەتی روانگە نەک بەسەر جیلی خۆیان بەڵکو دوای خۆشیان هەر ئەو کاریگەرییەتیەی ماوە.**

**دڵشاد عومەر کاکی:** کاک لەتیف خۆبشی خۆی وا پیشان دەدات کە کاریگەری خودی خۆبشی بەسەر جیلی دوای خۆیدا هەیە، کاک لەتیف لەو قۆناغەدا کە شیعری نووسیوە خاوەنی کۆمەڵێ شیعر بووە لەوانە بوو ئێمە خوێنەر بین بۆ شیعرێکی کاک لەتیف لەتەمەنێکدا کە ئەو ساکە هێشتاکە شیعرمان نەنووسیبوو، ئێمە خوێنەرێکی سادە بووین و بەپڕاوپڕی لێوردبوونەوەی ئەو قۆناغەی کاک لەتیفمان دەکرد، هێشتا ئێمەی فێری زمانی عەرەبی و فارسی نەببوو بووین تا زیندوێتی و جوانی شیعری ئەوانیش پێ بزانین ئەوەندەمان لە ئەدەبەکەی خۆمان دەبینی کە کاک لەتیف و هاورێکانی شیعریان دەنووسی، بە هەموو مەنتیق و مەعریفەیەک نەک تەنیا شیعر بەڵکو فیکرو هۆشی مرۆڤیش بەرەو نوێخوازی و بەرەو پێشچوون دەچێت و شیعریش بێ بەش نەبووە لە نوێخوازی و تەکانی خۆی هەبووە، من ناتوانم دەستنیشانی ئەوە بکەم چ شاعیرێ بڵندترە لەوی تر، هەر لەو سەردەمەدا شاعیر هەبووە لەوانەیە کاک لەتیفی سەرسام کردبێت، ئەو صەراحەتە دەمێنێتەوە بۆ کاک لەتیف خۆی کەتا چەند ددان بە شاعیرانی دوای خۆیدا دەنێت و ئەو بڕیارو رەئیە هی خۆیەتی..

**رامان: تۆ بڵێی ئەو رایەتایبەتەی لەتیف لەسەر شاعیرێک یان دوو شاعیر بووبێت بەڵام بەگشتی باسی کردبێت..؟!**

**دڵشاد عومەر کاکی:** ئەگەر بهاتایە کاک لەتیف لەو شیعرانەی پێشووتری کە نوسیوونی جوانتری بنووسیایە هەڵبەتە رای جوانتری دەبوو، ئەمە ئەگەر رەخنەش بێ، رەخنە زەمینەی ئازادی هەیە، کاک لەتیف هەر بەچاوی جارانەوە تەماشای شاعیرانی ئێستە دەکات و هەندێ جار توندەو دێت مێژووی شاعیرێک هەڵدەتەکێنێ، چەندەها شەڕی تری خۆی بەسەر ئەم شاعیرو ئەو شاعیردا گەرم کردووەتەوە، ئەمانە رای تایبەتی خۆین، دووبارە دەڵێم لەسەردەم و زەمانێکدا

## ديموكراتييه‌ت و سنگ فره‌وانی ئه‌و حزبانه له‌وه‌دایه بتوانن که‌ش و هه‌وایه‌کی سازگار بۆ نووسه‌ران ده‌سته‌به‌ر بکه‌ن

کاک له‌تیف شیعری جوانی نووسیووه، شیعری هه‌بووه‌و شاره‌زای زمانی عه‌ره‌بی بووه‌و له‌ناوه‌ندێکی رۆژنامه‌نووسیدا کارگوزار بووه‌و ده‌توانم ئه‌وه‌ش بڵێم کاک له‌تیف سوودی له شاعیرو چیرۆکنووسه عه‌ره‌به‌کان وه‌رگرتووه، هه‌ندێ دێرو ته‌عابیری شاعیرانی عه‌ره‌ب له‌ناو شیعره‌کانی کاک له‌تیفدا ره‌نگی داوه‌ته‌وه..

**رامان: له ناوه‌ندی هه‌شتاکان کۆمه‌ڵێک شاعیر له هه‌ولێر په‌یدا بوون، ناویان له خۆیان نا ته‌لیعییه‌کان، رات به‌رامبه‌ر ئه‌وان چۆن بوو له کاتی خۆیدا؟!**

**دڵشاد عومه‌ر کاکی:** به‌راستی ته‌لیعییه‌کان شێوازی جیاوازیان هه‌بوو به‌نیسبه‌ت ئه‌و گروپه‌ی روانگه، ئه‌وان له‌سه‌رده‌م و زه‌مانێکدا هاتنه کایه‌وه که شیعر تیایدا ده‌وڵه‌مه‌ندو زمانی ده‌ربڕین به‌هێز بوو، ناتوانم به‌نموونه بیانهێنمه‌وه، زۆر له‌و شاعیرانه به‌راستیی رۆشنبیر بوون، هه‌ندێکیان خاوه‌نی رابردووی شیعری خۆیان بوون، هه‌ندێک هه‌بوون له‌وانه‌ی لاسایی گرووپی خۆیان ده‌کرده‌وه، ئه‌وانه‌یان کۆمه‌ڵێک بوون ته‌شویهی شیعریان ده‌کردو ته‌نیا لاسایی و ته‌قلید کردنی ئه‌وانی تر بوون، به‌ڵام هه‌ندێ وشه‌ی شیعری و گوزارشتی جوان له نێوان دێره شیعرییه‌کانیاندا هه‌بوون، ئه‌وه‌ش دیارده‌یه‌کی شیعرییه‌و ئه‌و زیندوویه‌تییه له‌ناو ئه‌ده‌بی هه‌موو گه‌لاندا هه‌یه، بۆخۆم ئه‌گه‌ر وه‌ک ته‌لیعییه‌کان شیعرم نه‌نووسیبێت، ئه‌وه شیعری ئه‌وانم ره‌فز نه‌کردووه‌و به دیارده‌یه‌کی شارستانیم زانیوه... که زۆر نووسه‌ران به‌و شێوه‌یه گوزارشت له شیعر ده‌که‌ن و ئه‌و شێوازه‌یان گرتووه‌و سه‌ربه‌ستن له‌و شێوه ده‌ربڕینه..

**رامان: کاک دڵشاد دوای راپه‌ڕین خنکانێکی ئه‌ده‌بی و رۆشنبیری له کوردستان هه‌بوو، زۆربه‌ی ئه‌و نووسه‌رو شاعیرانه‌ی ئه‌فراندنیان هه‌یه ئێسته بۆ حزبه‌کان کار ده‌که‌ن، هۆی ئه‌وه بۆچی ده‌گه‌ڕێته‌وه..؟!**

**دڵشاد عومه‌ر کاکی:** یه‌که‌م کتوپڕی ئه‌و وه‌رچه‌رخانه‌ی له نێوان ماوه‌ی پێش راپه‌ڕین و دوای راپه‌ڕیندا هه‌بوو که نووسینه‌کانیان پڕ له‌نهێنی بوو له‌به‌رده‌م نووسه‌ره‌کان و ئه‌دیبه‌کاندا، ئه‌و جێگه‌یانه‌ی که‌تیایاندا ده‌نووسی به‌و نهێنی و زه‌بوونییه حاڵه‌تێکی زۆر ده‌رکه‌وتن و هانده‌رێکی سه‌یر له ناو دڵ و ده‌روون و بیرکردنه‌وه‌و گوزاریشتی نووسه‌ره‌کاندا به‌رپا کرد، نووسه‌ران ده‌هاتنه سه‌ر زه‌مینه‌یه‌کی ئازادو به‌شێوه‌ی سه‌ربه‌ستانه ده‌یاننووسی، ته‌نانه‌ت ئیبداعیش به‌و په‌له‌په‌له‌و به‌و سه‌ربه‌ستییه که وه‌ک بڵێی هه‌موو په‌نجه‌ره‌و ده‌رگاکان خرایه سه‌رپشت ئه‌فراندن تا راده‌یه‌ک بێ هێز بوو، راپه‌ڕینیش بۆ خۆی پاروو به‌پاروو ئه‌و

بەرهەمە ئەدەبیانەی دەپێچایەوەو، ڕاپەڕین هەموو سەروەت و سامانی ئەدەبی زەوت کرد، کە لە نێو ئەفراندن و داهێنانی نووسەراندا هەبوو، زۆر نووسەریش بەهۆی لایەنگری و پەلکێش کردنی ئەم حزبە بۆ ئەو حزب تووشی ئەو پەتایە بوون کە شێوازو فۆرمی شیعری خۆی بگۆڕێ و بەس زمانی تایبەت بەسەر شیعرەکاندا فەرز بکات و سارد بێتەوە لەو شێوە نووسینەی کە لەوەو پێش هەیبوو، هەموو ئەو ئەفراندنە کە لە گیانیانا هەبوو هەمووی دیاردەیەکی ئەو تۆیان بەسەر هات کە خامۆش و کپ بوون، لە دوای ڕاپەڕین حالەتی تر دروست بوو نووسەران کەوتنە سەر زەمینەیەکی تەنیا، کەوتنە حالەتی دەروونیی سەیرو نالەبارو، نەبوونی بژێوی و ژیانی بەدەرامەت بۆ نووسەران خۆی کێشەیەکی ترە، هەرچەندە نووسەر لەگەڵ بوون و نەبووندا خاوەنی فیکرو داهێنانی خۆیەتی، بەڵام هەموو ئەو دەستە بەرانەی کە نووسەر بوون و شاعیر بوون و هەندێ کەش و ئاوو هەوای ژیان و مەعیشەو دەرامەت دەیگرتنەوە ئەمە ئیجباری هەندێ کەسی کرد لە ئەدەب بکشێنەوەو هەندێ کەس ئەو بوێریی و زۆرانە گەورەیەی ژیانی پێ نەکرێت و سەرقاڵی ژیان و نەبوونی و نالەباری وای لە زۆر نووسەر کرد ساردییەک لە بەرهەمەکانیاندا هەبێت، هەندێکی زۆر تریش بەو شێوەیە کشانەوە.

**ڕامان: هۆی چییە ماوەیەکی زۆرە شیعر دەنووسی و تا ئێستا دیوانت چاپ نەکردووە؟**

**دڵشاد عومەر کاکی:** ئەمە زۆر برادەر لێم دەپرسن، لەوانەیە ئەمە نهێنی یان حاڵەتێکی خۆم بێت، ئەگەر بڵێم ترسێک هەیە لە ڕەخنە، ترسێکی زۆر بەئەزموونم لەگەڵ ڕەخنەیا هەیە، ترسێکی ئەو تۆ کە نەتوانم ڕووبەڕووی ڕەخنە ببمەوە، ئەو قۆناغانەش کە بەسەر خۆمدا هێنابێتم و لەناو ئەدەبەکەمدا ڕەنگم پێ دابێتەوە هەمیشە من لە ڕەخنەگرتنا بووم لەگەڵ خۆم. لە گۆڕانکاریدا بووم لەگەڵ شێوازی شیعریمدا لەبەر ئەوەی هەگیز نەمتوانیوە بەشێوەیەکی خێرا بڕیار بدەم کە کۆمەڵە دیوانێک لە قۆناغێک لە قۆناغەکانی نووسینما چاپ بکەم و بەکرچ و کاڵی بیخەمە بەردەست، ئەگەرچیش خۆم لە ناوەوە هەستم کردبێ لە قۆناغی شیعریمدا، زیاتر لە چەندین پارچە شیعرم بڵاوکردبێتەوەو چەند نووسین و پەخشان و کورتە چیرۆکم بڵاوکردبێتەوە، ئەمانە وەک سەروەت و سامانێکی ئەدەبی خستوومەتە بەردەست و هەمیشە ڕەخنەی لێ گیراوە، ئەگەر هاتوو من کتومت دیوانەکەم کردە کتێبێکی قەبەو ناوم لێ نا کۆمەڵە شیعرێک، ئەوا من دەکەومە بەر دەم بەرپرسیارییەکی گەورەی ڕەخنەیی، ئەمەشیان ئەو نهێنییەیە کە باسی دەکەم، حەزم وایە قۆناغێکی گەورەتر ببینم، بتوانم چەندین ڕەخنە لە خۆم بگرم، هەموو

ئەو ئەزموونە شیعرییانە کۆبکەمەوە، ئەو کاتە لە کۆمەڵە شیعرێکی بالانومادا کە خۆم لێی رازی بم و ئەزموونەکانی خەڵک بخەمە سەرئەزمونەکانی خۆم، رێنومایی و رەخنەکانی کەسانی ژیرو بەتوانا لەسەرم کۆبنەوەو کاریگەری ئەوانە لەشیعرەکاندا رەنگ بدەنەوە تا نەبنە خاوەنی ئەزموونێک کۆمەڵی شیعر بەناوی ئەو ئەزموونەوە لەچاپ نادەم..

**رامان: لە ناوەندی حەفتاکانەوە دوای شۆڕشی ئەیلوول خەڵکێکی زۆر، بەتایبەتیش لەدوای راپەڕین خەڵکی توانادار روویان لە هەندەران کرد، ئێستا دەتوانین بڵێین زۆرترین ژمارەی رۆشنبیر لە هەندەران دەژین، بەسیفەتی ئەوەی لە دەرەوە دەژیت بەرای ئێوە ئەو رۆشنبیرانەی لە تاراوگەن تا چەند کاریگەرییان بۆ سەر رای گشتیی میللەتەکەیان هەیە و تا چەندیش توانیویانە گوزارشت لە ئەدەب و رۆشنبیری میللەتەکەیان بکەن؟!**

**دڵشاد عومەر کاکی:** پێم وایە کۆچکردن بۆ ئەوروپا وەک ئەو کوردانەی لە ماوەیەکی دوورترەو کۆچیان کردووە بۆ هەندەران ساڵەوەختێک بووە بە ناوی خوێندنەوە یان کەسانێک چوونەتە ئەوروپا و نەگەڕاونەتەوە، ئەوانە تا ساڵەکانی هەشتا لە دوای ئەوەش کاتێ جەنگی ئێران/ عێراق دەستیپێکرد نەک تەنیا کۆچکردن بەڵکو کورد لە وڵاتانی دەوروبەری وەک ئێران و تورکیا و وڵاتانی تری عەرەبی دەوروبەر پەرت و بڵاوبوونەتەوە، ئەمەش هەمووی راکردن و زویر بوون و حاڵەتێکی ناهەمواری ئەو خەڵکە بووە، چ لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی، یان لەبەر ترس و راوەدوونانی رژێمەوە بوو بێت، یان بە هۆی نەبینینەوەی دیموکراتی و هۆکاری تری سیاسی بوو بێت، ئەوانە کوردستانیان بە جێهیشتووە، لە ناویاندا کۆمەڵێ رۆشنبیرو نووسەر گەیشتوونەتە ئەوروپا، لە دوای راپەڕینەوە ئەو لێشاوی کۆچە گەورەتر بوو، لە نێو لێشاوە گەورەکەدا هەندێ رۆشنبیرو هەندێ خاوەن قەڵەم، لە رێگەدا لەگەڵ بەدوادا چوونی چارەنووسی خۆیاندا بوون، نووسەر هەن نەگەیشتوونەتە ئەوروپا یان هیوایان ئەوەیە بگەنە ئەوروپاتا ئومێدو خەونەکانی خۆیان ببیننەوە، ئەوانەی لە دوای راپەڕین چوونەتە ئەوروپا تەنیا بەیەکداچوون و مامەڵەکردنێکی کەمی ئەدەبی لە ناویاندا هەیە، بەو خێراییە فێری زمانە ئەوروپییەکان نەبوون تا بەشێک لە ئەدەب و کولتوری ئەو وڵاتانە بخوێننەوە یان نەیانتوانیوە نووسینە کوردییەکان بۆ سەر زمانەکانی تر وەربگێڕن، هەتا پردێ لە نێوان ئەدەبی ئێمەو ئەدەبی گەلاندا دروست بکەن، هەر چەندە زۆر دەگمەنن ئەو نووسەرانەی کە لە سەردەمی جەنگی ئێران - عێراقدا - کە خۆیان سەرقاڵ کردبێت بۆ خزمەتی ئەدەبی کوردی، زۆر دەگمەنن ئەوانەی کە بەرۆکی ئەدەبیاتیان بەرنەدابێ، ئەوانەش هەژارانە لەگەڵ ئەدەبدا ژیاون و ئەو تواناو سەوداسەرییەیان نەبووە کە لە ئاستێکی ئەو تۆدا دەربکەون، ئەو نووسەرانەی ئێستەش کە بەشێوەیەکی زۆرتر لەم ساڵانەی دواییدا هاتوونەتە ئەوروپا جێگەی دڵخۆشییە کە ئەوانە بتوانن یەکبگرنەوەو بتوانن لە داهاتوودا پێش هەموو شت فێری زمانە ئەوروپییەکان ببن تا لە خیلالی زمانەکانەوە بۆچوون وتوانای ئەدەبی خۆیان

دەربخەن و بتوانن لە زانیاری و ئەو جیهانە بەرفرەوانەی ئەوروپا شتێک بە کوردستان بگەیەنن، ببنە پردێکی گواستنەوەی فیکرو زانست لە نێوان ئەوروپا و کوردستاندا...

**رامان: لەو شاعیرانەی جیلی خۆت کامیان تایبەتمەندی و کەسێتی شیعری خۆی هەیە؟**

**دڵشاد عومەر کاکی:** چەند گرووپێک لەو شاعیرانە لە پێش ئێمەوە هەبوون وەک **فەرەیدون عەبدول بەرزنجی و گۆران مەریوانی** ئەمانە پێش ئێمە بوون، تازەگەری و شەوق و جوانی و رووناکیم لە شیعرەکانیاندا دەبینی، زیندوێتی و زمانی بەهێزو دەربرینی نوێ لە نێو شیعری ئەو برادەرانەدا هەبوو، دوای ئەوانیش گەر بێتوو بیانکەینە چەند قۆتاغێکی مێژوویی شاعیرانی وەک **حەمە عومەر عوسمان** کە شیعرەکانی زۆر سەرنجی رادەکێشام و تا ئێستەش رەسەنایەتی تیا دەبینم. **جەمال غەمباریش** یەکێکی ترە لەوانەی بەناسکی شیعر دەنووسن کە ئەویش سەردەمێک لەمەوبەر ئەو توانا شیعریەی هەبوو ئێستە بڵاوکراوەکانی نابینم، چەندین شاعیری تریش لە هەولێرو ناوچەکانی تری کوردستان هەن، بەو پێیەی رۆشنبیری هەموو کونج و بستێکی کوردستانی پەی کردووە.

**رامان: چەند لە شیعری خۆت رازیت؟**

**دڵشاد عومەر کاکی:** ئەمە پرسیارێکی زۆر قورسە، نازانم، هۆی ئەوەشە تا ئێستە دیوانم بە چاپ نەگەیاندووە یان شتێکی تر، کاتێ شیعری خۆم دەبینمەوە دڵخۆشم زۆرجار لە ملاو ئەولا سەرنجدانی کەسانی تر لەسەر شیعرەکانی خۆم دەبیستم زۆرجاریش لە رەخنەگرانی هاوڕێم وەک **شێرزاد حەسەن و ئازاد عەبدولواحید** لەگەڵ یەکدا وتووێژی شیعری دەکەین، ئەوان دەتوانن زۆرجار را دەربڕن، بەڵام خۆم وەک خۆم ناتوانم بڵێم دڵخۆشم بە شیعرەکانی خۆم.

**رامان: چەند دەبێ لە هەندەران دەژیت؟!**

**دڵشاد عومەر کاکی:** بۆ ماوەی دوو ساڵ ونیوێک دەبێ دوورکەوتوومەتەوە، ساڵێک لە تورکیا بووم و نزیکەی ساڵ و نیوێکە لە ئەڵمانیام.

**رامان: ئەم ماوە کەمە هیچ گۆڕانکارییەک بەسەر ژیانی شیعریتا هاتووە؟!**

**دڵشاد عومەر کاکی:** وەک ئەوەی لە وڵاتێکی ئەورووپیدا دەژیم هەر چەندە سەوداسەری و بزێویم زۆرە لەگەڵ زماندا تا رادەیەک توانیومە لەگەڵ هاوڕێیانی خۆمدا پێشبڕکێ بکەم لەگەڵ ئەو برادەرانەی کە لەوێ بوون هەست دەکەم کە لە زمانەکە نزیک بوومەتەوە، دەتوانم گفتوگۆو مامەڵەی پێ بکەم، بەڵام وەک ئەوەی کە بتوانم پێی بخوێنمەوەو پێی بنووسم پێم وایە چەند ساڵێکم دەوێ «خۆشویستنی منیش بۆ زمانەکە ئەوەیە زووتر بگەمە ئەو ئاستەی کە لە رێگەی فێربوونی زمانەوە بتوانم مامەڵە ئەدەبیەکەم فرەوان بکەم، بەڵام ئێستە وەک نامۆیەکی ئەو وڵاتەم بەو مانایەش نا کە بڵێم لە وەزعێکی نالەبارو دوورە پەرێزام، بەڵکو لە وڵاتێکدام زۆر شادمانم بەوەی کە دەتوانم لە رێگەی بیرکردنەوەو سەرنجدانی خۆمەوە لە وڵاتێکدا بتوانم بە وێنەیەکی جیاوەو بە

شێوازێکی جیاواز خزمەت بە ئەدەبەکەو ژیانی شیعریم بکەم.
**رامان: پێت وایە رەخنەی ئەدەبی کوردی دروست بووبێت گەر هەیە چۆن پێناسەی دەکەیت؟!**
**دڵشاد عومەر کاکی:** رەخنەی ئەدەبی لە سەردەمێکی کۆنەوە هەر هەبووە، ئەوەی دەماودەم، یان بەسەرپێیی، یان بە نووسین یان ئەوەی لە کۆڕێکدا چەند وتەیەکی گوتبێ، یا لە رووی وتەبێژی خۆیەوە لەناو برادەرەکانیدا دانیشتبێ و شتێکی دەربارەی شیعر وتبێت.. هەندێ رۆشنبیری کورد هەن بێ ئەوەی رەخنەگر بن دەتوانن گوزارشت لە شیعر بکەن، شیعر دەناسن و بەو پێیەی کە شیعر وجودی هەیە، ئاستی شیعریش لەگەڵ ئاستی ئەو رەخنانە دایە کەشان بەشان لەگەڵ یەکتردا رۆیشتوون، بێ ناوهێنانی رەخنەگران، لە کوردستانیشدا چەند رەخنەگرێکی بزێوو بەسەلیقە هەن، چونکە شیعر بێ رەخنە بێ برادەرو بێ کەس و تەنیا باڵەو وەک موسافیرێکی تەنیاو کەسێکی نابەڵەد رێگەی دەگرت و سەری لە هیچ شوێنێکەوە دەرنەدەکرد..
**رامان: وەک بەرنامەی ئەدەبی خۆت چیت بە دەستەوەیە؟!**
**دڵشاد عومەر کاکی:** پێش بەرنامە ئەدەبییەکەم پێم وایە زمان زۆر پێویستە بۆ هەر بەرنامەیەکی ئەدەبی، بەرنامە بەتوانا و سەلیقەی ئینسان دادەرێژرێت، قۆناغ بە قۆناغ بەرنامە ئامادە دەکرێت، بڕوام بەوە هەیە لە داهاتوودا زۆر تواناو موفاجەئاتی تر دێنە بەردەمی ئینسان، لەوانەشە وەرچەرخانێک لەبەردەمی نووسین و شێوازی نووسینی ئینساندا هەبێت، من ئەگەر لە شیعرەوە دەستم پێ کردووە باوەڕم وایە بە چیرۆک کۆتایی پێ بێنم و خۆشەویستی زۆر زۆرم بۆ رۆمان هەیەو یەکەم قۆناغ کە لەبەر دەمدایە بە هەوڵی ئەو زمانەی فێری دەبم پێویستم بەوەیە رۆمان بخوێنمەوە و دیراسەی رۆمانە جیهانییەکان بکەم، پاشانیش ئەو توانا شیعرییەی کە لەمندا هەبووە رووکارێک و پەنجەرەیەکی روو لە رۆمان بووە یان ئاشنایەتیان لەگەڵ چیرۆکدا هەیە، بەو هیوای پڕاوپڕی بەرهەمەکانم لە رۆمانێکدا تۆخ بکەمەوە...
**رامان: گۆڤاری رامانت چاو پێ کەوت، چ پێشنیارێکت هەیە بۆ پێشخستنی ئەو گۆڤارە...**
**دڵشاد عومەر کاکی:** گۆڤاری رامانم بینی و هەر ئەمڕۆ چەند بەرهەمێکم تیا خوێندەوە، لە کاتێکدا سەیری ئەو بەڕێزانەم کرد کە لەناو ئەو گۆڤارەدا بەرهەمەکانیان تیا بڵاوکردۆتەوە، جێگەی دڵخۆشییە کە سەرتاپای ئەو نووسەرانەی تیایە کە لە هەموو کوردستاندا بەرهەم بڵاودەکەنەوە، بەرهەمەکانیش بەرهەمی ئەو نووسەرانەن کە رەخنەو بەرهەمی چاک و وتاری باش و چیرۆکی چاکیان هەیە، خاوەنی رابوردوێکی ئەدەبین، گۆڤارەکەم وا هاتە بەرچاو کە کەرنەڤاڵێکی رۆشنبیرییەو تۆکمەیی تیایە لە بەرگەوە بۆ بەرگ، شتێکی تریش لە گۆڤارەکەدا دووری و خۆپاراستنی گۆڤارەکەیە لە تەوژمە سیاسییەکان، هەر لایەنێکی پاڵپشتی ئەم گۆڤارە دەکات من شاباشی دەکەم و سوپاسی ئەو

دڵسۆزانە دەکەم کە درێژە بە دەرچوونی ئەم گۆڤارە دەدەن، هیوام وایە ئەم گۆڤارە گەورەیی بدا بەنووسەری کوردو لەو زەبوونی و ناهەمواریيە دەربیکات.. زۆریشم پێ خۆشە ئەو گۆڤارە موکافەئەی هەیە بۆ بەشدارەکان، چونکە نووسەری ئێمە بەراستی چ توانایەکی خۆ بژێوی نییە، نووسەری ئێمە بەرهەمەکەی ماندوو بونیەتی لەگەڵ نووسیندا و لەگەڵ خوێندنەوەدا، لەبەر ئەوە ئەو پاداشتە پێشکەش بە نووسەران دەکرێت جێگەی دڵخۆشییە، هەروەها ئەگەر بتوانن هەندێ پروپاگەندەش لە دوو لاپەڕەی کۆتایی گۆڤارەکەدا بڵاوبکەنەوە هەتا هەندێ دەسکەوت لە بازرگانەکان کۆبکەنەوە تا پێ بە پێی پاداشتەکان نەفەقەی داپۆشێ..

**رامان: هونەرمەند یان نووسەر لە ئەوروپا ئەو بەرهەمانەی خۆی زۆرجار دەکاتە کالایەک و لە بەرامبەردا پاداشتی پێ وەدەگرێت و هاوکات خزمەتی بوارەکەی خۆیشی پێ دەکات، ئێستە کە زۆر لە نووسەران و هونەرمەندە بێلایەنەکان لە راگەیاندنی پارتەکاندا کار دەکەن بۆ دابین کردنی بژێوی رۆژانەی خۆیان ئەمەش باشترە لەوەی سواڵ بکات یان خەڵک خێری پێ بکات، چۆن بەراورد لە نێوان ئەو دوو حاڵەتە دەکەیت؟!**

**دڵشاد عومەر کاکی:** مرۆڤی ئازاو بەتوانا هەر داهێنانێک کاتێکی لە ماندووبوونی خۆی بۆ تەرخان کردووە، بیکا بە دەستمایەو بە جۆرێک لەنانی رۆژانەی ئەوە باشترە، چونکە من دەبینم لە ئەوروپا کەس دەست پان ناکاتەوە بۆ پاروویەک نان، تەنیا ئەوانە نەبێ کە بە هۆی موخەدەراتەوە لاواز بوون و لە سوچێکدا داوای نانێک دەکەن، کەسانی هونەرمەند هونەرەکەیان پێشکەش بەخەڵک دەکەن بێ چاوەڕوانی پاداشت، بەڵام خەڵکی هونەرپەروەر بێ دڵیان ناکەن و هاوکارییان دەکەن، وڵاتی ئێمە نەگەیشتوونەتە ئەو رادەیەی بەو شێوەیە خەڵکی هونەر و ئەدەبی خۆش بوویت کە یارمەتی هونەرمەندو ئەدیب بدات، ئەو کارەی حزبەکان دەیکەن کارێکی زۆر پیرۆزە گەر بتوانن بەشێکی زۆر لە یارمەتی تەرخان بکەن بۆ کەسانی هونەرمەندو ئەدیب، گوناحە نووسەری کورد زەبوون بن، یان بەلادا بێن و سیمای کۆمەڵایەتی خۆیان ون بکەن، گوناحە نووسەری کورد بچووک بێتەوە، نووسەری کورد ئەو مرۆڤەیە کە لە قۆناغەکانی خەباتدا لە ژێر زوڵم و ستەمی رژێمدا خۆڕاگر بووە، ئەگەر هیچیان نەکردبێت خراپ نەبوون و کەسانێ نەبوون سەوداسەری بکەن بەسەر ئەدەبی کوردییەوە، یان ئەدەب و هونەری کوردی بفرۆشن، ئەو حزبەش زۆرتر شارستانییە کەباڵ و باوەش بۆ هەموو نووسەریکی کورد بکاتەوە بەبێ جیاوازی بیروباوەڕ، گەورەیی دیموکراتییەت و سنگ فرەوانی و هەناسەی ئەو حزبانە لەوەدایە کە بتوانن کەش و هەوایەکی خۆش بۆ نووسەران ساز بکەن و رێز بۆ وتەی نووسەر دابنێن ، نوسەران بەپێی خواستی کەسانی تر نەخرێنە ژێر کێشمەکێشی حزبایەتی، هەر نووسەرێ سەربەستە لەوەی خزمەت بە بیروباوەڕ و سیاسەتێکی خاوێن بکات...

**رامان: رات چییە بەرامبەر ئەم نووسەرانە؟**

- **مەحموود زامدار:**

* **دلشاد عومەر کاکی:** ئەگەر خەلکێک مێشکی پڕە لەوشە، دڵی پڕە لە سۆزو وشە، مەحمود زامدار کابرایەکە ورگیشی پڕە لە وشە...

- **شێرزاد حەسەن:**

* لەدوا بەرهەمی - حەسار-دا، توانیویەتی وەک پەیژەیەک بۆ ڕابووردووی چیرۆکەکانی پلەیەکی بەرزتر بێ لەوان، لە حەسارردا حەسمی زۆر شت کراوە، سیحرێکی تازەی لە ڕۆمانی کوردیدا هێناوەتە ئاراوە.

- **ئازاد عەبدولواحید:**

* تا ئێستە بەردەوام شتی ئازاد دەخوێنمەوە، ئەو پێناسەیەی کە لای من هەیە، ئازاد ڕۆشنبیرێکی گەورەی کوردە، وە ڕەخنەنووسێکی بە ئەمانەتە، ئازاد دوور لە شێوازی هەموو ڕەخنەگران ڕەخنە دەنووسێت، یەک تایبەتمەندی تری لایە، سەردەمانێک عادزیەک لە نێوانماندا بوو، کەچی لەو کاتەشدا بایەخی بە چەند شیعرێکم دابوو، وەک ڕەخنەنووسێکی بە ئەمانەت و بە ئەمەک چەند شتێکی لەسەر نوسیبوون، لە کۆڕێکدا بە ئینصافانەوە، بە جوانی و بە سەلیقەیی ڕەخنەکانی دەربڕیبوو، لە بەر ئەوە بەیەکێ لە نووسەرە هاوچەرخەکانی کوردی دادەنێم..

- **ئەحمەد سالار:**

* هەر چۆنێ ئاورێ بۆ شانۆ بدەیتەوە، ئەحمەد سالار هەیە، هەر لاپەڕەیەک هەڵدەیتەوە وێنەی ئەو هەیە، مەرجەع و کتێبێکی گەورەیە لە هونەری کوردیدا..

- **حەمە عومەر عوسمان:**

* شاعیرێکی دەگمەنە لە شیعری کورتتدا، بە شێوازی خۆی توانیویەتی بە هەناسەیەکی قووڵەوە شیعر بنووسێ، حەمەو شیعر دوو برادەری یەکن..

- **بەرزان هەستیار:*** وەک خۆی ناسکە لەگەڵ شیعردا.

- **ئەنوەر مەسیفی:**

* هەندێ جار دزیم لە ئەنوەر مەسیفی کردووە، هەندێ دێری خۆم لە سەروسیمای بە گوزارشتی شیعرەکانی ئەنوەردا دەبینمەوە.

**سازدانی گفتوگۆ:**
**عەبدولڕەحمان کاکل**

محەمەد عومەر عوسمان

# شاعیری پایزو گەڵاریزان نازانێ لەمەولا شیعری رەش یان سپی بنووسێ؟

**محەمەد عومەر عوسمان یەکێکە لەوشاعیرە لاوانەی لە سالانی هەشتاوە ئامادەبوونی خۆی لەسەر گۆرەپانی شیعری کوردیدا سەلماندووە، بە تایبەتیش دووای دەرچوونی کۆمەڵە شیعرەکەی (لە غوربەتا). سەبارەت بە تێروانینی بەرامبەر بە شیعر و بارودۆخی ئەمرۆی شیعری کوردی و پرۆژەکانی، (رامان) ئەم دیمانەیەی لەگەڵ ساز کرد.**

*** چۆن خۆت لەناو دنیای شیعر دۆزییەوە؟**

سەرەتا وێنەم دەکێشا.. دوواتر چیرۆکم دەنووسی.. ئەوجا بە تەواوەتی خووم دایە شیعر.. شیعر بەو پەری شەیدابوونەوە پەلکێشی کردم بۆ لای خۆی، هەروەک ئەوەی شیعر نووسین (**نوێژ**) بێت و شاعیریش کەسێکی بالاتر لە کەسانی ئاسایی کە هەروایشە.. ناشزانم وەسفی شیعر بکەم ئاخۆ شیعر نووسین ئیلهامەو دادەبەزێ بۆ شاعیر وەک ئەڵێن یان ئیلهام نییەو دەبێ تۆ سەرکەوی بۆ لای وەک «**کۆڵن ولسن**» دەڵێ یان ئەو بێدەنگییە کە بەقسەی دێنین وەک **پۆل ڤالیری** دەڵێ. یان هەر هەموویانە پێکەوە... هێندە دەزانم شیعر چاوی سێیەمم بوو ئێستەش هەر ئەو چاوەیە بۆ بینین و تێرامان لە هەموو ئەو دیاردانەی کەسانی ئاسایی نایبینن.. گەر بیشی بینن دڵ و دەروونیان جۆش نادا... خەڵکی سادە تەنیا ئەو زامانە دەبینن کە خوێنیان لەبەر دەڕوا، بەڵام من ئەو زام و برینانە دەبینم بە بێ ئەوەی خوێنیان لێ بێت هەست دەکەم وەک دەریا قووڵن و وەک تاڤگە خوێنیان لەبەر دەڕوا.. لە راستیدا سەرەتا وامدەزانی شیعر ژیانێکی هێمن و پر لە ئاسوودەییم بۆ دابین ئەکا... درەنگتر زانیم شاعیریەتی جەنگێکی بەردەوامە... هەمیشە شاعیر لەسەر شکاندنی گوڵێک لەگەڵ رەشەبادا بەشەڕ دێت و ئێستاش نازانم شیعر دێت بۆ لام یان من دەچم بۆ لای، یان لەیەک جیا نابینەوە.

*** تۆ لەچاو ئەزموونی شیعریت بەرهەمت کەمە هۆکەی چۆن لێک دەدەیتەوە؟**
- کەمی بەرهەم چەند هۆکارێکی هەیە لەوانە ئەو جیهان بینییەی بۆ شیعر هەمە کە شیعر دەبێت بەو شێوەیە بێت، یان «**هیوم**» ئاسا نووسینی کۆپلەیەک شیعرم پێ باشتر بێ لە دەیان شیعری ئاسایی کە ئەمە لایەنی تەکنیک و دارشتنی وێنەو چەندین لایەنی تر دەگرێتەوە، یان «**کیتس**» ئاسا لە هەوڵی گەیشتن بە «**موستەحیل**» دابم هەروەک چۆن ئەو دەیویست ناوی خۆی لەسەر ئاو بنووسێ، لەلایەکی تریشەوە دوورکەوتنەوە لە زۆری و بۆری.
*** تا چ رادەیەک رات لە جیلی شیعری خۆتە، ئایا پێت وایە بەپێی پێویست لە سەردەمەکە هاتبنە پێشەوە؟**
- **ژ دانۆفیەت و باوک سالاری** لە ئەدەبدا غەدرێکی زۆری لە جیلی شیعری ئێمە کردووە.. بەتایبەتی ئەوانەی شیعر وەک لافیتەیەکی سیاسی سەیر دەکەن و رۆشنبیری و تێروانینیان بۆ شیعر سنووردارە. جیلی شیعری من گەلێ شاعیری بەهرەدارو مژدە بەخشی گرتۆتە خۆی .. تا رادەیەکی باش لە سەردەمەکە هاتوونە پێشەوەو بۆ کەسێک مەبەستی لێکۆڵینەوە بێت لە شیعری نوێ بە هیچ جۆرێ ناتوانی هەندێ ناو - و دەنگ و رەنگی ئەم جیلە فەرامۆش کات.
*** لەگەڵ وەچەی پێش خۆتان لەچی یەکناگرنەوەو؟ لەچیدا یەکدەگرنەوە؟**
- لەگەڵ وەچەی پێش خۆمان لەوەدا یەک ناگرینەوە کە هەندێکیان شیعر وەک لافیتەیەکی سیاسی دەبینن و دەیانەوێ شیعر چارەسەری هەموو کێشەکان بکاو وەڵامی هەموو پرسیارەکان بداتەوەو بەناوی شیعری مولتەزیمەوە شیعر بکەنە پاشکۆی سیاسەت و چەند لایەنێکی تریش بەڵام لەگەڵ هەموو شیعرە جوانەکاندا یەک دەگرینەوە هەموو ئەو شیعرانەی لە دوێنێ و ئێستە و داهاتووشدا هەر شیعرن.
*** رەخنە تا چ رادەیەک بەسەری کردوونەتەوەو مافی ئێوەی داوە؟ ئایا جیلی شیعری ئێوە لە بارەی رەخنەوە تاکوێ بەسەرکراوەتەوە؟**
- هیچ دیوانێکی شیعر بەقەدەر «**لە غوربەتا**» رەخنەو خوێندنەوەی رەخنەیی بەسەری نەکردۆتەوە، هەر لە سەرەتاوە لەسەر ئاستی بڵاوکردنەوە بە پلەی یەکەم رەخنەگری بەتوانا «**ئازاد عەبدولواحید**» کەم و زۆر لە نزیک کردنەوەی شیعرەکان لە خوێنەر رۆڵێکی باش و بەرچاوی بینیوە دواتریش کۆڕە ئەدەبیەکان و نووسینەکانی مەریوان وریا قانع و ئازاد حەمەو یووسف حەیدەری و چەندانی تر هاوکات زۆر لەوانەی خوێندنەوەیان بۆ شیعر سەقەتەو لە وەڵامی بەشی پرسیارێکی ترا ئیشارەتم بۆ کرد منیان بەرەشبین و گۆشەگیر داوەتە قەڵەم کە وانییەو دیارە شیعر دەبێ هەروەک شیعر بخوێنرێتەوە و رەشبینی و گەشبینی زیاتر زمانی سیاسەتەو نابێ رووبەرووی شیعر و ئەدەب و هونەر بکرێتەوە.. دەبێ بزانین شیعر چۆن دەخوێنرێتەوە بتوانین بگەینە ئەو ئەنجام و مەبەستانەی لە پشت شتەکانەوەن بۆ نموونە وشەی «**شەراب**» لە شیعری خەیام دا مانای ئەوە نییە کە خەیام شەو و رۆژ لە مەیخانە کەوتووە... وەکو «هەژاری موکریانی» شاعیر دەڵێ

گەر بەو چاوە سەیری شیعری خەیام بکرێ بەو پێیە دەبێ خەیام هەموو دەم سەرخۆش بووبێ و لەسەبەتەدا بردبێتیانە ماڵەوە، لە کاتێکدا خەیام وێڕای شاعیریی زانای فەلەک و زانای ماتماتیک بووە، هەروەها راوێژکار و یاوەری پاشای سەردەمی خۆی بووەو خاوەنی مەنهەجی (**شک**)ە پێش (**دیکارت**) ی فەیلەسوف... من لە جیلی خۆما لە هەموویان زیاتر رەخنە بەسەری کردومەتەوە... کە ئەمەش مانای ئەوە نییە ئەو رەخنانە هەمووی لەبەرژەوەندی من بووە.

بۆ بەشی دووەمی پرسیارەکەت پرسیارێک دێتە پێشەوە ئایا دەقی شیعری چاک ئامادەیی هەبووەو رەخنە ئامادەیی نەبووە یان رەخنەگری چاکمان هەبووەو شیعری چاک ئامادەیی نەبووە بەهەر حاڵ چەند رەخنەگرێکی هوشیارو بەتوانای لێ دەرچێ لەلایەن هەندێ لەوانەی ترەوە هەرچەند بەرەخنەگر ناسراون رەخنەکانیان لە پەندو ئامۆژگاری دەچێ هەر لەو قالبەدا خولاوەتەوە! (**رەشبینی، گەشبینی، شێوە، ناوەڕۆک**) کە لە جێی خۆیا بەکاری ناهێنن و بۆتە شێرپەنجەی رەخنەی کوردی.

*** لە دیوانی یەکەمتدا هەندێ خاسیەتی پێشووی داهێنانی خۆت دەستنیشان کرا لە نووسینی رەخنەییدا پەنجەی بۆ راکێشرا، ئایا لە پڕۆژەی داهاتووتدا چ خاسیەتێکی داهێنەرانە لەناو پڕۆژەکەدا بەدی دەکرێ؟**

ـ تاکە پڕۆژەیەکی ئێستەم ئامادەکردنەوەی (**لەغوربەتا**)یە لەگەڵ شانزە شیعری تر بۆ چاپی دووەم ئەو شیعرانەی تریش بە پێی ساڵی نووسینیان ریزم کردوون و هەمان جیهانبینییەکەی (**لەغوربەتا**)یە، بۆ پڕۆژەی تری داهاتوو جارێ هیچ پڕۆژەیەکم نییە میزاجی رەنگم تێک چووە نازانم چۆن باسی دەلالاتی رەنگەکان بکەم... لەوانەشە پڕۆژەی داهاتووم شیعرێکی بێ رەنگ بێت یان شیعرێکی جەنگی رەنگەکان بێت

**سازدانی گفتوگۆ:**
**ئازاد عەبدولواحید**

**عەلی مەندەلاوی:**

# پێویستە هونەرمەندی کورد لە ئەوروپا تایبەتمەندیی میللەتی خۆی بپارێزێ

***پێ لێ هەڵبڕین نییە ئەگەر بڵێین هونەرمەند (عەلی مەندەلاوی) نەک هەر هونەرمەندێکی ناسراوە لەسەر ئاستی کوردستان و عێراق و وڵاتانی عەرەب، بەڵکو هونەرمەندێکی ناسراوە لەسەر ئاستی جیهانیشدا، جێ دەستی ئەو هونەرمەندە بەسەر هونەری کاریکاتێرو هونەری پاک و بێگەردی منداڵانەوە دیارە، لەسەردانێکیدا بۆ گۆڤاری (رامان) بە هەلمان زانی ئەم دیانەیەی لەگەڵدا ساز بدەین،***

**رامان: سەرەتا هەر دەبێ بەو پرسیارە دەست پێبکەین کە چۆن خۆتان لەناو هونەر دۆزییەوە؟**

**عەلی مەندەلاوی:** لە سەرەتاوە جیهانی منداڵان بواری کارەکانم بوو، بیرکردنەوەم لەو جیهانەدا تەشەنەی دەسەند، هۆکارەکە ئەوە بوو هۆگری گۆڤارو رۆژنامەکانی منداڵان بووم، ئەو لایەنەم خۆش ویست چونکە خاوێنی تیا بەدی دەکرا، کەس نییە نکۆڵی لە خاوێنی جیهانی منداڵان بکا، لەو ماوەیەشدا کە هۆگری ئەو جیهانە بێگەردە بووم لە بەغدا دادەنیشتم.

**رامان: ئەو ماوەیەی لە بەغدا بوویت، گۆڤارەکانی ئەو کاتەی منداڵان چی بوون کە سەرنجیان راکێشایت..؟**

**عەلی مەندەلاوی:** ئەوانەی لە بەغدا هەبوون و دەست دەکەوتن: (سۆپەرمان و ئەبطال و تەنویر و میکی) ئەمانە لە بازاڕەکاندا هەبوون.

**رامان: ئەوکاتە تەمەنت چەند بوو کە خەریکی خوێندنەوەو دەورکردنەوەی ئەم گۆڤارانە بووی؟**

**عەلی مەندەلاوی:** لە سەرەتایی بووم و تەمەنم دوانزە ساڵان بوو، بەڵام کاتێ گەیشتمە ناوەندی گۆڤاری تایبەت بەخۆم هەبوو کە خۆم بەناوی (عەبووسی) دەرم دەکرد

**رامان: لەو سەرەتایەدا لاسایی ئەو گۆڤارانەت دەکردەوە کە پێشتر باست**

کردن..؟

**عەلی مەندەلاوی:** لە سەرەتادا لاساییم دەکردنەوە، دوایی کەسایەتیی تایبەت بە خەیاڵی خۆم وێنە دەکێشا، لە پۆلی یەکی ناوەندییەوە لە خولێکی «مۆزەخانەی

مەحموود زامدار- عەلی مەندەلاوی- ئازاد عەبدولواحید

نیشتمانی» بەشداریم کرد، هەروەها لە خولێکی هاوینەیی مۆزەخانەی کەلەپووری میللیدا بەشدار بووم ئەو خووله خولێکی رۆشنبیریی بوو، کارێکی سۆمەری کۆنم لەسەر بۆرەک ئەنجامداو تیایدا، گەشتیارێک هات و بەهۆڵەکەدا سوڕایەوە کە بەرهەمەکەمی بینی داوای کڕینی کرد، ئەمە یەکەم بەرهەمم بوو کە بەتەمەنی (١٣) ساڵی فرۆشتم..

**رامان: تاکەی لەسەر شێوازی لاسایی کردنەوەی گۆڤارەکان بەردەوام بوویت؟!**

**عەلی مەندەلاوی:** زۆری نەبرد وازم لەلاساییکردنەوە هێنا، وەک وتم تەمەنم (١٣) ساڵان بوو، گۆڤارێکی تایبەت بە خۆمم بە ناوی (عەبووسی) دامەزراند، لەوەدا لاسایی کەسم نەکردەوە، بەڵکو چیرۆکی میللی کوردی بوونە کەرەسەی وێنەکانم، چونکە ئەو زانیاری و گەنجینەیەی لە هەقایەتی میللی هەمبوو، ئەو هەقایەتانەی کە

## هونەری منداڵانم خۆش ویست چونکە جیهانێکی پاک و بێگەردبوو

دایک و کەس و کارم بۆیان دەگێڕامەوە، دەمبیستن و بە چیرۆکێ یان سیناریۆیەک وێنەم دەکێشان، تەنانەت (عەبووسی) کە پاڵەوانی سەرەکی سەر بەرگ بوو، لە هەقایەتێکی میللی کوردی وەرم گرتبوو.. کە لە شێوەزاری ـ لووڕی ـ ییەوە وەرمگرت و بەزمانی عەرەبی سیناریۆکەم بۆ داڕشت.

**رامان: لەلایەنی ناوەرۆکەوە قازانجت لە هەقایەتی میللی کوردی کردو رەنگەکانیشت هەر رەنگی کەلەپووریی کوردەوارییەو لە رەنگی گەرمی سەرنەخشی بەرەو جاجمی کوردییەوە نزیکە؟**

**عەلی مەندەلاوی:** رەنگەکانم کەلەپووری نییە، چونکە کوردستان تا ئێستەش لە قۆناغی کەلەپووری دایەو بریتییە لە گوندێک..

**رامان: بەزاراوەی هونەریی پێیان دەوترێ رەنگە کەلەپوورییەکان**

**عەلی مەندەلاوی:** خۆی کوردستان سروشتێکی رەنگینی هەیە، تەنانەت لە رەنگی جلوبەرگە کوردییەکاندا ئەو سروشتە رەنگینە هەیە.. ئەوەش کاریگەری

هەبووە لەسەر کارە هونەرییەکانم..

**رامان: تۆ هەر لە بەغدا ژیاوی، یا باکگراوەندی ترت هەیە، منداڵی تۆ لە کوێی تر بووە؟**

**عەلی مەندەلاوی:** تا تەمەنی (٨ ـ ٩) ساڵی لە گوندی (مەندەلی) بووم..

**رامان: مێژوو نووسەکان وای بۆ دەچن کە بەر لە «٣٠» هەزار ساڵ لە شاخەکانی (کامبێردجی) فەرەنسی و لەسەر تاشە بەردەکان، هەروەها لە ئیغریق و نووسینەکانیش بەر لە سێ هەزار ساڵ وێنەی سەیر سەیری کاریکاتێرییان کردووە، بۆ ئەمە دەبێ لە کوردستان شتی وا هەبێ و هونەرمەندی کاریکاتێر لە شاخەکانی کوردستان سوودی لێ وەرگرێ..؟**

**عەلی مەندەلاوی:** ئەو وێنانەی کە باسی دەکەیت پێوەندی بە بەردو شاخەوە نییە، هەر لە ئەشکەوتەکاندا لەلایەن مرۆڤی کۆنەوە دروست کراون، کاتێ دەچوون بۆ راو ئەو وێنانەیان دروست دەکرد، وێنەی کەرەسەکانی راوو ئاژەڵ و ئەوانە بوو، یان تیر و رم و ئەم جۆرە کەرەستانە ئامانجەکەی رزگار بوون بوو..

# لەکاری هونەریمدا بۆ منداڵان چیرۆکی میللی کوردی بوونە کەرەستەی وێنەکانم

**رامان: مۆرکی ـ کاریکاتێری پێوە نییە..؟!**

**عەلی مەندەلاوی:** لەوانەیە بەبێ ئاگایی تێیدا هەبێ.

**رامان: مەبەست لەوەیە بڵێین کاریکاتێر زۆر کۆنە؟**

**عەلی مەندەلاوی:** شت هەیە پێوەندی بە کاریکاتێرەوە هەیە، ئەوەی پەیکەرێک دەبینێ کە خواوەندی پیاوە، یان خنواوەندی ژن، یان خواوەندی دایکە، کە لە مۆزەخانەکانی ئێستەدا هەن پێش سۆمەرییەکان، ئەوانە هی شارستانییەتی دایک بوون، لەو پەیکەری دایکە کە دەبینین جۆرە کاریکاتێرێکی تێدابوو، مەبەست نییە ئەوە کاریکاتێر بووە، بەڵام کە ئەوەیان کرد مەبەستیان بە پیت و بەرەکەتی بوو، پیت و بەرەکەتی زیاتر لە مەمک و رەحم و لەدایک بوون خۆی دەنوێنێ، بۆیە ئەو شوێنانەیان گەورە دەکرد دوای ئەوە خوداوەندەکە بوو بە پیاو بۆ نموونە لە داستانەکەی گلگامێش یەکەم رستە دەڵێ «هو الذي رأى كل شي» چونکە چاو زیاتر هەموو شتێ دەبینێ، هەموو شتێ بە هۆی چاوەوە دەبینرێ، لەبەر ئەوە موبالەغەیەکی کاریکاتێری تێدایە.. من شتی وام لە گۆڤارو نووسراوی کۆنی کوردیدا نەدیوە.

**رامان: کتێبێ بەناوی ـ مێژووی مۆسیقای کوردی ـ دەرچووە کە نووسەرەکەی ـ حەمەی حەمە باقییە ـ زیاتر باس لە لوڕستان و لای کرمانشا دەکات، یەک دنیا بنەمای هونەری پەیکەرتاشینی زۆر چاک و جوانی تێدایەو ئەوانەی پێوەندیی بە مۆسیقاوە بووە وەریگرتوون.**

**عەلی مەندەلاوی:** ئەوەندە زانیاریم لەسەر مێژووی کۆنی کوردستان نییە، بەڵام دیارە مێژوویەکی زۆر دەوڵەمەندە...

**رامان: وەک دەزانی ئەم وشەی کاریکاتێرە ـ وشەیەکی ئیتاڵییە ـ وەک زانراوە ماناکەی ئەوەیە تۆ وێنەیەکی سەیرو ناشیرین بەدەردەخەی، یان ئەو کەلێنانەی کە لە لەشدا هەیە زیاتر دەتەوێ لە رێگەی رەخنە و لاقرتێ بەدەری بخەی ئایا ئەمە راستە؟!**

**عەلی مەندەلاوی:** بەشێوەی گشتی ئەمە راستە، بەڵام توانای هەیە بە شێوەیەکی تر خزمەتی پێ بکەی، من ئامانجم ئەوە نەبوو بۆ پێکەنین و لاقرتێ بێ، کاتێ وێنەی کۆمەڵێ کەسایەتیم کێشا، زیاتر رێزو بایەخم پێدان، بەڵام ئەوانەی کە دەیانبینی هەستیان نەکرد کە ئەوە کاریکاتێرەو هونەرە هەمان شت بۆ (گۆران) زیاتر وەک ئەوە نەمدیوە خەڵکی بهێنێتە پێکەنین، هەروەها هەموو کاریکاتێرەکانی تریش..

**رامان: (داڤید لی) هونەرمەند دەڵێ چاوی کاریکاتێریست ئەو دەزانێ چۆن مامەڵە لەگەڵ کەسایەتی بکات. هەڵبژاردنی (سەیاب) یان (گۆران) بۆ خۆشەویستی و رێزە، خۆت دەتەوێ ئەمە بەدەرخەی...**

**عەلی مەندەلاوی:** هەڵبژاردنی ئەو پرۆژەیە هەمووی بنەرەتی رێز بووە، بناغەی سەرسامی خۆم بووە بەو کەسێتییانە، لەبەرئەوە زیاتر بە شێوەیەکی روون خەڵک ئەوە دەبینێ، لایەنی پێکەنینیش لە کاریکاتێردا هەیە، بەڵام ئەوانەی هەڵمبژاردوون، بە هەڵبژاردنی خۆم بوون، بەمەبەستی گاڵتەولاقرتێ نەبووە.

**رامان: مانای ئەگەر (عەلی مەندەلاوی) بخرێتە بەر تاقیکردنەوەو ئەزموونێک ئەگەر مۆسۆلۆنیی و جەنگیزخان و هیتلەر بتەوێ مۆرک و سیمای کاریکاتێری پێ بدەی، لایەنی گاڵتەو لاقرتێیان پێ دەدەی.؟**

**عەلی مەندەلاوی:** بەڵێ چونکە ئەوانە دژی مرۆڤن، بەڵام من زیاتر حەزم لە دۆزینەوەی کەسایەتی ئیجابییە لە مێژوودا، کەسایەتی سلبی دیارەو ناسراون بۆ هەموو خەڵک، کاریکاتێر وەک بڵندگۆیەکی گەورەیەو ئەو کەسایەتییە گەورە دەکەیتەوە، ئەو وردەکاری و تەفاسیلەی دیار نین بە شێوەیەکی ئاسان گوزاریشتی لێ دەکەی.

**رامان: پێوەندی لە نێوان هونەری منداڵ و کاریکاتێر هەیە، ئەو پێوەندییە چۆن لە ئیشەکانتدا رەنگ دەداتەوە؟**

**عەلی مەندەلاوی:** لە وێنەی منداڵاندا زۆر نییە لەو رەنگاو رەنگییەی ئەوسا رزگارم بووە، لەوڵاتە عەرەبییەکاندا رەنگی گەرم و رەنگاو رەنگ نییە، زیاتر لە کوردستان رەنگی گەرم هەیەو هەر بۆ خۆی سروشتەکەی وایە، منداڵیش زیاتر حەزی لە رەنگی جوان و قرمزی و زەردو سوورە، رەنگی مردوو منداڵ حەزی لی ناکات، کە ئیشی کاریکاتێرم کرد ئەو کاریگەریی رەنگە بەسەریانەوە هەبوو، ئەوەش پێوەندی

به چاوەوەیە، بەلام وردە وردە کەسایەتی کاریکاتێر لەو کاریگەرە دوور کەوتەوە، چونکە کاریکاتێر تایبەتمەندی خۆی هەیە ناتوانێ تایبەتمەندی ئەم بدەی بەو..

**رامان: ئیشی منداڵان زیاتر فەنتازیای ئەفسانەیی تێدایە، بەو فەنتازیایەوە مامەڵە لەگەڵ ئیشی منداڵان دەکرێت، ئەو ئەفسانانە زیاتر نزیکن لە رەسەنایەتی کورد ئەو حاڵەتە، حاڵەتی سوود وەرگرتن لە رەسەنایەتی ئەفسانە دەبێ لەگەڵ خەیاڵی منداڵ بگونجێ.**

**عەلی مەندەلاوی:** لەوکاتەدا - سۆپەرمان - و ئەوانەم خوێندەوە، لەهەقایەتی کوردیی خۆماندا ئەو جۆرە هێزو خۆ بە بەرزگرتنە هەیە، ئەگەر ئەوە لەبەرامبەر سروشت و دێوو درنج و ئەوانە نەبێ خۆی رانەدەگرت، ئەوکاتە سۆپەرمان زۆر بوون، بەلام سۆپەرمانی نوێ یان تەڕەزان، بە شێوازێکی نوێ کردیانە خۆراکی خەیاڵی منداڵان، منیش ئەوەم زانیوە، سۆپەرمانەکانی لای خۆمان هەوڵیان دەدا وەلامی پرسیاری زۆر بدەنەوە، کە ئەو پرسیارانە وەلامی زۆرە بۆ منالان، بۆ نموونە بەمناڵی من چیرۆکێکم دەبیست بەناوی - چەرخ و فەلەک - کە فرۆکە بوو، ئەوەیان

# من بۆ پێکەنین ولاقرتێ وێنەی کەسایەتییە رۆشنبیرییەکانم نەکێشاوە بگرە بۆ رێز لێنانە

کردووە بە سیناریۆو سیمایەکی ئەفسانەیی تێدابوو بۆ منالْ بۆ ئەوەی متمانە دروست بکەیت و بۆخۆتیش قەناعەتت هەبێ بە مێژووی خۆت، لەو رێگەیەوە زیاتر منالْ نزیکە لە جیهان و لە تایبەتمەندی خۆی، دوای ئەوە رێگەی ئەو کارە رێگەی خۆرهەلاتییە، خۆر ئاواییەکان زیاتر لە دروست کردنی سۆپەرمانەوە تا دوایی تەکنیکی بوون، ئێمە کە ئیشمان دەکرد هەر لەقتەیەک بەجیا و بەش بەش رەنگمان دەکرد، هەر لەقتەی وەک تابلۆیەک بەلام ئەوانەی خۆرئاوا بە چاپخانە رەنگیان دەکردن، ئەوانەی ئێمە خۆرهەلاتین، چیکییەکانیش تایبەتمەندی خۆیان هەیە..

**رامان: کەواتە عەلی مەندەلاوی لەبواری کاریکاتێر بە چ هونەرمەندێکی جیهانی کاریگەر بووە..؟**

**عەلی مەندەلاوی:** ناوم لەبیر نییە، بەلام وێنەکێشێکی ئینگلیزی هەیە کە وێنەکانی فلیمی (دیوار)ی کێشاوە زۆر پێی سەرسام بووم، ئەو فلیمە لە هەشتاکاندا بوو «تەنانەت منیش تابلۆیەکم دروست کردو ناوم نا (دیوار)».

**رامان: ئیشت زۆر کردووە بە تایبەت لە بواری کاریکاتێردا، بەلام رووبەرێکی زۆرت بۆ خەڵکی تەرخان کردووە، لە ئیشە کاریکاتێرییەکانت تەماشا دەکەی لە (بەدر شاکر سەیاب) تا یووسف نمر ذیاب وحاتەم صەگرو تا شاکیر حەسەن ئال سەعید و مەدەنی سالْح زۆرکەم لات لە کەسایەتییە ناودارەکانی کورد کردووەتەوە،**

**بەتایبەتی لەبواری رۆشنبیریدا..؟**

**عەلی مەندەلاوی:** وێنەی گۆران و کەمال مەزهەر و چەند کەسێکم لەناو کوردەکان کردووە بەکاریکاتێر، جارێکیان چووم بۆ سلێمانی بەدوای

عەلی مەندەلاوی- نەسیر شەمە- عەواد ناسری شاعیر

چەند وێنەیەکی گۆران، داخەکەم لەلای کورەکەیشی دەستم نەکەوت، تا لە دواییدا لەلای مامۆستا محەمەد مەلا عەبدولکەریم چەند نموونەیەکم دەست کەوت.

**رامان: مەبەستمان ئەوەیە تۆ زیاتر لە خەڵکی تر جێی گلەییت، خەڵک وەک هونەرمەندێکی کورد دەتناسن، چاوەڕێی ئەوەت لێ دەکەن بۆ هونەر دۆستانی کورد خۆت تەرخان بکەیت، ئایا ئێستە بیرت لەوە نەکردۆتەوە ئەو کەموکورییەت قەرەبوو بدەیتەوە...؟**

**عەلی مەندەلاوی:** لەگەڵ (شێرکۆ بێکەس) پرۆژەیەکم بەدستەوەیە، دەمەوێ پێشانگەیەک لەسەر شیعرەکانی بکەمەوە نامەی بۆ نووسیم و وتی ئەمە وەک بیسمیللایەو هیوای خواست دەست بە ئیشی کوردی بکەم.

**رامان: (داڤیدلی) کاریکاتێرست مرۆڤ دەکاتە سێ بەش (بەراز ـ ئەسپ ـ سەگ) کاتێ تۆ وێنەی فیلێک بەکاریکاتێر دەکێشی کە لە گرووپی بەرازە، بەڵام لموزی هەیە، تۆ چۆن رای (داڤیدلی) لێک دەدەیتەوە.**

**عەلی مەندەلاوی:** تا ئێستە بیرم لە پێوەندی مرۆڤ بە ئاژەڵەوە نەکردۆتەوە، بەڵکو مرۆڤ هەر بە شێوەی خۆی وێنەی دەکێشم، ئەوە ئەزموونی داروینییەکانەو ئەو ئەزموونە هەیە کە فەرەنسییەکان دەیانکرد، منیش بەناوی (الحیوانات التي تحکمنا) وەک پرۆژەی کتێبێک کاری وام ئەنجام داو لەو ئیشانەدا هەر سەرکردەیەک نزیکە لە چ ئاژەڵێ یەکێکم کرد بە کەڵەشێر، یەکێ بوو بە بەراز لە فەرەنسا زۆری لێ هەڵبژێران.

**رامان: (مارتن لۆثەر) کە ناوت بیستووە یەکەم کەس بووە بەکاریکاتێر گاڵتەی بە کلێسا کردووەو تەنزی بەقەشەو راهیبەکان کردووە، دەشڵێن ئەگەر کاریکاتێر نەبوایە بزووتنەوەی (مارتن لۆثەر) سەری نەدەگرت، ئایا کاریکاتێر هێندە کاریگەرە تا کار لە بزاڤەکانی شۆڕشگێڕیی و نیشتمانی بکا..؟**

**عەلی مەندەلاوی:** کاریگەری کاریکاتێر زۆرە لەچاو هونەرەکانی تر، چونکە گەیشتنە بە قووڵایی قووڵی شتەکان، هونەرێ نییە وەک کاریکاتێر بگاتە ئەو قووڵاییە وەک چۆن تەلسکۆب میکرۆبات گەورە دەکا، کاریکاتێریش ئاوا دەتوانێ رووداوو حاڵەتی ناوەکی بە هەمان ئاست گەورە بکاتەوە کە تەلسکۆب دەیکا..

**رامان: وەک هونەرمەندێ لەکام پێشەنگای خۆتدا هەستت کرد ئەو حاڵەتەت**

گەورە کردۆتەوە؟!

**عـــەلی مـــەندەلاوی:** ئەو پێــشــەنگایەی وێنەی کەسایەتیەکانم کێشابوو کە فارووق یووسف رەخنەی لەسـەر نووسی، لەو کـارانەدا من لە رووخسـارەکـانی ناوەوەیانم روانیبوو: لەوانە شاکر حەسەن ئال سەعید و سەیاب و یووسف نمر ذیاب ـ م تێدا وێنە کێشا، لەو کـارانەدا سەرسام بووم لەوەی رەخنەگرەکـان لەسـەریان نووسی و باسیان کرد، ئەوە لە سالی ١٩٨٦ بوو، بەلام من لە (١٩٨٣)وە لە رێگەی گـۆڤـاری (الف باء)ەوە وێنەی بەدر شاکر سەیابم کێشا، لەوەوە بیرۆکەکە لە دایک بوو، دوای ئەوە بە تەلەفۆنات و بەنامە خەلکانێکی زۆر سەرسامی خۆیان بەرامبەر ئەو کارە دەربڕی، کەمن چاوەڕێم نەدەکرد، لە کاتێکدا بەرێکەوت بوو ئەم وێنە بچکۆلەیەم کـێشـاو ویسـتم لەو گـۆڤـارەدا بلاوی بکەمەوە، (ئەلف با) ش داوای لێکردمـەوەو دووەم رۆژ وێنەیەکی ترم کـێشـاو وایان پێشنیـار کـردبوو کە گەورەی بکەنەوە، بەهۆی ئەو بایەخە زۆرەی خوێنەر کە بە وێنەکـەی (بەدر شاکـر سەیاب) درا، (مصمم)ەکە گەورەی کرد بەو مەبەستەی کاریگەریی بەهێز بدا بە گۆڤارەکـە ئەگـەر گـەورەی بکاتەوە، بەلام بە بێچەوانەوە وێنەکـەی تێکدا، بۆیە منیش وازم لە گۆڤارەکە هێنا.. وازم لەکارهێنا..

**رامان: بۆ وێنەکردنی هەر یەکێک لەو رەمزە رۆشنبیرییانە تۆ هەموو بەرهەمەکانی دەخوێنیتەوەو دیراسەی کەسێتی دەکەی ئینجا رەسمی دەکەی؟،**

**عەلی مەندەلاوی:** نهێنی سەرکەوتنی کارەکان ئەوەیە، ئەو کەسێتییانە من پێیان سەرسامم، ئەوە بوو بە تەکوینی رۆشنبیری من و خولقاندمی..

**رامان: یووسف نەمر ذیاب چ کاریگەرییەکی لەسەر رۆشنبیریی تۆ هەیە؟!**

**عـەلی مـەندەلاوی:** ئەو ئیشـانەی بەناوی «في دائرة الضـوء» کردم بۆ گـۆڤاری (الـــف بـــاء) ئەوانە هەلبــژاردنی من نەبوون، بەلکو ئەوە وەزیفـە بوو لەلایەن نووسەرانی گۆڤارەوە بۆم دەستنیشـان دەکران.. من ئیشم لەسەر ئەو کەسێتیـیـانە کـرد، بەلام ئەوە خۆش بـوو جارێکیـان (حـەمـیـد سـەعـیـد) شـتـێکی لە رۆژنامـەی (الزوراء) نووسی و وتی شتێکی سەیرو غـەریبـە ئەو نووسەرانە باش دەناسێ؟، (یووسف نەمـر ذیاب) برادەرمـە، بەلام حـەمـیـد سـەعـیـد وتی سـەیرە (عـەلی) ئەو کەسێتییانە ناناسێ و بەو هێزەوە وێنەیان دەکات، ئنجا هۆنەرمەندێ لە رۆژنامەی (فـولکس کـرانت) کـە دووەم رۆژنامــەیە لە هۆلەندە، بانگی کـردم بەناوی ئەو رۆژنامـەیەوە دەعـوەتی کردم و وتی ئەزمـوونێکی وا لە هۆلەندە هەیە نووسـەرێک لەگەل رەسامێکی کاریکاتێریدا هەردووکیان گۆشەیەکی جیگیریان هەیەو ناسراون، ئەوانە رایان وابوو ئیشی من تایبەتمەندی ئەوەیە پێویستی بە نووسەر نییـە، ئەو وێنەکـێش و نووسـەرە لەو رۆژنامـەیەدا بە ئەزمـوونی هەردوولا کـار دەکـەن، بەلام

(عەلی مەندەلاوی) بەتەنیا کارەکانی دەکات..

**رامان: کەواتە عەلی مەندەلاوی چاوو فیکرەیشە؟!**

**عـەلی مـەندەلاوی:** بەڵێ من دیراسەی ئەو کەسێتییە دەکەم و تابلۆکەم دەچێتە ناخی کەسێتییەکەوە و روخسار لە ناوەوە دەکیشێ، مرۆڤ وەک ئاوێنەیە.

**رامـان: لەسەر ئەو جۆرە ئسلوبەی کـاری تۆ مەحمود زامدار و ئازاد عـەبدولواحید چۆن دەبینی؟!**

**عـەلی مـەندەلاوی:** شتێک هەیە سەیرە لای خۆم، مرۆڤ هەیە هەرگیز نایناسم کە وێنەی بۆ دەکەم بەشـێوەیەک، بە مـوبالەغـەیەک لەچاودا بـۆ شێـوەی کە تەواو دەبێ دەڵێن ئەوە فلان نییە بەڵکو ناخەکەیەتی،..

**رامان: بەوچاوە سەیری من بکە، تەشریحم بکە.. تەشریحی کاک ئازاد بکە؟**

**عــەلی مــەندەلاوی:** چۆن خۆراکێ دەکرێتـە مورەبا، ئاوهاش مرۆڤ دەتوانێ لە سیماو شکڵی بڕوانێ .. کاک ئازاد سیفەتی تەئەمولی تێدایە.

## کاریکاتێر وەک بڵندگۆیەک وایە بۆ گەورەکردنی کەسایەتییەکان و لایەنی شاراوە بە دەردەخەن..

کـــاک مـــەحـــمـــوود لە کاریکاتێردا زیاتر لە سروشت دەکـەی، سـیـفـەتی شـاخ و بەردت هەیە..

**رامان: بێینە سەر ئەوەی تۆ وەک هونـەرمـــــەندێکی کاریکاتێریستی سەرکەوتوو، هەلومـــەرجی هونەرمـــەندی سـەرکـەوتـوو لەکـاریکاتێـردا چییـە؟ ئەمـڕۆ زۆر هەن ئیشی کـاریکـاتێـر دەکـەن، بەڵام زۆر دوورن لـە جیـهـانی کـاریکـاتێـر کە زۆرجـار مۆرکی پۆسـتـەر وەردەگرێ، کـاریکـاتێـر لـە رۆژنامـەوانیـدا پێویستەو دەبێ هەبێ، وەک پێویستـە دەیانەوێ بڵێین ئەوە ئێمەش کاریکاتێر بڵاو دەکەینەوە؟**

**عـەلی مـەندەلاوی:** زیاتر لێرە مەوزوعـیـەتە لە کـارەکەدا، هەیە لە هەندەران هیچ خـوێندنی هونەریی نەبووە، بەڵام بە بەهرە بووە بە وێنەکـێـشی کـاریکـاتێـر، بە مـوتـابەعـەی خۆرسـک و بە ئیش و بەمـاندوو بوون پێگەییـووە، هونەرمـەند دەبێ بزانێ چۆن لە هێڵـەکاندا ئیش دەکا، کە لە رەنگ گرنگ ترە بۆ کاریکاتێر، دوای ئەوە رۆشنبیری گشتی پێویستـە، چونکە کـاریکاتێر رەمز زۆر بەکـاردێنێ، هەر لە کۆنەوە وێنەکێشی کاریکاتێر سوود لە رەمز وەردەگرێ، بۆ نموونە (ئەسپی تەروادە) وەک رەمزێکی مێژوویی بۆ زۆر بابەت لە بواری ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی وەرگیراوە، زۆر لە وێنەکێشە کاریکاتێرییەکان ئەو رەمزەی وەردەگرت و دەیکرد بە رێـگەیەک تا فــیـکرەی خـــۆی پێ بگەیەنێ، ئنجــا ئەگــەر کــەسێ مـــێـــژووی لەخوێندبێتەوە چۆن وێنەی کەسێتـیـەکی مێژوویی دەکـات؟ رۆشنبیری گـشـتی گرنگترین بنەمای هونەرمەندی کاریکاتێرە..

**رامان: ئەزموونی رەنگاندنی کاریکاتێر هۆیەکە بۆ گەیشتن بەناخ و قووڵایی؟!**
**عــەلی مــەندەڵاوی:** نا ئەوە هۆکارێکی یارمەتیدەرە، سیفەتی کاریکاتێر (زێدەڕۆیی ـ موبالغە)یە، بتەوێ کەسێکی تووڕە بەکاریکاتێر بکەیت، دەزانیت تووڕەیی دەموچاوی ئەو کەسە سوور هەڵدەگەڕێ، وێنەکێشی کاریکاتێر زیاتر دەموچاوی سوور دەکات، تەنانەت موبالغە لە هێڵەکانی دەکات، چاوی زەق دەکا، دووکەڵ لە لووت و گوێچکەی دێتە دەرەوە، مووی تەپڵی سەری بە پێوە دەوەستێ.
**رامان: کاریکاتێریستی کورد لەبەر ئەوەی لە هونەری هێڵ دەستی کورتە، زۆر وشە بەکاردێنێ، هەمیشە چەند دێرێ لەژێر وێنەیەکی کاریکاتێری دەنووسێ، لە کاتێکدا پێویستە هێڵەکان رێک بخات تا بە هێڵەکان تەعبیر بکات نەک بە وشەی زۆر..**
**عـەلی مـەندەڵاوی:** خۆی دوو قوتابخانە هەیە «بە تەعلیق» و «بەبێ تەعلیق» زیاتر میسرییەکان پشت بە «تەعلیق» دەبەستن.

## رۆشنبیریی گشتی گەورەترین بنەمای هونەرمەندی کاریکاتێرە

**رامـان: کەواتە لەبەرئەوەی وەرگر ئاستێکی رۆشنبیری باشی نییە، وێنەکێشەکە ناچارە تەعلیقەکەی لەگەڵ دابنێ..**
**عــەلی مــەندەڵاوی:** مەرج نییە، وێنەکێشی کاریکاتێر ئەوەی بەلایەوە گرنگە، من کە ئەسپی تەڕوادەم کرد خەڵکەکە لەوە نەدەگەیشت ئەوە ئەسپی تەڕوادەیە..
هونەرمەندی کاریکاتێر دەبێ بزانێ ئەو کۆمەڵگەیەی کە تێیدا دەژی ئاستی رۆشنبیرییان چۆنە؟! لەوانەیە بۆ ئەم کۆمەڵگەیە بەجۆرێک کاربکەم و بچمە کۆمەڵگەیەکی تر بە جۆرێکی جیاواز لەمەی ئێرە کاربکەم، چونکە هونەری کاریکاتێر بۆ کۆمەڵە.. دەبێ لێرە بزانم خەڵکی بیرو قسەو بیرو بڕوایان چییە، سوود لەوە وەربگرم و جارێ بۆ ئەسپی تەڕوادە باز نەدەم.
**رامان: نووسەرێکی زۆر بەناوبانگ و گاڵتەجاری وەک (ستیڤن نیکۆک) ئەو دەڵێ «گەوهەری گاڵتەجاری لەبەرائەتی مرۆڤ دوور نییە» قەشە (تینگ) دەڵێ لەو وەختەی کە کاریکاتێرستی رەخنەگری گاڵتەجار شتی ناشیرین وێنە دەکات هەر لەو چرکەساتەدا هەموو ئیستاتیکایەکی جوان دەبینێ و دێتە پێش چاوی، نێوانی ناشرینی و جوانی لای تۆ چۆن دەردەکەوێ..؟!**
**عــەلی مــەندەڵاوی:** بەنیسبەت کاریکاتێر، ئەوەندە بنەمای ستاتیکی ناکرێتە پێوەر، جار هەبووە ناشیرین کردن دەوری هەبووە، مۆسۆلۆنی شێوەی دەرەوەی چەندی جوان بێ دەتوانی بیکەی بە ناشیرین، تا ناوەوەو فیکرەکەی بەدەربخەی، جاریش هەیە مرۆڤی ناشیرین خۆی کەسایەتی ئیجابییە، هونەرمەندی کاریکاتێر دەتوانێ بەجوانی بیخاتە روو و تێڕوانین و فیکرە چاکەکەی نیشانی بینەر بدەی،

مەسەلەی ستاتیکاش ڕێژەییە، خەڵکی ئەفریقی ئێستە ڕەشن، تەماشا دەکەی بەلای کاریکاتێریستەوە ڕەشەکان جوانترن، یان جاری وا هەیە خەڵکی یابان بە ئاڵۆزی نیشان دەدات، مەسەلەکە ڕێژەییە.

**ڕامان: ئێستە سێ ئامۆژگەی هونەرە جوانەکانمان لە کوردستاندا هەیە، ئەوەی بایەخی پێنادرێ هونەری کاریکاتێرە، تۆ لەسەر ئاستی ئەکادیمی بۆ خوێندنی هونەری کاریکاتێر چی دەڵێی؟!**

**عەلی مەندەلاوی:** من لەم ڕووەوە ئەزموونێکم هەیە، کە لە ئامۆژگەی هونەرە جوانەکان بووم، لە خوێندنی ئەکادیمی وەرگیرام، ئەوکاتە تەمەنم (١٥) ساڵان بوو کە چوومە ئامۆژگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا، مۆدێلمان هەبوو، لە مۆدێل دروست کردندا کەسێک، یان پەیکەرێک دێن و لەبەردەمتا دایدەنێن تا کلێشەکەی وەربگری، لە پۆلی دوو بووم مامۆستامان «محەمەد عەلی شاکر» بوو، بابەتەکەی بۆ شیدەکردینەوە دەیوت سەر سێ بەشە ئەمە سەرو لووت و گوێ و ئەوە چاوو بەو شێوەیە وێنەی دەکێشی، من سەرەکەم بەدرێژیی و گەورە کرد، کە مامۆستاکەم هات سەیرم پێ هات کە قسەی نەکرد.. قوتابیەکان هاتن وتیان ئەوە چییە ئێمە کاری ئەکادیمی دەکەین و لەکاتی حەوانەوەدا هەموو قوتابییان سەیریان پێ دەهات کە من شتێکی دوور لە ئەکادیمیەت و مەنهەجم ئەنجدام داوەو مامۆستا محەمەد عەلی شاکریش دەنگی نەکردووە، ئینجا مامۆستا محەمەد وتی ئێمە هونەرمەندی کاریکاتێرمان نییە، ئەمە یەکەم جارە دەبینم عەلی بەم شێوەیە وێنە بکات، پێم شتێکی باشە هەبێ؛ لەبەر ئەوەی من هانی دەدەم، باوێنەکێشێکی کاریکاتێرشمان هەبێ، بە نمرە بە باشی منی هەڵنەسەنگاندبوو، لەگەڵ قسەکەیدا ڕێک نەبوو، بەڵام بەلای منەوە نمرە گرنگ نەبوو..

**ڕامان: ئەگەر لەهەندەران گەڕایتەوە دەتوانی لە بەشێکی ئامۆژگەکانی کوردستان وانەی کاریکاتێر بڵێیتەوە ؟! پشتیوانی ئامۆژگەکە دەکەی کە بەشی کاریکاتێریان هەبێ ؟**

**عەلی مەندەلاوی:** لەئەکادیمیاتی دەرەوەش شتی وا نییە ، هەیە ستریشنی پێ دەڵێن ، ئەوە وێنەیەکە دیراسەی تایبەتی خۆی هەیە ، بەڵام لە کۆمەڵەی ئەکادیمیاکان لە هۆڵەندە چەندین جار وتومە ئەوە باشە هەبێ ..

**ڕامان :دوای ئەوەی کاریکاتێر لە ڕۆژنامەوانی گرنگی زۆری پێ دەدرێت زۆرکەس هەیە کاریکاتێری بەلاوە گرنگ نەبووە، کە گرنگ نەبووە هۆی ئەوەیە ئیشی هونەری نانی تیدا نییە، بۆیە تا لە ڕۆژنامە جێی خۆی بکاتەوە بووە بە کاریکاتێریست، تۆ ڕات لەسەر ئەوە چییە؟!**

**عەلی مەندەلاوی:** لەو کاتەی پێشەنگای (مەربەد ) لە (هۆڵی بەغداد) کرایەوە، بەڕێوەبەری هۆڵەکەم باش دەناسی کە «سەمیری » ناو بوو تەلەفۆنی بۆ کردم و

وتی حەز دەکەم پێشانگاکەت لە هۆڵەکەدا نمایش بکەی، هەر لەو کاتەدا لەلایەن بەڕێوەبەری هۆڵەکەوە تەلەفۆنم بۆ کراو وتی تۆچی دەکەیت چۆن لە هۆڵەکەی مندا کاریکاتێر نمایش دەکەی، منیش وتم ئەوە دیوارەکان چڵکن بوون و منیش پڕم کردنەوە،ئەوە لە ساڵی ١٩٨٨بوو، لە هۆڵی نیشتمانیش لەساڵی ١٩٨٦ بۆ هەموو هونەرمەندە ناودارەکان پێشەنگە کرایەوە، لەوێ ئەزموونەکەم واتە تابلۆ کاریکاتێرییەکانی (گۆران و جەواد سەلیم و بەدر شاکر سەیاب)م لەوێ وەک رۆژنامەکان پێشانگەم بۆ کردنەوە و ناوم نا-وجوە من الداخل - ئنجا بەڕێوبەری هۆڵەکە پێی وتم من مانگێ ئەو هۆڵەت پێ دەدەم کێ تابلۆی کاریکاتێری دەکڕێت

# هونەرمەندی کاریکاتێر دەبێ ئاستی رۆشنبیری ئەو کۆمەڵگەیەی تێیدا دەژی لەبەر چاو بێ

لە کاتێکدا من کارەبا و ئاو سەرف بکەم و میوان دێ و کرێ دەدەم، منیش پێم وت ئەو کارانەم بۆ فرۆشتن نەکردووە، تەنیا ئەزموونێکە ئەمەش وەک موغامەرەیەک بوو، یەکەم جار بوو لە مێژووی ئەو هۆڵەدا کەس تابلۆ لە پێشەنگایەکدا نەکڕێ، بەڵام وەزارەتی رۆشنبیری هەموو ئیشەکانی کڕیم، ئیستفادەی چاکی کرد..

**رامان: مەبەستمان ئەوە بوو وێنەکێشی فاشیل هەن لە پێشەنگاکانیدا بینەری بۆ کۆ ناکرێتەوە، تەماشا دەکا لەرۆژنامەوانیدا بۆ شایی هەیە و رۆژنامەوانەکان پێویستیان بە کاریکاتێر هەیە ئەویش دێ بۆ شاییەکان پڕ دەکاتەوە ..**

**عەلی مەندەلاوی:** هەیە خۆی لەو کارە هەڵدەقورتێنێ، بەڵام لەسەر کارەکە نامێنێتەوە، هەیە بەردەوام دەبێت، ئەوەی لە کاریکاتێرەکەشدا فەشەل دێنێ وەک گەڵای وشکی دار خۆی هەڵدەوەرێ .

**رامان : چۆن ئاستی کاریکاتێر لە عێراق بەگشتی و لە کوردستان بە تایبەتی هەڵدەسەنگێنی..؟**

**عەلی مەندەلاوی:** لەعێراقدا بەشێوەی گشتی زۆر تەشەنەی سەندووە، هونەرمەندێکی کاریکاتێری میسری هەیە بەناوی (محێدین لەباد ) گۆشەیەکی شاقوولی لە نووسین هەیە لە دوولاپەڕەدا موتابەعەی کاریکاتێری جیهانی دەکات، کاتێ لە قاهیرە ساڵی ١٩٨٩ بەشداریمان کرد، ئەو شوێن پێی ئیشەکانی هەڵگرتبووین، کاریکاتێریستی عەرەبی هەمووی روویان لە میسر کردووە و کاریگەری بۆ دەوری خۆی هەیە، وێنەکێشە کاریکاتێرییە میسرییەکان پێشکەوتووترن لە هی وڵاتانی تر، کاریکاتێر لەوێ لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە دەستی پێ کردووە و هونەرمەندی چاکیان لی دەرکەوتووە، لە ناونیشانی وتارەکەی (محێدین لەباد) بەو شێوەیە بوو «کاریکاتێری عێراقی بەسەر میسردا نە

ڕۆیشتووه» مانای لەمیسرەوە سروش و بەهرەی خۆی وەرنەگرتووە، لە ناوەرۆکی وتارەکەدا نووسیبووی کە کاریکاتێری عێراق تایبەتمەندی خۆی هەیە و لە کاریکاتێری میسری جیاوازە، هی میسر زیاتر پشت بە گفتوگۆ و نوکتە دەبەستێ، لەکاتێکدا کاریکاتێرە عێراقییەکان جگە لە (بەسام فەرەج) و غازی پشتیان بە «تەعلیق» بەست و بەگشتی ئەوانەی تر تەعلیقیان کەم بوو، بۆیە زیاتر مۆرکێکی فەلسەفیان بە خۆوە گرتووە، چونکە هونەرمەندە کاریکاتێرییەکانی عێراق ڕۆشنبیرییەکی بەرزیان هەیە و زۆربەیان دەرچووی ئەکادیمییەکانن، بەناوبانگترینی ئەو کاریکاتێریستیانە موئەیەد نیعمە، عەبدولڕەحیم یاسر، ڕائید نووری، خضیر حمێری لەناو کوردیشدا لە کۆنەوە نەمدیوە، چونکە ئەو بوارانە کەم بووە، بۆ نموونە گۆڤاری «مجلتي» خۆی قوتابخانەیەک بوو، ڕووگەیەکی تایبەتی تیا دروست بوو ،ئێستە ئەگەر یاریگەیەک نەبێ بۆ فتبۆڵێن بواری نابێ، ئەگەر مەیدان و یاریگەو ڕۆژنامەوانیت هەبێ ئەوکاتە هەوڵدان دروست دەبێ و پەرە دەسێنێ..

**ڕامان: لەبواری بووکەشووشە و تەلەفزیۆندا دەورت هەبووە؟!**

**عەلی مەندەلاوی:** لەتەلەفزیۆن کارم نەکرد، هەوڵیشم دا، لەبەر ئەوەی تەکنیکی باش نەبوو، بەڵام بۆ کتێب کارم کردووە، هەرچەند سێ چوار ئەزموونم هەبوو لەکتێبدا، دوو کتێبم هەیە لەگەڵ هونەرمەندێکی تر یەکەمیان (لەقوڕ چی دروست بکەین) دووەمیان (لەمیوەو سەوزە چی دروست بکەین). بووکەشووشەم لەخەیارو میوەو ئەوانە دروست دەکرد، کاتێ لەهەموو جۆرەکانی میوەجات بەتەقلید بڵاوم کردنەوە، دوای ئەوەی کتێبەکە بڵاو بۆوە تەلەفۆنات و کاغەزی زۆر بۆ ئیدارەی گۆڤاری(مجلتي، مزمار) هاتن وتیان کێشەی گەورەی بۆ دروست کردووین، هەرچی هەیە بەمیوە دروستی دەکەن.

**ڕامان: ئەو هەوڵدانە بەپێی زانیاریمان دەگەڕێتەوە سالی ۱۹۳۰ لەگەڵ پەیدا بوونی (شارڵ پلیبۆنی) ڕۆژنامەنووس و طەباعی فەرەنسی، ئەو شافیلیپی فەرەنسی لەشێوەی هەرمێ دروست کردووە، دیارە شا بڕیاری دا کە شەش هەزار فرەنک (شارڵ) غەرامە بدرێ، هەر لە کلێشەو شکلی هەرمێی (شارڵ) بڕیارەکەشی بڵاوکردەوە..**

**عەلی مەندەلاوی:** ئەوەی پار دەرمکرد-الحيوانات التي تحكمنا- دوای ئەوە کتێبێکی ترم دەرکرد هەر دەربارەی کەسایەتی ناسراو، بەڵام بەمیوەجات..

**ڕامان: ئەگەر بیرت بێ جوانترین کاریکاتێر کە لەژیاندا بینیبێتت..؟**

**عەلی مەندەلاوی:** زۆرن: ئەوەی لەبیرمە هونەرمەندێکی یۆنانییە لەگەڵی بەشداریم کرد لەپێشەنگاکەی لەندەن، کاریکاتێرەکەی پێوەندی بەفلیمی (دیوار)ەوە هەبوو ئەو فلیمە لە ژێر کارتێکردنی شۆڕشی قوتابییانی سالی ۱۹۶۸ دا بەرهەم هێنرابوو، قوتابییان بەسەرە بەرەو مەکینەیەکی قیمەکێش دەڕۆن و لەناو مەکینەکەدا دەهاڕدرێن و دەبنە قیمەی گۆشت، لەگەڵیدا مۆسیقای تیپێک لێدەدرا، ئەم وێنەکێشە یۆنانییە یەکێکی کردبوو وەک حاکم مۆرێکی بەدەستەوە

بوو، خەڵکی بەسەرە بەلایدا تێدەپەڕن و حاکمەکە مۆر لەسەری هەموویان دەدا، ئەوەی بەلایدا دێت سەری سروشتی و ئاساییە، بەڵام کە دەگاتە لای ئەم لەسەرەوە سەریان شێوەی تەختایی وەردەگرێ بەپێی ئەو مۆرەی لەسەریان دەدا..

**رامان: کاریکاتێر هەیە بەنووسینە بەرەسم نییە دەڵێ «بەسەر حەوت پشقل بازدەدات»، ئەمە کاریکاتێرە، مەسەلەن «مار دەکوژێ توولە مار بەخێو دەکات» یان «ئەوەندە فێڵ زانە و ساختە چییە جۆ بەدیواردا هەڵدەگێڕێ» تۆ ئەوە دەبینی ئەو کەرەسەو پەندانە بکەیتە کاریکاتێری گاڵتەجار..؟**

**عەلی مەندەلاوی:** ئەو میللەتەی نەزانێ ئەسپی تەرِوادە چییە، من ناچارم بەزمان و بەرۆشنبیری و بیری خۆیان کاریان بۆ بکەم، زۆرتر لە کولتوور سوود وەردەگیرێ، زۆر گۆرانی فۆلکلۆری هەیە سیمای کاریکاتێری هەیە، هونەرمەند (غازی)و(میسرییەکان) بۆ کاریکاتێر سوودیان لەپەندە میللییەکان وەرگرت.

## هونەری کاریکاتێر لافیتەو پۆستەر نییە

**رامان: تۆ وەک ئەزموونت هەیەو بەپێی رای رەخنەگران ئەزموونەکەشت سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، رێنوێنی چییە بۆ ئەوانەی ئێستە خەریکن لەکاری کاریکاتێردا کاردەکەن، لەم کەش و هەوایەدا کە ئازادی و رۆژنامەوانی هەیە؟**

**عەلی مەندەلاوی:** ئەم وێنە کێشانەی ئێستە لێرە کار دەکەن وەک ئێمە نین، لەکۆنەوە وەک ئێمە لەعێراقدا کاریان نەکردووە، ئێمە هەزار هەوڵمان دەدا کە راستەوخۆ کار نەکەین، چونکە سانسۆر هەبوو، بەڵام ئێستە لێرە بوار هەیە وەک بڵندگۆ هەرچی حەز دەکەی دەتوانی بیکەی و بیڵێی کارێکی باشە سوود لەو ئازادییە وەربگرن و باشتریش وایە سوود لە کولتووری جیهانی وەربگرن.. تەنانەت وەزارەتی رۆشنبیری هەوڵ بدات ئیشتراک بکات بەهێنانی گۆڤاری بێگانە تا لەو هونەرە بەئاگا بن .. کاریکاتێر پۆستەر و لافیتە نییە، بەڵکو تلسکۆبە هونەری چۆنییەتی بەکارهێنانییەتی لەسەر سلبیات، تا بەشێوەیەکی هونەریی دەری بخەی، بەڵام بەرزو پڕ ئەفراندن..

**رامان: بەنیسبەت تەصمیم کەچوار ساڵ لەئەکادییە خوێندووتە، تەصمیمیش بەشێکە لە دروست بوونی پۆستەرو بەرگی کتێب، ئایا چەند بۆ کاریکاتێر سوودت لەو بەشەی تەصمیم وەرگرتووە؟**

**عەلی مەندەلاوی:** خۆی پێوەندی لەنێوان کاریکاتێر و تەصمیمدا نییە، بۆیە هیچ سوودم لێ وەرنەگرت، من نەچوومە ئەو بەشە تا لەبواری کاریکاتێر سوودی لێ وەربگرم، ئەساسی چوونم بۆ ئەو بەشە بوونی ئەو بۆشاییە بووکە لەپسپۆڕیی تەصمیمیدا هەبوو، تەنانەت (ناظم رەمزی) کاتی خۆی خاوەن چاپخانەی رەمزی بوو کوردیش بوو، هونەرمەندێکی شێوەکاری داهینەریشە، هەموو ئەوانەی لەتەصمیم کاریان دەکرد بواری خۆیان نەبوو، تا ئێستە پسپۆری لەعێراقدا بۆ تەصمیم پسپۆڕیی نییە، من کەچووم تەماشا دەکەم مامۆستاکان پێوەندییان

بەتەصـمـیـمـەوە نەبوو، دوای ئەوە تەکنیکی تەصـمـیـمی نویٚ وەک کۆمـپـیـوتەر و ئەوانە هیـچی نەبوو، بەڵکو ئەوەش گـاڵـتـە بوو تـەنیـا سـوودی ئەوەی هەبوو لەسەربازیٚ دووری خستمەوە، تا ماوەم هەبیٚ بۆ ئیش کردن و سوودم لەکتیٚبەکانی کتیٚبخانە وەرگرت کە لەقوتابییەکان قەدەغە کرابوو و تەنیا بۆ مامۆستاکان بوون، من مـامـۆسـتـاکـان برادەرم بوون، ئەوان کـتـیـٚبـەکـانـیـان بەدەست دەگـەیانم، ئەو سەرچاوانە ئەکادیمی بوون و لەدەرەوە وەرگیرا بوون..

**رامان: بەهیٚزترین بنکەی تەصمیم لەکوێیە؟**

**عـەلی مـەندەلاوی:** بەپلەی یەکەم یابان زۆر پیٚشکەوتووە، لەتەصـمیمدا، چونکە چاپەمەنی و پیشەسازیی پیٚشکەوتووی هەیە، هەروەها ئەمەریکاو ئینگلتەرەش چاوی زیرەک گەر ئەو کـەرەسـە تەکنەلۆژیانەی لەبەردەست بیٚ تەصـمـیـمی پیٚش دەخات.

**رامـان: کـەواتە رات وایە کـتـیٚـبی عـیٚـراقی و کـوردی بەشـیٚـوەی گـشـتی ئەو پیٚشکەوتنەی بەخۆوە دیبیٚ؟**

**عـەلی مـەندەلاوی:** یەکجار سەقەتە، ئیٚستە کەوادر لەدەرەوەن بەشیٚوەی ئەکادیمی

## دەمەویٚ ئەزموونیٚکی هونەری بهیٚنمەوە لیٚرە سوودی لیٚ وەربگیریٚ

لەئامۆژگەو لەقوتابخانەی تەصمیمی هەندەران دەخویٚنن؟...

**رامـان: دەڵیٚن نیوەی کتیٚب پیٚش ناوەرۆکی، تەصـمیمی بەرگـەکـەیەتی، تەنانەت قـسـەش هەیە دەڵیٚن کـتیٚب لە نـاوونیشـان و غـیـلافـەوە دەخـویٚندریٚتـەوە.. بۆ ئەم گرنگیدانە بە تەصمیم..؟**

**عـــەلی مـــەندەلاوی:** چۆن جـوان دەردەچیٚ، ئەوەیە، جـار هەیە جـوانە، بەلاٚم رەنگەکانی جوان نییە، تەنانەت ناوی نووسەرەکە گرنگە لەسەر کتیٚبەکەدا نموونەی کتیٚبیٚکی (بەدر شاکر سەیاب) هەیە دەبیٚ ئەو ناوە لەعینوانی کتیٚبەکە گەورەتر بکەم تا مەسافەی چاو ببیینیٚ کە لە کتیٚبخانە چاوی پیٚ دەکەویٚ..

رەنگ، چ رەنگیٚ کاریگەری دەدا بەچاو لەنیٚوان ئەو کتیٚبانە رەنگەکان دیار بیٚ، تەنانـەت جۆری پیت، ئەمـەش ریٚگەیەکی ترە بۆ نموونە کـتـیٚـبـیٚکی (مـارکـیـز)یان فرانسوا ساگان هەیە، دەزگاکانی بلاٚوکردنەوە زیاتر بازرگانین و گرنگی بەناوەکان دەدەن پیٚش ناونیشان..

**رامـان: منداڵی کـورد زۆر لە ئەدەبیـات و سـینـەمـا و هونەری تایبـەت بەخـۆی بیٚبـەشن، هونەرمەندی کورد بەپیٚی پیٚویستی کار ناکەن، ئیستـە تۆ لە دوو بواری گـرنگ (کـاریکاتیـر و کـاری منداڵ) کـارت کـردووە، کـە هەردووکی کـیـٚلـگەی نەکیٚلـراون بۆ ئیٚمە، چونکە کـەمن ئەوانەی پسـپـۆرییـان لەئیـشی منداڵان پەیدا کردبیٚت، جەنابت چۆن ئەو ئیشانەی ئیٚرە دەبینی؟!**

**عەلی مەندەلاوی:** لەوکاتەدا وێنەکێش، بۆ منداڵان نەبوو، تەنانەت بۆ گۆڤاری (مـــجلتي) وێنەکێشی پسپۆڕ نەبوو، تەنیا وێنەکێشەکان چوونە گۆڤارەکان و ئیشـیـان کرد، پاشان کەوادیر دروست بوون بێ ئەوەی خوولی تایبەت و چوونە دەرەوە هەبێ (مجلتي) خۆی بوو بەقوتابخانەیەک، (ئەستێرە) کە گۆڤارێکە ئیشی جوانیان تێدا کردبوو، لەوانە (لاله عەبدە) و (دارا محەمەد عەلی) و (مەدحەت) ئەوانە گەر بەردەوام بوونایە دەبوونە قوتابخانەیەک..

**رامان: بەپێی قۆناغەکان تایبەتمەندی هونەری منداڵ چییە؟**

**عـەلی مـەندەلاوی:** لەقـۆناغی سـەرەتایی منداڵ زانیـاری کـەمـە، دەبێ بەرەنگ دەوروبەر و سروشتی بۆ پێناسە بکەی، ناسینی دەوروبەر بەرەنگەکـان واتە سوور چییـە، زەرد چییـە، نـاو خانوو چۆنە، دەرەوەی چۆنە، ئەمە گەرمە، ئەوە ساردە؟! زانیاری بنەڕەتی سەرەتایی بدەیتێ، دوای ئەوە دەبێ لایەنی فەسلەجی و مەعریفی هەرتەمەنێ روونبکەیتەوە، چۆن ئەو کتێبە خۆشەویست دەکەی لای منداڵەکە دەبێ

# پێویستە هونەرمەندی کورد لە ئەوروپادا تایبەتمەندی خۆی نیشان بدا

هەمـوو ئەوانە بەوردی لێی بکۆڵرێتـەوە،یان شـتی مـوجـەسـەم و بەرجـەسـتـە لەقۆناغێکی تردا دروست دەبێ، قۆناغێکی تر هەیە زیاتر منال تێیدا گرنگی بە چیرۆک دەدا، قـۆناغی دوای ئەوە زیاتر قـۆناغی خوێندنەوەی پێ دەڵێن، چونکە قـۆناغی پیش ئەوە دەبێ تەنیـا بەوێنە وێنەکـان بخـوێنێـتـەوە، قـۆناغـەکـان بەم شێوەیەن:

قۆناغی یەکەم: تەنیا بێدەنگە، بەبێ دەنگی و بەوێنە شت فێر دەبن

قۆناغی دووەم: دەبینێ و دەخوێنێتەوە ئەوەش لەتەمەنی (٦-٧) ساڵیدا.

قـۆناغی سـێـیـەم: گـرنگی بە رووداو دەدات و لەهەمـوو بوارەکـانی ژیانەوە پرسیاردەکات ئەمەش تا تەمەنی (١١-١٢) ساڵ دەخایەنێ.

قۆناغی چوارەم: منال گرنگی بە موغامەرات و خەیاڵ دەدات، ئەو کاتە گرنگی بەچیرۆک و فانتازیاو خەیاڵی ورد دەدات، جووڵەکان چۆن دەبینێ..؟!

**رامان: ئێستە گۆڤاری (هەنگ) لەوەزارەتی رۆشنبیری دەردەچێت، بەلام دەکرێ وەزارەت بۆ دوو قۆناغ- دوو گۆڤار دەربکەن؟**

**عـەلی مـەندەلاوی:** جاران لەهەشـتـاکان -مـجلتي و مزمار- سـەرکـەوتوو بوون، دوای هەشتا فاشیل بوون کەهەوڵیاندا- مـجلتي - بکەنە گۆڤارێکی تایبەت بە تەمـەنێکی زۆر کـەم، چونکە ئەم منداڵانە ناتوانن بۆ خـۆیان -گـۆڤـارەکـە بکڕن و باوک و دایک بۆیان دەکڕن، ئەوانیش ئەوەندە هۆشـمـەندییـان نییـە گـۆڤـارەکـەیان

بەبەردەوامی بۆ وەربگرن، بۆ منداڵانی کوردستان گۆڤارێک تایبەت بێ بە قۆناغی خوێندنەوە تا دوانزە ساڵان باشە قسەیەک هەیە دەڵێت گۆڤاری منداڵان گەورەکان نایخوێننەوە، بەڵام چێژی لێ وەردەگرن، ئەفلام کارتۆنیش چێژی لێ وەردەگیرێ..

-مجلتي- پێش هەشتاکان هەموو منداڵان دەیانگرت بەدەستەوە، تەنانەت منداڵ هەبوو تەنیا شتەکانی دەبینی هەر پرسیار و خەیاڵی بۆ منداڵ دروست دەکرد.. قۆناغی دووەم گۆڤارێک هەبێ وەک (مزمار) چونکە ئاستێکی ژیری بەرەو ژورتری هەیە منداڵ لەتەمەنی (١٢) ساڵییەوە حەز دەکا گۆڤارەکەشی وەک گۆڤاری گەورەکان بێ- چیرۆکی گەورەتر سیناریۆی گەورەتر- ئێستە لەهۆڵەندا بۆ ئەو تەمەنە بەرنامەی تایبەت هەیە بەتەمەن دوو بێژەری گەورە هەیە، ئێستە ئێمە کە هۆڵەندی فێربووین پێمان دەڵێن تەماشای ئەو بەرنامەیە بکەن و لەوێوە موتابەعەی هەواڵە جیهانییەکان دەکەین..

**رامان: بزاڤی کاریکاتێرو شێوەکاری کوردی چۆن دەبینی؟**

**عەلی مەندەلاوی:** شتی سادەن بەڵام توانای تێدایە، ئێستە لە دەرەوە کەسانی زۆر هەن، کە لە ئەفلام کارتۆن و کاریکاتێرو لەزۆر بواری تردا ئیش دەکەن..

**رامان: دەمانەوێ باسی ئەوەمان بۆ بکەی دەوری هونەرمەندی کورد لەهەندەران لەبواری هونەری شێوەکاریدا چییە؟! ئایا لەوێ توانیویانە ئەو موعانات و دەردەسەرییەی میللەتی کورد لەرێی هونەرەوە بەخەڵکانی بیانی بناسێن، بەتایبەتی لەم کاتەدا کە لەناو میللەتاندا - ململانێی شارستانی- لەسەر بنەڕەتی بنەماکانی نەتەوەیی سەری هەڵداوە، ئایا هونەرمەندی کورد توانیویەتی بنەماو نەریت و شارستانی کورد بخاتە روو؟!**

**عەلی مەندەلاوی:** لەوێ هونەری شێوەکاری هاوچەرخ زۆر پێشکەوتووە، ئێستە کارەکانی (ئیسماعیل خەیات)یش هەر ئەزموونگەرییە، جەماوەری ئەوێ ئەگەر ئەو ئەزموونانە رەسەن بێ هەوڵ دەدەین چێژی لێ وەرگرن..

**رامان: لەئەوروپا هونەرمەندی کورد تایبەتمەندی کورد دەربخات باشە، یان رووبکاتە لایەنی تەجریدی؟**

**عەلی مەندەلاوی:** دەبێ تەجریدییەکە رەسەنایەتی هەبێ ئەگەر لەگەڵیدا نەبێ کارەکەی رەت دەکرێتەوە..

**رامان: بەگشتی کە رۆشنبیری کورد دەچنە هەندەران توانیویانە خۆیان پێبگەیەنن؟**

**عەلی مەندەلاوی:** کە دێن «کورد یان هیندی» ئەوانە لەژێر کاریگەری هونەری خۆر ئاواییدا نین، تەنانەت بەرەنگەکاندا دیارە کە لەجیهانی ئەورووپی نین، گەر تایبەتمەندی نەبێ لاڵ دەبێ، گەر لاڵیش بێ زمانی هونەریی لەکیس دەدات، سەرکەوتوو نابێ، ئەوکاتە دەوترێ ئەمە هونەرمەندی کوردە بەزمانی خۆیان بەرەنگی نزیک بەخۆیان شتی جوان دەکەن بۆ ئەوەی بزانن کە کورد هەر کۆمەڵگەیەکی خێڵەکی و شەڕانی نین، بەڵکو شارستانیەتیش لەکوردستان هەیە، ئێستە لەوێ مرۆڤی ئاسایی زۆر نائومێدە

**رامان: کەهاتییەوە کوردستان خۆت واتەنی نائومێدییەکەت رەوییەوە، پێت باش نییە بگەڕێیتەوە کوردستان و راستەوخۆ خزمەتی بینەری کورد بکەی؟**

**عەلی مەندەلاوی:** پێش منیش زۆر کەسانی تر دێنەوە ..

**رامان: هاتنەوە و نەهاتنەوە بابخەینە ئەم لاوە، بەلام هونەرمەندو نووسەر هەمیشە جەماوەری راستەقینەی خۆی لەولاتەکەیەتی بەلایەنی کەم هونەرمەندانی هەندەران جار جار پێشەنگایەک بهێننەوە بۆ کوردستان، تا تووشی دابڕان نەبن ئایە بیرتان لەوە نەکردووەتەوە.. ؟**

**عەلی مەندەلاوی:** ئەوەش بەتوانای تاکەکەسی نابێ، دەمەوێ ئەو ئەزموونانە بێنمەوە تا ئەوانەی ئێرە سوودی لێ ببینن، پێم باشە لەڕێی وەزارەتی رۆشنبیرییەوە پێوەندی بەدەوروبەرەوە بکرێ و هەندێ پێشەنگای سەرکەوتوو لەهۆڵەکانی ئەوێ پیشان بدرێ..

**رامان: لەکۆتاییدا بەخێر هاتنەوەت دەکەین لەکوردستان و هیوامان وایە بەیەکجاری بێیتەوە زێدو هەواری خۆت.**

**ژیاننامەیەکی پڕ لە بەخشش**

*** ١٩٥٨ لە گوندی هەواسیای کوردستانی عێراق لە دایک بووە**

*** ١٩٧٩ لە ئامۆژگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا-بەشی سیرامیک- دەرچووە**

*** ١٩٨٦ لە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی بەغدا- بەشی نەخشەسازی چاپەمەنی- دەرچووە**

*** ١٩٧٥- ١٩٩١ وەک نیگارکێشێکی پیشەدار لە خانەی رۆشنبیریی منالان- بەغدا- کاری کردووە.**

**هەر لەو سالانەشدا پتر لە (٣٠) کتێبی منالانی بۆ چەندین دەزگای پەخشی عیراقی و عەرەبی جێبەجێ کردووە.**

*** (٣) ساڵ لە ولاتی توونس ماوەتەوە**

*** ئێستە لە هۆڵەندا جێنشینە**

*** ئەندامی سەندیکای هونەرمەندانی عیراقە**

*** ئەندامی دەستەی نێو دەوڵەتی بۆ هونەری شێوەکاری- ئەیاب- ئەندامە**

**پیشانگە تایبەتیەکانی**

*** ١٩٧٧- هۆلی کۆمەڵەی رۆشنبیری- بەغدا**

*** ١٩٨٣- تابلۆی منالان- هۆلی مۆزەخانە- سلێمانی**

*** ١٩٨٦- چەند روخسارێک لە ناوەوە- هۆلی ئورفەلی- بەغدا**

*** ١٩٨٨- پیشانگەی هۆلی بەغدا**

*** ١٩٩٢- هۆلی مەڵبەندی رۆشنبیریی ئیسپانی- عەممان**

*** ١٩٩٣- هۆلی رواق- توونس**

*** ١٩٩٤- هۆلی- هۆلی شاری تۆتریخت- هۆڵەندا**

*** ١٩٩٧- هۆلی رازا- هۆڵەندا**

پیشانگەی هاوبەش

* ١٩٧٩- نیگارکێشانی نامیلکەی منالآن- پۆڵەندا

* ١٩٧٩- سالّی منالآنی جیهان- بەغدا

* ١٩٨١- نیگارکێشانی نامیلکەی منالآنی عەرەب- ئیتالیا

* کاریکاتێری عێراقی- هۆڵی مۆزەخانە بۆ هونەری نوێ- بەغدا

* ١٩٨٧ نیگارکێشانی نامیلکەی منالآن- چیکۆسلۆڤاکیا

* ١٩٨٧ پیشانگەی کاریکاتێر- بولگاریا

* ١٩٨٨ لیژنەی کاریکاتێر- هۆڵی مۆزەخانە بۆ هونەری نوێ بەغدا

* ١٩٨٩ میهرەجانی کاریکاتێری عەرەبی- گەلەری کوفە- لەندەن

* ١٩٩٠ کاریکاتێری عەرەبی ئەفریقی- قاهیرە

* ١٩٩١ شەش هونەرمەند لە عیراقەوە- عەممان

* ١٩٩١ چەند هونەرمەندێک لە توونس و بەغداوە- توونس

* ١٩٩٢- ڕۆژانی ڕەنگاوڕەنگ- عەممان

* ١٩٩٢- دەستەی نێو دەوڵەتی بۆ هونەری شێوە کاری- توونس

* ١٩٩٢- سلاوێک بۆ هونەرمەند ناجی ئەلعەلی-

* ١٩٩٢ پیشانگەی کاریکاتێری جیهانی- لەندەن

* ١٩٩٣- دەستەی کاروان- پاریس

* ١٩٩٣- لەگەڵ هونەرمەندی فرەنسایی ژاک بارتیلیمی- پاریس

* ١٩٩٤- هۆڵی دری برخن- هۆڵەندا

* ١٩٩٥- میهرەجانی هونەری عەرەبی- بەلجیکا

* ١٩٩٦- هۆڵی شاری روشفور- فرەنسا

* ١٩٩٧- هۆڵی ستین ڤایک- هۆڵەندا

* ١٩٩٧- هۆڵی زونهۆف- هۆڵەندا

* ١٩٩٧- هۆڵی مەڵبەندی هونەر- شاری هنگلۆ- هۆڵەندا

* ١٩٩٧- هۆڵی شارەوانی شاری لیل- فرەنسا

* * *

سەرنج

ئەمجارەیان وا دیارە و وا بڕیارە هۆڵەکانی شارەکانی ئەم کوردستانە بڕازێنێتەوە..!

چاوەڕوانین.

سازکردنی گفتوگۆ:

**ئازاد عەبدواحید - مەحموود زامدار**

## موحسین قوچان

# هوزان لنک من پروژەکێ بەردەوامێ ژیارێیە

***هوزانڤان موحسین قوچان.. بێ گومان دەنگەکێ شیعری یێ بەرزو ناڤدارە ل ئاسمانێ هوزانا کوردی، هەر وەلێ خودان ئەزموونەکا شیعری یا بەرفرەهە.***
***شیعرا محسن قوچانی ب حەقیقەت تشتەکێ سەیرە، چونکە ژ واقعیەتێ و چیڤانوکێ و تەمەردێ و تەحدایێ پەیدا دبیت و پرە ژ غموضێ و مژێ و پرە ژ سەر بلنداهیێ و گەشبینێ... یەعنی ب کورتی شیعرا محسن قوچان تشتەکێ تایبەت و سەرنج راکێشە و گەلەک جاران یا بویە جهێ گەنگەشێ لناڤ هوزانڤان و رەوشەنبیران دا.***

**پ/ دەمێ ژ دانانا شیعرەکێ بدیاهی دهێ چ هەست لایێ تە پەیدا دبیت؟**

و/ هوزان لنک من پروژەکێ بەردەوامێ ژیارێیە ب چ رەنگا بدوماهی ناهێت. پشکێن بچویک ژ ڤی پروژێ مەزن ئەز بسەروبەر دکەم، ژ بن رویێ رویدانا بەردەمە سەر رویێ رویدانا.

ژ دەستپێک بونا پارچەکا هوزانێ هەستەکا ئالوزو نە تەنا من ڤەدگریت، دەلیڤێن پر ئاریان و تەر ژ بارانا روندکا، لەوما ئەز خو ژ دەورو بەرا ڤەدقەتینم و ڤەدگەرییێم هندری کەساتیا خو، ژ دەلیڤێن کورت دناڤ بەرا هش و نەهشییێ... ژ ئاریانا پارچێن پروژێ من دزێن.

دگەل سەروبەرکرنا پارچە هوزانەکێ ئەز هەست ببونەکا نوی دکەم، تەنا هییێ، ژ خو رازیبونێ، هەستەکا نازک ب مەزناهیێ و دفن بلندیێ... هەستا داهینەرا بپەیداکرنا تشتەکێ هەژی ژ نەبونێ، لێ ئەڤ رەوشە گەلەک نامینیت و حەزا لێگەریانەکا دی دکوراتیا من دا پەیدا دبیت... حەزا نێچیرەکا نوژەن و بەردەوامیا پروژێ مەزنێ ژیانێ گەلەک جاران ئەڤ هەستێن هە، دناڤکر دئالوزن و پر مزن و بکوتەکیەکا کورە ئەز دڤاڤێرم

**پ/ بهزراتە شعر ئیلهامە یان نەء؟**

و/ شعر شعرە، لێ ئەنجاما یان ڤەرێژا مروڤەکێ بەهرەمەندە زێدەباری

شەهرەزایەکا بەرفرەهە.

# هەمی بونا من غرورە..!!

براستی مرۆڤی (موهوب) بێ شەهرەزایی نەشێت کارەکێ مەزن بکەت و بەرهەمێ وی دێ یێ ساکار بیت و بێ بەها بیت و مروڤێ شارەزا ژی کارەکێ داهینەر پێ ناهێتە کرن و بەرهەمێ وی دێ یێ هشک و یێ خرش بیت، ئانکو هوزانا سەرکەتی و نەهەمی هوزانە ڤەرێژا کەساتیەکا (موهوب)ە دگەل رەوشەنبیریەکا بەرفرە و شارەزایەکا مەزن و سەربورەکا کویر دژیارێ دا، لێ بهزرامن دیسا ئەڤا بوری چ نائینیت ئەگەر ئەنجاما کەساتیەکا یاخیبوی نەبیت... یاخیبون لسەر هەمی کەچیا ژیانێ تشتەکێ گرنگە.

**پ/ ئایا غرور تە دگریت و ل چ حالەت؟**

**و/** هەمی بونا من غـــرورە... غـــرورە ژبونێ و هەتا هەتایێ و پروژێ منێ بەردەوامێ هوزانێ خزمەتکارێ ڤێ غرورێ یە، رێکەکە بو بلندکرن و بەرفرەهکرن و ئاسێکرنا کەلها غرورێ. تو دزانێ بوچی؟

چونکە غرور هەستەکا زێدەیە بکەساتی ووجا مروڤێ (مغرور)و ئەز دهەستەکا بێ دوماهیی یا دفنبلندیێ دا دژیم. من باوەرە ژیار لسەر دەستێ مروڤێن (مغرور) ئاڤا دبیت یان دهەرفیت. چونکە مروڤێ لاوازو بێچارە و هەست بکەت یێ بێ ورج و چنەیە دژیانێ دا دێ چ دەتە ژیارێ و ئەوب خو چ نە؟.

**پ/ ئایا شعر نها هەر (وەزیفێ جاران دبینیت) یان نەء و بوچی؟**

**و/** هەر ژ دەمێ ئەفلاتونی و ئەرستوی هەتا نهە دانوستاندن ێن فەرمەسونی (فلسفی) یێن مەزن لسەرڤێ چەندی یێن هاتینە کرن و تیبورێن جودا جودا هەنە.

نە شعر روخسارو ئاڤاهی و ئامیرەو نا ڤەروک، نەژی رێکێن دەربرینا هوزانێ و نەژی (وەزیف)ێ هوزانێ د ئاکنجینە و دنەلڤن. ئەڤ تشتە یێن دگوهرینەکا بەردەوامدا. هندەک جاران دگەل گوهرینا ژیارێ و ئەڤە کاودانەکێ ساکارێ هوزانێ یەو هندەک جاران ژی لپێشیا ژیارێ رادکەن و دبنە پێشەوایێن ئاڤاکەر بو ژیارەکا نوژەنا سەرکەفتی ترو ئەڤە رەنگێ سەرکەفتی یێ هوزانی یە. بمن نەووجەک بتنێ هوزانێ هەیە و (وزیفێ) سەرەکی پەیداکرنا خوشیێ یە لنک گوهداری یان خویندەڤای و ئاراندنا مروڤی یە. پشتی ئاراندن و خوشیێ هەمی رەنگێن دی یێن ووجێ دهێن

ئەو باوەرێن بەری نهە من هەین کو هوزان چەکە... تڤەنگە... ساتورە، توپە من یێن لپاش خو هێلاین و بەس ژبو

بیرهاتن ئەز هندەک جاران لسەر ملێ خو پاشدا لیێدزڤرم.

**پ/ پشتی تەکنولوجیاو قمر صناعی و ڤدیوکاسێتا کارەکێ مەزن کری لسەر ژیانا خەلکی مە یا روژانە... ئایا پشتی چەند سالەکێن دی شعر نامریت؟**

و/ هوزان ژیانە... نوژەنکرنا ژیانێ یە... پەیداکرنا تشتی یە ژ نەبونێ لەورا ئەگەر مرنەکا وێ هەبیت دێ لدوماهیا هەبونێ بیت

هوزان ئاویزەکا مەزنە ژبو لڤاندن و ئازراندنا ئامێرێن بەرڤانیا مروڤی یا نەهشییێ ژ کەساتیا خو وەک خەونێن هشیاریێ و پاشدا زڤرینێ، خراندنێ، کراسکرنێ و حەتا دوماهییێ.

چونکه دڤێ ژیارا سرت دا حەز کرنییێن مروڤی بکەڤرەکێ رەق یێ دور هێلی دکەتن وتێنه دابرین و ڤەدگەرن دنەهشیا مروڤی دا ئومبار دبن. ئەگەر مروڤ لژێر بارێ گرانێ دابرینێ دا بمینیت دێ کەساتیا وی هەلوشیت، لێ میکانیکیا بەرڤانیا کەسایەتی بخاپا ڤێ ڤالاییێ تژی دکەت و هوزان ڤان خاپا دئارینیت ئینجا چاوا مرن ژبو هەیە.

ددرێژیا هەبونا مروڤان دا هوزانێ کارەکێ مەزن دژیارا وی دا کریە. دوەرارا مروڤاییێ دا هوزانێ کار هەبویەو کارتێکرن لێ هاتیەکرن، ئانکو وەرارکریە دگەل وەرارا ژیارێ و بازێریێ و پێشەوا بویە.

قمر صناعی وڤیدیوو تلستار نەشێن هوزانێ بکوژن..

دژیارا نوکەدا دگەل سینەماو ڤدیوکاسێت و TV و سەتەلایتا ورادیویا هەڤرک بو هوزانێ پەیدابوینە کو بشێن خاپێن نەهشییێ بئارینن لەورا رولێ هەر تشتەکی کزتر لیدەهێت ژ سەردەمێ کو ئەو ئێکانە دقادی دا، لێ نە ئانکویە کو بەرەف مرنێ دچن.... کزبون نەمرنە... گەلەک جاران ئەڤ تشتێت هە خزمەتا تورەی دکەن بگشتی و تورە ژی دگریت وەک هونەرێ مونتاجێ ژ هونەرێ سینەماییێ هاتە دناڤ تورەی دا. دیسان د گەهاندنا هوزانێ دا ئەڤ ئاویزە کارەکێ مەزن دبینن

**پ/ تە دڤێت روژەکێ ژ روژا ببیە تاقانە شاعر و کەس ل بەر سینگێ تەنە مینیت؟**

و/هوزان ڤەرێژا مروڤایەو بەرهەمێ هەر کەسەکی تامەک هەیەو هەر سەربورەکێ

**د ژیانا ئەدەبی و هوزانی دا من هیچ موجامەلا بەرپرسا نەکریە . .**

ووجەک هەیە. ئەز حەز ژ مشەیا رەنگا دکەم.
چێبیت من بڤێت ئەز هوزانڤانێ ژ هەمیا مەبستربم، لێ من نەڤێت ئێکانەبم.
چونکە بەری هوزانڤانییێ ئەز خوێندەڤامە...
ئەز خوشییێ ژ بەرهەمێ خەلکێ دی دبینم و گەلەک جاران ئەز ددانم پارچەک ژ کەساتیا خو.

**پ/ ئایا خاندنگە هێن ئەدەبی (البنیویة، الواقعیة، الطلیعیة) هتد وەک جاران گرنگیا خو هەیە؟**

و/ بمن چ جاران خاندنگەهێن تورەی برەنگەکێ رویت (مجرد) نەبوینە، تێکهەلدان بونە ژ پتر ژ خوێندنگەهەکێ، لێ ئەدیبێن خوێندنگەهەکێ ژ خوێندنگەها سەر بەرهەمێ وان دا زال بویە و بویە درویشمێ وێ خوێندنگەهێ.
نوکەژی هوزانڤان هەنە خو بخوێندنگەهاڤە گریددەن، لێ ئەزو هەڤالێن من ژ دەستەکا (نویکرنا هەروهەر) خو ب چ قالبێن بەروەخت یێن بەرهەمدانێ ڤە ناگرێدەین. نویکرن درویشمێ مەیە و لێگەریان ل نمونێن نوی یێن کارێ مە یێ بەردەوامە.

**پ/ شیعرا گەنجا تو چاوا دهەلسەنگینی وتوکێ دهەلبژێری کو لپاشەروژەکێ ببتە شاعرەکێ بەرز؟**

و/ روژانە من گوهـ لهوزانێن قەنج دبیت و ئەز دخوینم لێ نە ئەز حەز سەنگاندنێ دکەم و نەژی کارێ منە تنێ ببپشت راستی ئەز دبێژم تنێ هوزان لنک مە یا بسلامەتە.

**پ/ بو چی پویتێ خەلکی یا بشعرو ئەدەبی کزبوی و تو دبێژی دێ روژەکێ شعرو ئەدەبی رەواج و تەشجیعا بەرێ بو زڤریتەڤە؟.**

و/کزبونا پویتێ خەلکی بهوزانێ گەلەک ئەگەر هەنە و یا ژ هەمیا مەسترە هەرفتنا نمونێن بلندە... ئانکو بەری نها تورەو دوزا کوردی بهەڤرا دگرێدای بون و د نەهشیا جڤاکی یا خەلکی دا ئێک پێگوهورکا یا دی بو. دگەل سەرهەلدانێ و کەتنا بزاڤا کوردی دشاشیادا وەک بزاڤ و کەچیێن کەسا نمونێ شورەشێ لپێش چاڤێن وان شکاندو بو ئەگەرا شکاندنا هەمان نمونێ تورەی دیسان بارێ ئابوری یێ سرت و وەستیانا خەلکی بپەیداکرنا پاریێ نانی ڤە هەڤرکیا هەمی بزاڤێن دی یێن مروڤایی دکەت.
هەروەسا هەبونا رادیوو TV و سەتلایت و ڤدیوکاسێت و سینەمایا هەڤرکیا هوزانێ دکەن. دیسا هەرفتنا هندەک بیرو رایێن فەلسەفی بێزاری پەیداکریە و گومان ئێخستیە سەر کاریگەریا هونەری بگشتی وەک ووج وشیانا گوهرینێ بمن دێ رەواجا ئەدەبی زڤریتەڤە پشتی پەیدابونا دەستەکەکا نوی یا خوێندەڤایا ئەڤ مەرجێن هەلووشیانێ ژێ نەگرن.

**پ/ گەرتە پەیڤەک کورتک هەبیت؟**

و/ لپێشیا هەر گوهرینەکا مەزنا ئابوری، سیاسی، جڤاکی و هەمی سەرهەلدانێن مەزن بگرو بکێشەکا مەزنا بیرورایا هەبویە ددرێژیا دیروکێ دا وڤێ بگرو بکێشێ رەوشەنبیرا سەرکێش کریە.

دژیارا کوردەواریا نوکەدا ئەم پێدەڤی بیرو قەلەمێن رەوشەنبیرێ کوردین، لێ ئەڤ بزاڤە یاوندایە چونکە رەوشەنبیرێ مە ژ ئەگەرا جەنگا سایکولوجی یێ ترسیایە و مروڤێ ترسیای، نەشێت تشتەکێ ببهابکەت لەورا ئاخفتنامن ئەوە ل بەرەڤ ئاڤاکرنا مروڤەکێ کورد بێ نەترسیای و خو ژ سەرگێژیا نەدەتە پاش.

**پ/ شاعر شاهدێ زەمانێ خویە، هەتا چ رادە ئەڤ گوتنەتە بجهـ ئینایە و ئایا تە دشعرێ دا هەر ئەو تە گوتیە ئەوا د بەرژەوەندا جەماوەری دا نهاو پێش نها، یانژی تە مجاملا بەرپرسا کریە؟**

و/ بەرژەوندیا جەماوەری تشتەکێ ب گەلەک کوژیا دهێت دیتنێ ئانکو ئەز تشتەکێ ببەرژەوەندا جەماوری دزانم و کەسەک دی تشتەکێ دژی دیتنامن ببەرژەوەندا جەماوەری دزانیت... ئەز دبینم کو شورەش رێکە بو دەستڤە ئینانا مافێن مللەتی و (مسعود محمد) دبینیت ڤیانا ژیارێ و خودانەپاش ژ مرنێ بەرژەوەندیا مللەتی یە، لەوما وەک راستیەکا سەر بەردای (مطلق) ئەز دزانم کانێ چەند ئەز د بەرژەوندیا مللەتی دا بویمە، لێ هەمی دەما من ستویێ خو ئێخستیە بەر چەقویێ دا بەرەڤانی ژ وان تشتا بکەم یێن ئەز هزر دکەم بەرژەوندیا جەماوەری یە ئو هەمی دەما ئەزی یاخیبویمە لەوما ئەزێ مایمە بێ کولاڤ، تنێ کولاڤێ من خوارن.

هندی ئەز هزرا خودکەم بیرا من ناهێت جارەکێ من دەلە دلێ بەرپرسەکی دابیت دکارێت خو بێت ئەدەبی دا و هەر دەم ئەز وەکو دەڤێ (شیری) بویمە بیێ پویتە پێبکەم دێ کی سل بیت، دی کی من دەتە قوتان، دێ کی من دەت دەستێ دادگەهێ.

**- محسن قوچان ل سالا ١٩٥٤ لگوندێ (بامەرنێ) سەر بقەزا ئامێدیێ هاتیە**

دونیایێ
- سالا ١٩٧٦ کولیجا چاندنێ ل زانکویا (موصل) بدوماهی ئینانه.
- ژ سالا ١٩٧٠ دەست ب بەلاڤکرنا هوزانا کریە
- ئەندامێ ئێکەتیا نڤیسەرێت کوردە- تایێ دهوکێ
- تانهو ئەڤ هەر سێ دیوانێت هوزانێ یێت چاپکری:
١- بەفر یا ل ڤێرێ- ١٩٨٦ بغداد.
٢- وێنەک ژ فلمەکێ پرچیایی- ١٩٩٣ دهوک
٣- چاڤێن ئەوێ کەچا هەنێ- ١٩٩٥ دهوک

لەسەر راسپاردەی رامان
وصفی حەسەن ئامادەی کردووە

رزگار عەبدوڵڵا:

# شیعری کوردی لە گێژاو و تەنگژەیەکی گەورە دایە

***(رزگار عەبدوڵڵا) نەوەی هەشتاکانی شیعری هەولێرە، هەر لە سەرەتای تەمەنی شیعریدا بە خەون و خولیا و ئەشقێکی مەزن و بە ترسەوە رووی کردە ئەم جیهانە پڕ تەلیسم و جوانە، بە گومانەوە تەماشای توانا و دەسەڵاتی شاعیرانەی خۆی دەکردو لەبەردەم ئەفسوون و ئاوێنەی شیعردا هەڵوەستەیەکی هونەری کردو بە ئاکارو رەوشتێکی بەرزەوە لەبەردەم پەیکەری شیعردا راوەستاو بە ئەسپایی خۆی بەم خەڵوەتگایەدا کردو کڕنۆشی برد.***

## یەکێتی نووسەران نەیتوانی سەربەخۆیی خۆی بپارێزێ دووای راپەڕین

**رزگار لە ساڵی (١٩٨١) لە ماڵ و وڵاتی خۆی هەستی بە تێنئاوارەبوون کرد، هەر بۆیە سەری پڕ لە هەستی شاعیرانەی هەڵگرتوو بوو بە گەریدەی وڵاتان و ماوەی (١٣) ساڵە ئەم وڵات و ئەو وڵات دەکاو تا لە ستۆکهۆلم گیرسایەوە.. جا سەبارەت بە شیعرو باری رۆشنبیری و بزاڤی شیعری و یەکێتی نووسەران و چەندین لای دیکەی پەیوەستدار بە باری رووناکبیری ئەم گفتوگۆیەمان لە گەڵیدا سازکردو لێمان پرسی:**

**رامان: حەز دەکەین سەبارەت بەدروستبوونی یەکێتی نووسەرانی کورد لە سوید قسەمان بۆ بکەی؟**

**رزگار عەبدوڵڵا:** لە ساڵی (١٩٨٨) بەهەوڵ و تەقەللای کۆمەڵێک لە رۆشنبیرو نووسەرانی کورد لەدەرەوە لە پێش هەمووشیانەوە کاک کەمال میراودەلی یەکێتی

نووسەرانی کورد دامەزرا، بەو مەبەستەی بنکەیەکی جێگیری بۆ لە سوید یا لەندەن بۆ مسۆگەر بکرێ، کەچی تەنها لە سوید دروست بوو، ئەو یەکێتیە کۆمەڵێک چالاکی رۆشنبیری وەک کۆرو کۆبوونەوەو سیمیناری ئەدەبی و دەرکردنی گۆڤاری (وان)ی لە ئەستۆ گرت، تا ئێستە چەند ژمارەیەکی لێ دەرچووە، بەڵام یەکێتیەکە وەک ئێرە دووچاری گیروگرفت هات، لەوانە گیروگرفتی بەڕێوەبردن، نەدەبوو هەر ناوێک و گۆڤارێک بێت، لەبەر ئەوە بڕیار درا یەکێتییەکە هەڵوەشێتەوە، چونکە برادەرانی ئەندام هی هەموو پارچەکانی کوردستان بوون بە ئاسانی نەدەگەیشتنە یەک و کارەکان بەسستی دەڕۆیشتن و چەند کەسێکی لێ دەرچێ کەس بە جدی کاری نەدەکرد، من و کاک خەبات عارف بڕیارماندا گۆڤارەکە بە جوهدی خۆمان دەربکەین و ئەم یەکێتی نووسەرانی لەمپەرە لەبەردەم گۆڤارەکە لابدەین.

**رامان: بە تێڕوانینی زۆر کەس یەکێتی نووسەرانی کورد دووای کۆنگرەی راپەڕین کەسێتی خۆی لەدەستدا، ئێوە دەوری یەکێتی نووسەران چۆن دەبینن و چی دەڵێن؟**

**رزگار عەبدوڵلا:** من پێم وایەو بە راستی دەیلێم.. یەکێتی نووسەرانی کورد لە کوردستان وەک یەکێتی نووسەرانی وڵاتە کۆمۆنیستەکانی جارانە، بۆ نموونە وەک یەکێتی نووسەرانی سۆڤیەت کە دەزگایەکی رۆشنبیری بوو بەدەست لووتکەی دەسەڵاتەوە، لەبەر ئەوە چاوەڕوانی کارو داهێنانی ئەدەبی لە یەکێتیەکی ئاوها سەقەت ناکرێ، ئەگەر یەکێتی نووسەرانی کورد دووای راپەڕین بیتوانیبا سەربەخۆیی خۆی بپارێزێ و خۆی تەرخان بکات بۆ کارو چالاکی ئەدەبی، لەو بڕوایەدا بووم وەزعی رۆشنبیری و ئەدەبی لە ئێستە باشتر دەبوو، بەڵام دیارە وەزعی کوردستان و دەسەڵاتی یەکێتی و پارتی رێگە بەوە نادا..! ئەگەر یەکێتی و پارتی هەر هەموو نووسەرەکان و یەکێتی نووسەرانی ناچار نەکردبایە ببنە پیاویان لەو بڕوایەدام یەکێتی نووسەران خۆی دەیتوانی درێژە بە ژیانی خۆی بدات و گەشە بە چالاکییەکانی خۆی بدات، لەبەر ئەوە ئەگەر یەکێتی و پارتی گرینگی بەئەدەبی کوردی دەدەن ئەوا دەبێ رێگەی سەربەخۆیی هەموو نووسەرێک و هونەرمەندێک و رۆژنامەنووسێک و رێکخراوە پیشەییەکانیان بدەن، ناچاریان نەکەن مل کەچی بڕیارە سیاسییەکانی ئەوان بن، دەبێ بە پێچەوانەوە بێت، ئەم ئەزموونی دەست بەسەر داگرتنی رێکخراوە پیشەییەکان زۆرە، هەر هەموو وڵاتە دیکتاتۆرەکان پەیڕەوی دەکەن رێکخراوەکان دەکەنە واجیهەی خۆیان و وابەستەی سیاسەتی تاوانکاری رژێمەکانیان دەکەن. لەبەر ئەوە ئەم کارە بە سەلبی بەسەر بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیری و گەشەکردنی ئەم وڵاتەدا دەشکێتەوەو سستی دەکات، هەر بۆیەشە کارێکی چاوەڕوان نەکراو نییە ئەدەب و هونەری کوردی لە کوردستاندا کەلاکێکی مردارو بۆگەن بێت و چاوەڕوانی داهێنانی لێ نەکرێت.

**رامان: کاک رزگار ئەگەر نەخشەی شیعری کوردی دووای گۆران بهێنێتەوە بەرچاوت تا ساڵی (١٩٨٠) و کۆی بکەینەوە لەگەڵ (١٣) ساڵی ئەزموونی گەڕیدەییت لە ئەوروپا شوێنی خۆت لە شیعری کوردی لە کوێ دا دەدۆزیەوە؟**

**رزگار عەبدوڵلا:** پێم وایە ئەم پرسیارە زۆر زەحمەتە، وەڵامدانەوەشی بە

شێـوەیەکی مـوتلـەق رەنگە بێ ویژدانانە بێت، لەبەر ئەوەی ئەو چەند ساڵەی رابردوو دەتوانم بڵێم تا رادەیەک لە وەزعی رۆشنبیری و بزاڤی شیعری لەکوردستان دابڕا بووم، بە دەگمەن نەبێت شتێکی ئەوتۆم دەست نەدەکەوت، بۆیە بڕیار دان بە گران دەوەستێ، بەڵام دەتوانم بڵێم ئەو شیعرانەی لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی دووای راپەڕین دەستم کەوتوون و خوێندوومەتەوەو بینیومە وا هەست دەکەم شیعری کوردی لە شوێنی خۆیدا وەستاوە جار جار دەبینی دەنگێک هەیە، رەنگە وەک بانگدانەکەی ناو کودیلەی بیلالی حەبەشی بێت..! کەواتە بە شێوەیەکی گشتی شیعری کوردی چەقی بەستووە، هەرچەندە پێناسە کردنی ئەو ماوە دوورو درێژەو لە قاڵبدان مەسئولیەتە، بەڵام دیسان تەئکید دەکەمەوە شیعری کوردی لە تەنگژە و گێژاوێکی گەورە دایەو پێویستە خۆی دەرباز بکات، بە تایبەتی لە رووی زمانی دەربڕین و زمانی شیعر نووسین، شێوەی بیرکردنەوەو هەموو کەرەسەکانی دیکەی بگۆڕێ ئەگەر نا شیعری کوردی زۆر زۆر لاوازە..! دەبێ ئەوەشمان لەبیر بێت کەسانێک هەن خۆیان گرتووە ئەگەر نا زۆربەی هەرە زۆری فت کە..!

**رامان: رزگاری شاعیر لەدەرەوە جورئەتی نووسینی بینیوە، هەڵبەت ئێوە لە شاعیری ناو کوردستان بەجورئەتترن، ئایا جورئەتی دەربڕین پێوەندی بە داهێنانی شیعریەوە هەیە؟**

**رزگار عەبدوڵلا:** بە حەقیقەت ئەم مەسەلەیە زۆر گرنگە، رۆشنبیرانی کوردی دەزگاکانی راگەیاندنی کوردستان گرنگی پێ بدەن، چونکە ئەو مەسەلەیە زۆر بایەخدارەو دەبێ لەوێوە دەست پێ بکەین، هەموو وشەیەکی کوردی، نووسەران و هونەرمەندان و رۆژنامەنووسان مافی ئەوەیان هەیە بەکاری بهێنن، جا ئەوە تێکستی ئەدەبی بێت یان لەسەر شانۆدا بێت یان لە کاری شێوەکاری بێت و تاد، بەڵام بە داخەوە بوونی سانسۆر لەسەر ئەدەب و هونەری کوردی کۆمەڵێک هۆی هەیە کە هەندێکیان کۆمەلایەتی و ئەوانی تر لە رووی عەقیدەوەیە، ئەو هۆکارانە وایان کردووە ئەدیب و نووسەرو هونەرکاری کورد هەموو شتێک دەرنەبڕن، بەڵام لە ئەدەبیاتی ئەورووپیدا هەر وشەیەک قسەی پێ بکرێ مافی خۆتە لە نووسین بەکاری بهێنی، لێرەدا رێگە نەدراوە..!

**رامان: بێگومان زۆر ولاتانی دنیا گەڕاوی، باری رۆشنبیری و ئەدەبی ئەو میللەتانەو لە سێبەری حکوومەتەکانیاندا بینیوە، باری رۆشنبیری و ئەدەبی کوردی لە سێبەری ئەم دەسەلاتەدا چۆن دەبینن؟**

**رزگار عەبدوڵلا:** هەڵبەت ئەم دەزگایەی کە ناوی حکومەتی هەرێمەو یا راستتر با بڵێم یەکێتی و پارتی هێجگار کەمتەرخەمن لە گەشەپێدانی ئەدەب و هونەری کوردی و راگەیاندن، ئەگەر یەکێتی و پارتی ئامادەبن بەشێک لەو ئیمکانیاتە مادییەی بۆ راگەیاندنی خۆیان بەکاری دەهێنن بیدەن بەدەسەلاتی هاوبەشیان لەهەرێم لەو بڕوایەدام یەکێتیەکی راگەیاندن و رۆشنبیری چاک دروست دەبێت، ئێستە ئەو زانیارانەی کە راگەیاندنەکان لە رۆژنامەو تەلەفزیۆنەکاندا بلاوی دەکەنەوە، راگەیاندن و دەنگ و باسی پچڕ پچڕی ئێرەو ئەوێیە، پێم وایە هیچ

چارەیەک نییە، ئەگەر ئێستەش نەیکەن هەر دەبێ لە داهاتوودا بیکەن، چونکە مەحاڵە کار بەم شێوەیە بکرێت تا ئێستە هیچ وڵاتێکی بەم شێوەیەی کوردستان لە دنیادا نییە کە دوو حزبی بەدەسەڵات و دەسەڵاتدار، رۆژنامەی رۆژانەو رادیۆو تەلەفزیۆنی تایبەتی خۆی هەبێت.. لە حاڵەتێکدا پەرلەمان و حکومەتەکەیان کەناڵێکی راگەیاندنی نەبێت. جا ئەو گرینگیدانە بە ئیعلامی حزبی خۆی لە خۆیدا مانای ئەوەیە یەکێتی و پارتی ددان بە پەرلەمان و حکومەتەکەی خۆیان دانانێن ئەگەر نا وەزع بەم شێوەیە نەدەبوو.

**رامان: ئێوە وەک خۆرهەڵاتیەک لە ئەوروپادا هەستتان بە هیچ ئەزمەیەکی رۆحی کرد؟ ئەگەر وایە ئەم ئەزمەیە تا چەند لە شیعردا رەنگی داوەتەوە؟**

**رزگار عەبدوڵلا:** بێگومان پێکەوە گرێدانی دوو کەلتووری لێک جیاوازی خۆرهەڵات و خۆرئاوا هێجگار زەحمەتە، چونکە مرۆڤی رۆژئاوایی و رۆژهەڵاتی لەبیر کردنەوەدا لێکتر جیان، لەبەر ئەوە بە تەئکید زۆر زۆر ئاساییە مرۆڤ لە سێبەری ئەم شارستانیەتە جیاوازانە دووچاری کێشەی رۆحی بێت، ئەگەر مرۆڤێک زۆر بە ئاگاو هوشیار نەبێ رەنگە خۆی تێدا بزر بکات، یان دووچاری بێزاری و نامۆیی بێت، پێم وایە ئەوەش حاڵەتێکی ئاساییە، دوور نییە مرۆڤێکی خۆرئاواش بێتە ئێرە تووشی هەمان حاڵەت بێت، بەڵام هێندە هەیە ئەوان وەک گەشتیار دێن و ئێمە ناچار کراوین لەوێدا بژین..!

**رامان: وەرگێران لایەنێکی پرشنگداری شارستانیەت و رۆشنبیری میللەتانە رزگار عەبدوڵلا چەندە سویدی دەزانێ و تا ئێستا چی وەرگێراوە یا لە هەر زمانێکی دیکەی ئەورووپییەوە بۆ زمانی کوردی؟**

**رزگار عەبدوڵلا:** لە راستیدا وەرگێران لە زمانی سویدیەوە یا لە هەر زمانێکی دیکەی ئەورووپییەوە بۆ زمانی کوردی لای گەلێک برادەر ئاسانترە وەک لە کوردییەوە بۆ زمانەکانی دیکە.

لە بواری وەرگێران لە زمانە زیندووەکان بۆ سەر زمانی کوردی چەند برادەرێک هەوڵی باشیان داوە، سەرەتایەکی چاک هەیە بۆ ئەوەی لە داهاتوویەکی نزیک کۆمەڵێک بابەتی چاک بکرێنە کوردی، من تا ئێستە کۆمەڵێک شیعری شاعیرانی سویدم کردۆتە کوردی بەڵام حەز ناکەم پەلە لە بڵاو کردنەوەیاندا بکەم، هەوڵ دەدەم زیاتر کاریان تێدا بکەم و بۆ ئەوەی بەرهەمێکی چاک و نایاب دەربچێ، مەسەلەی وەرگێرانیش زۆر زۆر زەحمەتە هێندە هاسان نییە، بێگومان وەرگێران دەستاوێژێکی گرینگە لە ناساندن و تێک گەیشتنی میللەتان لە یەکتری، ئەدەبیاتی کورد لەم بوارەدا زۆر هەژارە، ئەمەش هۆی بابەتی خۆی هەیە، یەکێک لەوانە ئازاد نەبوونی مرۆڤی کورد بوو لە فێر بوون و سەفەر کردنی بۆ دەرەوە بەهەر شێوەیەک بێ، کۆچکردنی مرۆڤی کورد لەشەڕی عێراق- ئێران دەستی پێ کردو لەو ماوە کەمەدا هەر بەوە راگەیشتین سەرەتایەکی باش بۆ وەرگێران دروست بکەین و بەو ئومێدەی لە داهاتوودا سوودی لێ ببینین.

**رامان: کاک رزگار کە هێندە لە شیعری ئێستە نا رازیت دەتوانی کۆپلەیەکی**

**شیعری خۆتمان بۆ بخوێنیەوە؟ بەڵکو ببێتە سەرچاوەی گفتوگۆیەکی گەرمیش..!**

**رزگار عەبدوڵلا:** کۆپلەیەکی دووا شیعری خۆمتان بە ناوی **(گـۆرانی روح)** بۆ دەخوێنمەوە:

**لە چاومدا بە ئەنقەست ئەشکی تەنیایی داناکاو**
**لە تاریکی غوربەتیشدا هەر بۆ هەوەس داناگیرسێم**
**چۆن دەتوانم بێ فرمێسک باسی مێژووی بن تەوەری**
**غوربەتت بۆ بکەم..؟**
**من جەستەیەکی لەت لەتم**
**ئەم رووباری غوربەتە سەری هەڵگرت**
**شەپۆلی دا لەقەڵاو شار کۆچی کرد..تاد**

**فەیسەل دێهاتی ئامادەی کردووە**

# پێڕست